# ڕۆشنبیری نوێ



ژماره ١٢٥ وەرزی بەهار - ١٩٩٠ -




شێخ مەحمود (١٨٨٢-١٩٥٦)

## لەم ژمارەیەدا

لێکۆڵینەوەی رامیاری

# خاندنەك دیاسایا ئۆتۆنۆمی بۆ دەڤەرا كوردستانا عیراقێ دا

نڤیسینا: بریندار مزیری

## پێش گۆتن

دیمقراتی‌یا ئێکسەر نیزیکترین رێکخستنە بۆ مللەتان و رێکەکا دروستە یاکو مللەت رادبیت ب کارهینانا مافێ خۆ ئو پێ پشکداری‌یێ بکەت دناف حکمی‌دا. بەلێ ئەڤ رێکە نوکە بەرهەنگاری گەلەك ئالوزی‌و گرفتاری‌یا بویەو دبیت ئەڤەژی دزڤریتە هژمارەکا ئەگەرا ژوانا..

١ ـ زیدەبوونا خەلکێ وەلاتی.

٢ ـ بەرفرەهی‌یا ئەردێ دەولەتێ.

ژبەر ئەڤان دەولەتا دەست کر ب رژێما نیابی یان رژێما دیمقراتی‌یا نەئێکسەر... یان ژی دێ هندەك کەس ژناف مللەتی دێ هینە هلبژارتن ژدەڤ خەلکێ وەلاتی ئو ئەو دێ جهێ باوەری‌یێ بن و دێ رابن ب کارێ یاسادانانێ و دێ شوینا مللەتی گرن...

ئەڤ کارە ژی دێ هێتە بجهـ ئینان ب رێکا هلبژارتنێ وەلاتی دێ دەنگی خۆ دەن بۆ ئەوێ کەسێ یێ کو باوەری‌یا وان پێ دهێت ئەو دزانن کو ئەو دێ شێت بەرەڤانی‌یێ ژمافێ وان کەتن. من دڤێت تیروژکەکێ باڤێمە ل سەر دیروکا ب کارهاتنا یمقراتی‌یەتێ ئو هلبژارتنا نوینەرا ل ناف دیروکا عیراقێ‌دا.. ئو پشتی پەیدابونا جڤاتا یاسادانانێ.. بۆ دەڤەر کوردستانا ئوتونومی..

### کورتی‌یا پەیدابونا دیمقراتی‌یێ ل عیراقێ

پەیدابونا دیمقراتی‌یێ ئو هلبژارتنا نوینەرا ل ناف دیروکا عیراقێ‌دا بۆ جارا ئێکێ مللەتێ عیراقێ رابوو ل سالا (١٨٧٦) ب هلبژارتنا نوینەرا بۆ جڤاتا (مبعوثین) یاعثمانی ل بن دەست هەلاتداری‌یا ئیمبراتوری‌یەتا عثمانی ئو ئەڤ مافە جارەکادی بکارهات پشتی زڤرینا دستوری یانکو پشتی شورەشا (تورکیا فتاه) ل سالا (١٩٠٨) یاکو دەست پێ‌هاتی‌یەکرن بۆ هلبژارتنا ئەندامێت جڤاتا مبعوثین ئەڤە ژی پشتی وەرگیران هاتی‌یە پەیدابون ل ناف دەولەتا عثمانی‌دا وسلطان (عبدالحمید) دویرئێخستی.. ئەڤ بزاڤە هاتە زانین بناڤێ (المشروطیة).

بۆ جارا سێ‌یێ دیسان مللەتێ عیراقێ رابوو ب کارهینانا مافێ خۆ ل دەمێ حکمێ مەلەکی ل عیراقێ هاتی‌یە پەیدابون ئەوژی ل سالا (١٩٢١) ڤێجا مللەت گەلەك جارا رابوو بکارهینانا مافێ خۆ... ب رێکا هلبژارتنێ ئو هلبژارتنا ئەندامێت جڤاتا چێگرنێ‌و هلبژارتنا جڤاتێت نیابی خۆ ژسالا (١٩٢٥) هەتاکو سالا (١٩٥٨) ل ئەڤێ قوناغی‌دا مللەتێ عیراقێ (١٦) شازدە جارا نوینەر هلبژارتن و بۆ جڤاتا نیابی یا عیراقێ. ئەڤەو قوناغ کو حکمی مەلەکی ل عیراقێ ئەو نینە کو باشتر بوو ژ قوناغا حکمێ جمهوریەتێ یاکو دەست پێ دکەت خۆ ژ سالا

(١٩٥٨ ـ ١٩٦٨) ل ئەڤی دەمیدا رژێم نەدشیا رابیت ب کاری خویی دروست ئەڤەو پشتی شورەشا (١٧ ـ ٣٠) تیرمەها سالا (١٩٦٨) هاتی جارەکادێ مافێ دیمقراتییەتێ زڤراندەڤە ئو شورەشێ دانابو بەرچاڤێت خو بو چێکرنا دەزگەهەکا دیمقراتییا هلبژارتنێ . . ڤێجا رابو ب دەرئێخستنا بەیاناما هژمارا وێ (٢٤) ژدەڤ جڤاتا قومانداری‌یا شورەشێ ئەڤ یاسایە دیاردکەت ب چێکرنا جڤاتا نیشتانی ئو ئەندامی‌یا کورێت وەلاتی ئو هەر ئەنـدامەك دێ مەنسەبێ خوپارێزیت ل ناڤ دەزگەهێت حکومەتێدا . . وهەروەسا پێك هاتی‌یە ژ بەرپسیارێت نقابا ئو ئێکەتی‌یا ئو دگەل هژمارەکا وەلاتی‌یا یاکو دیروکا وان یا پاقژ ئو وان دخزمەتا نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌دا کارکری‌یە ئەڤەو پشتی کو دستوری عیراقێ یێ سالا (١٩٧٠) هاتی‌یە بەلاڤەکرن . . ژێیرا دوێ ژ دەرگەهێ جارێ بەحسی ئەحکامێت جڤاتا نیشتمانی دکەت یاکو ل دویڤ ئەوێ چەندێ یاسا هژمارا وێ (٢٢٨) ل روژا (١٧)ی کانونا ئێکێ یا سالا (١٩٧٠) دەرکەفتی‌یە . . ل دویڤ ئەڤێ یاسایێ بریار هاتەدان کو ئەندامێت جڤاتێ دێ هێنە تەعین کرن وەك ئەندام ل ناڤ جڤاتێدا و کاودانێت شورەشێ ل وی دەمی مولەت نەدایێ کو رابیت ب کاری جڤاتا نیشتمانی چونکو سەروبەری دیمقراتی و رەحەتی هێشتا ل عیراقێ بجهـ نە هاتیو وهێشتا مولەت دڤیا . . ڤێجا پارتی‌و شورەشێ دیت کو هێشتا زی‌یەو یا پێدڤی‌یە رێکێ خوش بکەت بو قوناغا بهێت داکو بشێت بەری دەستێ خو بینیت و پینگاڤەکا باش پاڤێت ڤێجا هوسا بزاڤ هاتەکرن هەتاکو شیاین ل سالا (١٩٨٠) ب دەرئێخستنا یاسا هژمارا وێ (٥٥) ئەڤ یاسایە هاتە ناڤکرن ب یاسا چێکرنا جڤاتا نیشتمانی ئەڤ یاسایە پێك هاتی‌یە ژ (٦٤) مادا وهاتینە بەلاڤەکرن ئەڤ یاسایە پێك هاتی‌یە ژ (٦٤) مادا وهاتینە بەلاڤەکرن ل سەر (٤) چار دەرگەها ئو جڤات پێك هاتی‌یە ژ ئەندامی‌یا (٢٥٠ [illegible]) اما . ئەڤ ئەندامە دهێنە هلبژارتن ب هلبژارتنەکا ئێ[illegible]ـەر و یاس[illegible] ربەست و دەنگدان دێ یا ب نەهێنی بیت (بەرزەی) بیت [illegible] سەر بنیاتێ کو هەر نوینەرەك بو (٦٠،٠٠٠) شیست هزار کەسایە . ئو پشتی بەیاناما (١١) یازدەی ئادارا سالا ١٩٧٠ دەرکەفتی بو چارەسەرکرنا خلمەتا کوردی ل دویڤ ئەوێ بەیانامێ جڤاتا سەروکاتی‌یا شورەشێ یاسایا هژمارا وێ (٥٦) یاسالا (١٩٨٠) دەرئێخست دبێژنێ یاسایا جڤاتا یاسادانانا حکمێ زاتی بو دەڤەرا کوردستانا عیراقێ .

## پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی‌و خلمەتا کوردی

پار[illegible]بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی خو ژ روژا دامەزراندنا وێ ئو هەتاکو نهو دیت کو پێدڤی‌یە سودێ وەربگریت ژ سەربورێت بورین ئو رویدانێت دیروکێ راڤەو شروڤە بکەت ب چاڤەکێ زانیاری هەتاکو سود ژێ بهێتە وەرگرتن ئو ئاخڤتنێت سەروکێ قوماندار ل دور نڤیسینا دیروکێ ئو دیمقراتییێ نموونەکا ئاشکرایە بو ئاخفتنا من ئوریکا پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی دانایە ل بەرسینگێ خو دوو چق ژێ دچن . .

چقێ ئێکێ: ئەو رێکە یاکو دویرە ژحەزێکرنێت تایبەتی ئو کەسایەتییێ

چقێ دوێ: راڤەو شروڤەکرنا رویدانێت دیروکێ ئو دیمقراتی یێ چ ل وەلاتێ مە یان ژێ ل جیهانێ دڤێت لدویڤ رێکێت زانیاری ئو ئەو رێکێت زانیاری بکاربهینن ئوب هزرەکا شورەشگیرانە یا دویربیت ژ توخم پەریسییێ و کەڤنەپەریسی ڤێجا ل دویڤ لێرینانا پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی ئەم بەری خو ددەینە رویدانێت دیروکی ئو دیمقراتییێ، ب رەنگەکێ راست چونکو ئەو قودیکا روناهی‌یی‌یە . . دا جهێ خو بکەت ئو ریکا خو ببریت دا بکەهیتە ئارمانجا خو یاکو دانای بو ڤی ملەتی ئەڤەژی نەخشا وێ بو خو ژ روژا ژدایك بونا وێ . . ئو یاهاتی‌یە دیارکرن ل ناڤ بەلاڤوکێت پارتێدا . .

پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی بڤەکولینەکا زانستی ئو جوان بەحسی سەروبەری خلمەتا ملەتێ عیراقێ یاکری ب رەنگەکێ گشتی‌و خلمەتا کوردی ب رەنگەکێ تایبەتی ئو خەباتا وێ گریدا ب خەباتا ملەتێ عیراقێڤە ئو ئێکەتی‌یا نەتەوایەتییێ . . ژوێ بنیاتێ کو ئێکەتی‌یا نیشتمانی بهێتە پارێزتن . . ئەڤ چەندە ژێ هاتە دیارکرن دراپورتا کونگرێت پارتێدا . ئو سەروکێ قوماندار صدام حسین زەلامێ ئەڤی رێکێ بو ئەو نەخشە بو دانا ئو ئەوی بخوپشکداری‌کر دگوت و بێژیت بەیانا (١١) یازدەی ئاداری‌دا هەکە ئەم بەری خو بدینە دیروکێ دبینین کە گەلەك چارەسەرکرنێت هاتینە دانان بو خلمەتا کوردی ل درێژی‌یا دیروکا عیراقێ بەلێ ئەو چارەسەرکرن گرێدای هەبوون ب دەزگەهێت ئیمپریالیزمی‌و کولەداریێ ئو یێت کەڤنەپەریسی‌یێڤە و یێت دویربون ژ کەتواری ملەتێ عیراقێ‌و نەهاتبونە دانان ل سەر بنیاتەکاهوکم ژبەرهندێ نەشیان خو راگرن بەرامبەری بزاڤا ڤی ملەتی ڤێجا دەمی شورەشێ سەری خو بلندکری ب سەروکاتی‌یا پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی ئو ب دلەکێ پاقژ خو هاڤێتە ئەڤی خلمەتێ چونکو ئەندامێت وێ کورێت ملەتی‌نە . . ئەو پتر دنێزیکی کەتواری خونە . . ئو هەروەسا ئەوان پاشەروژا ملەتێ عیراقێ دانا بەرچاڤێت خو ئو خودانا بەرپسیارێت ئەڤی ملەتی . . لەوانیکێ خەم ژێ خوار ئو پێتەیی‌کر . . ئەڤ پروژە هاتە خواندن . . خاندنەکا نوی ئو ب چاڤەکێ پێشکەڤتی بەری‌خودایێ و خەم ژێ خوار هەتاکو گەهشتینە بەیاناما (١١) یازدەی ئاداری . ئەڤ بەیانامە ئیعترافەکا دروستە ب مافێ ملەتی کورد ل عیراقێ ئو شەمالەکا روهنە دریکا خەباتا ملەتی‌دا

## لێکۆڵینەوەی رامیاری

### یاسا حکمێ ذاتی

یاسا حکمێ زاتی بۆ دەڤەرا کوردستانێ ل عیراقێ ئێکە ژ مەزنترین دەست کەفتییت شورەشێ بۆ مللەتی ئو دهێتە دانان بۆ ڤەگوهازتنەکا باژێرڤانییێ ئو گوهورینا ژیانا مللەتێ کوردی. . ئەڤ چەندە ژی یا دیار بوو ژوان دام و دەزگەهێت هاتینە چێکرن ئەویت خزمەتێ دگەهینە مللەتێ کورد ل باژێریت حکمێ زاتی هەروەسا پرۆژێت سەخبێرکرنێ ئویێت خزمەت گوزارییێ ئەویت دبەردەوام. . ئو ژ دەزگەهێت یاسا حکمێ زاتی ئەڤەنە. .

١ ـ جڤاتا یاسادانانێ.

٢ ـ جڤاتا بجهـ ئینانێ.

### جڤاتا یاسادانانێ

لدویڤ ئەحکامێت ژێرا ئێکێ مادا (٤٢) ژدستورێ بەروەخت جڤاتا سەروکاتییا شورەشێ یاسایا هژمارا (٥٦) یاسالا ١٩٨٠ دەرئێخست دبێژنێ جڤاتا یاسادانانا حکمێ زاتی بۆ دەڤەرا کوردستانا عیراقێ. .

مادا ئێکی دیاردکەت کو ئەندامێت جڤاتێ ژ (٥٠) پێنجییا زێدەتر نەبن. .

مادا دوێ ئەندام ب رێکا هەلبژارتنێ دهێنە وەرگرتن مادا سێ ئەو ئەندام نوینەرێت هەمی خەلکێ دەڤەرا کوردستانێنە مادا هەشتێ ژ ژێرا دوێ دبێژیت ئەندامێ جڤاتێ چ بیر و هزرا و چ رویدانا ل دەمێ کارێ خۆ دجڤاتێدا ڤەگوهێزیت ئەو بەرپسیار نابیت مادا نەهی دبێژیت: چێنابیت لدویڤ ئەندامەکی ب گەرن یان ژی دەستە سەربکەن. . ژبەرچ تشت بیت ئیلا پشتی وەرگرتنا دەستویرییێ ژ جڤاتێ. ژبلی هەکە رابۆ ب گونەهییەکا پێش چاڤ بکەت.

مادا دەهێ دبێژیت جڤاتا یاسادانانێ ئەو دەزگەهەك یاسادانانێیە یا هەلبژارتییە ل دەڤەرێ. .

مادا یازدێ دبێژیت جڤاتا یاسادانانێ دێ سەروکەکی بوخو هەلبژێریت ئو چێگرێ سەروکی و یادەرێ پێکەرێ نەپەنی ل ناڤبەرا ئەندامێت وێ ئو کومبینێت جڤاتێ دێ هێنەکرن ب حازربونال باراپتر ژ ئەنداما. .

ل دور نەمانا ئەندامی. . یاسایا جڤاتێ ل ژێرا سێیێ دیارکرییە ئو دبێژیت:

١ ـ دویماهی هاتنا دەمێ جڤاتێ. . یان پیچ بونا وێ

٢ ـ خوڤەکێشانا ئەندامی ئەڤە ژی یادروستە ب رازیبونا پتر دەنگێت ئەنداما.

مادا دوازدێ دبێژیت هەکە ئەندامەك ژ ئەندامێت جڤاتێ دەرکەڤت یان ژی چوو بەر دلوڤانییا خودێ یان ب چ ئەگەر بیت. . دیسا جڤات دێ رابیت هەر ل وێ دەڤەرا هلبژارتنێ ئەندامەکی هەلبژێرن ئەوژی ب رێکا هەلبژارتنێ. . هەروەکو هاتییە دیارکرن دیاسایا جڤاتا یاسادانانێدا. ئەوژی پشتی بورینا (٩٠) نوت رۆژا ل سەر ڤالابونا وی ئو ب مەرجەکی کو ژ دەمێ جڤاتێ (٦) شەش هەیڤا کێمتر نەبیت.

ل دۆر حیسـاباتێت دەڤەرێ ئەڤ یاسایە دیاردکەت ئو دبێژیت «حیساباتێت دەڤەرێ دهێنە دانان ل بن چاڤدێرییا دیوانا چاڤدێرییا دەراڤی.

مادا (١٣) ژمەرجیت هەلبژارتنێ دیاردکەت و دبێژیت: هەر عیراقییەکێ ل دەڤەرا ئوتونومی دشێت خۆ ب هەلبژێریت یان خۆ تەرشیح بکەت هەکە مەرجێت ئەڤێ یاسایێ ل دەڤ پەیدابن.

مادا (١٤) دبێژیت ئەوێ خۆ دهەلبژێریت دڤێت عیراقیبیت ئو ژییێ وی گەهشتیتە هەژدە سالییێ مادا (١٥) ئەوان مەرجا دیاردکەت ئەوێت کو دڤێت ل دەڤ بهێنە پەیدابون ئەوژی

أ ـ ئەو ل عیراقێ ژدایك بیت ئو ژ دایك و بابێت عیراقی بیت

ب ـ یێ بالقبیت ژیێ وی بیست و پێنج سالا وێڤەتر بیت

جـ ـ باوەرییێ ب بیروهزرێت شورەشا (١٧ ـ ٣٠) تیرمەهی بینیت.

د ـ خزمەتا لەشکەری تەمام کربیت یان لێهاتبیتە ئازاکرن

هـ ـ ژنا وی بیانی نەبیت

و ـ ١ ـ یاسا چاککرنا چاندنێ ژێ نەگرتبیت.

٢ ـ سامانێ وی نەهاتبیتە دەستە سەرکرن. . یان خومالی کرن ژبلی هەڤبشکێت کومپانیێت هەڤپشکی.

ز ـ ١ نەهاتبیتە حوکمکرن بگونەهەکێ ئەوێ گونەهی پەیوەندی دگەل تەناهییا دەولەتێ یا ژناڤدا ئەو ژ دەرڤە هەبیت.

یان گونەهەکا پویوەندی دگەل باوەرییا گشتی هەبیت، یان گونەهەکا پەیوەندی دگەل ئابوریا نیشتمانیو باوەرییا سامانییا دەولەتێ هەبیت یان ژی پەیوەندی دگەل رەوشت و شەرەڤێ هەبیت

٢ ـ نەهاتبیتە حوکم کرن ل سەر گونەهەکا گوشتنا بدەست

ح ـ خاندن و نڤیسینێ ب زمانێ کوردی یان عەرەبی چاك بزانیت.

ط ـ روینشتیێ دەڤەرێ بیت.

مادا (١٩) دبێژیت ئەو لیژنا چاڤدێرییێ ل سەر هەلبژارتنێ دکەت دێ ناڤێت مرەشحا بۆ ئەندامییا جڤاتا یاسادانانێ دیارکەت ئو دڤێتن ژمارا وان زێدەتر بیت ژ ژمارا ئەندامێت جڤاتا یاسادانانێ یێت تایبەت بۆ هەر دەڤەرەکا هەلبژارتنێ ئو بۆ لیژنێ هەیە ناڤێ هەر مرەشحەکی ب هەلگریت ژناڤ لیستا مرەشحا هەکە ژێ پشت راست نەبون ل دەڤ وان پەیدابو. . کو ئەڤ مرەشحە باوەرییێ ناهینیت ب بیروهزرێت

شۆرەشا (١٧ ـ ٣٠) تیرمەهێ ئو مرەشەح دێهێتە ئاگەهدارکرن بۆ دەمێ سێ رۆژا ژ راکرنا ناڤێ وی.

مادا (٢٠) دیاردکەت کو رۆژا هەلبژارتنێ دێ هێتە دیارکرن ب رێکا مەرسوما کوماری ئو رێکێت راگەهاندنێ داهەمی وەلاتی پێ بزانن.. ئەوژی بەری (٥٠) پێنجی رۆژا.

هەروەسا یاسا جڤاتا یاسادانانێ دەڤەرێت هەلبژارتنێ یێت دیارکرین ئو هژمارا خەلکێ وێ ئو هەر نوینەرەکی کا چەند کەس دڤێت ل دور هەبن.

مادا (٢٣) دیاردکەت کو هەر پارێزگەهەك دهێتە بەلاڤەکرن ل سەر چەند دەڤەرێت هەلبژارتنێ ئەوژی ل دویف رویشتییێت دەڤەرێ یاکو هەر دەڤەرەك دڤێت ژ (٢٠٠,٠٠٠) کەسا کێمتر نەبیت ل سەر بنیاتێ کو هەر نوینەرەك بۆ (٤٠,٠٠٠) کەسایە ئو هەکە خەلکێ وێ ژهەژمارا (٢٠٠,٠٠٠) کێمتر بو دەڤەر دێ هێتە هژمارتن کو ئێك دەڤەرە.. یاهلبژارتنێ.. ئو هەکە پترتر بۆ دێ هێتە هژمارتن بۆ دوو دەڤەرێت هەلبژارتنێ ئەوژی دڤێت بۆ هەر نوینەرەکی ژ (٤٠,٠٠٠) کەسا کێمتر نەبن.. ڤێجا دێ لیستا ناڤاهێتە بەلاڤ کرن..

ب رێکێت راگەهاندنێ ئو کومبینا.. هەروەسا ناڤێت وان دێ ل بەر دەرگەهێ جهێ هەلبژارتنێ هێنە هیلاوستن. ئو رێزا جارێ دیاردکەت کو ژمارا (٢٠,٠٠٠) کەسا یان پتر دێ هێتە حسابکرن وەك ژمار (٤٠,٠٠٠) کەسا.

مادا (٢٤) دیارکەت کو بۆ هەر دەڤەرەکا هلبژارتنێ دڤێت لیستەك هەبیت ناڤێت مرەشەحا ل سەر بهێنە بەلاڤکرن. ئو نڤیسین ئو دڤێت ناڤێت مرەشەحا پتربن ژ ئەندامێت بۆ دەڤەرێ دڤێن دامنافا ئێك و دوو بکەن..

مادا (٢٥) دیاردکەت کو دەڤەرا هەلبژارتنێ دهێتە بەلاڤەکرن ل سەر هژمارەکا بنگەهێت هەلبژارتنێ ئەوژی داکو ل بەر وان ب ساناهی بیت ئو دابشێن دەستێ خۆ بدانە ل سەر ل دەمێ هەلبژارتن دهێتەکرن..

ئەڤە بکارهات ل سەر دەڤەرا حکمێ زاتی ل وان هەلبژارتنێت هاتینەکرن ڤێجا پارێزگەها هەڤلێرێ هاتە بەلاڤەکرن ل سەر (٥) پێنج دەڤەرێت هەلبژارتنێ

هەروەسا پارێزگەها سلیمانێ هاتە بەلاڤەکرن ل سەر (٥) پێنج دەڤەرێت هەلبژارتنێ...

پارێزگەها دهوك هاتە بەلاڤەکرن بۆ دوو دەڤەرێت هەلبژارتنێ.. یانکو بۆ پارێزگەها هەڤلێرێ (٢١) نوینەر هاتنە دانان ئو بۆ پارێزگەها سلیمانێ (٢٢) نوینەر هاتنە دانان ئو بۆ پارێزگەها دهوك (٧) حەفت نوینەر هاتنە دانان هەمی دبنە (٥٠) نوینەر.

## جڤاتا بجهـ ئینانێ

ئەڤ جڤاتە دهێتە دانان ژ دام و دەزگەهێت دەڤەرێ.. ئەو سەحدکەنە خلمەتێت گرێدای پێڤەهی ل هەرسێ پارێزگەهێت ئوتونومی ئو خلمەتێت گرێدای هەی ب ئەمیندارێت گشتیڤە ئو بجهـ ئینانا کاروبارێت رێڤەبرنێ و یێت دەراڤی ئو نەخشکێشانێ هەروەسا زێرەڤانییێ و رێڤەچوونێ دکەت ل سەر ئەوان پروژا ئەوێت هاتینە دانان ل هەڤلێرێ ئو سلیمانێ ئو دهوکێ ئو دێ سەحکەتێ کانێ بدروستی بجهـ تێن.. ئەڤەو رژێما دام و دەزگەهێت رێڤەبرنێ یادەڤەرا کوردستانێ یا ئوتونومی هندەك نڤیسکەهێت دانایێن.. ئارمانجا وان ئەوە رابن ب کارێت خۆ ئەوێت بۆ هاتینە دانان.. ژوان نڤیسگەها نڤیسگەها جڤاتا بجهـ ئینانێ ئو نڤیسگەها هژمارتنێ و نەخشکێشانێ ئو نڤیسگەها دویڤچوونێ و سەحکرنێ ئو دگەل رێڤەبەرییا شوولێت جڤاتێ.. ئەڤ نڤیسگەهە هەمی دگرێدایێنە ب رێڤەبەرییا کوچکا گشتیڤە.

## دویماهیك

پارتا بەعسا عەرەبییا هەڤپشکی پێنکاڤێت چەلەنگ هاڤێتن ئو رێکا راست دانا بۆ رێڤەبرنا چارەسەرکرنا ئاشتی و دیمقراتییێ بۆ خلمەتا کوردی.. ئو باوەری هینا ب مافێ مللەتێ کورد ئو ئەڤ مافە هاتە دیارکرن دناڤ دستوریدا ئو پشکداریيا (٥) پێنج وەزیرێت کورد ل ناڤ جڤاتا وەزیران دا ئو چێگرێ سەرۆکێ کوماری کوردە..

هەروەسا سەرۆکێ جڤاتا یاسادانانێ ئو سەرۆکێ جڤاتا بجهـ ئینانێ ئەندامن ل ناڤ جڤاتا وەزیران دا ئو ئەمیندارێت رێڤەبەرییێ ل دەڤەرا ئوتونومی ئەو ب پەلا وەزیرانە..

ڤێجا دڤێ پێداچوونێدا بەحسی هندەك لایێت یاسا ئوتونومی هاتەکرن یاکو ئەوژی دەست کەفتییەکە بۆ مللەتێ مە ئو رێکا راستە بۆ ئاڤاکرنا شارستانیەتا کوردستانێ یاکو ئەوژی پشکەکە ژ شارستانییەتا عیراقا مەزن.. ڤێجا یاسا ئوتونومی هاتییە دانان داکو خزمەتا مللەتێ کورد بکەت ئو دا کورێت مللەتی مافێ خۆ بجهـ بینیت ل دیمقراتییێ بۆ هەلبژارتنا نوینەرێت خۆ. بۆ ئاڤاکرنا عیراقا مەزن

ژێدەر:-

١ ـ یاسا ئوتونومی بۆ دەڤەرا کوردستانا عیراقێ
٢ ـ صدام حسین. پێکڤە ژبۆ ئاڤاکرنا عیراقا مەزن. دار الحریة للطباعة. بەغدا.

٣ ـ صدام حسين . الشعب مصدر القوة والعطاء . دار الحرية للطباعة / بەغدا

٤ ـ راپورتا مەبەندىيا كونگرا نەهی یا پارتا بەعسا عەرەبیيا هەڤپشکی / ١٩٨٢ بەغدا .

٥ ـ صدام حسين : الحكم الذاتي عمق وحدة العراقيين .

دەڤا ئاخفتنا سەروکیيە ل چاڤپیکەتنا وی دگەل سەروك و ئەندامیت جڤاتا یاسادانانیو یابجهـ ئینانی . . ل٢٨ / ٨ / ١٩٨٦ ژبەلاڤوکیت دەزگەهێ عیراقی یا روژنامەکەری و بەلاڤەکرنی . بەغدا ـ ١٩٨٦

٦ ـ وەزارەتا بەرەڤانیێ . ریڤەبەریێ رینماییا سیاسی . . ریڤەبەرییا رەوشەنبیری . نیت نیشتمان نیت میمەت . نیك نارمانج . دار الحرية للطباعة بەغدا ١٩٨٨

٧ ـ عبدالوهاب تانەبانی ـ سەرەکی فەرماندە صدام حسين و مەسەلەی کورد ـ گوڤارا رەوشەنبیری نوی ژمارا (١٠٣ ـ ١٠٤) سالا ١٩٨٤

٨ ـ کوڤارا رەوشەنبیری نوی هەژمارا (١٢١) ئادارا ١٩٨٩

# قراءة في الحكم الذاتي لمنطقة كوردستان

بقلم : بريندار مزيري

كان للسيد الرئيس القائد صدام حسين الدور الكبير والقيادي في حل المسألة الكردية حلاً سلمياً وديمقراطياً واحلال السلام في ربوع شمال وطننا الحبيب وصدور بيان الحادي عشر من اذار عام ١٩٧٠ وتطبيق الحكم الذاتي لمنطقة كردستان .

وان حل المسألة الكردية كان بحق خطوة جريئة قوية متينة كما كانت ضربة وصفعة قوية ضد القوى الامپريالية والاستعمارية التي حاولت وتحاول دوماً ان تستغلها في سبيل مصالحها . وتطرق البحث الى دور القائد في صنع الحكم الذاتي وكذلك تجربة الحكم الذاتي التي تؤدي الى تعميق وحدة العراقيين وان هذه التجربة ليست حالة عابرة املتها ظروف معينة . بل انها كانت تشكل احدى الركائز الاساسية في مسيرة الحزب النضالية واتاحة الفرصة الكاملة امام ابناء شعبنا الكردي وتفجير كل الطاقات الكامنة من اجل المساهمة الفاعلة في عملية التغيير والبناء هذا وان الباحث يتناول في هذا البحث بعض الجوانب المهمة التي يخص المجلس التشريعي والمجلس التنفيذي ومهماته ومدى سلطة كل منهما اضافة الى ذلك يتطرق الى عدد اعضاء المجلس التنفيذي

والشروط التي يجب ان يتوفر في المرشح والعضو . . ويبحث في توزيع المناطق الانتخابية حسب الكثافة السكانية ويقول الباحث ان الثورة في قطرنا كانت سباقة الى اتخاذ قرارات وطنية وقومية قياسا لعمرها اذا ما قيست بمعطيات التجارب الثورية السابقة في العالم . . وان حل المسألة الكردية حلا سلمياً وديمقراطياً انجازا مهما حققتها الثورة في العراق ويعتبر انتصاراً لدول العالم الثالث .

# ١١ی ئادار چەسپاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی

کەلاوێژ حسن

**به راستی یەکێ لە گەورەترین ئەو گیرو گرفتانەی کە تووشی هەموو سەرکردە سیاسی‌یەکان لە عیراقدا بو گیرو گرفتی چارەسەرکردنی باری کورد بووە دەشت و شاخەکانی کوردستان هەموو رۆژێك بە خوێنی عەرەب و کورد رەنگ دەکرا بە بێ ئەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم مەسەلەیە دانێن.**

بەڵام حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست رێرەوێکی تەواوی دارشت ئەمەش بە هەنگاوێکی مێژووی دائەنرێ نەك تەنانەت لە بارەی خەباتی جەماوەرانی کوردو ئامانجە نەتەوەیی‌یە رەواکەیەوە. بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی خەباتی جەماوەرانی عیراق دەگرێتەوە. لە پێناوی کۆمەڵێکی دیموکراتی پێشکەو تنخوازی کە نمونەیەکی بێ هاوتا پیشان دەدات لە نێو کۆمەڵانی دراوسێکانیدا لە شێوەی چارەسەر کردنی بارەکانی نەتەوە هەمە چەشنەکانی لە ناو خۆدا. . ئەو نمونەیەش بە شێوەیەکی روون ئاشکرا هاتە کایەوە ئەوەش ئەو بەیاننامەیە بو کە ناوەرۆکەکەی ئۆتۆنۆمی بو بۆ ناوچەی کوردستانی عیراق لە چوار چێوەی عیراقدا کە بەیانی «١١ ئادار دەناسرێ»

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە دانانی ئەو چەشنە رێرەوەدا لە سێ کانگای سەرەکی‌یەوە دەست نیشانی کردوە، وەك لە «راپۆرتی سیاسی سەر بەهەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی‌دا هاتوە:-

١ - بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عیراقدا، هەر چەندە هەندێ ئاڵۆزیی مێژوویی تیادا بووە، لەگەڵ ئەو خڵتەو شێوە دوورە پەرێزی‌یە کۆنە پەرستانەی کە لە گەڵیدا هاتبو. . . بەڵام لە جەوهەرو بنەرەتدا بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی‌یەو لە سنوری داخوازی کردنی مافە نەتەوەیی‌یە رەواکانی گەلی کوردە لە چوار چێوەی کۆماری عیراقدا، کە لە سەروویانەوە ئۆتۆنۆمی‌یە.

٢ - حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست حزبێکی نەتەوەیی و مرۆڤ پەروەری سۆشیالیستی و دیموکراسی باوەرە. لە بەر ئەمە زۆر ئاسایی‌یە مافە رەواکانی جەماوەرانی کورد تێ بگات و لە پێناوی زامن کردن و پاراستنیاندا تێکۆشێ بۆ زامن کردنی ئەم مافانە، لە چوار چێوەی دەستوورو یاساو کار گوزاری‌دا ئەو رێبازە بنچینەیی‌یە نەگۆڕاوەی، کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست پشتی پێ بەستبوو بۆ هێنانە دی ئەم مافانەو زامن کردنیشیان، رێبازی ئاشتی و دیموکراسیانە بوو لە رێگەی هاریکاری‌یەکی دڵسۆزانەو ئیجابیانەوە لە گەڵ هێزە خێر خوازە نیشتمانپەروەرو پێشکەوتنخوازەکاندا لە ریزەکانی جەماوەرانی کورداو لە چوار چێوەی کاری ناوکۆیی نیشتمانی‌یەوە کە بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازدا خۆی ئەنوێنێ. . حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست. . . لەم سێ خاڵەوە سەرنجی خۆی لە مەسەلەی کوردەوە داوە بە هەمو توانایەوە تێدەکۆشا بۆ چارەسەرکردنی

هەرچەندە. . . دوای خوێندنەوەو بلاوکردنەوەی «یاسای ئۆتۆنۆمی» بۆ ناوچەی کوردستانی عیراق و دامەزراندنی دام و دەزگای راپەراندنەکانی. . . . چەند بەرەیەك دژی وەستان و ویستیان لە رێی ئەم یاسایەدا بەربەستی بکەن. بەڵام ئەوە بو سوربونی پارت و شۆرش. . . «لە سەرو هەموویانەوە سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین - خوابیپارێزێت - بوە هۆی پەرەسەندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بو پێشکەوتنی تاوەکووای لێ هات لە هەموو لایەکەوە گەشەی سەند.

**[پەیوەندی دەروونی نێوان عەرەب و کورد بە درێژایی مێژوو دەربرینی ئەو دەسکاری‌یە دوژمنیانەی کراون بۆ ئاوەژووکردنی راستی‌یە مێژووی‌یەکان و دەوری سەرۆکی فەرماندە لە دەرخستنی ئەو راستی‌یە یانەدا]**

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست. هەر لەو رۆژەوەی شۆرشی تەمـوزی بەرپـاکـردو سەرکـردەی شۆرشی کرد. لە بەر رۆشنـایی نەخشەیەکی وردو زانستی یانەداو رووی کردە مەسەلەی کورد، بۆ ئەوەی ئەم کێشـەیە چارەسـەر بکـات، چارەسـەرکـردنێکی بنەرەتی و ئاشتی و دیموکراتیانە چونکە گەلی کورد بە درێژایی مێژووی لە عیراقدا هەر لە کاتی (صلاح الدین ئەیوبی)یەوە بەڵکو لەوەش پێشتر چارەنووسی کوردو عەرەب یەك بووە بەڵام لەم دوایی یانەدا کەشەری برا کوژی کەوتە ناو ئەو دووگـەلـەوە لە نێو چەوانی دوژمنـانی هەردوو گەلـەکـە بوو بە تایبەتی دوژمنانی گەلی کوردی قارەمان زۆرەها بەڵگەمان بەدەستەوە هەیە لە سەر خەباتی مێژووی گەلی کوردمان شان بە شانی گەلی عەرەب لە عیراقدا.

بەڵێ گەلی کورد زۆر هەژاری و نەخۆشی و برسێتی کێشا چونکە هەموو خێرو بەرهـەمی بە دەست دوژمنـانی گەلەوە بوون دەسیان گرتبوە سەر ناوچەکەوە. بەڵام ئەمانە لە راستیدا دوژمنی گەلی کورد بوون تەنانەت ئەم فرو فێلانـەو پرو پاگەندەیان ئەکردو لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان هیچ پەیوەندیەکی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی لە ناو مێشکیان نەبوو. یارییان بە مێشکی ئەو خەڵکـە هەژارە ئەکـرد بە ناو مافی نەتـەوایەتی بیونە مایەی رژانـدنی خوێنی هەزارەهـا گەنج و هەتیوکردنی هەزارەها کۆرپەی ناو لانکی بێ گوناه.

## دڵنیایی سەرۆك صدام حسین (خوا بیپارێزێت) لە گرەو کردنی لە سەر گەل و جەماوەر.

لەم بارەوە سەرۆکی فەرمـانـدە خوا بیپـارێزێت لە پرسیارێکـدا کە ئاراستەی کرا بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە.

ئێمـە گەلمان لە گەڵدایە:ـ زۆر دەوڵەت یاری بە کێشەی کورد کردو هێشتا زۆر دەوڵەت هەن یاری پێ دەکەن و هیوای لە سەر بنیات دەنێن، ئەوان لە سەر خائنـەکان گرەو دەکەن و ئێمە گرەو لە سەر گەل دەکەین ئەوان گرەو لە سەر لەرێ دەرچوان دەکەن ئێمە گرەومان لە سەر رۆڵەکانی عیراقی مەزنە لە کوردەکان هەروەك گرەومان لە سەر عەرەب یان تورکمانە.

لەم نیشتمانەدا، لە هەموو نەتەوەو ئایین و تایەفە جیاجیاکان گرەو لە سەر عیراقیەت و گرەو لە سەر نیشتمان پەروەری ئەکەن واقیع سەلماندی گرەوەکەمان واقیعی بو، چونکە گرەوی تەلەکە بازان نەبوو، بەڵکو گرەوی ئەو خاوەن باوەڕانەی تێکەڕا گەلەکەیان دەناسن و رۆژ انە لە گەڵیا دەژین لە ویژدانیانـداو لە دەرون و عەقلیان دا دەژی. ئێمە گەلی وەك ئێوەمان هەیەو خائنـەکـان ئەو خائنـانەیان هەیە، کە لە شوێنی دەرەوەی مێژوو دەگەرێن، ئەوەش بە بێ ئەوەی جێ داخ بێت دەروات، شێوەی رازی کردن بە کار ناهێنن دەرگای پاش گەزبونەوە دەکەینەوە بەڵام بە بێ رازی کردن بە بێ ئەوەی پاشگەز بخەینە بەردەم ئەوەی بەچەك و شیر بۆ بەرگری لە شۆرش و لە نیشتمان بە چەسپاوی و خۆداگرتنەوە دەجەنگێ. لاپەرە [١٦] صدام حسین شۆرش و حزب بۆ کوردیش هەر وەك بۆ عەرەبن].

بەڵی تاوانباران بازرگانەکانی شەر لە پێش شۆرش ١٧ی تەموز کاریان بە گوێرەی پیلانـەکـانیان کە پەیوەنـدیان بە زایونـزم و ئیمپـریالیزمـەوە هەڵئەسـوران هەمـوویان یەك مەبـەست ئەیانگـرێتەوە رەنجی جوتیارو کرێکـارانیان ئەخوارد ئەو خەڵکە تووشی رەش ورووتی بوبو بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان هەبێ بەڵام کە بەیاننامەی ١١ی ئاداری پیرۆز دا لە ساڵی ١٩٧٠ بڵاوکـرایەوە مافی نەتـەوایەتـی بەگـەلی کورد بەخـشی ئەم بەیاننامەیەش راگەیاندنێکی سەرکردایەتی حزب و شۆرش بوو بۆ گەلی کورد بۆ ئاشکـرا کردنی یاسـای ئۆتـۆنۆمی ناوچەی کوردستان هەروەها دەسکـەوتێکی دیمـوکـراتیانـە بوو کە سەرکـردایەتی بەدی هێنـاو رەنگدانەوەیەکی راستەقینەی بیرو باوەری شۆرش تێروانینە مرۆڤایەتیەکانی بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

## ٢ ـ مافی عیراقی و مافی ئۆتۆنۆمی:

. . . . . . . . . . . . . . . . . . .

لە عیراقدا. کورد دوو مافی هەیە مافێك وەك عیراقی یەك و مافێکی تر ئەویش مافی ئۆتۆنۆمی یە، بەم جۆرە دەبینین کورد ئەندامە لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا هەروەهـا ئەنـدامـە لە ئەنجـومـەنێکی بچـوکـدا کە ئەرکی یاسـادانـانی ناوخـۆیی هەیە ناوی ئەنجـومـەنی یاسـادانـانی ناوچـەی ئۆتـۆنۆمی یە. بەڵام عیراقی دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی یەك مافی هەیە. کورد دوو مافی هەیە، لەگـەڵ عیراقیدا تێکـرا ئەنـدامی ئەنجـومـەنی نیشتمانیداو دوایش خۆی بە تەنیا بۆ دووەم جار ئەنـدامی ئەنجـومەنی یاسادانان بۆ ئەنجومەنی یاسادانان هەڵدەبژێرێ. عیراقی لە حکومەتی مەرکەزیدا بەشدارەو کورد لە حکومەتی مەرکەزیدا بەشدارەو بەشدارە لە حکومەتێکی ناو خۆیی بچوکدا،

ناوی ئەنجـومەنی راپەراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی یەو لە مەدا لارییەك نابینین، چونکە کورد بۆ وەدی هێنانی ئەم دوو مافە لە عیراق جیانابێتەوە. خۆی بە زل نانوێنی بە سەریا بەڵکو لەو مەوقیعەوە لە ناخەوە لە عیراقا دەژی زیاتـرو قووڵـتر مادام ئەمە نیشتمانێکە هەموویان سوورن لە سـەر پاراستنی مادام گەلەکەمان هەوڵی دروست کردنی شەخسیەتی دەدات بە جۆری وای لێ بێ بەرگەی ئەرکی مێژووی بە شێوەیەکی راستەقینەو تەواو بگـرێ جا نەتـەوەی هەر چییەك بێ ئاینەکەی هەرچی بێ و تایفەکەی هەرچی بێ کە ئەو سـەر بەوویە هەمـوو شتەکاتی تر ئەو خوسوسیاتانەن دەوارە مەزنـە رەنـگ دەکەن کە عیراقە بە بێ ئەوەی بدرێ. [سەرۆکی فەرمانده ل٢٢ شۆرش و حزب بۆ کوردیشن هەروەك بۆ عەرەبن]

## ٣ - شێوەی دیموکراتی‌یانە لە بەیاننامەی یانزەی ئاداری پیرۆز

بە شێوەیەکی دیموکراتیانە کە ئەم بەیاننامەیە بە بێ کەم و کوڕی جێ بە جێ بوو، بوەسەرەتایەك بۆ دەرکردنی گەلێ بڕیاری گرنگ، دیارترینیان سەر هەڵدانی، هەر دوو ئەنجومەنی یاسادانان و ڕاپەراندنی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان بۆدەست بە کار کردنیان ناوچەکە ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی سەنـد لە هەمـوو ڕوویەکەوە بەهاوبەشی ڕۆڵەکانی گەلی کورد ئەم کارە مەزنەش ئەرك و لێپرساوێتی خستە ئەستۆی بە شداری لە بنیات نانی عیراقی مەزن و بە هێز کردنی یەکێتی نیشتمانی هەروەها بە بڕوا بە خۆکردن و بە سەرکردایەتی گەلەکەمان و بەرەنگاری هەموو پیلانێك بین، کە دەست کردی زایۆنزم و کۆنەپەرستان و دوژمنە درندەکان بوو.

ئەوە بۆ نوزدە ساڵ ئەچێ کە گەلی کورد لە کوردستانی عیراق دا مافی ڕەوای خۆی لە خۆ ڕێبەری‌دا وەرگرتووە لە ژێر ئاڵای عیراق تێدەکۆشێت بەشـداری بنیاتنان و بەرەو پێشەوە بردنی نیشتمانە ئازیزەکەی دەکات لە هەمـوو مەیدانێکـدا ئەو گۆڕانەو پەرەپێدانـەی کە لە خاکی کوردستان لەم ماوەیەدا ڕوویداوە لەبـەرچاوەو زۆر جیاوازی هەیە لە گەڵ کاتی فەرمانڕەوایی کۆنەپەرستەکان و هاوپەیمانەکانیان ئەم پەرەسەندنەش پێك هاتووە لە بەڕێوەبردنی کاروبـاری کۆمەڵایەتی و ئابوری ڕۆشنبیری و گواستنەوەو هاتو چۆ کشت وکاڵ و چارەسەرکردنی گیروگرفتی نیشتەجێ بوون و تەنـدروستی و پەروەردەو فێرکـردن لە ناوچەکەدا پێشکەش کراوە لەوانـەش پرۆژەی پەروەردەیی ،کۆمـەڵایەتی و تەنـدروستی و کردنـەوەی قوتـابخانەو دایەنگاو خەستەخانەو چەندین خزمەتگوزاری تر کە ڕەوتی ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکە بەرەو پێشتر دەبەن. ئەم پەرەسەندنەو هەسـت کردن بە سـکـالاو پێویسـتی گەلی کورد دیاریدەی ئەوەیە کە سەرۆکی فەرمانـدە هەستی بە ئازارو ئەشکەنجەی گەلی کورد کردوە کە هەروەکو خۆی فەرمویەتی [دەبێ هەمیشە ئەو هۆو ڕێگەیە لە بیر نەکەین کە پێ‌ی گەیشتین بە شوێنی خۆمان و نابێ لەو شوێنەی ئێستاماندا و لە هەندێ ڕووالەت یان هۆیە نارەواو نادروستەکانی‌دا نوقم بین بێ ئەوەی ئەو بیرو ڕاو ئەو هۆو شێوازانـە بخـەینـەوە بیر کە ئێـمـەیان گەیاندنە شوێنی ئێستامان هەر یەکێك لە ئێمە ئەگەر لە چوار چێوەی ڕژێمی عارف و بەهاو نەریتی ڕزیوی پێشـووی ڕژێـمـە کۆنـە پەرسـتـەکاندا بوایە ئەو شوێنەی ئێستای دەستگیر نە دە بوو سەرۆکی فەرماندە [ل ١٨ دیموقراطیە]

ئەو ئامـانجـانەی لە پەیوەندیان بە خەلکەو لە هاونیشتمانان لە هێزە رامیاری‌یەکـان لە هاوڕێیانـیان بە گشتی خەبـاتیان بۆ کردوون و لە پێناویاندا شۆڕشیان گێڕاوە پێویستە لە بیر خۆمانیان نەبەین و چاودێری بیان بکەین خزمەتی گەل بکەین

سەرۆکی فەرماندە ل١٨
الد. مقراطيه نظرة شمولية للحياة .

هەروەهـا ئەبینین لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان بە شێوەیەکی دیموکراتیانە گەلی کورد نوێنەرانی ڕاستەقینەی خۆیان. لە هەر سێ ناوچـەکـەدا بە شێوازی دەنـگە دانی نهێنی‌یەوە هەڵدەبژێردرێت. ئەمەش بەندێك بوو لە بەندەکانی بەیاننامەی [١١ی ئادار] کە هەرسێ ساڵێك بە شێوەیەکی دیمـوکـراتیـانە ئەنـدامـانی ئەنجومەنی یاسادانان هەڵدەبژێردرێ. ئەم جۆرە هەنگاوانە کە ئێستا لە مێژ ووی گەلی کورد ڕوو ئەدا لە کاتی پاشـەیەتی و دەوری عوسمانی و بەڵکو لەوانیش پێشتر ڕووی نە داوە هەموو نەخشـەی سـەرکردەی گەلی عیراقی نەبەز سەرۆکی فەرماندە صدام حسیـنـە (خوا بیپارێزێت) کە هەر وەکو چەندەها جار ڕای خۆی دەربڕیوە بەرامبەر گەلی کورد بۆ نمونە ئەم ڕایە ئەخەمە پێش چاوتان بەڕێز سەرۆکی تێکۆشەر دەربارەی پاشە ڕۆژی عیراق هەڵسو کەوتی پاشە ڕۆژ لە کاتی باسـکـردنی پرۆژەی خۆڕێبەری‌دا لە ڕۆژی بیست و چواری ئەیلولی ساڵی ١٩٧٣دا ووتی وئـێـمـە لە لێکـۆڵـینـەوەی ئەم پرۆژەدا ئامانجێکی سەرەکیمان هەیە ئەویش ئەوەیە بزانین چۆن پاشە ڕۆژی عیراق بنیات دەکـرێت و ڕێکخـەری ئەو پەیوەنـدی‌یانەی کە کوردو عەرەب و پەیوەنـدی عەرەب بە کۆمەڵ و دەوڵەت کە لە ناو چوار چێوەی‌دا دەژین ڕێك دەخەن، کامانەن: هەروەها بۆ دەست نیشان کردنی شێوەی ڕێك خـستن پەیوەنـدی‌یەکـانی هاولاتی کوردی گەلـەکەمان بەدەوڵەتەوە ئێمە دەمانەوێت بگەینە ڕاستی، نەك بە شێوە گشتی‌یەکەی بەڵکو دەمانەوێت بگـەینـە هەمـوو لایەکـانی ئەو ڕاستی‌یەوە) ئەم بۆ چوونـەی سـەرۆکی فەرماندە ئەوە ئەگەیەنێ کە مەسەلەی کورد شتێکی واڵەتی ڕامیاری نی‌یە، بەڵکو لە ویژدانی و بیرو ڕای سەرکردایەتی شۆڕش دا جێی تایبەتی خۆی هەیە.

سەرەنجام

بەڵێ سەرۆکی فەرمـانـدە، سەیری دوا ڕۆژی مەسـەلەی کوردی کرد ئەمیش ئەو دوا ڕۆژەیە کە هەمومان چاوەڕێیان ئەکرد باشترین بەڵگەش بۆ برایەتی کوردو عەرەب ئەو بەگـژ چوونە توندو تیژانە بوو کە لە هەموو کەرتەکانی جەنگدا ڕووی‌دا خوێنی ڕۆڵەی کورد لە گەڵ خوێنی ڕۆڵەی

عەرەب تێکەڵاو بوو هەر لە زاخۆوە هەتاکو فاو بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەرگریان کرد نەیانهێشت دوژمن بێتە ناو سنورمانەوە سەربازی کورد لەگەڵ سەربازی عەرەب شان بە شانی یەك چەکیان هەڵگرت و لە یەك چرکەیەك دا پەنجەیان بە پەلە پێتکەی تفەنگەوە ئەنا بۆ نیشانە گرتن لە بەکرێ گیراوەکانی شەیتانەکانی قوم و تاران بەڵێ بەم شێوەیە داستانی سەرکەوتنیان لە ناو لاپەرەکانی مێژوو تۆمارکرد هەزار سڵاو لە شەهیدانی گەلی عیراقی نمر. لە گەڵ ئەمانەشدا لە کاتی دامەزراندنی فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی ناوچەی کوردستان دا رۆڵەکانی گەلی کورد سنوریان پاراست شالآوی دوژمنانیان تێکشکاند لە ناوچەی حاجی ئومەران و پێنجوێن و قەڵادزێ و چوارتاو زۆرەها شوێنانی تر بەم جۆرە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست توانی چارەسەری مەسەلەی کورد بکا بەرپای کردوو بوو بە سەرەتایەکی نوێی سەردەم نەك تەنیا لە مێژووی ئێستاماندا بەڵکو لە مێژووی عیراقدا چونکە چارەسەری بنەرەتی و رازی بوونی گەلێك بەم شێوەیە هەنگاوێکی بێ هاوتایە.

سەرچاوەکان


١ ـ وتباری بەرێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین ـ خوا بیپارێزێت ـ شۆرش و حزب بۆ کوردیش هەروەك بۆ عەرەبن ل١٦

٢ ـ دیموکراتیەت رِوانینێکی گشت لایی ژیانە ـ صدام حسین ـ لاپەرە ١٧

٣ ـ دیموکراتیەت هەمان سەرچاوە لاپەرە ١٨

٤ ـ شۆرش و حزب بۆ کوردیش هەمان سەرچاوەی یەکەم لاپەرە ٢١ ـ ٢٢

٥ ـ صدام حسین مروف و تێکۆشەرو ژیرو دانا ل١٤١

٦ ـ قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان

٧ ـ هاوکاری ژمارە ١١٠٩


# بيان الحادي عشر من آذار وتطبيق قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان

گەلاوێژ حسن


هذا البحث تناول اهم النواحي الرئيسية لموضوع الحكم الذاتي لمنطقة كوردستان العراق خلال عمره المديد من سنة ١٩٧٠ الى ١٩٩٠ والتي مستمرة بخطواته الجبارة في سبيل خدمة شعبنا الكردي بشكل خاص وشعب العراقي بشكل عام.

وقد قسمت البحث الى اقسام القسم الاول مقدمة ومدخل الى صلب الموضوع. حيث ذكرت فيه الوقائع التي دعت الى مطالبة الشعب الكردي بالحكم الذاتي والواقع فرض نفسه.

القسم الثاني ايمان حزب البعث وعلى رأسهم السيد الرئيس حفظة الله بالمسألة الكردية ومعاناة هذا الشعب الأبي عبر تاريخ وذكرت في هذا القسم نظرة الحزب والثورة والقيادة ونظرة بطل النصر والسلام صدام حسين حفظه الله الى القضية الكردية

اما في القسم الثالث ذكرت كيفية تلاحم الشعب العراقي في البناء في السلم والحرب في الذود عن أرض العراق ومن اهم اسباب نجاح هذه الخطوة الجبارة هو وجود قائد حكيم وسياسي فذ ومخطط عراقي هو شخص الرئيس القائد صدام حسين حفظه الله الذي اعتبره عامل القوة والارادة الصلبة في إقرار السلام في منطقة كوردستان العراق.



لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵی ئەوەم داوە چەند راستییەك روون بکەمەوە لەو بابەتە مێژوویەی کە پەیوەندی بە تەمەنی نۆزدە ساڵی بەیاننامەی ١١ی ئادارەوە هەیە. باسەکە لە چەند بەشێك پێك هاتووە، چۆنیەتی دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی هەروەها دەوری سەرۆکی فەرماندە صدام حسین (خوابیپارێزێت) لە چەسپاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی و هەروەها تێروانینی بۆ دوا رۆژی ئەم مەسەلەیە جا هیوادارام لەم وتارەدا توانیبێتم هەندێ لایەنی سەرەکی ئەم پرۆژە مرۆڤایەتیەم بۆ ئێوەی ئازیز پێشکەش کرد بێ

**لێکۆڵینەوەی رامیاری**

# لە بیرەوەری دوو یادی مەزن و پیرۆزدا . .
# «٧»ی - نیســانی ١٩٤٧و «٢٨»ی - نیســانی ١٩٣٧

«شفیق محود جاف»

گومـانی تیادا نی‌یە . . لە هەر بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیدا پێویستە لە نێـوان ئەو بەرچـاوەو ئامـانجـانـەدا کە ئەو بزووتنـەوە شۆڕشگێـڕی‌یە رەچـاوی کردووە لە نێـوان گشت ئەو پێـویستـانـە کە توانای گۆڕینی ئەو ئامانج و بەرچاوانەی هەیە بۆ خستنەوە . رووی واقیعەوە لە چوارچێوەی رێبازی خەباتگێڕییدا ـ گونجاوییکی تەولوەتی هەبێت . .

بەمـەوە بە نەبـوونی ئەم گونجاوی‌یە ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕی‌یە بێ هوودەو پەك کەوتـوویی دەمێنێتـەوە، یان دەبێتـە مەیـانێکی دووبەرەکی‌و نارێکی لە نێـوان ئامـانجـەکان و رێبازی کاروانی واقیع دا ، ، هەرواش کە جێی گومـان نی‌یـە . . بوونی ئەو جۆرە نمـوونانە لە واقیعی مێژوودا هەنـەو کەمیش نی‌یە لێرەدا بنیات نانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ئەوەی کە پێـوە پەنـدەو لێی‌یـەوە دێتەکایەوە لە ئەنجامی شەپۆلەکانی رامیاری‌و بیر و فیکـریدا لەوەدا نی‌یـەو ناتـوانـرێت بە هەڵـوێستی زارەکی‌و نیەت پاکی بگـۆڕدرێت . . بۆ چەنـدی راستی‌ی ئەم قسـانـە دەڵێین . . تێکۆشان و خەبـاتـی تەواوەتی بۆ وەجێ هێنـانی ئامـانجـەکـان هەر دەبێت دژ بە گیـروگرفتێکی زۆردا بچنە یەکا . . یان لە نێو ناتەبایی‌و دووبەرەکی‌یەکی گەورەدا دەتـەقێتـەوە . ئەوەش ئەگـەر بێت و روانگەی روونی بەرنامەی زانسـتی‌ی هەر بزووتنـەوەیـەکی شۆڕشگێـڕی جێ‌بەجێ نەکرێت، نەك تەنهـا بە گوێـرەی ئامانجەکانی‌و بزووتنەوە بیر وراکانی‌و بەس . . . بەڵکو دیسـان بە گوێرەی رێ‌رەوو شێوازی تێکۆشانەکەیەوە . . . بەمەوە دەگەینە ئەوەی کە لە دایـك بوونی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتـراکی وەنـەبێت دەربـڕینێـك بووەو بووبێت لە رەت و بەرپـەچـدانـەوەی کردەوەیـەکی راستـەو خۆ بە رووداوەیـەکی رامیـاری کە نەتەوەی عەرەبی لەو قۆناخەدا بۆی ژیـا . . بەڵکـو لە دایـك بوونی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە ئەنجـامی ئەو جوداو جوداکـاری‌و جیـاوازی‌و ناتەبایی‌و نەگونجاوی‌یکی تونـدو تیـژدا سەری‌هەڵداو هاتە کایەوە لە گۆڕەپانی نەتەوییدا کە لە نێوان بەرژەوەنـدیـەکـانی جەماوەرانی نەتەوەی عەرەبی‌و ئامانجەکانی‌و ئامانجە مرۆڤایەتیەکانی‌و نێوان واقیعی ئەو چەوسانەوەو دواکەوتووەی کۆمەڵگەی عەرەبیدا بووە

کەوابوو ، لە دایك بوونی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ئەنجامی دەستـکـەوتـی بوونی بزووتنـەوەی عەرەبی بووە بەرەو پێشکـەوتن و بنیـات نان . . . حزبی بەعـسی عەرەبی ئیشتـراکی . . . . بە ئامـانـج و روانگـەو تیـۆرو تێکـۆشـانی رۆژانـەیـەوە . . ، حزبێکی شۆڕشگێـڕو نەتـەوەیی‌و پێشکەوتنخوازەو نیشتمانی عەرەبی بە گێژەنگەی بوونی خۆی دەبینێت و بزووتنەوەی خەباتگێڕی بەرەو وەجێ هێنانی پەیامە نەمرەکەی

## باری رێکخستنی نەتەوەیی .

باری رێکخسـتنی نەتەوەیی، لە روانگەی حزبی بەعـسدا بایەخێکی هەرە گرنگی دراوەتێ، لە هەموو بوارەکاندا ، بە تایبەت لە ئاستی فەلسـەفەیدا کە لە بزووتنـەوەی رەچـاوی کردووە . . . بەمـەوە، حزب کاتێ بیـرو باوەڕەکـانی بڵاو کردەوە لە سەرەتـای قۆنـاخی دامـەزرانـدنیـدا دوپـاتی کردۆتـەوە کە حزبی بەعـسی عەرەبی ئیشتـراکی وەنـەبێت هەر تەنیـا ناوو مەبـەس بێت و بەس . . . بەڵـکـو واقیـعـی رێکخستنی‌و شێـوازی کاروهـەڵـوێست و تێکـوشـانەکەیەتی ، هەرواش دیسانەوە رێکخستنی حزبی لە نێـو ژیـاویی بیـروبـاوەڕو ئایدیۆلۆژیەتی شۆڕشگێڕی عەرەبی ناخ و سروشتی ئەوخەبـاتـە شۆڕشگێـڕی‌یـەیـەوە هاتووە کە لە پێناویدا تێکـۆشـاوەو تێـدەکـۆشێت و بەرگـری کردن لە بەرژەوەنـدی‌یـەکـانی جەمـاوەران و پێـداوێستـەکـانی نەتـەوەی عەرەبی، لە . . . یەکێتی‌و رزگـاربـوون و پێشکـەوتن، لەم روانگـەوە . . جەمـاوەرانی عەرەبی چاوەڕوانی بزووتنـەوەیـەکی شۆڕشگێـڕی عەرەبیی کردووە کە توانـای لەبەکار هێنانی وزەو توانانی جەماوەرانی عەرەبیی هەبێت و پێویستی‌ی بە سەرکردایەتی‌یەکی لێهاتو بۆ سەرکردایەتی کردنی تێکۆشان و خەباتەکەی دژی هێـزەکـانی دواکـەوتـوویی‌و ناتـەبـایی‌و پەرت بوون داگیرکەران و بێگـانـە پەرستی . . ئەمـەش کە لە چاوگـەی بیـرو بیرمەندێکی قووڵ و بایەخدانی بە رێکخستنی شۆڕشگێڕیەوە بێت . . ئەمە لەلایەکەوەو . . لەلایەکی دیکەوە لەسەرنەکەوتنی رێکخراوە سیاسی‌یە تەقلیدی‌یەکانی کە لە نیشتمـانی عەرەبیدا هەبوو پێشی دووەمین . شەڕی جیهانی کە توانای گرتنـە ئەستـۆی قۆنـاخـەکـانی مێژوویی‌و دەربـڕینی راستـەقینـەی

# لێکۆڵینەوەی رامیاری

. ربوەبردنی نەبوو . .

حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە ئەنجامی ژان و ژۆیەکی بێ ئارام و تفت و تاڵێکی تیژ و دوور و درێژەوە سەری هەڵدوا هاتە سەرگۆرەپانی خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی لە نێو گفتوگۆیەکی حەوت ساڵیدا کە ئەنجامەکەی لەنێوان . «٤-٦»ی نیسانی «١٩٤٧» بەرهەمەکەی وەدەس هات و لە رۆژی «٧»ی نیسانی -«١٩٤٧»دا لە دیمەشق ـ پایتەختی سوریا بانگی لە دایك بوونی درا کە ئەوە بە یەکەمین کۆنگرەی حزب دانراو بە سەرەتای یەکەمین قۆناخی ژیانی نوێی عەرەبی ناسراوە . . لەم کۆنگرەیەدا یەکەمین دەستووری حزب بڵاو کرایەوەو جۆریەتی قەوارەی رێکخستنی و نەخشەو پلانی سیاسی و ستراتیژیی حزب دانرا کە بیر و باوەرە سەرەکیەکانی لە یەکەمین دەستووری حزب دوپات کرایەوە کە دەڵێت :-

یەکێتی نەتەوەی عەرەبی و سەربەخۆییەکەی و نیشتمانی عەرەبی تەنها بۆ عەرەبەو مافی چۆنیەتی رەفتار و هەڵس و کەوتیان تیایدا هەیەو لەکاتۆ باری بەکارهێنانی سامانەکانی و پاشەرۆژی و چارەنووسی خۆیدا سەربەستە

بەمەوە حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی رووی کردە چالاکی نواندن و بڵاو کردنەوەی بیر و باوەرەکانی ، هەتا گەیشتە رێکخستنی بنکەی شانەکانی لە هەرێمە عەربیەکاندا «لە ریزەکانی سوپایی و شارستانی» بەڵام لە ماوەی یەکەمین کۆنگرەیەوە هەتا دووەمین کۆنگرەی لە ساڵی «١٩٥٤»وەك یەك رێکخراوی یەك کاری کردووە کە مەڵبەندی چالاکیەکانی لە دیمەشق ـ پایتەختی سوریا بووەو یەکەمین لقیشی لە ئەردەن کرایەوە، ئەوەش پاش یەکەمین کۆنگرە بەچەند مانگێك و لە پاشاندا بەچەند مانگێك واتەلە ساڵانی «١٩٤٩-١٩٥٠» لەلەبنان ولەعیراقیشداکرایەوە

لە ساڵی «١٩٥٤»ی مانگی «حوزەیران دا ـ نوێنەرانی رێکخراوەکانی حزب لە هەرێمە عەرەبیەکانی «سوریا ـ ئەردن ـ لوبنان ـ عیراق» کۆبوونەوە کە یەکەمین کۆبوونەوەی سەرکردایەتیەکانی حزب بوو لە دەرەوەی سوریا سازدرا پاش جێگیر بوونی رێکخراوەکانی . . کە ئەمەش بە دووەمین کۆنگرەی نەتەوەیی دانرا لە هەمان کۆبوونەوەدا یەکەمین سەرکردایەتی نەتەوەیی هەڵبژێردرا بە هەڵبژاردنی هاورێ «خوالێخۆش بوو»میشیل عفلق ـ بۆ ئەمینداری گشتی حزب و بریاردانی پەیرەوی ناوخۆیی کە لە لایەنهەرێمی سوریاوە پێشنیاز کرابوو، بەمەوە دەزگاکانی سەرکردایەتی نەتەوایەتی حزب دامەزراو رووی کردە تێکۆشان و خەباتی بزووتنەوەی شۆرشگێری عەرەبی و دەربرینی لە بوارەکانیداو چۆنیەتی پتەو کردن و دارشتن و رێکخستن و ستراتیژیەتی فیکری کە شۆرشی عەرەبی بۆ قۆناخێکی نوێ دەگوێزێتەوە . .

لە قۆناخی ساڵانی «١٩٥٤-١٩٥٩»سێیەمین کۆنگرەی نەتەوایەتی سازدراو چەند رووداوێك لە گۆرەپانی عەرەبیدا هاتنەکایەوە، وەك یەکێتی نێوان میسر و سوریا و خاوبوونەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی لە ئەردن و بەرپا بوونی شۆرشی «١٤»ی تەموزی [١٩٥٨] لە عیراق داو لادانی لە ئامانجەکانی گەل و نەتەوەو کۆسپ و تەگەرە روودان لەرووی تاقی کردنەوەکەی نێوان میسر و سوریا و پێویستی چارەسەرکردنی ئەو بارە نەتەوەییەیە کە لە ئەنجامدا بەپێی بریاری حزب لە ئەیلولی«١٩٥٩»سێیەمین کۆنگرەی نەتەوەیی سازدرا بۆ دانانی نەخشەو پلانی ستراتیژیەتی بزووتنەوەی شۆرشگێری عەرەبی بەپێی رۆشنایی هەنگاوە نوێکانی بۆ کارکردن و چالاکیەکانی حزب سەبارەت بە رامیاری عەرەبی و نێو دەولەتی ، بەڵام لە بارەی بوارەکانی ناوخۆییدا گەیشتە دانانی خاڵ و مەرجێکی تایبەت بۆ بزووتنەوە نوێیەکەی . .

ئەوە بوو لە نێو کۆنگرەکانی «٤، ٥، ٦»دا ـ واتا لە ساڵانی [٦٠-٦٣]دا گۆرانکاری و پەرەسەندنێکی نوێ سەری هەڵداو هاتەکایەوە لە ئەنجامی نواندنی حزب بەچالاکیەکانی لە مەیانەکانی رامیاری عەرەبیدا، بە تایبەت لە ساڵی [١٩٦٣]دا ـ بە بەرپا بوونی شۆرشی «٨»شوبات «١٤» رەمەزان ـ بووکی شۆرشان و مۆر کردنی پەیمانی «١٧»نیسان کە لە ئەنجامی ئەم مۆرکردنە جڵەوی دەسپێشخەری کەوتە دەس عیراق و توانی نەخشەو پلانی یەکێتییە سێ قۆڵیەکەی نێوان «عیراق و میسر و سوریا» دابنێت . . بەڵام ئەنجامی ئەم یەکێتییە سەری نەگرت و هەڵوەشاو نەتەوەی عەرەبی کەوتە بەر شاڵاو و بارێکی قورس و گرانی پر لە مەترسی . .

حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی وەك حزبێکی شۆرشگێر و تێکۆشەر ، وەنەبێت لە ئەنجامەکانی ئەوکۆسپ و تەگەرانەو گیر و گرفتەکان کۆڵی دابێت و لە چالاکیەکانی کەم کردبێتەوەو هەستی کشانەوەی لە مەیانەکانی تێکۆشاندا گەماڕۆی دەروونی دابێت و ئەو بیر و باوەرانە کە لە پێناویدا قوربانیی بەخشیوە دووره پەرێزی لێبگرێت و پەتی بناغەی پەیوەندیی سست بکاتەوە، یان بپچرێنێ . . نەء. . . بەڵکو بە پێچەوانەوە بە توندو تیژ تر رووی کردە مەیدانی تێکۆشان .

ئەوەبوو کاتێ عبدالکریم قاسم پاش سەرکەوتنی شۆرشی «١٤»تەموزی ساڵی [١٩٥٨] کە حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دەستێکی باڵای لەو سەرکەوتنەدا هەبوو بینی ئەو لادانەی لە بیر و باوەرەکانی شۆرش و ئامانج و ئاواتەکانی گەل و نەتەوەو رەفتاری زوڵم و زۆرداری و سەرهەڵدانی سەرلەنوێ دەرەبەگایەتی نوێ، ئەو کاتە دەستە توندوتیژەکەی خۆی بۆ رزگار کردنی شۆرشی «١٤»تەموز و گەل و نەتەوە لە دیکتاتۆرییەت و لادەران لە بیر و باوەرەکانی گەل و نەتەوە . . بەکار هێنا لە نێو ئامادە کردنی کۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرم و لە هەڵبژاردەی خودی خۆی کە یەکێکیان ـ لەولاوانە لاوی خوێن گەرم و چاونەترساو و بەرجەرگ صدام حسین بوو کە لە رۆژی«٧» تەشرینی یەکەمی

# لێكۆڵینەوەی رامیاری

«١٩٥٩»دا فەرمانی حزبی بەجێ هێناو شان بەشانی هاوڕێكانی دەسڕێژی لە عبدالكریم قاسم كرد، بەڵام هەرچەندیش ئەم تاقی كردنەوەیە سەرنەكەوت، لە هەمان كاتدا بە جوانترین سەركەوتنی لە مێژووی خەباتی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكیدا تۆمار كرا . . كە لە ئەنجامیدا تێكۆشەرانی حزب دەربەدەر بوون و ئەوەشیان گیران كەوتنە ژێر باری ئازاردانیان بەدەستی درندەو جانەوەرەكانی دیكتاتۆریەتی عبدالكریم قاسم و دەزگا بەكرێگیراوەكەی . . بەمەشەوەحزب و تێكۆشەرانی حزب كۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لە دووبارەڕێكخستنی ڕیزەكانی خۆیان «سوپایی و شارستانی»كە لە ئەنجاما داری خەبات و تێكۆشان بەرهەمی نوێی بەخشییە گەل و نەتەوە ـ لە ڕۆژی «٨» شوباتی «١٩٦٣»بە بەرپابوونی شۆڕشی بووكی شۆڕشان بەروخاندنی هەتا هەتایی تەختی رژێمی دكتاتۆریەتی قاسمی لە عیراقدا . . بەڵام ئەم بووكە جوانە تەنها نۆمانگی خایاند لە ژیانی تێكۆشانێدا كە بەدەستی بێگانە پەرستانەوە لەلایەن چلكاو خۆرانی دەزگاو دەستەكانی عارفی كۆتایی پێدرا بەمەوە دووبارە تێكۆشەرانی حزب گیرۆدەی ناپاكان هاتن و خرانە بەندیخانەوە كە یەكێك لەو تێكۆشەرانە صدام حسین بوو توانی خۆی رزگار بكات و بەو ژیری و داناییەوە بە تێكۆشان و خەباتێكی بێوچان ریزەكانی پارت گلێر بكاتەوەو شانەكانی سەرلەنوێ پێك بێنێت و بیان هێنێتە جۆشی جارانیان، بەڵكو بەجۆشتر ئامادەكران بۆ رۆژی دانراوو روخاندنی رژێمی عارفی كە لە بەرەبەیانی رۆژی «١٧»تەموزی «١٩٦٨»ئەو پەیمان و بەڵێنەی كە بەگەل و نەتەوەی دابوو بەجێی هێنا لە نێو سەركردایەتی كردنی شۆڕشی «١٧ـ٣٠»تەموزی مەزن و پیرۆزو بەخشینی بەگەل و نەتەوە بەگۆڕ كردنی حوكمی عارفی هەتا هەتایەو دامەزراندنی رژێمیكی پێشكەوتن خوازو سەربەخۆو پاقژ كردنەوەی نیشتمان لە بەكرێ گیراوان لە رۆژی «٣٠»تەموزی پیرۆزداو بەتەواوەتی چەسپاندنی شۆڕش

## ئەستێرەیەكی گەش لە ئاسمانی عیراقیدا . .

ئەو توانایە كە خوا بەتوی بەخشیوە . . بەو توانایە توی بە سەركردەیەكی دلێرو تێكۆشەر خولقاندووە لە پێناوی یەكگرتنی بیروباوەڕەكانی پارت كەبووە دیارداوەیەكی راستەقینەو ئاشكرا لە ژیانا ، هەر ئەو توانایەیە كە شۆڕشی نەتەوە لە بارو دۆخی ناسكی ئیستایدا پێویستی پێیەتی و لە دایك بوونێكی نوێیەو دوپاتی شناسنامەو بەخشینی شارستانیەتیەكەی دەكات . .

«میشیل عفلق»

ئەو قۆناخە تاریكە كە باڵی رەشی كێشابووە سەر ئاسمانی نەتەوەی عەرەبیدا تەنانەت هەر ئەو تاریكییە نەبووە هۆی نەمانی دەوڵەمەندی ماددی و رۆشنبیری و گەشەكردنی شارستانیەتی نەتەوە، یان گۆڕینی رێگەو بانی بازرگانی نێو دەوڵەتان ، یان نەمان و لاواز بوونی شارە گەشەسەندووەكانی یان لەژێر دەستی هێرش و شاڵاوەكانی خاچەسوورەكان . . بەڵكو لەوە زیدەتر تاریكی و رەشتر دیاری داوە لە نێو كەساسیدا بەهۆی رووداوی پچڕاوی یەكێتی عەرەبی كە چەند هەوڵێكی بۆدراوە لە پێناوی یەكگرتنی قەوارەی پچڕاوی نەتەوە بەڵام كات تێپەڕی بوو، بۆیە پێویستی بەچەند سەدەیەك دەكرد هەتا لەژێر ئێش و ئازارەكانیدا دووبارە سەر بەرزكاتەوە دژی پێچ و پەناكانی مێژوو . . گومانی تیادا نییە ئەوەش بەبێ دیارنەدانی ئەستێرەیەك لە ئاسمانی نەتەوەدا نەدەكرا بۆ دووبارە بوژاندنەوەو زیندوبوونەوەی نەتەوەی عەرەبی لە مەیانەكانی تێكۆشان و خەباتداو سەرلەنوێ سەرهەڵدات و بێتە كۆڕی خەباتەوە

گومانی تیادا نییە . . كاتێ شانۆ ئامادە دەكرێت ـ هەوڵی دۆزینەوەو ئامادە كردنی پاڵەوانێك بۆ ئەو شانۆیە دەدرێت . . لەدایك بوونی صدام حسین لەوكاتە تاریك و كەساسی و ناهەمواری یە عەرەبییەدا بووە بەدەم ئێش و ئازارەكانیەوە. ئەو رێكەوتنە مێژوویەوە كە دەكەوێتە نێوان لە دایك بوونی صدام حسین و بوونی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی لەوە قووڵترە كە تەنانەت بەرێكەوتێكی ئاسایی بناسرێت لەنێوان ئەو دوو رووداوەدا . . وەك وتمان كاتێ شانۆ ئامادە دەكرێت هەوڵی دۆزینەوەی پاڵەوانێك بۆ ئەو شانۆیە دەدرێت بۆ نواندنی پاڵەوانیەتی لەسەر شانۆی خەبات و تێكۆشان لە مەیدانەكانی نیشتمان و نەتەوەدا . .

ئەوەنەبێت لە دایك بوونی صدام حسین لەو خانووەقوڕینەدا لە رۆژی«٢٨» نیسانی «١٩٣٧»دا ـ بە چەپڵەو هەڵهەلەوە پێشوازی كرابێ یان لانكەی تایبەت و رازاوەی بۆ ئامادە كرابێ . . بەڵكو بەهەتیوی لە دایك بووەو لە ناوجەرگەی هەژاری و هەژارەكاندا ، لە ناو جوتیارە چەوساوەكاندا كە لە ئەنجامدا وەك فەرماندەیەكی راستەقینەی هاتە كۆڕی خەباتی ژیان و ژیانی خەباتەوە

لەگەڕەكی الحارە و لە ناو خانوویەكی قوڕیندا لە شاری تكریت بەدەم گریان و هاوارێكی بەتینەوە چاوی كردەوەو بەرووڕووی ئەو تاریكی و ناڵەباری و كەساسیی نەتەوەكەیدا وەكو شێر نەراندی . . هەر لە سەرەتای منداڵییەوە هەستی بەوە كردبوو كە پێویستە رێڕەوو شێوازی چۆنیەتی ژیانی پاشەڕۆژی خۆی و نەتەوەكەی دا بێن بكات لە هەمان كاتیشدا هەستی بەوەش كردبوو كە هەستی پچڕاوی دەروونی هەتیویی ـ یان پاڵی پێوە دەنێ بەرەو كڕژ بوون و گۆشەگیری . . یان بەرەو دەرچوون لە پێچ و پەناكانی ئەو چەشنەو شێوە كڕژبوونەوەیداو نێزیك بوونەوەی لە خەڵك و ئاڵوە بوونی لەگەڵ كۆمەڵگەدا . . . بێگومان صدام دوویەمین رێگای هەڵبژاردو لە پێچ و پەناكانی گرژبوون و نەهامەتی خۆی

## لێکۆڵینەوەی رامیاری

رزگارکرد . . ، بۆیە بەرەو ژیانێکی قورس و گران . . بەرەو بەرهەڵستکاریو بەرەنگار بوونەوەی ژیانی نائەمواری وەك مرۆڤێکی بیرمەندو بەتوانا بەربەرەکانێی دەکرد وەك خەباتگێرێکی ئازاو ژیرو بەواناو چاونەترساو بەرەو بنیات سازی ژیانی خۆی ملی رێی گرتە بەر.

ئەم هۆیانە باری ژیانی صدام ی ـ گۆری کە بەدڵ و دەروونییەوە چەسپابوو بەدرێژایی ژیانی تێکۆشانی کە لە ئەنجاما وای لێکرد ببێتە مرۆڤێکی خەباتگێرو تێکۆشەرو دووربین و شۆڕشگێرو خۆڕاگرو پتەو کردنی پەیوەندیی لەگەڵ چەوساوەکاندا ـ هەژارەکاندا کە لە ئەنجاما وەك شۆرەسوارێکی دلێرو چاونەترساوی عەرەبی هاتە سەر مەیدانەکانی خەباتی نەتەوەو دابین کردنی ژیانێکی بەختەوەرو کامەرانی بۆ گەلەکەی . .

. . . بەبڕواوە دژ بە بارودۆخی ژیانی دواکەوتوویی تێدەکۆشێت بۆ دەستنیشان کردنی پاشەرۆژێکی روناك کە لە ئەنجامدا ئەو گۆڕانکارییە نائاساییە لە ژیانیدا روویدا لە تەمەنی دەساڵیدا ـ لە ساڵی [١٩٤٧] پەردەی رەشی لە رووی ژیانی هەڵدایەوەو صدام رووی کردە رۆشنایی ژیان پاش چوونی بە قوتابخانەو لە ئەنجامی ئەو وەرگرتنە گەرمییەی لەلایەن خاڵییەوەمامۆستا «حاجی خیرالله»وەرگیرا کە هەستی بۆی دەکوڵاو بە ئاواتی گەیشتنیو فێر بوونی خوێندن و نووسین . . ئەوە بوو پلەی خوێندنی سەرەتاییو یەکەمی ناوەندیی لە شاری تکریت تەواو کردو لە پاشان چووە ئامادەیی کەرخ بۆ تەواو کردنی ریبازی خوێندنەکەی

### لێدان و مەبەست . .

هەڤاڵێکی بەعسی بەصدام ی ـ راگەیاند ـ کە لە بەغدا داواکراوە ، بەبێ وەستان گەیشتە لێپرسراوەکەیو ـ لە بەغدا ـ پێی راگەیانرا کە لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی بەعسیدا بەپێی فەرمانی حزب هەڵبژێردراوە بۆ کوشتنی عبدالکریم قاسم . . . صدام . . بەبێ هیچ پرسینەوەیەك . . وتی . . ئامادەم . . ئەوەبوو لە کاتی دانراودا پاش چاك فێر بوونی لەو چەکانە کە بەکاری دێنێت لە رۆژی «٧»تەشرینی یەکەمی «١٩٥٩»دا ئەو کۆمەڵە لاوە بەعسییانە فەرمانی حزبەکەیان وەجێ هێنا لە نێو دەسرێژکردنی عبدالکریم لە شەقامی رەشید بەرانبەر بە «عگدالنصاری»بەڵام هەرچەند نەگەیشتنە ئەنجامی ئەرکەکەیان بەڵام رێگای رەوای خۆیان گرت لە پێناوی رزگارد کردنی گەلی عیراق و وەدی هێنانی رۆژێکی پرشنگدارو نوێو گەڕاندنەوەی شۆڕشی«١٤» تەموز بۆ ریبازە سەرەکییەکەی . . ئەوە بوو هاوڕێ صدام حسین گوللەیەکی چلکاو خۆرەکانی عبدالکریم قاسم بەرقاچی کەوت و توانی لەگەڵ هاورێکانیدا بگاتە مەڵبەندی نهێنی تایبەتی خۆیان و لەوێدا گوللەکەیان لە قاچی دەرهێناو پاش چەند رۆژێك توانی خۆی بگەیەنێتە سنووری سوریا ئەوەش بەیارمەتی هاوڕێو تێکۆشەرانی حزب و لە سنوور دەرباز بوو . . کە ماوەی سێ مانگ لە هەرێمی سوریادا مایەوەو لە پاشان چووە کۆماری میسر کەلەوسەردەمەدا قەڵای خەباتگێران و تێکۆشەران بووە . .

لە سەرکەوتنی شۆڕشی «١٤»رەمەزان«٨» شوباتی «١٩٦٣» پاش رووخاندنی حوکمی دیکتاتۆریەتی عبدالکریم قاسم گەڕایەوە بەغدا بەڵام ئەم شۆڕشە نازدارو تازە بووکە «بووکی شۆڕشان»تەنها «٩» مانگی خایاند کە لە ئەنجامدا لە وەرگەڕاندنەوە رەشەکەی «١٨»تەشرینی «١٩٦٣»دابەدەستی ناپاکان و بەکرێگیراوانەوە رووخاو دووبارە هاوڕێیان و تێکۆشەران و خەباتگێرانی حزبی بەعسی کەوتنە بەر پەلاماری گرتن و بەندکران و دەربەدەری کە صدام حسین یەکێ لەو هاوڕێو خەباتگێرە بەجەرگانە بوو کە لەئەنجامی ناکاوێدا گیرا . . بەڵام ئەم تێکۆشەرو شۆڕشگێرە توانی خۆی لەبەندیخانە رزگار بکات و بگاتە هاوڕێکانی حزب و رێکخستنی ریزەکانی حزب و ئامادە کردنیان بۆ رۆژی دانراوی ئایندە بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی مەزن لە پێناوی رزگارکردن و رووخاندنی رژێمی عارفی بەکرێگیراو.

صدام حسین پاش رزگار بوونی لە بەندیخانەو گەیشتنی بە تێکۆشەرانی حزب ئەرکی ئامادەو رێکخستنی ریزەکانی گرتە ئەستۆی خۆی کەتوانی بۆ رۆژی دانراو بەتەواوەتی ئامادەیان بکات بۆ رۆژێکی نوێ لە ژیانی گەلی عیراق و نەتەوە لە نێو بەرپاکردنی شۆڕشێکی هەرە مەزن کە بەخودی خۆی لە بەرەبەیانی رۆژی «١٧»تەمموزی ساڵی «١٩٦٨» لە هێرش بردنێکی مەردانەو دلێرانە سەرکردایەتی شۆڕشی مەزنی عیراقی کردو سەرکەوتنی وەدی هێنا بە گۆڕکردنی رژێمی بەکرێگیراوی عارفی . .

بەڵام ئەم سەرکردە خوێن گەرم و دلێرو چاونەترساوە ماوەی «١٣»رۆژ پاش سەرکەوتنی شۆڕش لەغەم و پەژارەدا دەژیا کە شۆڕش لە مەترسیدایە بەبوونی دوو ناپاکی خزاو بۆناو شۆڕش و سەپاندنی خۆیان بەسەر شۆڕشدا کە بەرێزی . پەیمانی بە هەڤاڵەکانی دابوو بەخۆی بوونی ئەو دوو ناپاك و خزاوانە چارەکات ئەو دوو ناپاکانە عبدالرزاق نایف و ابراهیم الداود بوون کە عبدالرزاق نایف پلەی سەرەك وەزیرانی وەرگرت بوو وابراهیم الداود وەزیری بەرگری . . ئەوەبوو لە رۆژی «٣٠»ی هەمان مانگدا واتە پاش «١٣»رۆژ لە سەرکەوتنی شۆڕش صدام حسین ی تێکۆشەرو بەجەرگ و زاناو داناو دلێر ، ریزی شۆڕشی لەو دوو خزاوانە پاقژ کردەوەو بەڵێنی خۆی بەجێ هێناو پڕ بەسینگ هەناسەیەکی ئاسوودەیی کێشاو دڵ ئارام بوو . . بەمەوە شۆڕش بە شێوەیەکی تەواوەتی چەسپاوو جێگیر بوو بە شۆڕشی «١٧ ـ ٣٠» تەمووزی مەزنی «١٩٦٨» ناو نرا

لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنە مەزنەو بڵاو کردنەوەی بەرنامەکەی،

ئاسـۆیـەکی نوێ لە ئاسمـانی عیـراقـدا گەشـایـەوە لە نێـو هەڵبـژاردنی سەرکردایەتیی حزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکی لە بەغدا بە هەڵبژاردنی خواڵێخۆش بوو احمد حسن البکر بۆ پلەی ئەمینداری نهێنیی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعسی عەرەبیی ئیشراکی ـ سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ـ سەرۆکی کۆماری عیراق . . و هەڵبژاردنی هاوڕێی خەباتگێڕ صدام حسین بۆ پلەی جێگری ئەمینداری نهێنیی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و لیپرسراوی لقی بەغداو رێکخراوی ئافرەتان و جوتیاران

■ ـ سەرۆکی ڕابەر بەرێز صدام حسین جوانترین و نەخشین ترین شوێن پەنجەی ڕەنگینی لە سەر لاپەرەکانی مێژوودا دەدرەوشێتەوە کە هەمیشە لە پێناوی بەرژەوەندیەکانی گەلی عیراق و نەتەوەدا بێ ووچان لە کاردا بووە ـ لە نێو چارەسەر کردنی باری کورد لە «١١» ئاداری ١٩٧٠ ـ مێژوویـیداو چەسپاندنی دەزگاکانی لە ساڵی «١٩٧٤» و بانگە دانی ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچەی کوردستانی عیراق و خۆماڵی کردنی نەوت و سامانەکانی نیشتمانیمان و بایەخدان بە سوپاو دامەزراندنی دەیەهای پرۆژەی گەورەو چاك کردنی باری گوزەرانی گەلی عیراق لە بوارەکانی ئابووریی و تەندروستیی و کۆمەلایەتیی و پەروەردەیی بەتایبەت بایەخدانێکی هەرە مەزن بەرێکخستنی سوپاو بەهێزکردنی بە شێوەیەك جێگەی دڵنیایی گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەبیی بێت بۆ پاراستنی خاك و ئاوو ئاسمان و شەرەفمەندیی گەل و نەتەوە لە تەماحکاریی دوژمنان کە لە مێژەوە بەرێزی دەسنیشانی ئەوەی کردبوو بەبوونی بوونی ڕەشەبای گەنیوی کە لە سنووری رۆژهەڵاتی نیشتمانی پیرۆزمانەوە دەهات و پڕ لە رق و کینەی ڕەشیان بەرامبەر ئەو هەموو گۆڕانکاریی و پێشکەوتن و پەرەسەندن و هەنگاوە نوێیانە کە لە عیراقدا لە ژێر ئاڵای حزب و شۆڕشەکەیدا بەرابەری سەرۆکی ڕابەری بەرێز صدام گشت گۆرەپان و بوارەکانی ژیانی گەلی عیراقی پڕکردبووەوە . . بەمەوە دوژمنانی گەل و نەتەوە، تێکۆشان و هەوڵی دەستێوەردانی عیراقیان دا لەبۆ ڕاگرتنی ڕەورەوەی پێشکەوتنی عیراق کە لە ئەنجامدا جەنگێکی نارەوایان بەسەر عیراقدا لەلایەن رژێمی ئیرانی بێگانەپەرست و بەکرێگیراوەوە سەپاند بۆ مەبەستی ڕوخاندنی رژێمی پێشکەوتنخواز لە عیراقدا ئەوەبوو گشت ئەنجامەکانی ـ لە شکست هێنان و سەرشۆڕیی و دۆڕین گەمارۆی رژێم و هێزە چەکدارەکانی ئیرانی دا کە ئەم رژێمە چەپەلە لە هەو لایەکەوە یارمەتی دەدرا بەتایبەت لە قەوارەی زایۆنیزمەوە کە مەترسییەکی گەورەی لە عیراق پەیدا کردبوو . . بەڵام ـ ماوەی ئەو هەشت ساڵە لەو جەنگە خوێنڕێژییە، وەك بۆ هەموو جیهان ئاشکرابوو کە چەند لە هاوپەیمانەکانیەوە یارمەتی دەدرا نەیتوانیوە بگاتە ئامانجەکانی چونکە عیراق لە پێناوی ماف ڕەوایی خۆی بەرگری کردووەو رژێمی ئیرانی بە نارەوایی هاتۆتە سەر عیراق جگە لەوەش ئەومیان لەبیر چووبوو کە لە عیراقدا سەرکردەیەك هەیە بەخۆی فەرماندەیی سوپاتێکۆشەرە جەنگاوەرەکەی دەکات فەرماندەیەکەو لە ناو فەرماندە سوپاییەکانی جیهاندا هەمان شێوەی ئەستێرەیەکی گەشاوە دەدرەوشێتەوە خاوەنی بیر و باوەڕو دووربین و لێکدەرەوەیێکی تیژە کە ئەوەش نیشانەی فەرماندەیەکی لێهاتوو بلیمەتە . . سەرەڕای ئەو ئیمان و باوەڕو مەزنەی بە گەل و نەتەوەکەی کە بە پێچەوانەوە حوکمرانانی ئێران لە سەپاندنی ئەم جەنگە بەسەر عیراقدا ، بیریان لەوە نەکردبووەوە کە لە پاشەرۆژدا لە ئەنجامی ئەم جەنگە چیيان بەسەر دێت . . هەشت ساڵی ڕەبەقی خوێنڕێژی تێپەڕیی و عیراق سەرکەوتنێکی هەرەمەزنی بەسەر رژێمی ئیراندا تۆمار کرد کە لە ژێر باری ناچاریدا بە سەرشۆڕیی و مل کەچی بە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی ژمارە «٥٩٨» قایل بێت . کە بەمە گەلی عیراق بەرابەرەیی سەرۆکی ڕابەری بەرێز صدام حسین «خوابپاریزێت» لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ مەزنترین سەرکەوتنی هێناو دابین کردنی سەرکەوتن و ئاشتیی و ئاسایشی کە لە هەموو جیهاندا دەنگی دایەوە . .

گەلی عیراق بەسەرکردایەتی ڕابەرە دلێرەکەی . . صدام حسین «خوابپاریزێت» لەژێر سێبەری چەتری یەکێتی نیشتمانی عیراقدا بەسەر بەرزیی و کامەرانیی و بەختەوەریی و شادمانیی و سەربەخۆیی و سەربەستی ژیانی خۆی بردۆتە سەرو دەباتە سەر . . بەپێچەوانەی گەلانی هەژار و پێوەندکرا لە ئێراندا کە لەو رۆژەوە دارو دەستەی مەلاو ئاخوندەکان گەیشتوونەتە سەر تەختی پاشایەتی هەتاکو ئەمرۆ لە تام و چێژی ژیانی سەدەی بیستەم بێبەش کراون . بەهۆی ئەو رژێمە مێشك پووچەڵە کە دەربەسی کەس نییە جگە لەمانەوەی خۆی نەبێت

● ـ پیرۆزو هەزار پیرۆز بێت یادی ئەم دوو جەژنە مەزنە لە ژیانی گەل و نەتەوەدا .

● ـ هەزاران پیرۆزبایی و جوانترین سڵاوی بەسۆز بۆ سەرۆکی ڕابەری بەرێزو مەزنمان سەرۆك صدام حسین «خوار بپاریزێت بەبۆنەی یادی پیرۆزی لە دایك بوونییەوە .

## سەرچاوەکان


١ ـ المنهاج الثقافي المركزي لحزب البعث العربي الاشتراكي الكتاب الثالث

٢ ـ التقرير السياسي للمؤتمر القطري الثامن ١٩٧٤

٣ ـ صدام حسين مناضلا ومفكرا وانسانا ـ امير اسكندر ١٩٨٠

٤ ـ صدام حسين : الرجل والقضية والمستقبل / فؤاد مطر ـ الطبعة الاولى ١٩٨٠ دار النشر العربية . المؤسسة العربية للدراسات والنشر.

لێكۆڵینەوەی رامیاری

# في ذكــرى ذكــريين عظيمين الســابـع من نيسـان ١٩٤٧ ـ الثـامن والعشرين من نيسان ١٩٣٧

شفيق محمود جاف

لاشــك . . ان ايــة حركـة ثوريـة لابـد من الانسجـام التـام بين الاهـداف التي تتبناها تلك الحركة وبين الادوات المؤهلة لترجمة اهـداف الحـركـة الى حيز الواقع ضمن مسيرتها النضالية، وبدون هذا الانسـجـام تبقى الحـركـة الوطنية حبيسة اطر التنظير اوتتحول الى ساحـة تنـاحر طموحاتها ونهجها الواقعى، ولعل الامثلة ليست قليلة في الـواقـع التـاريخي على ذلـك . . وان البنـاء الاجتماعى والاقتصـادى ومـا يرتبـط به وينبثق عنـه من تيارات سياسية وفكرية لايمكن تغييـره بالمـوقف الـوعظى والنيات الحسنة، ويقدر صحة هذه المقولة، فان النضال الحاسم باتجاه تحقيق الاهداف لابد ان يصطـدم بكثيـر من العقبـات اوينفجـر ضمن تمزقات وانشطارات كثيرة مالم تتحقق الرؤية الواضحة للمنهج العلمي لاية حركة ثورية لابـالنسبـة لاهـدافهـا ومنطلقـاتهـا الفكـرية فحسب، بل بالنسبة لادواتها واساليب نضالها ايضا.

● لم تكن ولادة حزب البعث العربي الاشتراكي تعبيرا عن رد فعل مباشر وآني للاحداث السياسية التى عاشتها الامة العربية في تلك المـرحلة، وانمـا ولـد الحزب كنتيجة للتناقض الحاد بين مصلحة جمـاهيـر الامـة العربية واهدافها وطموحاتها الانسانية وبين الواقع الاستغلالي المتخلف للمجتمع العربي.

أذا . . فولادة حزب البـعـث الـعــربي الاشتــراكي هي محصلة موضـوعيـة لحـركـة الـوجـود العـربي نحو التقدم والبناء، كما وان الحـزب من منطلقـاتـه واهدافه ونضاله اليومى، فانه حزب تقدمى قومي اعتبـر الـوطن العـربي اطـار وجوده وحركة نضاله نحوتحقيق الرسالة العربية، وبهذا اكد الحزب حيث اعلن مبادئه منذ المرحلة التأسيسيـه على انـه «حـزب عربي ليس في اسمـه وغـايته المثالية فحسب بل ايضـا في واقعـه وتنظيمـه واسلوب عمله . وان الاطـار القـومى لتنظيم الحـزب جاء تعبيـرا حيـويا من منطلقات وايدلوجية العـربيـة الثـورية وطبيعة النضال الثورى الذى خاصه بحق للدفاع عن مصـالـح الجمـاهيـر وحـاجات الامة العربية والوحدة والتحرر والتقدم

● لقد كان تطلع الجماهير العربية نحو اداة ثورية تستقطب طاقاتها وامكـانـاتهـا وتقود نضالها في صراعها ضد قوى التخلف والتجزئة والاستعمـار ينبـع من ادراك عميق لاهمية التنظيم الثوري من جهة وفشـل التنظيمـات السياسية التقليدية التي كانت سائدة في الوطن العربي قبل الحرب العالمية الثانية في استيعاب متطلبات المرحلة التاريخية والتعبير الحقيقى عن الارادة الشعبية من جهة اخرى . .

لقـد كانت مرحلة بدايـة الاربعينـات تشكـل بالنسبة لحركة البعث مرحلة تبشيـريـة بالمبادىء القومية والاشتراكية الجديدة واستمرت حتى نيســان ١٩٤٧ حيث انعقـد المؤتمـر الاول الـذي يعرف في تاريخ العرب بالمؤتمر القومى الاول «في دمشق» خلال الفترة من «٤ـ٦»نيسان ١٩٤٧ ـ حيث توجت هذه المرحلة التى امتدت قرابة سبـع سنـوات من التمهيـد والتشـاور وكـان الاثبـات والاعلان في

## لێکۆڵینەوەی رامیاری

السابع من نيسان ١٩٤٧، واعلان الدستور الاول وتحديد الشكل التنظيمي والخط السياسي الاستراتيجي للحزب، حيث اكد دستور الحزب في البداية وحدة الامة العربية وحريتها وان لها حقها الطبيعي في ان تحيا في دولة واحدة وان تكون حرة في توجه مقدراتها

ومن خلال المؤتمر القومي الثاني «١٩٥٤» وفي اجتماع ممثلي تنظيمات الحزب في الاقطار العربية «سوريا لبنان ـ اردن ـ العراق» خارج سوريا ـ والذي يمثل اول اجتماع لممثلي الاقطار العربية ـ انتخب اول قيادة قومية للحزب، حيث انتخب الرفيق «المرحوم» ميشيل عفلق اميناً عاماً للحزب وهكذا توالت المؤتمرات القومية والقطرية.

● لقد كانت ولادة صدام حسين في وقت كانت الامة العربية تئن تحت وطأة الظلم والتخلف والانقسام والأستغلال، ولم تكن هذه الولادة التاريخية بين هذين التاريخين ـ ميلاد صدام حسين وميلاد حزب البعث العربي الاشتراكي مصادفة.. بل لها معاني اعمق واوسع من ان تكون مجرد مصادفة.. فالمسرح عندما يكون مهيئا يكون في انتظار ولادة بطل ليمثل الدور البطولي على ارضية هذا المسرح.. فكانت ولادة البطل المنتظر صدام حسين في الثامن والعشرين من نيسان ١٩٣٧.. ولم تكن ولادة هذا الوليد البطل القائد الذي ولد في قرية صغيرة في مدينة تكريت وفي بيت طين قد استقبلت بالزغاريد والشموع وباقات من الورود ومهد مزركش مضاء ينتظره.. لقد ولد يتيماً في بيت طيني كما يولد اطفال الفقراء.. حيث شب بينهم واحبهم.. وما ان بلغ سن العاشرة من عمره حتى بدأ يفكر ومن قرارة نفسه ان يخطط لمستقبله. وكان له ماأراد وخطط واكمل خططه واعتلى ساحة النضال الفكري والقومي ـ وكان له ذلك الموقف والوقفة الجريئة عندما استدعى الى بغداد وانيطت اليه مع رفاقه وبامر الحزب مهمة قتل عبدالكريم قاسم.. وتمكن من الخروج من العراق بعد البحث الدقيق عنه من قبل الزمرة القاسمية ـ ووصوله الى سوريا ومن هناك الى جمهورية مصر العربية. والعودة الى العراق بعد نجاح ثورة الثامن من شباط عام «١٩٦٣» والاطاحة بالحكم القاسمي.

وما ن قامت الايدي المجرمة بخنق عروس الثورات في مهدها ـ بعد «٩» اشهر من ولادتها. حتى كان الرفيق المناضل مع رفاقه اودعوا السجون والمعتقلات الا ان القائد البطل واصل نضاله مع رفاقه في سجن حتى سنحت له الفرصة وتخلص من السجن ز نتحق برفقه وهو اكثر قوة واشد اندفاعا حيث تمكن من لم شمل رفاقه واعادة «تنضيمات الحزب» وتوحيدهم وتسليحهم ليوم المقرر فكان ذلك صبيحة يوم السابع عشر من تموز عام «١٩٦٨» حيث قاد سيادته رفاقه وتنتصر الثورة والاطاحة بالحكم العارفي.. كما وان القائد البطل كان هناك «دين عليه» الايفاء بعهد قطعه على نفسه امام رفاقه.. هو ان يتخلص من عميلين كانا قبل الثورة بايام فرضا نفسهما على الثورة وفي موقعين هامين خطرين على الحزب والثورة ـ عبدالرزاق نايف ـ رئيس الوزراء ـ ابراهيم الداود ـ وزير الدفاع ـ ففي يوم الثلاثين من تموز ـ اي بعد مرور «١٣» ثلاثة عشر يوما كان وعد القائد تم ـ حيث اوفى القائد بوعده وعهده للثورة وذلك بابعاد الاثنين عن الثورة واعتبرت الثورة ثورة «١٧ ـ ٣٠» تموز

● ـ وفي اجتماع لمجلس قيادة الثورة انتخب المرحوم احمد حسن البكر أميناً لسر القيادة القطرية ـ رئيساً لمجلس قيادة الثورة ـ رئيساً للجمهورية.. وانتخب القائد البطل صدام حسين ـ نائباً لأمين سر القيادة القطرية ـ نائباً لرئيس مجلس قيادة الثورة مسؤولاً عن فرع بغداد وتنظيم المرأة والفلاحين.

وما ان استلم القائد البطل مسؤولية الحزب والدولة حتى ظهرت اثار يده الكريمة على كافة الساحات ـ من تحولات اقتصادية ـ اجتماعية ـ صحية صناعية وامنية وعم الاستقرار البلاد من شمالها الى جنوبها حيث كان المهندس المخطط لحل المسألة الكردية وتطبيق الحكم الذاتي لمنطقة كوردستان العراق ـ وتأميم النفط والاهتمام الخاص بالجيش بانشاء جيش عراقي عصري تمكن وبقيادة القائد رد كيد المعتدين الطامعين في بلدنا طوال حرب ثمان سنوات حيث ارادوا النيل منها وايقاف عجلة التطور والتقدم والتنمية في العراق.. وما كان للاعداء الا ان يجنوا ويحصدوا مازرعوه من خيبة امل والركوع امام حقوقنا المشروعة في يوم النصر والسلام الذي حققه للعراق والامة والانسانية ومحبي السلام، الرئيس القائد المناضل صدام حسين حفظه‌الله بعد ان قاد واشرف ميدانياً على تحرير مدينة الفاو من رجس المعتدين وها هو العراق ينعم بالخير والبركة والرخاء والاستقرار في ظل ثورته وقائده ـ القائد ـ ابن الشعب الفارس صدام حسين «حفظه الله..»

کۆمەڵایەتی

# حسین حوزنی موکریانی و
# دەوری لە پێشخستنی هونەری وتاری کوردی دا

کریم مصطفی شارەزا

پێشەکی :-

کاتێـك لە مێـژ ووی مرۆڤـایـەتی دا، لە کەسێتی ی مرۆڤی بلیمـەت و بەهرەدارو داهێنەر دەکۆڵینەوە، دەبینین زۆربەیان داهێنـانیـان لە لایـەنێـك لە لایـەنەکانی ژیان دا بووە. کەم وابووە یەکێـك بەهـەرەی لەگـەڵیـك بواری زانستی وخزمـەتگوزاریی نەتەوەکەیدا بووبێ و، تواناو زانیاری یەکی فراوانی ئینایکلۆپیدیایی بووبێ و، لە هەموو بوارێکی ژیان دا داهێنانی وەدەست هێنابێ.

ئەگـەر بمانەوێ نموونەیەك لە جۆری دووەم لە مێژ ووی کورددا دەسـنیـشـان بکـەین، ئەوا بەبێ دوودڵی دەتـوانین لە ناوکوردە داهێنـەرو خزمـەتگوزارەکـان دا دەست لەسـەر وزنی موکـریـانی دابنێین، چونکـە ژیـانی پڕ شکـۆیدا پێنـاسـەی کۆمـەڵە کەسێکی بەهرەدارو داهێنەری هەڵگرتووە.

ئەگەر لاپەڕەی مێژ ووی نەتەوەی کورد هەڵبدەینەوەو لە مێژ وو نووسـە پێشـەنگـەکانی بگەڕێین، دەبینین حوزنی موکریانی مێژ وو نووسێکی خامـە ڕەنگینی پێشـەنگـەو یەکـەم کەس بووە لە کورددا مێژ ووی کوردی بە زمانی نەتەوەیی خۆی نووسیبێتەوە.

ئەگـەر مێـژ ووی ڕۆژنـامـە گەریی ی کوردیشـمـان بخوێنینەوە، بێگـومـان ناوی حوزنی وەك ئەستێـرەیـەکی گەش لە ئاسمـانی ئەم هونـەرە گرنگـەدا بەرچـاو دەکەوێ و، بە وتارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانیاری و ئەدەبی یەکانی مێشکی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ڕۆشن کردۆتەوە.

ئەگـەر لە هونـەری وەرگـێـران و، وەرگێـران بۆ سەر زمـانی کوردی یـەوەبـدوێین دیسـان ناوی حوزنی بە درەوشاوەیی لە ئاسۆی ئاسمـــانی ئەو هونـەرەدا دەبینین و ئەگـەر لە ئەدەبی کوردیمـان کۆڵی یـەوە، دەبینین خاڵـە حوزنی چیـرۆك نووسێکی سەرمەشق دادەرو شاعیـرێکی نیشتمـان پەروەر بووەو، ئەگـەر ناوی خۆش نووس و مۆرهـەڵکـەن و نەخشکـارو وێنـەگـری کورد هات، ئەوا دیسـان حوزنی لە ناویـان دا لە ڕیـزی پێشـەوەی ئەو هونـەر کارانەدادەوەستێ و، خۆ ئەگەر باسی نیشتمان پەروەریی ی کوردکرا، ئەوا حوزنی نیشتمان پەروەرێکی هەرە دڵسۆزی کورد بووە.

بەم جۆرە دەبـینین حوزنی موکـریـانی بەو هەمـوو بەهـرەوەو داهێنانانەوە خزمەتی نەتەوەکەی خۆی کردووەو ناوی نەمری لە سەر ڕووپـەری مێـژ ووی کورددا بەگـەشی تۆمـارکـراوە و هەر بەگەشی و نەمریش دەمێنێتەوە.

ئێمـە لەبـەر ماوە کەمی لە ناو حوزنی نیشتمـان پەروەرو مێـژ وو نووس و ڕۆژنـامـەگـەر و وتـار نووس و شاعیـرو چیـرۆك نووس و نەخشکـارو مۆرهـەڵکەن و خۆش نووس و وێنەگر، تەنها لە حوزنی ڕۆژنامەگەر و وتار نووسی بەهرەدارو دەوری لە پێشخستنی هونەری وتـار نووسینی کوردیدا دەدوێین، بەڵام جارێ ئەگـەر بەکورتیش بێ، با چاوێـك بە ژیـاننامەی گەشیدا بخشێنین، تاکو بزانین کێ بووە؟ چۆن پێ گەیووەو لە بواری ڕۆژنامەگەریی ی کوردیدا چی کردووە

حوزنی موکریانی کێ بووە؟

---

حوزنی موکـریـانی ناوی تەواوی سەیـد حوسێن کوڕی سەیـد عەبـدوللەتیفی کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ عیسای کوڕی شێـخ لەتیفی خەزایی یەو، ناوبـانگی هەنـدەرانی [حـوزنی] و ناو بانگی لە کوردستان [داماو] و [خدۆك] و [بێژەن] بووە.[1]

لە ساڵی ١٨٩٣دا لە شاری سابـڵاغ (مـەهـاباد) لە دایك بووەو هەر لە منداڵی یەوە بلیمەتی وزیرەکی لێ بە دی کراوەو سەودای کورد پەروەریی بووە.[2] لە تەمـەنـی ١٢ ساڵی دا کەس و کاری خۆی و مەهابادی بەجێ هێشتووەو ڕووی کردۆتە مەراغەو تەوریزو یەریڤان و ١٢ ساڵیش بە بەرگی ئەفغـانی یـەوە هەمـوو کوردستـان گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەو تۆمار کردنی مێژ ووی کورد.[3]

حوزنی خوێنـدنی سەرەتـایی لەلای باوکی وخاڵـەکـانی و لە قوتـابخـانـە سـەرەتـایی یەکـەی (مەهاباد) وەرگرتووەو، وەك هەندێ سەرچـاوە لە باسی ژیـانی دا دەڵێن: چەنـد ساڵێکیش لە ڕوو سیـاو ئەستـەمبـوڵ خوێندوویەتی و بە چاکی زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئەفغـانی و تورکی و ڕووسی و هینـدی فێـر بووە، کەمێکیش سەری لە زمانی فەرەنسایی و ئینگلیزی دەرچووە.[4]

حوزنی لە هەمــوو چەشنــە زانیــاری‌یــەك دەدوا، لە مێــژ وو، ئەدەب، ڕۆژنامەگەریی، مۆرهەڵکەنی و وێنەگری‌و خۆش نووسی‌و کلێشــەی وێنــە هەڵکندن لەدار بۆگۆڤار و ڕۆژنامەو هونەری وەرگێڕان لە زمانی بیانی‌یەوە بۆ کوردی، بەهرەدار بووە. [5]

حوزنی گەلێــك بەرهــەمی ئەدەبی‌و مێــژ وویی دانــاوەو چاپ کردووە، تاخــۆی لەژیــان دا بووە، لە نێــوانی سالانی (١٩٢٥ - ١٩٤٧) هەژدە کتێبــی چاپ کردووە، کە زۆر بەیــان مێــژ ووی کوردن و گەلێ بەرهــەمی دیکــەیشی بە دەست نووسی ماونــەتــەوە چاوەڕوانی چاپ کردن و بلاوکردنەوەن.

لە ناو کورددا یەکەمین کەس بووە چاپخانەی بۆخزمەتی زمان و مێژ وو و ئەدەبی کوردی دامەزراندووەو، لە ساڵی ١٩١٥دا لە شاری (حــەڵــەب)ی وولاتی شامی دانــاوەو لە دوایی‌دا لە ساڵی ١٩٢٥دا گواستــوویــەتی‌یــەوە بۆ کوردستــانی عیــراق و لە شاری ڕەوانــدزی داناوەو، لە سالانی [١٩٢٦ - ١٩٣٢]دا گۆڤاری [زاری کرمانجی] پێ چاپ کردووەو، لەو ماوەیــەدا «٢٤» ژمــارەی لێ بلاوکردۆتەوەو، لە سالانی [١٩٣٥ - ١٩٣٦]دا «١١» ژمارەی لە گۆڤاری (ڕوناکی) بە هاوکــاری کردن لەگــەڵ خوا لێ خۆش بوو[شێت مستــەفا] لە شاری هەولێر بلاوکردۆتەوەو، لە سالانی [١٩٤٣ - ١٩٤٧] گۆڤارو ڕۆژنــامــەی [دەنگی گێتی‌ی تازە]ی [6] بە هاوکــاری کردن لەگــەڵ محــەممەد بابان و پارێزەر فائیق تۆفیق و وەهبی لە بەغدا دەردەچواندو گەلێــك ووتــاری مێــژ وویی و کۆمەلایەتی و دەقی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی‌و شیعری شا؛ یرە ناودارەکانی کوردی بلاودەکردەوە.

حوزنی دوای خز ـەتێکی زۆری مێــژ وو و ڕۆژنــامــەگــەریی‌و ئەدەب و ڕۆشــنبیــری کوردی لە ڕۆژی ٢٠ی ئەیــلوولــی ساڵــی ١٩٤٧دا لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی براوەتەوە بۆ شاری هەولێــری دێــرین و لەوێ لە گۆڕستــانی ئیمــام محــەمــەد نێــژ راوەو، لە ماوەی ژیــانی‌دا ژنێکی هێناوە، بەلام هیچ منداڵێکی لێ نەبووەو، لە جیاتی منداڵ بەرهەمێکی زۆر بەنرخی چاپ کراوو چاپ نەکراوی لەپاش بەجێماوە.

ئەوخزمەتەی مێژ وونووسی گەورەی کورد، حوزنی موکریانی بۆ کوردو کوردســتــانــی کردووە، نەك تەنــهــا لە بارەی نووسینــەوەی بەشێکی مێــژ ووی کورد بەڵکــو لەبــارەی ڕۆژنــامە نووسی‌و دانانی چاپخــانــەی کوردی لە کوردستــان، بە هیــچ جۆرێــك بە چەنــد لاپەڕەیەك یا بە تاکە بابەتێك و نووسەرێك مافی ڕاستەقینەی پێ نادرێ‌و، [7] گەلــێ بەرهــەمی بە نرخی بۆدانــاوین وخزمــەتێکی گەورەی نەتــەوەکــەی کردووەو، ئەم کردەوە بە کەڵکــانــەی بوونــەتــە مایــەی مانــەوەی لە ناودڵ وویجــدانی ڕۆڵــەکانی نەتەوەی کوردو تا هەتایە لەگەڵی‌دا دەژ ین.

ئەوەی بە وردی سەرنــج بداتــە ئەونووســینــانــەی حوزنی لە ڕوژنــامەوگوڤارە کوردی‌یەکانی سەردەمی خۆی‌دا دەینووسین، بۆی دەر دەکــەوێ کە زۆربــەی نووسینــەکــانی پەیــوەنــدیی‌یــان بەژ یانی ڕۆژ انەی خەڵکەکەوە هەبووەو، وەك ڕۆژنامە نووسێك دەوری خۆی دیــوە، زۆرلێکــۆڵینــەوەی بەنرخی کۆمەلایەتی و ئابووری‌و مێژ ویی‌و ئەدەبی و هونــەریی هەبــووەو بە شێــوەیــەکی زانستییــانە بۆیان چووەو چارەسەری کردوون. [8]

خوێنەری بەڕێز، دوای ئەوەی کە (حوزنی موکریانی)ت ناسی‌و لە بەهــرەو زیــرەکی و هونەرمەندیی گەیشتی‌و زانیت دەستێکی بالای بووە لەهــونــەری‌و وتــارنووسین دا دەبا لێرەو دوا بزانین ووتار چی‌یە؟ چەنــد جۆری هەیــە؟ تایبەتمەندی‌یە سەرەکی‌یەکانی ووتار نووسین چین؟ کەی ووتار لە ئەدەب و ڕۆژنامەی کوردی‌دا سەری هەڵداوە؟ حوزنی و هونــەری ووتــار نووسین چۆن هەڵــدە سەنگێنین؟ دوای ئەمــانــەش باهــەندێ نموونەی سەرکەوتووی ووتارەکانی حوزنی لە گۆڤــاری زاری کــرمــانجی‌دا هەڵســەنگێنین و شی‌یان بکەینەوە تاکو بزانین تا چ ڕادەیــەك هەل و مەرجی ووتاری سەرکەوتوویان لێ دێتە دی‌و دەوری حوزنی چی بووە لە پێشخستنی هونەری ووتاری کوردی؟

وتار چی‌یەو چەند جۆری هەیە؟

---

زۆر کەس پێنــاســەی وتــار «المقــال» یان کردووە، هەیە دەڵێ: «وتــار جۆرە نووسینێکــە، زۆر لێکۆڵینەوەو قووڵ بوونەوە بەناو ڕەگ و ڕیشــەکــانی‌دا ناوێت و بەشێــوەیــەکی سووك و ئاســان پێشکەش بە خوێنەر دەکرێت». [9]

لە فەرهــەنگی لاڕوسی فەرەنســایی‌دا لە بارەی وتــارەوە ئەمــە هاتووەو دەڵێ: - «وتار بەو جۆرە نووسینانە دەڵێن کە خاوەنەکانیان بە قووڵی لێیــان ناکــۆڵنــەوە، یاخــود بە تەواوی بابــەتەکەیان چارە سەر ناکەن. وشەی وتاریش بە مانای «هەوڵدان و شارەزایی پەیداکردن» یاخود بە مانای تاقی کردنەوەیەکی سەرەتایی دێت». [10]

لە هەندێ سەرچاوەی دیکەش دا دەڵێ: هەیە لەوڕایە دایە، کە «وتــار جۆرە دارشتنێکی سووك و ئاســانــەو چارە سەری بابەتێك یان بیــرۆکــەیــەك دەکات و، بە زۆری لە سەر لاپەڕەی ڕۆژ نامە یا گۆڤار پێشکــەش دەکــرێ». [11] کەچی کاتێــك کە لە ئینــایکلوپیــدیــای بەریتــانی‌دا سەیــری وشــەی وتار دەکرێت، بەم جۆرەی خوارەوە بەر

چاو دەکەویت و دەلێ :-

«وتار جۆرە دارشتنێکە لە درێژی دا مام ناوەندی یەو چارەسەری بابەتێکی دیاری کراو دەکات و پەل و پۆی بۆ بابەتی تر ناهاوێت و دوو جۆرە وتار هەیە ، وتاری ڕۆژنامەیی کە گرنگی بە سەرتاپای بابەتەکە دەدات و، وتاری (ئەدەبی)یش بە زۆری گرنگی بە نرخ و بەهای بابەتەکە دەدا»[12]

لە سەر چاوەی دیکەش دا بەم جۆرە پێناسەی وتار کراوەو دەگوترێ : «وتار جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەبی پەخشان و لە بابەتێك یا بیرێکی دیاری کراوەوە دەدوێ و نووسەرەکەی بە شێوە نووسینەکەی خۆی لەچەند لایەرەیەك دا دەری دەبرێ و کەسێتی ی خۆی پێوە دیارە» .[13]

هونەری وتار نووسین لە ئەدەبی ڕۆژ هەلاتی دا نوێیەو، لە ڕۆژئاواوە وەرگیراوەو، لە سەدەی شازدەهەم دا لە سەر دەستی نووسەری پێشەنگ میشیل مونتانی (١٥٣٣ - ١٥٩٣)ی فەرەنسایی و، فرەنسیس بیکون (١٥٦١ - ١٦٢٨)ی ئینگلیز دروست بووە .[14] مۆنتانی لە سالی ١٥٨٠ دا یەکەمین وتاری و جوانترین وتاری بلاوکردەوەو لە دوایی دا بەهەموو ڕۆژئاوادا بلاوبووەوە و پێشکەوت و بۆ جێ بەجێ کردنی پێویستی یەکانی ژیانی هاوچەرخ، گۆڤارو ڕۆژنامەکان دەورێکی سەرەکی یان لە گەشەکردن و پێشکەوتنی دا گێڕا .[15]

هەندێ نووسەر لەو رایەدان کە وتار دووجۆری سەرەکی هەیە : وتاری ئەدەبی و وتاری ڕۆژنامەی نووسی و، دەلێن : وتاری ئەدەبی پتر لە گۆڤاردا بلاو دەکرێتەوەو، وتاری ڕۆژنامە نووسیش لە ڕۆژنامەدا جێی خۆی دەگرێتەوەو، وتاری ئەدەبی هونەرێکی خودیی یە ، کەچی وتاری ڕۆژنامەنووسی هونەرێکی کومەلایەتی یە یەکەمیان ئاوێنەی نووسەرەو، دووەمیشیان ئاوێنەی کۆمەلە، ئەدیب پتر پشت بە ئەندێشە دەبەستێ و ڕۆژنامەنووس بە واقیع و ڕووداو[16] و، ئەمرۆ وتاری ڕۆژنامەنووسی پتر؟ باوەو گەلێ جۆری هەیە وەکو وتاری سیاسی و وتاری کۆمەلایەتی و وتاری زانستی و وتاری ئەدەبی ی ڕۆژنامەیی و هەر جۆرەشیان تایبەتمەندیی ی خۆیان هەیە . وتاری سیاسی و کۆمەلایەتی پتر پێویستی یان بەچارە سەرکردنی خێرا هەیەو پەیوەندیی یان بە ژیانی ڕۆژانەی خەلکەوە هەیەو، وتاری زانستی و ئەدەبیش پێویستی یان بە چارەسەرکردنێکی لە سەرخۆ هەیە .

هەندێ لە ڕۆژنامە نووسان دەلێن : وتار گەلێك جۆری هەیە ، لەوانە وتاری ئەدەبی و وتاری سیاسی و وتاری لێکۆلینەوە ڕۆژنامەنووسی کە پێی دەگوترێ (ڕیپورتاج)و سەروتارو ستوونی ڕۆژنامەیی .[17]

ئێمە لێرەدا ئەوەی لەسەری دەوەستین و دەمانەوی لێکۆلینەوەی خۆمانی لەسەر دابمەزرێنین، مەسەلەی وتارە بە گشتی و بە هەموو جۆرەکانی یەوە، کە لە دوا دوای سەدەی ڕابوردووو، سەرەتای ئەم سەدەیەمان دا . هاتۆتە ناو ئەدەب و ڕۆژنامە نووسی کوردی یەوەو؛ پێی خۆی بە چاکی چەسپاندووەو لە سەر دەستی هەندێك ڕۆژنامە نووسی پێشەنگ و نووسەری داهێنەری وتاری کوردی یەوە گەشەی کردووەو پێشکەوتووە .

مەرج و تایبەتمەندیی یەکانی وتار:-

---

هەر چەند دانانی هەل و مەرج بۆ وتار نووسین کارێکی گرانە ، چونکە هەر نووسەرە لە نووسین دا شێوەی نووسینی خۆی هەیە ، بەلام لەگەل ئەوەش دا پسپۆرانی ئەو هونەرە هەندێ تایبەتمەندیی یان بۆ داناوە وەکو ئەمانەی خوارەوە :-

١ - وتار بەشێوەیەکی گشتی تەنیا یەك بابەت دەگرێتە خۆ و یەکێتی بابەتی تێدا ڕەچاو دەکرێت .

٢ - نابێ زۆر درێژ بێ و دەبێ نووسەر ووشەو ڕستەکانی و بیرو بۆچوونەکانی هەموی لە پێناوی دەربرینی بیرۆکەی بنەڕەتی ووتارەکەی بەکاربێنی .

٣ - پێویستە لەکاتی خوێندنەوەی وتار، خوێنەر هەست بەکەسێتی نووسەر بکات و وابزانێ لە هەموو دەربرین و برگەیەکی دا نووسەر لەلای دانیشتووە و بۆی دەدوێ .[18]

٤ - وتاری چاك پێشەکی درێژ ی نابێت.

٥ - پێویستە بەر لە نووسینی وتار نەخشەو بەرنامەیێکی دیاری کراوی هەبێ ، تاکو وتارەکە نەبێتە تەنها قسەی ڕووت و وشە ڕیز کردن .[19]

٦ - ناونیشانی وتار دەورێکی گرنگی هەیەوو با باشە ناوەرۆکی بابەتی وتارەکە بنوێنێ و بەچاکی سەرنجی خوێنەر یا گوێگر ڕابکێشێ .

٧ - لە وتاری ئەدەبی دا پێویستە نووسەر گرنگی بە ڕەگەزی سۆزو ئەندیشەو وێنەو مۆسیقای وشەو دەربڕینەکانی بدات و خوێنەر هەستیان پێ بکات .[20]

پوختەی مەبەستمان، لە نووسین و هێنانەوەی ئەم مەرج و تایبەتمەندی یانەی وتار ئەوەیە ، کاتێك نووسەر وتارێك دەنووسێ ، دەبێ بزانێ کە پارچە پەخشانێکی جوان و لووس و بێ گرێ دەنووسێ ، دەبێ بزانێ کە هونەری وتار نووسینیش وەکو هونەری

شیعـر وایـە، هەست و سۆز و ئەندیشەی وردی پێ دەوێ بە تایبەتی لە وتاری ئەدەبی دا.

کاتێـك وتـار نووسـە کوردەکـان ئەم هونەرەیان دەست داوەتێ، هەمـوو مەرج و تایبـەتمـەنـدێکی وتـاری سەرکـەوتوویان بۆ بەکار نەهێنـاوە، بەڵام لەدوایی دا لەگـەڵ پێشکـەوتنی ڕۆژنـامـە نووسی ی کـوردی ئەم هونـەرەشیـان پێشکـەوتووە و توانیویانە هەموو تایبـەتمـەنـدیی یـەکی وتـاری سەر کەوتـووی تێدا بهێننەدی و، وتار نووسە پێشەنگەکانی کورد دەورێکی دیارو کاریگەریان تێدا بینیوە.

## کەی وتار لە ئەدەب و ڕۆژنامە نووسی کوردیدا سەری هەڵداوە؟

وتـار لە ئەدەبـی کوردیدا هونـەرێـکی نوێیـەو، لەگـەڵ سەرهـەڵـدانی ڕۆژنامە نووسی ی کوردیدا لە دایك بووە، دەتوانین [٢٢ی نیسـانی ١٨٩٨] کە ڕۆژ ی دەرچـوونی یەکـەم ژمارەی ڕۆژ نامـەی (کـوردستـان)ە لە قاهیـرە، بە ڕۆژ ی لە دایك بوونی وتار لە ئەدەبی کوردیدا دابـنـێـین چونکـە لەوەو بەر کورد ئەو هونـەرەی نەبـووە، بەڵکـو هونـەری نامـە نووسین و دووان (خـوتبـە)ی بووە. ئەوانەش ناتوانن جێی وتار بگرنەوەو دەوری ئەوبیبنن چونکە نامەو خوتبـە بۆ چەنـد کەسێکی دیـاری کراو دەنـووسـرێن و دەخوێنرێنەوە کەچی وتـار لە ڕۆژنـامەو گۆڤاردا بلاو دەکرێتەوەو جەماوەرێکی زۆر و زەوەند دەیخوێننەوە.

هەنـدێ نووسـەری کورد، دەوری ڕۆژنـامـە نووسی لە گەشـە کردنی پەخشـانی کوردی‌و پێشکـەوتنی‌دا دەردەبـڕن و، هەمـوو چەشنـەکـانی ئەدەبی پەخشـانی وەکـو[چیـرۆك، شانۆنامە، وتار، دووان. . .] دەبـەنـەوە سەر هەڵاتنی گزنگی خۆری ڕۆژنـامـەی کوردی‌و دەڵێن: «سـەردەمی ڕۆژنـامـە، سەردەمی پەخشـانـە»[٢١] ئەمەش ڕاو بۆچوونێکی ڕاست و تەواوە، چونکە تاکو سەر هەڵدانی ڕۆژنامەی کوردی، هەر شیعر پتر لە مەیدانی ئەدەبی نەتەوەییمان دا خۆی دەنواندو پەخشان هونەرێکی دەگمەن بوو.

خوا لێ خۆش بوو عەلائەدین سەجادی لە کتێبەکەی [دەقەکانی ئەدەبی کوردی]دا، زاراوەی [پـەخشـانی ڕۆژ نامـە]ی لە جیـاتی (وتـار) بە کارهێنـاوە[٢٢] کەچی پەخشـانی ڕۆژنـامە گەلێ هونەری پەخشـانی وەکـو[وتـارو ریپـۆرتاج، وتوویژ «المحاورة»، چیرۆك، بیری ڕاگوزاری «الخاطرة»، هەواڵ (الخبر) دەگرێتەوە.

ئێمـە لەنـاو ئەو هەمـوو هونەرەی پەخشانی ڕۆژنامە، تەنیا (وتار) مان هەڵبـژاردووەو، دەمـانـەوێ لێ ی بکـۆڵینەوەو شوێنی دیاری لە ئەدەب و ڕۆژنـامـە نووسـی ی کوردی بەگـشـتی و لە لای حوزنی موکریانی بە تایبەتی دەربرین.

## حوزنی موکریانی و هونەری وتار نووسین:-

---

ئێمە لە کاتێك دا کە سەرنج دەدەینە وتارەکانی حوزنی موکریانی بەتـایبـەتـی لە گۆڤـاری زاری کرمـانجی [١٩٢٦ــ ١٩٣٢]و، ئاورێکیش لە وتـارەکـانی ڕۆژنـامـەو گۆڤارە کوردییەکانی پێش ئەو دەدەینەوەو، لە هەل مەرجەکانی وتاری سەرکەوتووش ورد دەبینەوە، هەست دەکـەین حوزنی دەورێکی باشی لە پێشخستنی هونـەری وتاری کوردی بووە. چونکە کەم وا هەیە هەل ومەرجی وتاری چاك لە ناو ڕۆژنـامـەو گۆڤـارەکانی سەرەتای سـەردەمی ڕۆژنامە نووسی ی کوردی بەدی بکرێ.

لەکـاتێـك دا کە سەرنـج دەدەینـە سەر وتـاری ژمـارە (١)ی ڕۆژنـامـەی کوردستـان کە لە [٢٢ی نیسـانی ١٨٩٨]دا دەرچووەو سەرەتـاکـەی بەم جۆرە دەست پێ دەکـات و دەڵێ: «صـەد هەزار شوکـرو حەمـدو ثەنـا ژ خودێ تەعـالارە ئەم مسلمـان خەلق کرن و ظانینـا علم و مەعـریفـە تێـرە هوش و زکـا دامـە. . .»[٢٣] هەست دەکـەین وتـارێکی تابڵێ‌ی کزو لاوازو پتـر بە دووان (خـوتبـە)ی مەلایـان دەچێ‌وگـەلێ مەرجی وتـاری لێ‌نـایەتە دی، بەڵام لێ ی ناگیـرێ چونکـە یەکـەمین تاقی کـردنـەوە یە لە مێـژ ووی ڕۆژنـامـە نووسی ی کوردیدا.

دوای ئەمە کاتێك چاو بە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی [ڕۆژ ی کورد ـ ئەستـەمبـول ١٩١٣] و[تێگـەیشتنی ڕاستی ـ بەغـدا ١٩١٨] و [بانگی کوردستان ـ سلیمانی ١٩٢٢] وگۆڤاری [دیاری کوردستان ـ بەغـدا ١٩٢٥]دا دەخشێنین، کە هەمـوویـان لە پێش گۆڤـاری (زاری کرمـانجی) دەرچـوون، هەست دەکـەین وتـارەکـانیـان هەرچـەنـدە پێشکـەوتنیـان بە خۆیـانـەوە دیـوە، بەڵام هێشتـا پێ نەگـەیشتـوون و هەنـدێ هەل و مەرجی وتـاری ڕۆژنـامـەیان هەر پێـویستـە. بەڵام هیـچ کامێکیـان لەوانـە وەکو(زاری کرمانجی)ی حوزنی پێشکـەوتنی بەخـۆیـەوە نەدیـوەو، ئاشکرایشە کە نووسەری زۆربەی هەرە زۆری وتارەکانی هەر (حوزنی) خۆی بووە.

ئەگەر لاپەڕەی ژمارەکانی زاری کرمانجی هەڵبدەینەوە، چاومان بە گەلێـك وتـاری سیاسی وکۆمەڵایەتی و ئەدەبی وزانستی ی حوزنی دەکـەوێ‌و، هەست دەکەین چەندە لە وتاری سیاسی سەرکەوتووە، ئەوەنـدەش لە وتـاری زانستی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری گشتی‌دا بە دەستەڵات و خامە ڕەنگین بووە.

لە وانەیە هەندێ کەس، زۆر بەکار هێنانی وشەی بیانی لە وتاری

حوڕی دا بەدی بکات و، ڕەخنەی لێ بگرێ، بەڵام ئەگەر سەرنج ـ تە وتاری ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە، دەبینێ هێشتا حوزنی لە هەموو نووسەری ئەو وتارانە زمانی نووسینی پاك و پوختترەو وشەکانی سوکترن لە سەر زاران و مانایان ئاشکراتر و ڕوونترەو، ڕاوەی بێگانەیان کەمتر تێدا بەدی دەکرێ.

دیاردەی تێکەڵاوبوونی وشەی بێگانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەش دا، وەنەبێ هەر بەتەنیا زمانی کوردی گرتبێتەوەو بەس، بەڵکو زمانەکانی دیکەشی گرتبووەو تەنانەت زمانی عەرەبیشی گرتبووەوە.[٢٤]

لەم بارەوە زانای عەرەبی زان (ئەنستاس ماری کەرمەلی) (١٨٦٦ ـ ١٩٤٧) لە ساڵی ١٩١١دا لە گۆڤاریکی عەرەبی کە لە میسر بەناوی (الزهور) دەردەچوو نووسیویەو دەڵێ درزمانی ڕۆژنامەکانمان، زمانێکە کاڵ وکرچ، ڕۆژنامەیەکیان نی یە بە زمانی عەرەبی پەتی و بەبێ هەڵە بنووسێ، ئەگەر بتەوێ بزانی ئەو ڕۆژنامانە بە چ زمانێك دەنووسن؟ لەخۆت دەپرسی و دەڵێی: لە وانەیە خاوەنی ئەم وتارانە بەتورکی، یان کوردی، یان هیندی، یان فارسی، یاخود بە عەرەبی عامی بدوێ و، لە ڕاستیش دا بەو هەموو زمانانەی نووسیوە»[٢٥]

لێرەدا ئەو ڕاستی یەمان بۆ دەردەکەوێ، کە زمانی وتارنووسین تا ئەو سەردەمەیش و دوواتریش لە (ڕۆژنامەی عەرەبی)یش دا کزو لاواز بووە، دیارە ئەوانەی وتاریان نووسیوە یان عەرەبێکی زمان نەزان بوون، یاخود کورد یان تورك . . . بوون و بە زمانی خۆیان بیریان کردۆتەوەو لە دوایی دا بەعەرەبییان نووسیوە. بۆیە عەرەبی یەکی ڕەوان دەرنەچووە. ئەمە لەبارەی زمانی ڕۆژنامە نووسی عەرەبی لەو سەردەمەدا، کەچی (حوزنی موکریانی) دوای ماوەیەکی دوای ماوەیەکی کەم لە بڵاوکردنەوەی نووسینەکەی کەرمەلی و لە بیستەکان دا، هەست دەکەین وتارەکانی بە زمانێکی کوردی ڕەوان نووسیوەو بە خزمەت کردنە کەمەی زمانی کوردی، کە لەگەڵ هەڵاتنی پرشنگی ڕۆژنامەی کوردستانەوە دەستی پێ کردووە، هونەری وتارنووسینی کوردی گەیاندۆتە پلەی گەیین و پێشکەوتنێکی هەست پێ کراو، بەڵگەشمان وتارە سەرکەوتووەکانی گۆڤاری (زاری کرمانجی)یەتی.

**لەگەڵ چەند نموونەیەکی وتاری حوزنی لە زاری کرمانجی دا :ـ**

حوزنی ڕۆژنامە نووسی کورد لە ڕەواندز و پیرەمێرد لە سلێمانی لە بیست و سی یەکان دا تووشی هەمان دەردی بێ وتاری و بێ کەرەستەیی بووبوون تاکو بە شێوەیەکی جوان و هونەریی، گۆڤاری «زاری کرمانجی» و ڕۆژنامەی «ژیان» دەربچوێنن، هەردووکیان خاوەنی زۆربەی وتارو نووسینەکانی ناو گۆڤارو ڕۆژنامەکانیان بوو، لەبارەی حوزنی یەوە کەس وەك (هاملیتن)ی ئەندازیارو نووسەری کتێبی [ڕێگایەك بە کوردستان دا] باسی زاری کرمانجی و خاوەنەکەی ناکات و بەم چەند دێڕەی هاملتن نیگاری پڕ مانای هەموو ژیانی ڕۆژنامە نووسی ی کوردی کێشاوە و دەڵێ :ـ «موکریانی خۆی بەتەنها وتارەکانی گۆڤارەکەی دەنووسی، خۆی بەتەنها وێنەکانی دەکێشان، خۆی بەتەنها لەچاپی دەدان و ئنجا دەشی پێچانەوە، ئەمە بۆ خۆی نموونەیەکی بێ هاوتایە لەسەر ڕووی هەمووزەمین».[٢٦] ئەمەش ئەوە دەگەیێنی کە ئەو دەمە کادیری ڕۆژنامەنووس دەگمەن بووە. بۆیە حوزنی زۆربەی وتارەکانی بە پێنووسی خۆی بوون وجگە لە ناوی خۆی و نازناوی حوزنی، وتارەکانی بە ناوی [داماو]و[خەلوك]و[بێژەن][٢٧] دەنووسین و گەلێ جاریش بە ئیمزای [س. ح، واتە سەید حوسین]و[ح. ح، واتە حوسێن حوزنی]و[ح. م، واتە: حوزنی موکریانی]و[م. ح، واتە: موکریانی حوسێن یا حوزنی]و بۆیە ئەو کەسەی خەریکی لێکۆڵینەوەی بەرهەم و ووتارو نووسینەکانی حوزنی بزێ، پێویستە ئاگاداری ئەم نازناو و ڕەمزانەنەی بێ.

ئێمە لێرەدا بۆیە تەنها نموونەی وتارەکانی حوزنی لە گۆڤاری (زاری کرمانجی) وەردەگرین و پەنا نا بەینە بەر نموونەی وتارەکانی تری لە گۆڤاری (ڕوناکی)و (دەنگی گێتی ی تازە) چونکە :ـ

(١). زاری کرمانجی یەکەم گۆڤاری حوزنی بووە لە کوردستانی عێراقی دەرچووانەوەو، ئەگەر هەر پێشکەوتن و سەرکەوتنێکی هونەری وتاری تێدا بەدی بکەین ئەوا هەنگاوێکی گەورەیە لە بواری گەشەکردنی ڕۆژنامەنووسی ی کوردی، چونکە لە سەردەمێك دا دەرچووە کە تازە پەخشانی کوردی کەوتبووە تەکانی چوونە پێشەوەی.

(٢). گۆڤاری هەڵوێستی ڕاست بوو، «بە هەموو توانایێکی یەوە پارێزگاری لە هەموو کارو کردەوەیەکی خێرخوای میللەتی کوردی تێدا بوویێ کردووە و، لە دژی هەموو ئەو هێزە زۆردار و خراپەکارانە تێکۆشاوە کە خەریکی زەلیل کردنی جەماوەری کورد بوون»[٢٨]

(٣). دوای زاری کرمانجی، ڕۆژنامەنووسی ی کوردی پێشکەوتنێکی هەست پێ کراوی بەخۆیەوە بینی، لە ساڵی ١٩٣٢دا گۆڤاری هاوار لە شام دەرچوو و لە ساڵ ١٩٣٥دا گۆڤاری ڕوناکی لە هەولێر دەرچوو ڕۆژنامەی (ژیان) پێشکەوت لەساڵی ١٩٣٩دا بوو بە [ژین]و لە هەمان ساڵیش دا گۆڤاری گەلاوێژ لە

بەغـدا دەرچـوو ئەمـانـە دەورێکی باڵایـان لە پێشخستنی وتـاری کوردیدا هەبـوو، بەڵام گرنـگ ئەوەیـە حوزنی لە بیستـەکـانـەوە دەورێـکـی باڵای لە (زاری کرمـانـجی)دا گێـراوە بۆ پێشخستنی پەخشانی کوردیو هونەری وتار نووسین. ئێمەش لەبەر تیشکی ئەو سەرامـەدیو پێشـەنگی یـەی‌دا، هونـەری وتـار نووسینی کوردی هەڵـدەسـەنگێنین و چەنـد نمـوونـەیـەکی لێ شی‌دەکەینەوە، وەکو ئەمانەی خوارەوە:-

(ا). [رەدیـە بۆ وەکیلێکی میللەت] ناونیشـانی وتـارێکی سیـاسی حوزنی‌یـە لە ژمـارە (٩)ی ساڵی (١) گۆڤـاری زاری کرمانجی‌دا بە ئیمـزای (م.ح) واتـە:- موکـریـانی حوسێن یان موکـریانی حوزنی بڵاوکـردۆتـەوە، هەمو مەرج و تایبەتمەندیێکی وتاری سەرکەوتووی لێ دێتــەدیو، بە زمـانێکی لووس ولێـك ودەربـرینێکی ڕاست و ڕەوان، بابـەتی «نـوێنـەری میللەت و مەرجەکانیو کارو ئەرکەکانی سەر شانی بۆ ڕۆڵـەکـانی گەلـەکـەی ڕوون دەکـاتەوەو، بەم شێوەیە وتـارەکـەی دەست پێ دەکات و سەر ناوێکی پڕ بە پێستی ناوەرۆکی بابەتەکەی بۆ دادەنێو دەڵێ: [رەدیە بۆ وەکیلێکی.... میللەت][٢٩]

«وەکیلێکی کە موقـەددەراتی ئوممەتێکی لە دەست دابێ، دەبێ ڕاست وبێ غەش وڕیـاو، تێگـەیشتـووبێت، لە هەمــوو دەردو ئێشێکی میللەت ئاگـادار بێت، ژیـان و عادات و تەبیعــەتی ئەو میللەتــە بزانیـت، تاکــو بۆی بکـۆشێ، چتێکی کە میللەت پێی ناخۆش بێت وزەرەری وەتەن بێت نەیکا، ئەو وەکیلە دەبێ خاوەندی ویـجـدانـێـکـی پاك، شـەرەفـێـکـی ئازاد تەبیعـەتێکی خاوێن و سەربەست بێ.

میللەتی مەزلووم بۆیە وەکیل ئینتیخاب دەکا، تاکو بۆ موحافەزەی حقــووقی میللەت و بۆ مەنـافیــع، سەربڵـنـدیی و ئازادیی وەتـەن بکـۆشێ و موقـەددەراتی ئوممـەت ڕابگـرێت و، نەشریات، ترەقی مەکتــەب، تەحصیــل، تیجـارەت، زراعــەت، هوگــری و[٣٠] ئیقتیصادی میللەت بخوازێت»[٣١].

کە بە وردی لەم سەرەتایەی وتارەکە دەکۆڵینەوە، دەبینین نوسـەر زۆر جگـەر سۆزانـەو بە گیـانێکی هاوچـەرخـانـە بە ڕەگ و ڕیشەی بابەتەکەی‌دا چۆتە خوارەوە. هێرش دەباتە سەر ئەو جۆرە نوێنەرانەی میللەت کە بە دڵسـۆزی بۆی تێ نـاکۆشن، ڕۆژی خۆی میللەت بۆ ئەوەی هەڵبـژاردوون تاکـو پارێـزگـاری لە مانی بکەن و لەدوای ئەم سەرەتایە پتەو و ڕوون و ڕوانە دەڵێ:-

«هێندێك لەو وەکیلانەی میللەتی مەزلوومی کوردان، بە دراوی فەقیـر و هەژارانێکی کە لە جەرگی ماڵ ڕمنـداڵیـان دەردەکـەوێت و دەیـانـدرێتی تاکـو بچنـە پایتـەختـان و حقـووقی میللەت موحافەزە بکـەن، لەبـری موداڧعەی حقووق لەبەر نەزانین و تێ نەگەیشتن، بەچایخانە، کەیف هەوەس، تەن پەروەریو بەهێندێك چتی زەردو سوور ئیغفــال دەبن، لەسـەر کورسی هەواو دۆشـەگی هەیـولا[٣٢] دادەنیشن، بە قسـەی خەیـاڵی فریـوودەخـۆن، عادات، ژیـان، ئەخـلاق، ڕەگـەزو دەمـارو تیـرەی میللەتی خۆیان لە بیردەچێتەوە.

ئەوەشیـان لەبیـرچـوتـەوە کە بۆ ئینتخـاب کردنیـان لەبـەر ئەم وئەو دەپـارانـەوە، ئێستـاش بەفرار و سێبەری فینك و تیاترۆ و عەتر لەسەر کورسـی دانـیشتن ئیشغــاڵی دەکــات و، وا دەزانێ کە حقــووقی میللەتێکی وا گەورە بخاتە ژێر پێیانەوە میللەت لە خیانەتی ناگاو ئافـەرینی لێ دەکـەن... پیـاوی وا لە نێو هەموو میللەت پەروەرو، وەتەن خواهان دا نوختەیێکی ڕەش لەسەر تەئریخی خۆی دادەنێت».

ئەم وتـارە سیـاسی یەی حوزنی دوولاپەڕەی گەورەی گۆڤارەکەی گرتــۆتــەوەو هەر دێـرەی لە دێـرێکی تری گەرمتـر و پڕ جۆشتـرە، پارچــەیــەکـی لە میـللەت پەروەریـی و بەنـاوی ڕەخنــەگــرتن و ڕەت کردنــەوەی کردارو گوفتـاری نوێنـەرێکی کوردەوە، ڕەخنـە لە هەمــوو ئەو نوێنــەرانــەی کورد دەگــرێت کە چۆن لە سەردەمی پاشـایـەتیو وەزارەتی [جـەعفەر عەسکەری]دا، بۆ هەڵبژاردنیان بە نوێنـەری میللەت لە پەرلـەمـان ڕوویان لە هەموو کەسێك دەنا تاکو دەنگیــان پێ بـدەن کە بووشن بە نوێنـەر هەمـوو بەڵێن ووادەیـەکی دابــوویــان بە میللەت لەبیــر خۆیــان بردەوە وبەرانبــەر بە مافی گەلەکەیان بێ دەنگ بوون.

کاتێـك هەمـوو وتـارەکـە دەخـوێنینـەوە وئاورکێش لە سەردەمی نووسینـەکـەی دەدەینـەوە کە (سـاڵی ١٩٢٧)ە، دەبینین وتـارێکی سیـاسی سـەرکـەوتـووە، نووسەر مەرجەکانی هونەری وتار نووسینی تێـدا بەکـارهێنـاوە. زۆر بە گەشی مانـای پتـەوو وشـەی جوانی لە دارشتنـەکەی‌دا بەکارهێناوەو، هەست و سۆزی نیشتمان پەروەریو نەتەوە پەرستیمان لەلا دەجۆشێنێ.

لەوانــەیــە هەنــدێ بڵێن ڕاستــە ئەم وتـارەی حوزنی لە بارەی ناوەرۆکەوە سەرکـەوتـووە، بەڵام لەبـارەی ڕوخسـاروشەوە جارێ ماویـەتی پێ بگـات چونکـە هێشتا وشەی بێگانەی زۆر تیا ماوە. لە وەڵام دا دەڵێم: لە سـەردەمی بڵاوکــردنــەوەی ئەم وتـارەدا، هیـچ کەسێـك هەرچـەنـدە زمان زان وخامە بەهێز بوایە، لەم نموونەیەی حوزنی تێ نـەدەپـەڕانـدو بە ناچـاری هەر وشـەی بیـانی ئاوێتـەی

ـەرەکەی‌و وشەی کوردی پەتی دەکرد.

بۆنمـوونـە با سەرنجێـك بدەینە چەند دێڕە نووسینێکی شاعیری گەورەو نوێ‌خـوازی کورد، شێـخ نووری شێـخ ساڵـح [١٨٩٦ - ١٩٥٦.٨] کە لەگەڵ هۆنراوەیەکی‌دا ناردوویە بۆزاری کرمانجی و لە سەرەتـاکەی‌دا دەڵێ :- «جەریدەی موحتەرەمەی زاری کرمانجی کە نە رەوانـدز ئینتیشـار ئەکـات، وەکـو رۆژێکی ضیـابـەخش فیوضی عیلم و عیـرفـانی بە ساحـەی کوردستـان دا بڵاوکردۆتەوە ڕووناکی ئیـستیقبالی [أظهر من شمس]ی نیشان بە ئەولادانی کورد داوە». .(٣٣) سەرەتای شیعرەکەیشی بەم دێڕە دەست پێ دەکات و دەڵێ :

صەبا ئەم دیاری‌یەم بۆخاکی پایی زاری کرمانجە،

لە نووری نا، لە مووری، توحفە بۆخزمەت سولەیمانە!!

ئەگـەر بەراوردی‌یـەك لەنێـوانی نووسین حوزنی‌و نووسینی شێخ نووری‌دا بکـەین بەتـایبـەتی لەبـارەی وشـەو دارشتنەوە، بێ‌گومان نووسینـەکـانی حوزنیمـان پاك و پوختتـر دێتـە بەرچـاو و بەنموونەی جوان و سـەرکەوتووی وتاری کوردیی وەردەگرین.

(٢). حوزنی وتـارێکی لە وەڵامی [نـامـەیـەکی کراوە بۆجەریدەی ژیـان] نووسیوە، نامەکەش بە ئیمزای (ب. مشیری بەرگدرو)ەو لە ژمـارە (٥)ی سـاڵی (٢)ی زاری کـرمـانجی‌دا بڵاوکراوەتەوەو(٣٤) لەسـەر هەڵـوێستێکی تایبـەتی ڕۆژنـامـەکـە هێـرشی دەبـاتە سـەرو حوزنیش بەم جۆرە و بەنـاوی زاری کرمـانجیێ ڕەتی دەکـاتـەوە و پارێزگاری لە (ژیان) دەکات و دەڵێ :-

«ئـەمـڕۆکـە لە کوردستـانی جنوبی‌دا، لە هەموو کوردستانی دنیـادا، دوو ڕۆژنـامـە بەکـوردی دەردەچن، ئەو دووانەش وا بەخێو ناکرین کە بژین و یان نەکەونە ژێردەستی ئەم و ئەوەوە.

ڕۆژنـامـە بە پشتیـوانی میللەت وگەورە پیاوانی وەتەنەوە دەژی‌و سەربـەستی‌و ئازادی پەیـدا دەکـا، بە یاریـدەدان گەورە دەبێ‌و بە دەست گرتن سەردەکـەوێ. میللەتی ئێمە ئەمـڕۆ بۆخۆی ڕووی لە مردنە نەك لە ژیان!! بۆخۆی تەمای کەوتنی هەیە نەك سەرکەوتن و بڵنـدیی!! بە ناشکـوری نەبێ میللەت دوچـاری نەخۆشی‌و دەردی یەکتر برینەوە بووە و ئاگای نە لە خۆی ماوەو نە لە مەعاریف و مەطبوعات!!

میللەتی ئێمە کە چوار دەستەیە، هەر یەکەی گرفتاری دەردێکە. (١). دەستـەی مەئمـووران لەبـەر مەعاش (٢). دەستـەی توجاران لەبەر حیسـاب و لێکدانەوە (٣). دەستەی خاوەند موڵك لەبەر یەکتر برینـەوە. . . (٤). دەستـەی فەقیـرانـە کە ڕوحی میللیـەتی هەیێ(٣٥)

ئەویش گرفتاری چوار دەردانە، بە مردن نەبێ رزگار نابێ».

نووسـەر لە وتـارە کۆمـەڵایەتی‌یەکەی‌دا باسی دەستەو چینەکانی میللەت دەکـات و دڵسـۆزیی بۆمیللەت و نیشتمـان وەپاڵ دەستەی هەژاران دەدات کە ئەو دەستـەیـەش گرفتـاری دەردی هەژاری‌و دواکـەوتن و چەوسـانـەوە بوون بۆیە بەچاکی ناپرژێنە سەر خزمەتی ڕۆشنبیـریی میللەت و لەسـەر وتـارەکـەی دەڕوات و دەڵێ :- «جـا میللەتێـك ئەمـە حاڵی ژیـانی بێ، چ ژیـانێکی پێ‌دەڵێن؟ چی لە دەست دێ بیکات؟ چۆن دەتوانێ بۆخزمەت کردنی مەطبووعات و مەعاریف بکۆشێ؟

ڕۆژنامەی (ژیان) چی کردووە کا گوناهـ بارە؟ ڕۆژنامەی (زاری کرمانجی)ی بەد بەخت بۆچ دەبێ سەرزەنشت بکرێ، کە نەتوانێ لە ساڵی‌دا ژمارەیەك بڵاوبکاتەوە؟ ئەگەر گوناهێکی هەش بێت هەر هی گەورەو کاربەدەستانە.

ئەگـەر ڕەگـەزی کوردیش وەکـو میللەتـەکـانی دیکە میللەتێکی بەختـەوەر بوایـە. گەورەکـان ئەو پارەیـەی کە لێـرەو لەوێ بڵاوی دەکـەنەوە، لە مەطبوعات و مەعاریفیان خەرج دەکردو، لە هەموو شارەکـانی کوردستـان دا جەریـدەو مەجـەللەو هەموو کتێبی ڕەنگاو ڕەنگیـان پێ دەینـا وجـود، ئەودەمی دڵخـوازی کوربـد پەرستەکان نەشریات دەکرا».

حوزنی لەم وتـارە کۆمـەڵایـەتی‌و ڕۆشنبیـریی‌یـەی‌دا، لەبـاری ناهـەمـواری گۆڤـار و ڕۆژنـامـەو کتێبی کوردی‌یەوە دەدوێ‌و، زۆر بە وریـایی بنچینـەی پرۆژەی چاپ و بڵاوکـردنـەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبی کوردی دامـەزرێنێ‌و، سەرختی ئەو پرۆژەیـەش دەخـاتـە ئەستـۆی پارەدارەکـانی میللەت. دیـارە مەبـەستی لەم وتارەشی‌دا ڕەددانـەوەی وەستـا بەشیـر موشیـرەو دەرخستنی ئەو بارە ناهەموارەی گۆڤـاری (زاری کرمـانجی)و ڕۆژنـامـەی (ژیـان) بووە، کە ئەرکی دەرچـوانـدیـان لەبەر بێ دەرامەتی و یارمەتی نەدانی دەوڵەمەندەکان زۆرگران و لەوزە بەدەربووە.

ئەگـەر بەوردی سەرنـج بدەینـە ئەم وتـارەی حوزنـی، وەك نووسینێکی جوان و ڕەوان و شەرکـەوتـوومـان دێتـە بەرچاوو، بۆمان دەردەکـەوێ کە نووسـەر ڕۆژنـامـە نووسێکی زرنـگە و هوشیـار و لێ هـاتـوو بووەو، زانیـویـە ٦٠ سـاڵ لەمـەوبـەر چ بنـووسێ‌و بۆکێ بنووسێ‌و چۆن بنووسێ؟!

(٣). حوزنی وەك لە وتـاری سیـاسی‌و کۆمەڵایەتی‌دا سەرکەوتووە، لە وردتای مێژوویی‌و گێڕانەوەی شکۆی ڕابوردووی کوردیش گەلێك دەست ڕۆیشتـوو بووە. بە زنجیرە، لە ژمارەکانی زاری کرمانجی‌دا

وتـاری مێـژ ووی بڵاوده‌کـردەوە و، یەکێـك لەووتـارانـەی بە ناوی [شـاری رەوانـدزی ئەمـرۆ و رەوانـدزی دوێنێ و رەوانـدزی سبەی] نووسیوە و لە ژمارە (٢)ی ساڵی (١)ی گۆڤارەکەیدا بڵاوی کردۆتەوەو ئەمــە بەشێکیــەتی ـ «رەوانــدنــزی پایتــەختی جوکمــدارانی بە شەوکەت و گەورەی سۆران و، پشتیوانی لێقەوماوانی میللەت خوا ووەتــەن پەروەران بوو، ئەستێــرەی بەختی لەگــەڵ مانگە و رۆژدا بەرابــەری دەکـرد، بەدەستــە ئومــەرا وحاکمــان دەهــاتنــە زیــارەتی خانووی ئاماڵی کوردستان و قیبلەگاهی خاص و عام. . .

دوکـان، بازار، قەیســەری‌و، تیمچــەو کاروانەرایانی بەئەنواعی بضــائع بوو، دەوری شاری بە دیواری مەحکەم وکۆنگرەوبورج و باروو راگیـرا بوو. . . حدوودی جزیـرەی ئامیـد، زاخـۆ، ژەنگـار، هەولێـر، زەردەشت، سابـلاغ، شنـۆ، گەوەری نەهری، حەکاری بوو. . . پایتەختی بە بەدەروازە و قەلا بەندکرابوو[٣٦]

بەم شێوەیە حوزنی لە وتارە مێژ وویی‌یەکەیدا رابوردووی گەشی شاری رەوانـدزمـان بۆ دەردەبـرێ و وەسفی ناوشـارو شوورەکەی بە جوانی دەکـات و باسی شکـۆو دەوری مێـژ وویمان بودەگێرێتەوە. لەوانـەیـە هەنـدێ لەووشـەوزاراوانـەی کە بەکـاری هێنـاون لەلای خوێنــەری بەڕێـز ئاشکـراو زانـراو نەبن وەکـو ئەمـانـەی خوارەوە: [تیمچــە: کە بەکـاروانســەرا دەگـوتـراو، کۆنگـرە بەشـوێنی بەرز دەگوتری کە چاودێری خەڵکی لێوە بکرێت و، باروو بە بۆرجەکانی قەلا دەگـوتـران و، جزیـرەی ئامیـد: جزیرەی بۆتانە، چونکە ئامەد ناوی کۆنی شاری دیاربەکرەو، مەبەستی لە (زەردەشت)یش شاری سەردەشــتـی ئەمــرۆیــە]. دوای ئەمــە نووســەر لە سەروتــارە مێژ وویی‌یەکەی دەروات و دەڵێ:ـ

«تا دەوری ئیقبالی ئەمیری مەنسووری عادیل میر محەممەد پاشا بوو، ئەوەنــدەی تر مەمـلەکــەت پێش کەوت، پاشــا لە گەلێـك دێهــات دا ئاش وپردو رێگــاو بانی لەســەر ئوســوولێکی فەننی دروست کرد. لە زۆر جێگـایـانی دوور بۆکێوی بڵندی بە هەندەسە جوگــەی ئاوی کێشـا، ئاودێـری زەوی‌و دەغـڵ ودانی کرد. لە زۆر لایـانی قایمی وەکــو دێـرە حەریـر، ئاکـۆ، سەران، باڵـەکـان، ئەقڵاوەو، غەیری وان قەلای بۆ بەرابەری دوژمن بینات نا. . . . .»

وەك بۆمان دەرکەوت حوزنی ئەم وتارە مێژ وویی‌و وتارەکانی تری بەجوانی‌و بێ گرێ نووسیون و یەکێتی بابەتی رەچاوکردووە وبەپێی بەرنــامــەیێکی رێکـوپێـك لە رابـوردوو و ئەمـرۆ و دوارۆ ژی شاری رەواندزەوە دەدوێ‌و شان وشکۆی محەممەد پاشامان بۆ دەگێرێتەوە.

(٤). حوزنی لە وتــاری زانسـتیش دا گۆی هونـەری وتـار نووسینی بردۆتـەوە، بۆ نمـوونـە با ئەم وتـارەی بخـەینـەروو تاکو بزانین چۆن سەرکەوتنی وەدەست هێناوە؟ بابەتەکەی بە ناونیشانی [بوونی رادیۆم بۆچی نەبێ نادرێ؟][٣٧] . بەوبەم جۆرە دەستی پێ دەکات و دەڵێ:ـ

«وەدەبــێ هەمــوو کەس لە رادیــۆم گەییشـت بێ، بەڵام زۆر ئەهمییــەتی بوونیــان نەزانیــوە، لە عالــەمی علووم وحەکیمی‌دا ئەهمییەتێکی گەورەی هەیە. لە نەخۆشی وجوددا هێندە بە تەئثیرە، لە تیشکێکی دیکـەدا نا تواندرێ ئەو تەئثیراتە بدرێتە کارو، لەرادیۆم زیـاتـر بە مەوداییێکی دیکـەش ئەو خزمـەتە ناکرێ. جا لەبەر ئەوەیە رادیوم لە تیمارخانە گەورەکانی دونیادا بۆتە هەمە کارەی کیمیاو عیلم».

دوای ئەم سەرەتـازانستی‌یە لە بارەی بابەتی رادیۆم کە توخمێکی تیشـك هاوێـژەو نەخـۆشی خراپی وەکـو شێـرپەنجەی پێ چارەسەر دەکرێت و نووسەری لێ هاتوومان لە سەر بابەتەکەی دەڕوات و دەڵێ:ـ

«بـۆ پەیـدا کردنی چەنـد سانتیگرام [رادیۆم] لە سەردەستووری «مــادام کۆری» کە ئەورادیـۆمی دۆزیـیـەوە، چەنـد تۆن، چەنـد قینطــار بەردێ کە رادیـۆمی تێـدایـەو، چەنـد تۆن وقینطـار مادەی کیمیایی‌و، پێنج تۆن ئاوی پێویستە، ئەوبەردانە لە ئاش دەکرێن وو دەهــاردرێن، لەگــەڵ ئاوچەنـد سەعات لە کاربۆناتی سۆدەدا دەبێ بکوڵێن، تاکو (رادیۆم) وەردەگەرێتە سەر خوێی بوون.

ئێمــە لە قووەتی تیشکی رادیـۆمـمــان قســەکـرد کە خراپ نابێ‌و بەتــەئثیرە، ئەویش کراوەتە سێ بەش: هەرچی‌یەکوبەشی یەکەمە، تیـژ رۆیشتنی تیشکی بە سەعـاتێـك ١٠٠,٠٠٠ مەتـرەو، لە وردە زەڕراتێکی زۆر چکۆلە رێك خراوە، ئەویش خودان کەهرەبای وەرگر [ئیجــابی]یــە. بەشی دووەم: تیــرژ رۆیشتنی لە سەعــاتێـك دا ١٧٠٠٠٠ مەتــرە، لە ئەلـیـکـتــرۆن رێکخــراوە، پاتی زەڕراتی کەهــرەبـایی موقنـاتیسی خودان کارەبـای بەردان (سەلبی)یە بەشی سێیـەم لە سەعـاتێك دا ١٨٥٠٠٠ مەترە دەڕوا، ئەوە لەوانی دیکە بڵندترو بە هێزتر و تیشك ئاوێژ و رووناکترەو مادەکەشی پڕە.

دەتــوانــدرێ میلیگـرامێـك لە راگیـۆم بە دوازدە زێـری ساف بکـردرێ‌و، بە هێنـدەی رووی کەوچکیکی چای پڕکـا بە ٢٠٠٠٠ لیرەی زێر بکردرێ».

خوێنــەری بەڕێـز کاتێــك لەم وتـارە زانستی‌یـەی حوزنی ورد دەبینـەوە هەست دەکـەین بە گیـانێکی زانستییانە نووسراوە و هەموو هەل و مەرجێکی تەواوی وتـاری سەرکـەوتووی زانستی لێ دێتەدی‌و

ـەوی یەکێتی بابەت و جوانی وشەو دارشتن و دەربرینی ماناى ـەری کردووەو ناونیشانەکەیشی پڕ بەپێستی ناوەرۆکەکەیەتی و زۆر حەیەر ئێستاش سوودی لێوەردەگرن وزانستی نوێی لێ فێردەبن، ـێت ئەو خوێنەرانە خومم کەڵکێکی چاکم لێوەرگرتووە، بۆیە وا ـرتی خوێندوومەتەوەو، وتارەکە بەئیمزای (س.ح) واتە (سەید حوسین) یا (سەید حوزنی) بلاوکراوەتەوەو، هەرچی ئەمرۆ ـخوێنێتەوە لەوانەیە باوەڕ نەکات ئەم وتارە لەگۆڤارێکی کوردی ـیکەی ٦٠ ساڵ لەمەوبەر لەشارێکی وەکو ڕەواندز بلاوکرابێتەوە، حو ئەگەر وا دابنێین وەرگێردراو بێ لە زمانانی ترەوە دیسان هەر بە ـتەزێکی سەرکەوتووی سوود بەخش دادەنرێت، چونکە وەرگێر زۆر ـجوانی و بەزمانێکی پاراوی ڕەوان دایرشتۆتەوە نەیهێشتووە گیانی ـوەرۆکە زانستی یەکەی بمرێت.

خوێنەری خوشەویست هەر کەسێکی لاپەڕەی ژمارەکانی زاری کرمانجی هەڵبداتەوە، بێ گومان چاوی بە چەپکێکی بەنرخ لە وتاری سەرکەوتووی هەمە جۆرەکەوێ، هەرچی بیگری، لەم نموونانەی پێشکەشمان کردن نزمترنین و هەمووشیان، یان بەرهەمی خامەی ڕەنگینی حوزنی موکریانین، یاخود ئەم پیانە داچوتەوە ورێکی خستوون، بەلام لێرەدا لەبەر درێژ دادرین، بەوەندە نموونەیە، وتاری حوزنی ڕۆژنامەنووسی داهێنەری خامە بەهێزی کورد دەوەستم و هەزار سلاو بوگیانی پاکی دەنێرم لەگەڵ ڕێزم دا بۆ ئێوی ئازیز

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


(١). حسین حوزنی موکریانی - دیرێکی پێشکەوتن - چ٢، هەولێر ١٩٦٢، ل: (١)

(٢). جمال خەزنەدار - رابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی - بەغدا ١٩٧٣. ل: ١٤٧

(٣). عبدالجبار محمد الجباری - مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی - کرکوك ١٩٧٠، ل: ١٧٧

(٤). حوزنی موکریانی - دیرێکی پێشکەوتن، ل(١)

(٥). جمال خەزنەدار - رابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی - بەغدا ١٩٧٣، ل١٧٧

(٦). هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣، ٣٤، ٣٥.

(٧). ممتاز حەیدەری - پاشکۆی ڕۆژنامەی عیراق - ژمارە (٣٢) ساڵی ١٩٧٩ بەغدا ل٥٠

(٨). هەمان سەرچاوە، ل: ٥

(٩). فائق بطي - تطور المقال في الصحافة العراقية - کتاب دراسات في الصحافة العراقية ٩٧٢ - ٢٩

(١٠). عبدالجبار داود البصري - رواد المقالة الأدبية - بغداد ١٩٧٥، ص١١

(١١). فائق بطي - تطور المقال - دراسات في الصحافة الكردية - بغداد ١٩٧٢، ص٢٩

(١٢). عبدالجبار داود البصري - رواد المقالة الأدبية - بغداد ١٩٧٥، ص١١

(١٣). وزارة التربية - النقد الأدبي - المقال - بغداد ط١، ١٩٦٩، ص٧٠

(١٤). عبدالجبار داود البصري - رواد المقالة الأدبية، ص: ١٤

(١٥). وزارة التربية - النقد الأدبي - بغداد ١٩٦٩، ص: ٧١

(١٦). عبدالجبار داود البصري - رواد المقالة الأدبية - ص٢٢

(١٧). فائق بطي - دراسات في الصحافة العراقية - تطور المقال، ص: ٢٩

(١٨). وزارة التربية - البلاغة - ط٢، بغداد ١٩٦٩، ص٨٩

(١٩). لطيف محمد الحكام - أساليب النثر الفني - النجف ١٩٧٤، ص٧٩

(٢٠). وزارة التربية - النقد الأدب - بغداد ١٩٦٩، ط١، ص٧٢

(٢١). کەمال ڕەئووف محەممەد - گۆڤاری توتونۆمی - ژمارە (٢، ٣) ساڵی ١٩٨٦

(٢٢). عەلائەدین سەجادی - دەقەکانی ئەدەبی کوردی - بەغدا ١٩٧٨، ل١٨٢

(٢٣). بروانە - ڕۆژنامەی کوردستان - ژمارە (١) ساڵی (١) ١٨٩٨، ل(١)

(٢٤). حمە صالح فەرهادی - چەند لایەنێکی ڕۆژنامە نووسیی کوردی - بەغدا ١٩٨٨، ل٢٠

(٢٥). گۆڤاری الزهور، قاهیرە ١٩١١، وتارێك بەپێنووسی: الاب أنستانس ماری الكرملي، ص٣١

(٢٦). کەمال مەزهەر ئەحمەد - تێگەیشتنی ڕاستی - بەغدا ١٩٧٨، ل٨٥، ٨٦

(٢٧). حوسین حوزنی موکریانی - دیرێکی پێشکەوتن - هەولێر چ٢، ١٩٦٢، ل(١)

(٢٨). نزار جرجيس علي - صحافة أربيل - بغداد١٩٨٨، ص ١٣٦

(٢٩). زاری کرمانجی - ژمارە (٩) ساڵی (١) ڕەواندز ٢/حوزەیرانی ٩٢٧، ل: ٢٢، ٢٣

(٣٠). حوزنی ووشەی هوگری بۆ إجتماعي، کۆمەڵایەتی بەکارهێناوە.

(٣١). دەقی وتارەکانمان بەشێوە دارشتنەکەی خۆیمان وەرگرتووەو هێناومانەتە سەر ڕێنوسی نوێ.

(٣٢). هەیولا = الهيولى: ووشەیەکی یونانی‌یە بەمانای مادەی سەرەتایی، بەلام لێرەدا بۆ (هەوەس)، یاخود بۆ (خەیاڵ)ی بەکار هێناوە.

(٣٣). زاری کرمانجی - ژمارە (٦) ساڵی (١) ١٥ی جمادی (١) ١٣٤٥، ل: ١٢

(٣٤). هەمان سەرچاوە، ژمارە (٥) ساڵی (٢) ١١/١١/١٩٢٨، ل٢٢

(٣٥). هەمان سەرچاوە و ژمارە، ل: ٢٢

(٣٦). هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢) ساڵی (١) ١٩٢٦، ل٢

(٣٧) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢٣) ساڵی (٥)، ٤/حوزەیرانی ١٩٣٠، ل: ٨

ملخص البحث

# حسين حزني موكرياني ودوره في فن المقالة الكردية

كريم مصطفى شارەزا
اربيل - محلة روناكي

يأتي حسين حزني موكرياني في طليعة المؤرخين الاكراد الذين سطروا تاريخ شعبهم باللغة القومية وكان اهتمامه بالتاريخ لدرجة كبيرة بحيث طغت شهرته كمؤرخ على باقي مجالات إختصاصه واهتماماته الأدبية والثقافية. فاشتغل بالصحافة وأصدر مجلة (زاركرمانجي) (١٩٢٦ - ١٩٣٢) في بلدة راوندوز وأصدر مجلة اخرى في مدينة أربيل باسم (روناكي) (١٩٣٥ - ١٩٣٦) واشتغل محرراً في جريدة ژين ورئيساً للتحرير في مجلة (دەنگی گیتی تازە) (١٩٤٣ - ١٩٤٧) واهتم كذلك بالترجمة الى اللغة الكردية فكان المترجم الوحيد لمجلاته ولم ينس الأدب أيضاً فاهتم بتدوين وجمع التراث الأدبي ونشره والتفت الى الأدب الشعبي فلم يألوا جهداً في تحقيقه وابراز الجوانب المضيئة فيه. وكتب بالاضافة الى ذلك قصصاً استقى مواضيعها من التراث.

وفي مجال اختصاصه في الصحافة كتب مقالات في شتى النواحي السياسية والاجتماعية والأدبية وكان معظمها يرتبط بالحياة اليومية للجماهير وسلك في تحريرها مسلكاً علمياً، فقام بالبحث من خلالها في مواضيع مهمة اجتماعية واقتصادية وتاريخية وأدبية. وبالنظر الى دوره في نشأة وتطور فن المقالة باللغة الكردية فقد أفرد الباحث بحثه هذا في تحليل بعض مقالاته المبكرة والمنشورة في مجلة زاركرمانجي منها السياسية والأدبية والاجتماعية وحدد جوانبها الفنية وتكنيكها وابرز مضامينها الهادفة. ولأجل الاحاطة بالموضوع فقد بدأ الكاتب بحثه بتعريف المقالة وشروطها وخصائصها الفنية وتاريخ ظهورها في الأدب الكردي.

# مەلا محمود ئەمینی موفتی

# ١٨٠٤ - ١٨٩٥

سۆران مەحوی

ووشەیەك :-

هەرچەنـدە واتەی فەلسەفەی پر بە پێستی «رق و خۆشەویستی» بە رواڵەت لە ژیانی مەردومان دا، وا نیشان دەدرێت کە گوایە ئەو وشـانـە دژ و پێچـەوانـەی یەکترین و لەزۆر رووشەوە هەر دانوویان ناکوڵێ و سەروسەختیان نی یە . . بەڵام ئەو وشانە بە واتە گشتی و موتڵەقـەکـەی چ بە روو[ سـەلبی وئیجـابی ]یـەکـەی دا، مانـایەکی قووڵ و وردیـان هەیـەو لە زۆر زیـان و سوود، یان زەرەرو قازانـج گە یـانـدن بەدەرنـیـین جارێ پێشـەکی بەرلـەوەی باسی «خـۆشـەویستی» و رێـز و دڵسـۆزی بکـەین، بە پێـویستی دەزانیین بڵێین :- زۆر جا، کـەوتـوە، ئەو رق کینـەیەی هەبووە، کە گەلێ جار رەنـگـ دانـەوەی لە زۆر بوغـزو غەزەب رشـتـن دا پەرچ دەبێتـەوە . . . سەرئـەنجام ئەو دیاردەیە دەبێتە ماڵئاوا کردنەوەو لە زۆر لایەنیشەوە بە خێروفەرێکی بێ‌شوومار بۆ بەرامبەرەکەی دەگەرێ!!

تەنـانـەت ئەو کەسانەی بە گیانی خۆشەویستی و دڵسۆزیشەوە لە کەسـانێکی تر دەدوێن، ئەوەنـدەی ئەو دیـاردەیـە کەڵـك و سوودو شادی و بەختەوەری ناگەیەنن .

ئەوجـا بێینـەوە سەر باس و خواستی خۆشەویستی و قەدرزانینەکە دەبینین ئەو وشــەیــەش هەر بەو کێش وپێـوانـەیـە، کە بە تەواوی رەنـگ دانـەوەی لە تەبایبوون و هاریکاری کردن و یەکگرتن و زۆر شتی تر لەو بابـەتـانەدا گردەخۆن و بەدەردەکەون . بێ لەوەی خۆیان لەخـۆیـان دا خۆشـەویستی یـە . . . دڵسـۆزی یـە . . . هەروەهاش چەنـدان تر، کلپـەو بڵێسـەی ئەو مەبـەستە خۆش و رۆشنـاتـر دەکـەنـەوە . . . بە هەر حاڵ ئێستـا کە دەمـانەوێ لەو باسە بدوێین و پووره هەنگی پر لە هەست ونـەستی ئەو دیـاردانە بوورووژێنین و لە هەندێ رووەوە، پەردە لەرووی نهێنی یەکانی لابەرین و بەتایبەت لە بوارەکـانی «ئـەدەب وژیـان»دا، هەروەهـاش ئەوشتـانـە ئاشکـرا بکـەین، کە گەلێ جار ئەدیبێکی بە نامێ و دیار، بەرامبەر ئەدیبێکی تر، جا ئەو ئەدیبە با لە هەر بوارێکی تری ئەدەب دا کاری کردبێت و

قەڵــەم بەبــڕشتی خۆی نوانــدبێ هاتــووە بەنــای ناهــەق جامی بوغــزوکینــەی پڕ بە مەبــەستی خۆی بەســەر بەرهەمی ئەدیبێکیتردا قڵپ کردۆتــەوەو دەرئــەنجامیش ئەو ئەدیبە پێ بزانێت یان نەزانێت، ئەو بارە خراپ و سەلبیــانــەی برای ئەدیب نوانــدوویــەتی، ڕووی گەش و پڕشنگــداری ئەو بەرهــەمــەی نیشــان داوەو لە کۆتاییدا ئەو نووسین و لێــدوانــدنــانــە گشتی بۆتــە مایــەی شکۆمەندیو بەرزێتی بەرهــەمــەکــەو ئاکــام بە خزمەتێکی گەورەو مەزن بەسەر لاپەڕەکانی مێژ ووی ئەدەبی کوردی دەشکێتەوە.

ئێمــە ئەگەر بەدرێژ ی لە ئاوو هەوێری ئەو باسە بدوێین، قسەی زۆر دەوێو بێ گــومــان جێگــایــەکی زۆریش لەم گۆڤــارە ئازیــزە دەگــرین . . . ئەوجــا لەبــەرئەوەی ئێستا ئەو دیاردەیە بە لێشاو بەسەر ڕووی لاپــەرەکــانی مێــژ وو ئەدەبی کوردیــەوە هەن . . . ئێمــە سەرنجــدان و لێکــۆڵینەوەی تێکرای ئەو دیاردانە فەرامۆش دەکەین و بە پێچــەوانــەی ئەوەوە نووکی خامــە وەردەچــەرخێنینە ڕووەوەو قاپیو ڕەنــگ دانــەوەی گیــانــی بەشــێکــی ئەو باســەو خواستــە کە «خــۆشــەویستی»و «قــەدرزانین»و «ڕێزلێنان»ەکەیەو ئایا بزانیین ئەو دیــاردەیــە چۆن لە بەشێ شیعــرو ئەدەبیــاتی کوردیدا بەتــایبەت لە قۆناغی شیعری کلاسیکیدا هەیە.،

ئێنجــا ئەگــەر خوێنــەری هێــژ او بەرێــز بۆ ئەو دیاردەیە چاوێك بە شیعــری هەنــدێ شاعیــرانی کلاسیکیدا بگێــرێت . . . بە چەندو چوون کردن دەبین ماناو مەفهوومی ئەو دیاردە شیعرییە، زۆر وێنەو تارمایی لە شیعری کوردیدا بەرچاو دەکەوێت . . لەگەڵ ئەوەش دا نابێ ئەوەمــان لەبیــر بچێت، ئەو باســەی ئێمە لێی دەدوێن . ئەگەر بۆڵێــژ یــری شیعری هەندێ شاعیر لەوڕووەوە نەکەین و بەچڕوپڕی نەچینــە باســەکــەوە، دووچــاری زۆر سەرلێ شێــواویو زۆرو بۆرییەکیش دەبین . . .

ئێستــاش بۆ گەیشتن بە ئامــانج، دەچینە میانەی خۆشەویستیو قەدرزانی نێــوان دوو کەڵــە پیاوی زاناو لێ هاتووی وەك ( موفتی)و مەحــویــەوەو تابــزانیین ڕەنگــدانــەوەی گیــانی خۆشــەویستی لە میــانــەیــان دا چۆن بووەو ئەو دیــاردەیــەش تاج ڕادەیــەك بەســەر شیعرەکانی «مەحوی» شاعیرەوە بەرامبەر ئەو زاناگەورەیە دیارە.

چەردەیەك لەژیان و بەسەرهاتەکانی موفتی :-

---

ئەوەی قســەی ڕاستیبێ . . نووسین و توێــژ ینەوە لە سەرژیان و ڕووداو بە سەرهــاتــەکــانی «مەلا محەمەد ئەمینی موفتی» بلیمەت و

هەڵکــەوتــوو، هەروا کارێکی سووك و ئاســان نیین و بگــرە بۆ ئەو مەبەستە پێویستی بە گەلێ زانست و پشکنیین و گەڕان هەیە . . .

بێ لەوەش ئەگەر بمانەوێ بە قووڵ و ووردی بەکرۆك و ناوەرۆکی ئەو باسەدا شۆڕببینەوە . . . بێ شك دەبێ پشت وپەنایەکی زۆر بەو بەڵگەنامە مێژ وویوسەرچاوە دیاریانە ببەستین، کەلەو ڕووەوە بروا پێ کراوە .

بە هەرحاڵ بەپێ ی ئەوکورتە ڕازی زانیاریو بەڵگەنامانەی لە بەر دەستان، «مەلا محەمەد ئەمین» دەبێتە کوڕی حاجی مەلا ئەحمــەدی[2] کوڕی مەلا [3] مەحمــودی کوڕی مەلا ئەحمــەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی دێلێژەیی مەشهوور بە «پیرحەسەنی» .[4]

«موفتی» تابڵێ ی عالمێکی پڕومەلایەکی زاناو قابیل بووە . . ئەو زاتــە هەر لە تەمــەنی منــداڵییەوە کە لە ساڵانی [١٨٠٣ یا ١٨٠٤] لەنــاوخێــزانێکی ئەهلی عیلم و زانست پەروەر لەشــا ری سلێمــانی لەدایــك بووە . . . سەروسیمــای زیــرەکیوژ یــری پێوەدیار بووە!! سەرەتــای خوێنــدنی یەکــەمجار لای هەندێ لە فەقێیەکانی باوکی بوون و دوایش باوکــی قورئــانــی پێ خەتــم کردووەو بەشێ لە پەراوو ووردیلە ئاینییەکانی پێ دەرس دەکات .

«مــوفتی» هەردەم بەهــۆی چەلــەنگــیو زیتیــەوە، نەك هەر لەلای باوباپیــرانی بگــرە هەمیشــە لای سەرجــەم زانــایانی ناوچەی سلێمانی جێگایی ڕێزلێنان و متمانەو شکۆمەندییەکی زۆر بووە .

عەلائەدینی ئەلموسلی» کە بەردەست و قوتابییەکی دیاری «جەمل ئەللەبــل» «عــەبدولرەحمان زینەلعابیدین» مەشهوور بە «ئەلیەمنی» بووەو هەر دووپێکەوە «مامۆستاو قوتابی» بۆ سلێمانی دین وپەیوەندی لەگەڵ زانایانی سلێمانی بەتایبەت باوو باپیرانی موفتی»دا دەبەستن .

ئیتــر پاش گەڕانــەوەیــان بۆبەغــداد، لەوەودوا مەلا ئەحمــەدی دێلێــژەی «مــەلا محــەمــەد ئەمین»ی کوڕی بۆ خوێنــدن بۆ شاری بەغــداد دەنێرێت و لەو شارەدا گەلێ مزگەوتاو مزگەوت دەکات . . . وەك لە بەڵگــەنــامــەیــەکی بنــەمــاڵەکەی موفتیدا دەردەکەوێت مەلا محــەمــەد ئەمین لە ساڵەکانی (١٢٤٢ ـ ١٨٢٢)دا لەشاری بەغداد فەقێ بووەو لەوێ خوێنــدوێتی . . . سەرەتــایی خوێنــدنی بۆ ئەو مەبــەستــە یەکــەمجار لای زانای بەناوبانگ «مەلا ئەحمەدی واعیز» بووە کە مووەدەریس لەمزگەوتی سلیمانی لەوێ . . . دوای ئەوە لای ئەوزاتــەش دەگــوێزێتەوە بۆ زیاتر گەیشتن بەهیواو ئاواتەکانی دەچێتە

حرمەت زانای گەورە «مەلا محەمەد سەعید نائیب» کەلەمزگەوتی «حونەفاء» موودەریس بووە.

پاش ئەوەی ماوەیەکیش لەوێ دەمێنێتەوەو سوودوکەلکێکی زۆر لە زانا گەورەیە وەردەگرێت... ئەوجا لەمزگەوتی «گەیلانی» لای عەلم وزانای مەزن «شێخ محەمەدی بەرزنجی» تحصیل دەکات و بەگەلێ زانست وزانیاری ئاینی نائیل دەبێت.

«موفتی» دوای پێ‌نانی ئەو قۆناغە تازەیەی ژیانەوە، کە بە مرۆڤێکی لێ‌هاتوو خاوەن زۆر ئەزموون و تاقی کردنەوەو موعاناتی ژیان و «خۆشی و ناخۆشی»یەکانی ژین دەناسرێت... ئیتر روو دەکاتەوە شاری سلێمانی و لە مزگەوتەکەی خۆیان دا، کە ئێستا مەشهووورە بە «مزگەوتی موفتی»[٥] بەمەلا دادەنرێت و باوکی پیەبەرزی لەبەر خۆشەویستی و ئازیزی ئەو؛ ئەوێ بەجێ دەهێڵێت و ئەویش لەمزگەوتی «حاجی سەید حەسەن»ی ئێستادا دادەمەزرێت و لەوێ دەست بە دەرزبێژی وپێش نوێژی کردنی خەڵکی دەکات... دوای ئەوە لەسالی (١٢٩٦ك ـ ١٨٧٦ز) ی‌زاینی‌دا موفتی لەشاری سلێمانی بەداد پەروەر دەبێت و پاشان لە سالی (١٣٠٦ك ـ ١٨٨٦ز)دا دەکرێ بە ئەندامی مەجلیسی ئیدارەو تا ئەوە بوو دوای ئەوەش لەسالانی (١٣١٠ك ـ ١٨٩٠ز)ی زاینی‌دا بە رەسمی بە (موفتی) شاری سلێمانی دادەنرێت.

ئیتر هەر لەدوای ئەو بەروارەوە نازناوی (موفتی) بەسەر خۆی و تێگرایی بنەماڵەکەیان دا، دادەبڕێت و بەکاروباری «فتوای و موفتی»تیەوە خەریك دەبێ.

بەڵێ «موفتی» دوایی ئەمانە هەمووی لە چوون وسەردانێکی‌دا لە سالی (١٣١٢ك ـ ١٨٩٢)ی‌زاینی‌دا بۆ تورکیا لە مەدرەسەیی «دار الحدیث» حسام پاشا لە شاری (ئەدرنە) بە موودەریس دەبێ، دوای ئەوەی واز لەو کارو فەرمانەش دەهێنێت بۆیەك جارەکی بۆ سلێمانی دەگەرێتەوەو ئەوسا بەپێی فەرمان و بریارێکی سەڵتەنەتی عوسمانی دەبێتە «چاودێری‌کەر»و «لێ پرسراوی» گشت کاروئیشی ئاینی عوسمانی‌یەکان لەو ناوچەیەداو ئەمجارە بە سایەو سێبەری هومایی دەوڵەتی عوسمانی لەو شارەدا دادەنرێت.

مەلا محەمەد ئەمینی «موفتی» بێ لەو هەموو سەرقالی و جەنجالی بوونەی ژیان... هەروەهاش نیزیکەی [٥٠ ـ ٦٠] سالی بەژیانی دەرزبێژی و پێش نوێژی مەردومانەوە سەرگەرم بووە.

لەو ماوەیەدا توانیوێتی گەلێ قوتابی‌یانی ئاینی پەروەردە و پێ بگەیەنێت. وەك:

(١) مەلا معروفی قازی، مەشهوور بە مەلا مارفی قازی.

(٢) شێخ عیسا مەدینی ـ عەوالان ـ ی.

(٣) حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی، کە ئامۆزای خۆی بووە.

(٤) مەلا حەسەنی مەلا یوسفی مرونیی،

(٥) مەلا عەزیزی موفتی کوری مەلا محەمەد ئەمینی موفتی. کە لای مەحوی شاعیریش زۆر خوێندوێتی.

(٦) بێخودی شاعیر.

هەروەها مەلا محەمەدی ئەمین موفتی رەحمەتی بێ لە پێگەیاندنی ئەو زاناو عالم و پیاوە گەورەو چاکانە... توانیوێتی لە بواری زانست و زانیاری‌یە ئاینی‌یەکاندا گەلێ دانانی ئاینی و رۆشنبیری جۆراوجۆری لەوبارەیەوە پێشکەش بە خوێنەران و نامە خانەی کوردی کردوە... بەڵام داخم ناچی بێ لەو پەراوەیان «الرسالة الحمیدیة» کە ئامادەکراوە بۆ چاپ، ئیتر هەموو پەراوەکانی تر بەدەست خەتی ماونەتەوەو ئەوانیش چاوەروانی فرسەت و رۆژ لە رۆژان دەکەن رێگایی پاکنووسی وچاپ کردن بگرنەبەر بەهیوا خزمەت کردن بە خوێنەرانی کورد... ئێستاش ئەمە ناوی هەندێ لەو پەراوانەن کە باسیان لێوە دەکەین:-

١ ـ الفریدە السمرقندیة[٦]
٢ ـ عالم المخاطرات.
٣ ـ کتاب فتاوی في علم المنطق.
٤ ـ حاشیة علی العوامل.
٥ ـ فرائض شرح المنهج.
٦ ـ رسالة في علم النحو.
٧ ـ رسالة في الفرائض
٨ ـ متحف الانوار وجامع الاسرار.
٩ ـ شمائل الشیخ السیوطي.
١٠ ـ عمدة المسالك في مذهب الشافعي.

بەڵێ ئەوزاتە گەورەیەو عالمە خزمەت گوزارە پاش ئەو کارو فرمان و خزمەتانە لەتەمەنی (٩١) سالی‌دا لە سالی (١٣١٥ك ـ ١٨٩٥ز)ی‌زاینی کۆچی دوایی دەکات وگیانی پاك وپیرۆزی بەخاك لە گۆرستانی بنەماڵەکەیان دا لە گردی سەیوان دەسپێرێت... دەك هەزار سڵاو و رەحمەت لەمەزاری پاکت بێ و لەگۆری هەموو یار و ئەحبابانیش
شتێکی پێویست ئەبێ بوترێت:-

ڕوون و ئاشکرایەو هەمووش دەزانین، سلێمانی هەر لە مێژ ووی بنیات نانیەوە، تا دەرحاڵ و ئێستاش، وێنەی گشت شارەکانی تری کوردستان هەمیشە لانکەو مەڵبەندی زانست و زانیاری‌و ئەدەب و ڕۆشنبیری بووە... زۆر عالم و زانایان و خێرخواو پیاو چاکانی تیاهەڵکەوتووە... تەنانەت چەندان گەورە پیاوانی وەك «شێخ مارفی نوێ دێ‌و حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی‌و شێخ سەراجەدینی تەوێڵەو شێخ حەسەنی گڵەزەردەو شێخ مەلا عوسمانی باڵەخەیی‌وزۆری تری لێ دروست بوون..

ئ ێجا ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ، لێی بدوێین، دیارە لایەنی زانست و زانیاری ئەو شتانەیە، نەك لایەنە تەریقەت و تەسەوفەکە.

بۆیە لە ڕوانگایی ئەوەوە بە پێویستی دەزانم، یادێکی ئەوزاناو مەلاو موفتی‌یانەی ئەم شارە خۆشەویستە بکەینەوە کە ئەوزاتانە ڕووو لایەنێکی شتە عیلمی‌و زانیاری‌یەکە دەگرنەوە... شاری سلێمانی هەر لە کۆنەوە تامێژ ووی ن ێ‌و هاوچەرخی، دوو جۆر «موفتی» بە خۆووە بینیوە:-

(١) - جۆرێك لەو موفتی‌یانە دیارە لە شوێنانێکی تری سلێمانی‌یەوە هاتوون و پاش ماوەیەکیش سلێمانی‌یان بەجێ هێشتووەو ڕوویان لە مەڵبەندو شوێنەوارێکی کە ناوەو لەوشوێنانەدا چەندان عالمیان پێ گەیاندوە... ئەوانەش وەك جەنابی محەمەد فەیزی [٧] زەهاوی و جەنابی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی... هتد.

(٢) - بەڵام جۆرەکەی تری ئەو موفتیانە، بریتین لەو بەرێز و زاتانەی کە بەرەچەڵەك و بنەچە خەڵکی سلێمانی خۆین، یان لە دەووروپشتی سلیمانی‌یەوە هاتوون و بەتایبەت لەگەڵ هاتنی بابانەکاندا لە سلێمانی نیشتەجێ بوون...

بە هەر حاڵ مەلا محەمەد ئەمینی «موفتی» یەکێکە لەو زانانە کەپێش قەدەرێك بەتێرو تەسەلی لە بەشێ ڕوودا و بەسەرهاتەکانی دووایین و ئێستا لە ڕووە پەیوەندی‌و عیلاقەتە ئەدەبی یەکەی لەنێوان میانەی خۆشەویستی ئەو هاوڕێ و دۆستی ئازیزی‌دا مەحوی (١٨٣٠ - ١٩٠٤ز) کەمێ قسە دەکەین و ڕاو بۆچوونی خۆمان لەو ڕووەوە نیشان دەدەین.

شتێکی تر هەر لەو بارەیەوە:-

مەحوی شاعیریان موفتی، نەك هەر لەگەڵ یەکتردا وەك دەبینرێ پەیوەندی ومیانەی نێوانیان کۆك و خۆش بووە... بگرە ئەوزاتانە لەگەڵ باووباپیرانی یەکتریش دا هەردەم بە خەست وخۆڵی عیلاقات و پەیوەندی‌یان هەبووە... [٨] ئەوە لەلایە لەلایەکی تریشەوە بەتایبەت مەحوی شاعیر بەهەق هەموو زاناو عالمێکی خۆش ویستووەو شوێنی تایبەتی خۆیان لەلای هەبووە.

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە هەمیشە لەزۆر ناکۆکی وکەشمەکێش و ملەملانێ‌دا بووە، بەرامبەر بەوانەی کە بەنارەوا ناوی خۆیان ناو ناوە «عالم و شێخ» لەپەنا ئەوناوانەدا خەڵکی ڕەش وڕووت و بێ گوناحیان چەوسانووتەوە!! ئەوجا بۆ ئەوەی ئەوەندە لە جەوهەری ڕاستی قسە دوورنەکەوینەوە، ئێستا بەشێ لە ئەو پەیوەندی‌یەی نێوان (مەحوی وموفتی) کەمشتێ نموونەی خەرباریکە دەخەینە ڕوو... ئەوەتا مەحوی لەو ڕووەوە دەرهەق ئەوخۆشەویستی‌یەی موفتی لە گۆشەو لایەنێکی ژیانەوە دەردەخات و بەم ڕەنگە ستایشی دەکات و دەڵێ:-

هەرچەندە تۆ ئەمینی، بەڵێ ما دڵی ئەمن؛؛
نابێ لە سیحری نێرگزی فەتتانی تۆ ئەمین..

واتە... هەرچەندە ئەتۆ بەناو ناوت ئەمینە، و مەلا محەمەد ئەمینی موفتیت، بەڵام تابێ دڵ و دەروونی من لەبەرامبەر سیحری نێرگزی فەتتانی ئەتۆ، کە ئەمانە هەموو نیشانەی جەوری چەلەنگی و جەوامێری و ژیروزیرەکی دەردەخەن، بە هیچ کلۆجێ ئەمینی بکات!!.

دیارە ئەمەش کە مەحوی دەرهەق «موفتی» دەبیێژ ێ دەیەوێت لە ڕێگایی خۆیەوە بە گشت ئەدیب وئەدەب دۆستانی هاوچەرخی خۆی رابگەیەنێت کە خەڵکە بزانن ئەوکاکڵەی جەوهەرو ماهیەتی مەلا محەمەد ئەمینی موفتی لەمەر خۆمانەو کەواتە ڕێزو خۆشەویستی لەسەر هەموومان پێویست و بەجێ‌یە.... هەر بەو جۆرە مەحوی شاعیر زیاتر تێ هەڵدەچێت وبۆباس وپەیوەندی خۆی لەگەڵ موفتی‌دا لەو ڕووەوە هەست و نەستی بەم چوارینەیە دەردەبڕێت:-

ڕێی خستە خەستەخانەکە یاری خستە پەی؛؛
جێ‌ی چاوە زارە «مەحوی» ئەم ئەسوارە دەرنەخەی..
سایەی هومای دەوڵەتە، کەوتە سەر سەرت؛
داوێنی هەوری ڕەحمەتە «موفتی» لەدەست نەدەی.

ئەم چوارینەیە لە شوێنێکی تری دیوانی دەست خەتی شاعیردا بەم جۆرەش هاتووە و دەڵێ:-

ڕێی خستە خەستەخانەکە، یاری خستە پەی؛؛
جێ‌ی چاوەزارە «مەحوی» ئەم ئەسرارە دەرنەخەی...
سایەی هومایی باڵی ئەوبوو، کەوتە سەر سەرم؛؛
داوێنی هەوری ڕەحمەتە «موفتی» لەدەست نەدەی..

یانی ئێستا كه یاری پێ و قوودووم خێر و باوه‌فام، هاتۆته كاول بۆ كه‌مه‌وه... كه دوور نی‌یه ئه‌و شوێنه مه‌به‌ستی له «خانه‌قا»ی مه‌حوی خۆی نه‌بێ.... نه‌كه‌ی مه‌حوی ئه‌م هاتن و نهێنی‌یه‌ی موفتی لای نه‌یاران و نا حه‌زانیٌ خۆت و موفتی بدركێنی... چونكه ئه‌گه‌ر ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ت ئاشكرا و نواند... ئیتر بارانی هه‌وری فه‌یزی به‌ره‌كه‌تی «ئه‌و» كه سایه‌ی هومای ده‌وڵه‌ته، به سه‌رتا نابارێت و ئه‌نجام دووچاری بێ ده‌رامه‌تی و ناخۆش یه‌كی زۆر دێت!!

دیاره بەم چوارینه‌یه‌دا ده‌رده‌كه‌وێت كه «موفتی یان مه‌حوی» سه‌ر به ده‌سته‌و تاقمێكی ده‌ست ڕۆیی و به‌رزتر له خۆیان بووبن و ئه‌وجا ئه‌و تاقمه به‌رامبه‌ر به‌موفتی‌یان مه‌حوی دوژمن و نه‌یارا بوون و ئه‌و په‌یوه‌ندی‌یه به‌هێز و زۆری ئه‌وانیان له‌سه‌ر شان گران و قوورس بووبێت... به‌هه‌رحاڵ، ئه‌وه‌ی راستی بێ بۆ ئه‌و چوارینه‌یه له‌ناو به‌شێ له ئه‌دیب و روناكبیرانی كورد دا، وا باوه كه مه‌حوی ئه‌م چوارینه‌یه‌ی بۆ شێخ مسته‌فای «موفتی»[9] كوری شێخ بابه ره‌سووڵی گه‌وره‌ی به‌رزنجی وتووه، كه ئه‌وزاته‌ش مه‌حوی شاعیری زۆر خۆش ویستووه‌و له‌گه‌ڵ ئه‌وهه‌موو كێشه‌یه‌ی مه‌حوی كه له‌گه‌ڵ به‌شێ له شێخان دا بوویه‌تی ئه‌وهه‌ر دۆستایه‌تی و خۆشه‌ویستی خۆی نه‌بڕیبووه.

منیش وەك بۆی بچم و پێ‌بزانم رەنگه ئه‌و چوارینه‌یه زیاتر بۆ كه‌سانێكی وەك مه‌لا محه‌مه‌د ئه‌مینی موفتی بووبێت، ئه‌وه‌ش به حوكم و راستی قسه‌ی به‌ڵگه نه‌ویستی ئه‌م واتانه:-

١ - جارێ سه‌ره‌تا مه‌حوی شاعیر له‌چاخ و سه‌رده‌می كاك ئه‌حمه‌دی شێخ دا هیچ نزامێكی عیلمی یان ته‌ریقه‌تی له‌گه‌ڵ بنه ماڵه‌ی شێخان دا نه‌بووه، ئه‌وه‌ش كه رووی‌دا له‌گه‌ڵ كورانی كاك ئه‌حمه‌دا هه‌مووی دوای كۆچی كاك ئه‌حمه‌د بوون... به‌سه‌رێكی تریشی هه‌روه‌ها [illegible]ابی «شێخ مسته‌فایٌ موفتی» چه‌ند ساڵێك پێش مردنی كاك ئه[illegible]ی شێخ بووه... ئیتر ده‌بێ بۆچی «مه‌حوی یان موفتی» نهێنی هاتنیان بۆ لای یه‌كتری لای به‌رامبه‌ره‌كانیان نه‌دركێنن؟!!

٢ - تاكه موفتی‌یه له سلێمانی، زیاد له‌وهه‌موو موفتیانه‌ی باسمان لێوه كردن، كه له لای ده‌وڵه‌تی عوسمانی‌یه‌كان له سلێمانی شوێنی بروا بووبێت و متمانه‌ی ئه‌وان بووبێت ته‌نانه‌ت «به هومای ده‌وڵه‌ت» له ناوچینی زانایان و عالم و مه‌لایانی ئه‌وسه‌رده‌مه‌دا ناسرابێت، هه‌ر موفتی مه‌لا محه‌مه‌د ئه‌مین بووه... ئه‌وه‌تا هاوری‌ی مه‌حوی كه‌نیزیك ترین دۆست و هاوری‌ی بووه به‌م جۆره ناوی ده‌بات:-

سایه‌ی هومایی ده‌وله‌ته، كه‌وته سه‌ر سه‌رت؛؛

دوێنی. هه‌وری ره‌حمه‌ته «موفتی» له ده‌ست نه‌ده‌ی..

به‌ڵێ په‌یوه‌ندی و خۆشه‌ویستی نێوان (مه‌حوی وموفتی) به‌وكێشه‌و پێوانه‌یه بوو، كه كه‌مێ لێ‌ی دووایین... هه‌ر ده‌م له خۆش و ناخۆشی‌یه‌كانی ژیان دا، له رووداوه نهێنی و ئاشكراكان دا وه‌ها جۆش و كوڵی ڕێز و نه‌وازشیان بۆ یه‌كتری ده‌ربڕیووه‌و یه‌كتری‌یان لاواندۆته‌وه... ته‌نانه‌ت له كۆچی دوایی «موفتی»یش دا، كه‌بزانه مه‌حوی له به‌رچی بووه نه‌یتوانیووه هاوبه‌شی و به‌شداری ئه‌و پرسه‌و ته‌عزی‌یه‌ی بنه‌ماڵه‌ی خوالێ خۆش بوو موفتی بكات، ده‌بینین وه‌ك ده‌ڵێن به رمێ دوونیشان بپێكێت و به‌م چوارینه‌یه كه‌بۆ یه‌كێك له بنه‌ماڵه‌كه‌ی ده‌نرێت و ده‌ڵێ:-

«مه‌حوی» كه غه‌یری ده‌ستی دوعا هیچی كه‌ی نی‌یه؛

مه‌عزوره، پێ شكسته، نه‌هاتۆته ته‌عزیه..

ئه‌و ئه‌جره گه‌وره‌یه‌ت، كه له‌به‌ر چاوی ئه‌و هه‌یه؛

مه‌جبووری كردوه كه به‌سه‌ر بێته ته‌هنیئه...

واته من غه‌یری ده‌ست به‌نده‌كردنه‌وه‌ی دوعا كردن و نیزا بۆتان هیچ شتێكی تر شك نابه‌م و نیمه.. ته‌نانه‌ت نه‌هاتنیشم بۆ ته‌عزی و پرسه‌تان گشتی له‌به‌ر مه‌عزووری پێ و قاچ شكستیم بوون... به‌ڵام هه‌نووكه، له‌به‌ر ئه‌جر و شكۆمه‌ندی و چاكه‌تان كه له‌به‌ر چاوم وون نابن، ئێستا ناچار و مه‌جبوورم نه‌ك به‌پێ بگره به‌سه‌ر بێنم بۆ ته‌هنیئه‌و پیرۆز بایی‌تان، به‌هۆی بونی موفتێتیت كه له‌شوێنی وه‌جاخ روونی باوكی ره‌حمه‌تیت دانیشتوویت.

دیاره مه‌حوی ئه‌م چوارینه‌ی له‌لایه‌ك به‌هۆی كۆچی دوایی موفتی‌یه‌وه دانا‌وه‌و به سه‌رێكی تریش پیرۆز بایی له مه‌لا عه‌زیزی كوری كردوه، له‌شوێنی باوكی به موفتی‌تی دانراوه.

له هه‌موو ئه‌مانه‌وه ده‌گه‌ینه چی؟!!

---

سه‌رئه‌نجام له هه‌موو ئه‌مانه‌وه ده‌گه‌ینه ئه‌وراستی‌یه به‌ڵگه نه‌ویستانه‌ی كه بڵێین:- بنه‌ماڵه‌ی موفتی هه‌ر له‌مێژه‌وه تا ده‌رحاڵ خاوه‌نی ئه‌م سیماو راستی و هه‌یه‌تانه بوون:-

١ - بنه‌ماڵه‌ی موفتی وه‌ك بنه‌ماڵه‌یه‌كی دێرین و عه‌ریقی ئه‌م شاره پشتاوپشت به بنه‌ماڵه‌یه‌كی ئه‌هلی عیلم و مه‌لا زاده و كاروفرمانی مه‌فتی‌یه‌وه ناسراون...

٢ ـ ئەو بنەماڵەیە هەمیشە بە دەرزبێژ ییەوە خەریك بوون وشوێن و شوێنەواریان هەردەم بە [یانەی عیلم وعلماء] لەم شارەدا ناوو شۆرەتی بووە. . .

٣ ـ هەر زانایەك لە شارانەوە هاتبێتە سلێمانی ، وەك دەڵێن سەرەتا پێڵاوی غەریبی لەوێدا کراوەتەوەو پاشان بە زاناو عالمانی تر ناسێنراوە.

٤ ـ زۆر زاناو عالم و ئەدیب و ڕۆشنبیران لە سەردەستی ئەو بنەماڵە پێ گەیشتووە.

٥ ـ هەروەهاش لە خودی بنەماڵەکە خۆیدا، زۆر زاناو عالمی بلیمەت و دیار هەڵکەوتووە.

٦ ـ عالمان و زانایانی ئەو بنەماڵەیە خۆیان جەنجاڵ و سەرقاڵی «تەریقەت»و باروذۆخە «تەسەوف»ە (١٠) کە نەکردوتەوە. . .

٧ ـ ئەو بنەماڵەیە بێ لەوەی پەیوەندییەکی گەرم وگوریان لەگەڵ زاناو ئەدیب و روناکبیرانی شارەکەیان دا هەبووە هەروەهاش زۆر نیزیك بوون لەگەڵ زۆر بەو زۆری عالمان و زانایانی غەیری نەتەوەکەشیان دا.

٨ ـ بنەماڵەی «موفتی» بێ لەوانەش کە زانیارییەکی زۆریان وەك میراتێکی لەبن نەهاتوو بۆ نەتەوەکەیان بەجێ هێشووە. . . هەروەهاش خاوەنی بەلگەنامەیەکی مێژ ووی زۆرن کەبێ شك ئەمرۆ ئەو وەسیقانە بە هاو برخی مێژ ووی خۆی هەیە. . .

دوا ووتە :ـ

لەکۆتایی و دواقسەدا دەڵێم :ـ ئومێدو هیوام زۆرە، توانیبێتم بەم کورتە نووسراوەیە ، لەلایەك خزمەتێکی بچوکم بە مێژ وونەدەبی کوردیو بە سەرێکی تریش خزمەتێکم بەڕاژەی ڕۆشنبیری زاناو عالمانی شارەکەم بەتایبەت بنەماڵەی ڕەحمەتی «موفتی چاومار» کردبێت. . . کە دیارە ئەو بنەماڵەیە هەر دەم ڕێگاو جێ و شوێنی تایبەتی خۆی هەبووەو لەلای هەموو خوێندەوارێکی کورد دڵسۆزو خۆشەویست بوون.

هەروەهاش هەر بەم بۆنەیەوە زۆر سوپاس کاك «جەمال موفتی» دەکەم کە هەندێ وورده زانیاری دەربارەی ڕەچەڵەکی بنەماڵەیان دامێ. . . دوا ووتە دەڵێم :ـ بەشکم خوا بکات ناوکی ئەم نووسینە ببێتە هاندەروپیشتیوانێ بۆروون کردنەوەوساخ کردنەوەی نووسینێکی گەورەتروبێ هەڵەو کەم وکوری. . . دووبارە ستایش و سوپاسمان بۆ هەموو لایەك هەر بژ ین

سەرچاوە و پەراوێزەکان :ـ

(١) بێ لەمەحوی شاعیر زۆر ڕوناکبیرانی تری کورد لە بارەی مەلا محەمەد ئەمینی موفتییەوە دواون. . . ئەوەتا شاعیری هاوچەرخ عەبدولرەحمان بەگی بابان، نازناووبە [بابە] بەم جۆرە پێوانەیە باسی موفتی دەکات و دەڵێ :ـ

ئەمین موفتی عەلامەیی زەمانە ؛ ؛
لە فەزڵ و دانیشا فەردو یەکانە. .
مەزایای خارجی وەسف و بەیانە ؛ ؛
لە چاوماری مەزن ڕەفرونیشانە. .
بە فەزڵ و دانیش و عیلمی تەواوی ؛ ؛
گەلێ بەرزە لە عەلامەیی زەهاوی،

(٢) لە دیاری ترین کورەکانی مەلا مەحمود، مەلا ئەحمەدە مەشهور بە چاومار بووە، بێ لەوەی لەخزمەتی باوکیدا تحصیلی کردوە، هەروەهاش لای مەلایان، مەلا عەبدوڵلای ڕەش و شێخ مەعروفی نوێ دێی خوێندوێتی ، ئەولەدوا چلەپۆپەی ژیانیداو مەحوی لەتاقی لاوێتیدا زۆر دۆستی یەکتری بوون ویەکتریان خۆش ویستووە. ئەم زانایە لە ساڵی (١٢٥٥ ك ـ ١٨٣٥ز) دەبێتە سەرۆکی مەلاکانی سلێمانی ولەوسەفەرەی حەجیدا لەساڵی (١٢٨٠ـ ١٨٦٠) کە دەکەوێتە ژێر گەردەلوول وتەم ومژێکی زۆرەوە کۆچی دوایی دەکات. . . شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەزمانی کاکییەوە شێخ عەلی دەرهەق ئەو کارەساتە دەڵێ :ـ

بحمدالله نەما کاك ئەحمەدی شێخ ،
زەهاوی مردوو گۆری گوم بوو چاومار. .
ئەگەر بێ شێخ عەلێش(دفع البلا) بێ ؛
ئیتر دنیا ئەبێتە عەینی گوڵزار.

٣ ـ مەلا مەحمود لە جێگایی باوکی لەدێی دێلێژە دادەنیشێت و لەوێ دەرزبێژ ی دەکات، پاش ئەوە دێت بۆ شاری سلێمانی ولەتەك شێخ مارفی نوێ دێیی دا پێکەوە هەردوو لە مزگەوتی گەورە دەبن بەموودەریس ووانەی ئاینی وفەلسەفی وفەلەکیات بە فەقێیان دەڵێنەوە، تاله ساڵی (١٢٣٩ ـ ١٨١٩)یزاینیدا کۆچی دوایی دەکات

٤ ـ مەلا محەمەدی پیر حەسەنی لەدێی دێلێژە لەدایك بووە، هەرلەوێش دا دەخوێنێ و پاش ئەوە دەبێتە موستەعیدو ئینجا دەچێتە خزمەت مەلا محەمەدی [ابن الحاج] لەدێی جێشانە. . . پاش ئەوە دەگەرێتەوە بۆ دێلێژەو بەیارمەتی شێخ ڕەزایی دێلێژەی خوێندنگایەکی گەورە دەکاتەوەو لەوێ دەبێتە موودەریس. . . تا

سالی (١٢٧٣ك ـ ١٨٥٣ز)ی‌زایینی کۆچی دوایی ده‌کات.

٥ ـ مزگه‌وتی موفتی به چه‌ند هه‌نگاویك ده‌كه‌وێته خوار گۆره پانه‌ی فوئکه‌یی سه‌راوه، داخه‌که‌م ئه‌و شوێنه پیرۆزه که‌یانه‌و شوێنی عه‌لمان و گه‌وره پاوان بوون ئێستاکه وێران و به کاولی چۆل و هۆل ماوه‌ته‌وه... ئومێده وارم نه‌وه‌کانی موفتی ڕۆژێ له ڕۆژان هه‌وڵ و کۆشش ئاوه‌دانه‌وه‌ی بکه‌نه‌وه.

٦ ـ هه‌رچه‌نده ئه‌و په‌راوه ده‌ست نووسانه ده‌خرێته پاڵ موفتی به‌لام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش دا بۆ هه‌ندێ په‌راوی‌یان شوێنی گومانه که‌هی ئه‌وزاته‌بن.

٧ ـ مه‌حوی ده‌رباره‌ی موفتی زه‌هاوی به‌م چوارینه‌یه ده‌یلاوێنێته‌وه‌و ڕووی تێ ده‌کات.

جه‌نابی موفتی فه‌ندی ڕشێنه‌یه یاران؛
له‌دڵتی ششته‌وه نه‌قشی محه‌به‌تی یاران..
هێشتا لافاوی توندوتیژ سروشك؛
نه‌چوته‌وه له‌دڵی عه‌قیقی وه‌فاداران.

٨ ـ ده‌بینین له‌زۆر ئه‌و به‌ڵگه‌نامانه‌ی له‌کتێبخانه‌ی ماڵی موفتی‌دا هه‌یه، وه‌ك ده‌رده‌که‌وێت (مه‌حوی) له‌لای ئه‌وبنه ماڵه‌یه جێگایی بروا بوون و متمانه‌ی تێگرایی بنه‌ماڵه‌بووه‌و هه‌مووخۆشیان ویستووه په‌یوه‌ندی‌یان له‌گه‌ڵ دا هه‌بووه

٩ ـ به‌لام مامۆستایی گه‌وره «شیخ ره‌ئووفی به‌عیب» له‌م دوایی‌یه‌دا پێی ڕاگه‌یاندم، گوایه مه‌حوی ئه‌و چوارینه‌یه‌ی بۆ شێخ محه‌مه‌دی موفتی وتووه، که ئه‌وزاته ده‌بێته برازای شێخ مسته‌فای موفتی که مه‌شهووره به [موفتی یه‌که‌ره].

١٠ ـ له‌بنه‌ماڵه‌ی موفتی‌دا، له‌م دوایی‌یه‌دا شاعیری گه‌وره‌و مه‌زن مه‌لا مه‌حموودی بێخود نه‌بێ که‌مێ ڕووی کرده قاپی‌و ده‌روازه‌ی ته‌ریقه‌ت و ته‌سه‌وفه‌که زووزوو ڕووی له‌شێخانی نه‌قشبه‌ندی له [بیاره‌وته‌ویله] ده‌کرد.. ئیتر نابینین که سانێکی‌تری ئه‌وبنه‌ماڵه‌یه ئه‌و ڕێبازگه‌یان گرت بێت.

# الملا محمد أمين المفتي
# ١٨٠٤ ـ ١٨٩٥

**سوران محوی**

ظهرت في السليمانية أسر ثقافية ودينية وعلمية لعبت دوراً هاماً في نشر الثقافة طيلة سنوات عديدة منها أسرة (المفتي) ومنهم (الملا محمد أمين) الذي ولد في السليمانية وتلقى العلوم الاولية فيها ثم شد الرحال الى بغداد عام ١٨٢٢ فتلقى العلوم العقلية والنقلية على يد أساطين علمية وفقهيه امثال (الملا احمد الواعظ، محمد سعيد النائب ومحمد البرزنجي والملا علاءالدين الموصلي)، ثم قفل راجعاً بعد أن تفقه بمختلف العلوم وشرع بتدريس الطلبة في (جامع المفتي) المسمى بأسمه وبعد وفاة والده انتقل الى مركز الافتاء وصار عضواً في مجلس الادارة.

وفي عام ١٨٩٢ سافر الى موكز الخلافة ونقل لفترة من الزمن الى التدريس في مدرسة (دار الحديث) في ادرنه.

تخرج على يدي الملا محمد المفتي مجموعة من العلماء منهم (الشاعر بيخود) الذي طبق شهرته كردستان.

• نستخلص من سيرة عالمنا (مفتي) بأن:

١ ـ اسرة المفتي كانت من الاسر العريقة التي اسدت خدمات مشهودة لكردستان وبرز منهم علماء عدة.

٢ ـ كانت دار المفتي في السليمانية مركزاً لجمع شمل علماء المنطقة حيث يتداول فيها امور الافتاء وحل مشاكل العلماء الادباء.

٣ ـ كانت تلك الدار بمثابة مضيف للوافدين الى السليمانية

٤ ـ تركت أسرة المفتي تراثاً ثرياً من الكتب والمخطوطات والوثائق يمكن الاستفادة منها في تدوين الاحداث العلمية والادبية لردح من الزمن.

**كۆمەلاْيەتى**

# كوردو شەڕى شوعەيبە

د. كەمال مەزهەر
كۆلێجى ئەدەبيات ـ زانكۆى بەغدا

ماوەيەك لەمەوبەر لە بەلگەنامەيەكى نهێنىى ئينگليزەكاندا ڕاستىيەكى بايەخدارم دەربارەى دەورى كورد لە شەڕى شوعەيبەدا بەرچاو كەوت كە شايانى لێدوان و لێكدانەوەيە.

بەر لەوەى دەولەتى عوسمانى لە شەڕى يەكەمى جيهاندا بداتە پال ئەلەمانياو لايەنگرانى دژى ولاتە هاوپەيمانەكان بە ماوەيەك ئينگليزەكان خۆيان بۆ داگيركردنى عيراق ئامادە كردبوو، كە سێ صەد سال دەبوو چاويان بڕيبووە سامان و شوێنى هەلكەوتووى لە ناوەندى ڕۆژهەلاتى نزيك و ناوەڕاستدا.

بۆيەكا تەنها تاكە ڕۆژێك بە سەر بەرپابوونى شەڕ لە نێوان بەريتانياى گەورەو دەولەتى عوسمانيدا تێپەڕى كاتێك هێزە چەكدارەكانى ئينگليز لە باشوورەوە پەلامارى خاكى عيراقيان داو هەر ئەو ڕۆژە، كە دەيكردە شەشى تەشرينى دووەمى سالى ١٩١٤، توانىيان فاوى تاكە بەندەرى ئەوساى عيراق داگير بكەن. لەو ڕۆژەوە تا ئاگربەسى مودرۆس لە تەشرينى دووەمى سالى ١٩١٨دا خاكى عيراق بووە يەكێك لە شەرگە سەرەكىيەكانى ڕۆژهەلاتى ناوەڕاست كە بايەخى بۆ ديار كردنى چارەنووسى شەڕى يەكەمى جيهان كەم نەبوو. دواى داگيركردنى فاو بە شازدە ڕۆژ هێزەكانى بەريتانياى گەورە شارى بەصرەى بايەخداريشيان بە ئاسانى داگيركرد.

دامو دەزگاى عوسمانى چونكە دەمى سال بوو جەوروستەم و چەوساندنەوەى ئازەوا بيووە پيشەى ڕۆژانەى وا داڕزا بوو نەتوانى خۆى لەبەر ئێشوى هێرشى ولاتێكى پێشكەوتووى وەك بەريتانياى گەورەدا ڕابگرى. لەبەر ئەوە فەرمانڕەوايانى دەروازەى بالا، يا وەك دەلێن بابى عالى و پاشاكانى، ئەبوو پەنا بەرنە بەر هەر ڕێگەيەك بۆى هەبى يارمەتيدەرى بەربەست كردنى ئەو ڵێشاوە بدات.

بۆ ئەم كارە بزواندنى هەستى ئايينى شتێكى لەبار بوو. بۆيەكا ئيتيحادىيەكان كە لە سالى ١٩٠٨وە دەسەلاتى ولاتى عوسمانىيان گرتبووە دەست و تا ڕادەيەكى زۆر لە دين لايان دابوو، لەپڕ بوونەوە موسلمان و بانگى جيهاديان دا. ئاخوندو مەلايانى ولات بە دەيان فەتوايان بۆ «شەڕى كافران» دەركرد.

سەرەتاى شەڕ بە هەزاران عيراقى بە دەم ئەم بانگەوازەوە چوون، تايبەت دواى ئەوەى پياوە ئايينىيە گەورەكانى شارانى وەك بەغداو كەربەلاو نەجەف بە پەرۆشەوە داوايان لە خەلكى كرد پەنا بەرنە بەر چەك نەبا خاكى ولاتيان بە هاتنى ئينگليزى «كافر» گلاو بێت!

ئەمجاريش كوردى ساكارى دلپاك كەوتەوە داوى دەروازەى بالاوەو گەلێكيان بە نانەسكىو چەك و تفاقى خۆيانەوە بەرەو باشوورى عيراق بۆ شەڕى ئينگليز مليان نا. تا ئێستە نە ژمارەى ئەو كوردانە، نە ژمارەى سەرجەمى ئەو عيراقىيانەى بە دەم ئەو بانگەوازەوە چوون بە تەواوى ساغ نەكرانەتەوە. كەمترين ژمارە بەپێى ئەو سەرچاوانەى بەدەستەوەن دە هەزارو زۆرترينيش بيست هەزار عيراقىيە. هەرچۆن بێ ژمارەيان بە پێى سەرچاوەى باوەڕ پێكراو لە ژمارەى سەربازى تورك زياتر بوو.(٤)

هەمان جياوازى لە ژمارەى ئەو كوردانەى بە دەنگ بانگەوازى دەروازەى بالاوە چوون هەيە. بەپێى مامۆستا ڕەفيق حيلمى لە بەرگى يەكەمى «يادداشت»دا پتر لە هەزار سوارەى كورد بە سەركردايەتى شێخ مەحمود بە چەكى خۆيانەوە بۆ شەڕى ئينگليز لە كوردستانەوە چوونەتە باشوور. هەرچى شوكرى مەحمود نەديمە، كە ئەفسەرێكى شارەزايەو كتێبێكى لە سەر شوێنى عيراق لە شەڕى يەكەمى جيهاندا داناوە، دەلى تا كانوونى دووەمى سالى ١٩١٥ دوازدە هەزار چەكدارى عەرەب و «دوو هەزارى كوردو توركمان» دەواريان لە دەوروبەرى

شاری ناصرییە هەڵدا.[٦] لای مێژوونووسی بەناوبانگ عەبدولرەزاق حەسەنی ئەو کوردانە هەزار و پێنج صەد کەسن،[٧] ئەو ژمارەیەی تێکەڵ بە نووسینی گەلێك مێژوونووسیتر بووە.[٨]

تێکەڵ و پێکەڵی ئەم ژمارانە لە کەمتەرخەمیی و بەرەڵلایی کاربەدەستانی عوسمانی‌یەوە هاتووە. هەرچی کاربەدەستانی ئینگلیزە تەواو بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەموو شتێکیان بە حساب و نومار و راپۆرت بوو. هەڵبەت ئەوان بایەخی زۆریان دابووە خۆ ئامادە کردنی بەرفراوانی عوسمانی بۆ شەری داهاتووی دوای کەوتنی شاری بەصرە، دەروازەی باڵا دەیویست هەرچۆنێ بێ لەشکری ئینگلیز لە ناوچە داگیرکراوەکانی باشووری عیراق دەرپەرێنێ، چونکە باش لەوە گەیشتبوو کە داگیرکردنی هەموو عیراق بروای موسڵمانانی جیهان بە تواناو دەسەڵاتی عوسمانی‌یان دەلەقێنێ، وێرای ئەوەی داگیرکردنێکی وا مانای گەیشتنی دوژمنی بۆ سەر سنووری خودی تورکیا دەگەیاند. لەبەر ئەوانەی باسمان کردن بەڵگەنامەکانی ئینگلیز بۆ لێکدانەوەی ئەم جۆرە باسانە لە گەلێك رووەوە لە سەرچاوەیتر زیاتر جێگەی بڕوان. جا لە یەکێك لە بەڵگەنامە تایبەتی‌یەکانی وەزارەتی جەنگی بەریتانیادا کە سەرەتای بیستەکان نووسراوە ژمارەی ئەو کوردانەی لە شەری شوعەیبەدا بەشداری‌یان کردووە سێ هەزار کەسە، واتە دوو تا سێ هێندی ئەو ژمارانەی تا ئیستە وتراون.[٩] ئەمەش خۆی لە خۆیدا، لەبەر گەلێك هۆ، بایەخی مێژوویی زۆرە. شەری شوعەیبە یەکەم بەرەنگاربوونەوەی کوردە دژی ئینگلیزی داگیرکەر. هەروەها سیمای یەکەم خەباتی هاوبەشی کورد و عەرەبی تێدا بە دی دەکرێ دژی دوژمنی تازەیان.

هاتنی ئەو سێ هەزار کوردە بە جل و بەرگی نەتەوەیی و خەنجەر و برنەوی خۆیانەوە لە رێگەی بەغداوە بۆ ناصرییە سەرنجی هەموانی راکێشاوە، وا دیارە بە هەر شوێنێکدا تێپەریبن بە گەرمی پێشوازی کراون.[١٠] گەورەترین بەڵگەی زیندووی ئەم بۆچوونە هۆسەیەکی باوی ئەو رۆژگارەی عەرەبانە کە بە دوو جۆر گوتوویانە: «دوو بەشی بەهەشت بۆ هادی خۆمان و بەشێکیشی بۆ کاك ئەحمەدو ئەوەی» (ثلثین الجنة لهادینا وثلثها لکاك أحمد أولاده)، یا «دوو بەشی بەهەشت بۆ هادی خۆمان و بەشێکیشی بۆ شێخ مەحمودو کوردانی»[١١] (ثلثین الجنة لهادینا وثلثا للشیخ محمود واکراده).

دیارە مەبەست لە کاك ئەحمەد کاك ئەحمەدی شێخی کوری شێخ مارفی نۆدێی باپیرە گەورەی شێخ مەحمودە. بەڵام مەبەست لە هادی (سید هادی مگوطر)ە کە یەکێك لە گەورە پیاوانی شامی‌یە بوو. ئەم پیاوە پارەدارێکی دەوڵەمەندو دەست و دڵ فراوانێکی سەیر بووە، پارەیەکی یەکجار زۆری بۆ شەرکەرانی شوعەیبەو دوایی بۆ بەشدارانی شۆرشی بیست خەرج کردووە، لەبەر ئەوە خەڵکی ساکار وەك باوکی هەژار و نەدار سەیریان کردووەو زۆریان خۆش ویستووە بۆیەکا لە قوڵایی دڵەوە لە لایەن خۆیانەوە دوو بەشی بەهەشتیان بۆ قۆرغ کردووە. هەر لەبەر ئەوەش ئینگلیزەکان رقیان لێی بووە، دوای دامرکاندنەوەی شۆرشی بیست گرتویانەو بە دەسبەسەری رەوانەی هندستانیان کردووە، دوایی لەگەڵ فەیسەڵی یەکەمدا بۆ ساڵی داهاتوو گەراوەتەوە عیراق.[١٢]

شێخ مەحمود بەناوبانگترین سەرداری کورد بوو کە لە شەری شوعەیبەدا بەشداریی کرد، هەرچەندە خوا هەڵناگرێ عوسمانی‌یەکان بەر لەوە کەمیان بە خۆی و کەس و کاری نەکردبوو، بۆیەکا لێیان دڵ برینداری و ناحەزیان بوو.[١٣] رەفعەتی ئیسماعیل بەگی داودەو نامیقی عەلی ئاغای ئامۆزای و سەید ئەحمەدی خانەقاش لەو ناودارانەی کوردن کە بە خۆیان و پیاوەکانیانەوە دژی ئینگلیز چوونە غەزاو لە شەری شوعەیبەدا بەشداری‌یان کرد.

بەشی هەرە زۆری ئەو سێ هەزار کوردەی چوونە شەری ئینگلیز بریتی بوون لە لایەنگرانی شێخ مەحمودو کورگەلی داودەو دەلۆ و زەنگەنەو هەمەوەندو جافی دەوروبەری کەلار.

شەری شوعەیبە بۆ هەردوو لا، چ ئینگلیز و چ عوسمانی، بایەخی زۆر بوو. گوندی شوعەیبە کە کەوتوتە باکووری رۆژئاوای شاری بەصرەوە لە رووی ستراتیژی‌یەوە زۆر گرنگە، ئەوسا هەموو رێگە سەرەکی‌یەکانی بۆ بەصرە دەچوون بەویدا تێدەپەرین، بۆیەکا ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی بەصرە یەکسەر کردیانە سەربازگەو دوایش یەکێك لە بنکە جەنگی‌یە بایەخدارەکانیان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا. سەرکردەی لەشکری عوسمانی لەو باوەرەدا بوو بۆ ئەوەی باشووری عیراق لە ئینگلیز پاك بکاتەوە بەر لە هەر شتێکیتر پێویستە دوژمن لە شوعەیبە دەرپەرێنێ.

هێرشی لەشکری عوسمانی و چەکدارانی کورد و عەرەب بۆ سەر سەربازگەی شوعەیبە بەرەبەیانی دوازدەی نیسانی ساڵی ١٩١٥ لە سێ لاوە دەستی پێ کرد. تۆپی ئینگلیز لەو شەرەدا هێند زاڵ بوو مەودای ئەوەی نەدا هێرش هێنەران بتوانن زۆر لە سەربازگەی شوعەیبە نزیك بکەونەوە، هەرچەندە سەرەتا توانی‌یان بگەنە چەند تەپۆڵکەیەکی دەوروبەری کە بۆ رۆژی داهاتوو ئینگلیزەکان دیسان گرتیانەوە.

بەرەبەیانی چواردەی نیسان دژە هێرشی گەورەی لەشکری ئینگلیز دەستی پێ کرد و دوای شەرێکی قورسێ چەند سەعاتی لەشکری تورك و چەکدارانی کورد و عەرەب خراپ شکان و بە ناچاری کشانەوە بێشەڵانی بورجی‌یە کە کەوتوتە رۆژئاوای شوعەیبەوە. سلێمان عەسکەریی فەرماندەی ئەو هێزانە، کە پیاوێکی ئازاو لێهاتوو بوو،[١٤] لە تاوا خۆی کوشت.

زیانی ئینگلیز لە شەری شوعەیبەدا یەك بە یەك بە دروستی زانراوە،

ئەوان هەزارو دوو صەدو پەنجاو حەوت کوژراوو برینداریان هەبوو.

بەڵام زیانی لەشکری تورك و چەکدارانی کوردو عەرەب تاوەکو ئیستە بە تەواوەتی نەزانراوەو وا دیارە هەرگیز ناشزانرێ. سەرچاوە هەیە ئەو زیانە دەگەیێنێتە شەش هەزار کوژراوگو بریندار.[16] بە پێی سەرچاوە ئینگلیزی‌یە ئاگادارەکان زیانی بەرەی عوسمانی بە کوردو عەرەبەوە دوو هێندی زیانی خۆیان بووە، کە دەکات دەوروبەری دوو هەزارو پێنج صەد کوژراوو بریندار.[17] وا پێ دەچێ ئەم ژمارەیە لە ڕاستی‌یەوە نزیکتر بێ، چونکە ئەو ناوچانەی لاشەی کوژراوەکانیان تێدا کەوتبوو کەوتنەوە دەست ئینگلیز.

هەرچی ژمارەی کوژراوو برینداری عەرەب و کوردە لە شەڕی شوعەیبەدا ئەوە نەزانراوەو نە دەزانرێ. ئارنۆلد ویلسنی لێپرسراوی سیاسی‌ی لەشکری ئینگلیز بە نیمچە گاڵتە پێ کردنێکەوە باسی بەشداری کردنی چەکدارانی عەرەب و کوردی لەو شەڕەدا کردووە،[18] هەرچەندە ئەگەر جەنابی بیری لە ناوەرۆکی ئەو بەشداری‌کردنە بکردایەوە هەڵبەت وا بە سووکی هەڵی نەئەسەنگاند.

نووسەری‌تر هەیە ئەو بەشداری‌کردنەی بەرز نرخاندووە[19] شوکری مەحمود نەدیم، کە وەك وتمان ئەفسەرێکی شارەزایە، بەتایبەتی باسی دەوری چەکدارانی کوردو عەرەبی لە شەڕی ڕۆژی سیازدەی نیساندا کردووەو وەك دەڵێ ئەو ڕۆژە ژمارەیەکی زۆر لە سوارەی عەرەب و کورد بوونە قوچی قوربانی‌ی گوللە تۆپەکانی دوژمن. بەپێی بۆچوونی ئەو ژمارەی کوژراوو برینداری کوردو عەرەب لە شەڕی شوعەیبەدا بە سەر یەکەوە خۆی داوە لە نزیکەی سێ هەزار کەس کە، وەك دەڵێ، چوار یەکی هەموو بەشدارانی کوردو عەرەبە لەو شەڕەدا، ئەوەش بەپێی هەموو پێوەدانێك نیسبەتێکی زۆر بەرزە.[20] من بەش بە حاڵی خۆم وای بۆ دەچم ئەم ژمارەیە زۆر بێ، هەرچەندە دانەری ئەو کتێبە لەبەر ئەوەی زمانی تورکی دەزانێ توانیوی‌یە سەرچاوەی عوسمانیش بەکار بهێنێ.

لەشەڕی شوعەیبەدا لە گەورەپیاوانی کورد نامیقی عەلی ئاغای داوده[21] شەهید بووە. شایانی باسە بنەماڵەی ئەم پیاوە بە درێژایی بیستەکان ناحەزی ئینگلیزو لایەنگرو پشتیوانی شێخ مەحمود بوون.[22] هەروەها، بە پێی گێڕانەوەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی «ڕەشید پاشای خەڵکی سلێمانی‌ی کۆنە موتەصەریفی موتەفیك و چەند پیاوێکی ناوداری‌تری کورد لە شەڕی شوعەیبەدا کوژراون».[23]

وەك گوتمان ناوەرۆکی مێژوویی بەشداری‌کردنی چەکدارانی کوردو عەرەب لە شەڕی شوعەیبەدا گەورەیە. ڕاستە هەستی ئایینی دەوری گەورەی بینی بۆ پاڵ پێوەنانی ئەو هەزاران کەسە بۆ شەڕی ئینگلیز، بەڵام هەستی نیشتمانپەروەریش دەوری خۆی لەو کارەدا بینی، چونکە بەلای ئەوانەوە ئینگلیز هەر کافر و غەیرە دین نەبوون، بەڵکو هەمان کات داگیرکەری بیانیش بوون. پێویستە ئەوەیش لە یاد نەکەین کە لەو ڕۆژگارەدا تێکەڵی‌یەکی زۆر لە نێوان هەستی ئایینی‌و نیشتمانیدا هەبوو، بۆیەکا جیاکردنەوەو دابڕینیان لە یەکدی کارێکی ڕەوا نی‌یە.

ئەو هەستە بزوێنەرە وای کرد سەردارانی عەرەب و کورد خەرجی زۆری ئەو هەزاران کەسە بگرنە ئەستۆی خۆیان. هی وایان بووە بە قەرزو قۆڵە ئەو کارەی ڕاگەیاندووە، چونکە وای دەزانی بەو جۆرە فەرمانی ئایین و نیشتمان بەجێ دێنێ.[24]

ئینجا لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کاربەدەستانی عوسمانی بە دەستوورو پیشەی هەموو شۆڤێنی‌یەکی ڕق ئەستووری بێ وەفاو نالەبار ڕەفتاری ئەو هەزارارن کوردو عەرەبە لە خۆبوردوانەیان کردووە، ئەوەی وای لە گەلێکیان کردووە هەر زوو بگەڕێنەوە هەوارگەی خۆیان. بە پێی گێڕانەوەی نووسەرێکی ئاگادار ئەفسەرێکی گەورەی عوسمانی بە ناوی ئەحمەد بەگی ئەوراقەوە زۆر بێ شەرمانە باسی ئەوەی کردووە چۆن لەشکری عوسمانی دوای «دەرپەڕاندنی ئینگلیز لە شوعەیبەو بەصرە» پێویستە بکەوێتە گیانی «خۆفرۆشانی عیراق» کە بە خایەنی لە قەڵەم داون.[25]

هەرچۆن بێ شەڕی شوعەیبە لاپەڕەیەکی بایەخداری مێژووی هاوچەرخی عیراقە کە کورد دەوری دیاری تێدا بینیوە. دەشێ لەمەودوا ژمارەی ئەو کوردانەی لەو شەڕەدا بەشداری‌یان کردووە بەسێ هەزار کەس دابنرێن نەك کەمتر.

«دوژمنە چاوەڕوانکراوەکانی وڵاتی دووئاوان ـ میسۆپۆتامیا» ناونیشانی سەیری ئەو بەڵگەنامە ئینگلیزی‌یەیە کە ئەم ڕاستی‌یە مێژوویی‌یە بایەخدارەی بۆ پاراستووین. دەربارەی کورد ئەو بەڵگەنامەیە نووسیوی‌یە دەڵێ: «ئەوان لەبەر ئەوەی شەڕکەری چاك و گورج و گۆڵن دوژمنێکی خەتەر، یا ترسناکن»،[26] وەك بەڵگەش باسی بەشداری‌کردنی ئەو سێ هەزار چەکدارە کوردەی لە شەڕی شوعەیبەدا کردووە. ئینگلیز لە ڕاپۆرتە نهێنی‌یە تایبەتی‌یەکانی خۆیاندا بەو جۆرە باسی کوردیان دەکرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك نووسەری بێ ویژدان هەن کە بە زۆری زۆردارەکی کوردیان کردۆتە داردەستی ئینگلیز.

.

پەراوێز:

---

(١) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە

Zaki Saleh, Mesopotamia - Iraq 1600 - 1914, Baghdad, 1957.

(٢) ڕۆژی پێنجی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤ بەریتانیای گەورە بانگی شەڕی دژی دەوڵەتی عوسمانی‌دا.

(٣) ئەسڵەکەی «پاشا قاپی‌سی - قاپوسی»یە کە «بابی عالی» شیان پێ دەگوت، دیارە ئەمیان لە «الباب العالي»ی عەرەبی‌یەوە هاتووە. لە زمانە ئەوروپایی‌یەکاندا (پۆرتە)ی پێ دەڵێن کە بە ئیتالیایی (Porta) و بە فەرەنسەیی (Porte) یەو بە مانای دەرگا دێت. عوسمانی‌یەکان بە جێکاری (مقر عمل) صەدری ئەعزەم، یا سەرەك وەزیرانیان دەگوت پاشا قاپوسی کە مێژونووسان جاروبار بە هەڵە لە بریتی ناوی دەوڵەتی عوسمانی بەکاری دێنن، ئەو هەڵەیەی بوتە ڕاست وو لە مێژوونووسیدا بەو جۆرە جێگەی خۆی کردوتەوە. پێم وایە بە کوردی دەتوانین بڵێین «دەروازەی باڵا» یا «دەروازەی پاشا».

(4) A.T.Wilson, Loyalities Mesoptamia, 1914 - 19178

A personaL and historicaL record, London, 1930, PP. 33 - 34.

(٥) ڕەفیق حیلمی، یادداشت، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل ٤٩ - ٥٠.

(٦) العمیـد الـرکن شکـري محمـود ندیم، حرب العـراق ١٩١٤ - ١٩١٨. دراسة علمیة، الطبعة الثامنة، بغداد، ١٩٧٤، ص ٢٩ - ٣٠.

(٧) عبـدالـرزاق الحسني، العـراق في دوري الاحتـلال والانتـداب، لجزء الأول، صیدا، ١٩٣٥، ص ١٦ - ١٧.

(٨) بە وێنە بڕوانە:

الـدکتـور عبدالله الفیاض، الثورة العراقیة الکبری سنة ١٩٢٠، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٧٥، ص١٥٣.

(9) War Office, 32/5806/2205, «The PltentiaL Enemies in Mesopotamia», Np. 162/428, dated April 15, 1920.

(١٠) بڕوانە: «العراق» (جریدة)، بغداد، ٢٩ حزیران ١٩٧٨.

(١١) دیارە مەبەستی پیاوەکانی‌یە کە هەموویان کورد بوون.

(١٢) دیـدەنی لەگـەڵ مامـۆستـا عەبـدولڕەزاق حەسەنی ڕۆژی نۆزدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٠

(١٣) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

M.S. Lazarev, Kurdistan I Kurdskaya Problema (90 - e godi XIX veka - 1917), Moscow, 1969, PP. 143, 211, 212, 216 - 217, 230, 302, 302, 348, 355-357, 268, 371

(١٤) سلێمـان عەسکـەری‌ی زۆر بڕوای بەپێـویستی‌ی یاریـدەی چەکدارانی کوردو عەرەب بوو. بەر لە شەڕی شوعەیبە بریندار کرابوو، لە کاتی شەڕی شوعەیبەدا بەبرینداری سەرکردایەتی هێزەکانی دەکرد.

(15) A.T.Wilson, Op. CIL., P.35

(١٦) العمید الرکن شکري محمود ندیم، المصدر السابق، ص ٤٩.

(17) A.T. Wilson, Op. Cit., P.35

(18) Jbid, PP. 22-23

(١٩) بە وێنە بڕوانە:

الدکتور عبدالله الفیاض، المصدر السابق، ص ١٤٩ - ١٥٣، العمید الرکن شکري محمود ندیم، المصدر السابق، ص ٢٨ - ٣٠، ٣٣.

(٢٠) العمید الرکن شکري محمود ندیم، المصدر السابق، ص ٣٣.

(٢١) شوکری مەحموود نەدیم بە هەڵە بە هەمەوەندی‌ی لە قەڵەم داوە.

(٢٢) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە لاپەڕە صەدو سی‌و صەدو چل و هەشتی ئەو کتێبەمان کە ساڵی ١٩٧٨ لە بەغدا بەناوی «دور الشعب الکردي في ثورة العشرین العراقیة»ەوە بڵاومان کردوتەوە.

(٢٣) ڕەفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی یەکەم، ل ٥٠.

(٢٤) دوکتـۆر عەبـدوڵـلا فەییـاز لەم بارەیـەوە بە تایبـەتی باسی محەمەد سەعیـد حەبـوبی دەکـات و دەڵێ موڵکی خۆی خستـە ڕەهنەوە تا بتوانێ ئەرکی خەرجی چەکـدارەکـانی بگـرێتـە ئەستـۆ (بڕوانـە لاپەڕە ١٥٢ - ١٥٣ی کتێبەکەی).

(٢٥) فریق المزهر ال فرعون، الحقائق الناصعة في الثورة العراقیة سنة ١٩٢٠، الجزء الاول، بغداد، ١٩٥٢، ص ٣٩ - ٤٠.

(6) W.O., 32/5806/2205, «The Potential Enemies in Mesopotamia», No. 162/428, dated April 15, 1920.

# الكرد ومعركة الشعيبة

د. كمال مظهر

بعد النجاح السريع الذي حققته القوات البريطانية في جنوبي العراق على إثر نشوب الحرب بين انكلترا والدولة العثمانية يوم الخامس من تشرين الثاني سنة ١٩١٤، والتي تمخض عنها إحتلال الفاو والبصرة في غضون أقل من شهر واحد، لجأ الباب العالي الى سلسلة من الاجراءات بهدف ردع القوات الغازية، وطردها من المواقع التي إحتلتها. فرفع الاتحاديون صاغرين شعار الجهاد بعد ان تنكروا له، ولكل مايتعلق به على مدى السنوات السابقة بسبب سياستهم العلمانية والقومية المتعصبة.

تمكن العثمانيون بفضل جهاد أعلنه شيخ الاسلام في استانبول، وكبار رجال الدين في العراق، من تحشيد الاف مؤلفة من المجاهدين العرب والكرد الذين توجهوا بحماس المؤمن صوب الناصرية لمحاربة «الغزاة الكفرة» في الشعيبة.

لاتتوفر حتى اليوم أرقام دقيقة عن عدد العراقيين الذين استجابوا لنداء الجهاد، إذ انها تتراوح مابين عشرة الاف وعشرين ألفا تقديرا لا تحديدا. ويكتنف قدر اكبر من الغموض التقديرات التي قيلت حتى الان عن عدد الكرد الذين اشتركوا في تلك المسيرة المهمة تأريخيا. ففي مذكراته سجل لنا رفيق حيلمي، الذي كان من مقربي الشيخ محمود - قائد المشتركين الكرد في المسيرة، ان «أكثر من الف فارس أتبعوا الشيخ محمود الى الشعيبة». وفي رأي الحسني كان عدد هؤلاء الفا وخمسمائة، الرقم الذي إقتبسه منه أخرون ممن تطرقوا الى الموضوع بصورة عابرة. بينما يؤكد العميد الركن شكري محمود نديم ان «الفي كردي وتركماني» ذهبوا الى الناصرية، ومنها الى الشعيبة. أما الانكليز فقد سجلوا في وثائقهم الخاصة رقما اكبر من كل ما سبق، ففي رأي الوزارة الحربية البريطانية وصل عدد الفرسان الكرد في الشعيبة الى ثلاثة الاف شخص، الرقم الذي نميل اليه اكثر من غيره لاسباب حللناها بشيء من الاسهاب.

ويتكرر الغموض نفسه بالنسبة لضحايا العثمانيين، نظاميين وغير نظاميين، في معركة الشعيبة التي بدأت صبيحة الثاني عشر من نيسان سنة ١٩١٥، واستمرت لمدة ثلاثة أيام. تجسد دور المجاهدين العرب والكرد في يومها الثاني بصورة خاصة.

كان الشيخ محمود البرزنجي أبرز زعيم قاد المجاهدين الكرد الذين كانوا يتألفون أساسا من أنصاره في منطقة السليمانية، ومن أبناء عشائر داوده وزنگنه وفرع كلار من الجاف في منطقة كركوك. وكان كل من رشيد باشا متصرف المنتفك السابق ورفعت اسماعيل بيك داوده ونامق علي اغا والسيد أحمد خانقاه من بين الشخصيات الكردية التي اشتركت في المعركة، وقد استشهد رشيد ونامق في معمعاتها.

يتسم الاشتراك الكردي في معركة الشعيبة باهمية تأريخية خاصة باعتباره أول تصد كردي للمحتلين الانكليز، ولكونه ينطوي أيضاً على أولى سمات لنضال العربي - الكردي المشترك ضد هؤلاء. ومما له مغزاه بهذا الخصوص ان احدى الهوسات التي كان يرددها الناس في الجنوب يومذاك كانت تقول: «ثلثين الجنة لهادينا وثلثها لكاك أحمد وأولاده»، وقد وردت بصيغة أخرى هي «ثلثين الجنة لهادينا وثلثها للشيخ محمود واكراده». ويقصد بالاول منهما في الصياغة الاولى كاك أحمد الشيخ بن الشيخ معروف النودهي الجد الأكبر للشيخ محمود، أما هاديهم فكانوا يقصدون به الوجيه الشامي المعروف هادي مگوطر الذي تحمس للجهاد، وصرف على المجاهدين من حلاله بحماس منقطع النظير.

# پەسەند و رەخنە لە سەر کتێبەکەی شمس محمد اسکندر

نووسینی: محەمەد جەمیل رۆژبەیانی

نووسەری بەرێزی بە پێز مەلا شکور مصطفا ئەمجارەش دوواترین پارچەی وەرگێڕاوی کتێبەکەی «شەمسی محەمەد ئەسکەندەر»ی بۆ ناردم ـ کە ناوی «مێژ ووی کوردە» لەسەردەمی سەدەی ١٥ ـ ١٦ زایینی دا ـ کە چاوێکی پەسەندکارانەو رەخنەگرانەی پێدا بگێرم، ئەوەی ڕاست بێ بینرخێنم، ئەوەش هەڵەبێ ڕاستی بکەمەوە. بەشە پاشماوەی کتێبەکەم خوێندەوە بۆم دەرکەوت ئەم نووسەرە زۆر بیین درێژانەو تێکۆشەرانە هەوڵی کۆکردنەوەی سەرچاوەگەلی زۆری داوە بۆ ئەوەی زانایانە بە خوێنەران و خوێندەوارانی بسەلمێنێ کە «ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی» بۆ دانانی کتێبی «شەرەفنامە» لە مێژ ووی کورددا زۆر خۆی ماندووکردووە بە خوێندنەوەی کتێبە مێژ ویی یەکان وبۆپەیداکردنی سەرچاوە بۆ باسەکان وزۆر کتێبی فارسی، تورکی ـ عەرەبی خوێندوەتەوەو باس وخواسی لێیان هەڵێنجاوە: جا شەمس محەمەد بەم توێژ ینەوەو لێکۆڵینەوەیە نەك هەر باری کۆمەڵایێتی کوردی لە سەدەکانی ١٥ ـ ١٦ زدا (٨ ـ ك) نیشان داوە، بەڵکوزبانی ئەوانەی بریوە کە دەم درێژ ییان کردووە و لافی ئەوەیان لێداوە کە «شەرەف خان» هەر لەخۆڕا مێژ ووی بۆ کورد هەڵبەستووەو ناوی هەندێ سەرداریتی و فەرمانڕەوایی و پاڕشاییتی بۆ کورد دەس نیشان کردووە، هیچ جۆرە سەرچاوەیێکی ڕاستەقینەی نەبووە کە باسی ئەوەی تێدابێ لەوەپێش سەرداریتیو فەرمانڕەواییو پاشاییتیی کورد هەبووبێ.

منیش لەگەڵ «شەمس محەمەد ئەسکەندەر»دام کە «ئەمیر شەرەف خانی بتلیسی» گەرچی لە تەمەنی دوازدە ساڵەدا ئەرکی فەرمانڕەوایی خراوەتە ئەستۆ و بەکاروباری میرییەوە ماندوو بووە، هەم ئەو رۆژگارەی لە ئیران دا پەناهەندە بوون وهەم ئەوحەلەی گەڕاوەتەوە وڵاتی بتلیسی پایتەختی باوباپیرانی هەمیشە لەگەڵ زانست وزانیاریدا خەریك بووەو بە خوێندنەوەو مەتاڵاوە ئاڵاوە. لە عەرەبیدا کتێبەکانی «ئیبنی میسکویە»و «ئیبنی الئەثیر»و «یافعی»

وهی تری خوێندوّتەوە، و باس و خواسی کوردی لیّ وەرگرتوون، ولەفارسی دا کتێبەکانی «حافظ ئەبرو» ـ «رەشیدی» «جوەینی» ـ «سەمەرقەندی» ـ «یەزدی» ـ قەزوینی» وزۆری تری خوێندوّتەوە ویەشی مێژ ووی کوردی لەم سەرچاوانەوە هەڵێنجاوبەوکتێبە تورکی یەکانی عوثمانی ی سەردەمی خوێشی خوێندوّتەوە. جگە لەم سەرچاوانە بەهۆی ئەوەوە کە سەردەمیّ لە ئیران پایەی «میری میرانی هەموو سەردارانی کوردی دراوتیّ وتۆانیویە زۆر لەسەردارانی کورد بناسیّ و هەواڵی هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتیان بزانیّ، کە گەروایشەتەوە ولاتی بتلیسی ژێر دەسەلاتی عوثمانی بەهۆی ئەوەوە کە «مەلا ئیدریسی بتلیسی» یەکەم کەس بووە لەوەبەر کاروباری هەموو سەرداره کوردەکانی لە ئەستۆدا بووە، بنەماڵەی میرانی بتلیسی هەمیشە لەناو فەرمانڕەوایانی کورددا بەرێزو جێگەی پەناو هیوابوون، وسەرداران وفەرمانڕەوایان چوونەتە دیدەنی یان. بەم جۆرە بۆی لواوە کە زۆربەی سەردارانی هەرێمەکان بناسیّ وئەوە کۆبکاتەوە کەدەربارەیان نووسراوو وتراوەو هەواڵ بگۆرێتەوەو دەنگ و باس بزانیّ. ئەوەی ڕاستی بیّ من بەش، بەحاڵی خۆم دەڵێم هەرگا ناوی «شەرەف خانی بتلیسی» بێت دەبیّ هەموو کوردێکی ووشیارو زرنگ و خاوەن ئاوەز سەری ڕێزگیرانەو وبەشکۆدانان، بهێنێتە کرنووش، ودەم بکاتەوە بە سپاس و هەڵنا.

ڕاستە لەسەرەتای «شەرەفنامە»دا هەندیّ باس و خواسی پرووپووچ و ئەفسانە هەیە وەکو ئەوەی کورد پاشماوەی ئەوانەن لە چنگی ئەژدەهاك ڕزگاربوون، ویا ئەوەی کورد لە بنەڕەتا توخمی عەفاریتەکانی سلێمانن، بیّگومان «شەرەف خان» ئەوانەی هەربۆیەوە نیشان داوە کە نەتەوەی کوردی بکەن بە مللەتانیّ کە ئەوانیان خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە چ جۆرە مێژ وویی ئەفسانەیی یان بۆ د روست کردوون خۆی بۆئەوەی باس نەکردوون باوەری پیّ یان بیّ. با لێرەدا نیکتەیێکی «سەعدی شیرازی» بخەمە مدە یاد کە نووسیویە: کابرایێ چووە گەرماوە لەسەر دیوارەکە نیگارێکی زۆر ناشرینی دی کە چاوی بەرەوژ وور وکەللەسەری سەربەرەو خوار وددانی گرودەمی تر لا قەوچ وپیچ بوو، پرسی ئەم نیگارە هی کێیە؟ ووتیان شەیتان! کابرا شەولە خەویا نیگارێکی زۆر جوانی کەوتە بەرچاو کە لەوە جوانتری لە تەمەنی خۆیا نەدیبو، ووتی: تۆکێی؟ وتی: من شەیتانم! کابرا وتی: درۆمەکە من وێنەی ناشرینی تۆم لە گەرماوە دی لێی ترسام وقیزم لێ هاتەوە! ئێستە تۆئەوەندە شیرینی دەمەوی بتخوم.

شەیتان وتی: ئەوانەی وێنەی منیان بەوجۆرە کێشاوە دوژمنن، نەتەوەی ئەوئادەمەن کە من لە بەهەشت دەرم کرد، چۆن هیوا دەکەی وێنەی جوانی من پیشان بدەن.»

بەڵی وەکو شیخ رەضای تاڵەبانی وتی:

«کیّ بیّ لە دلێرانی عەشایر کە نەچوو بیّ

وەك تیری ئەجە ل نووکی ڕمی جافی بە نافا»

هەرگیز دوژمنیّ کە نووکی خەنجەری دلێرپیاوانی کوردی چوو بیّ بە سنگا باوەڕ ناکریّ و ناگونجیّ کورد هەڵ بنیّ، بەڵکو هەمیشە باسی نەنگ وناشرینی ی دەکات، وەهەمیشە بەکەم و بیّ هێزی دائەنیّ، ولەژێر پیّ لەقەی خەڵکا ئەبینیّ. وگاڵتەی لیّ دیّ کە بیبنیّ نووسەرێك یا هۆزانڤانێك کورد هەڵ ئەنیّ ونیگار بۆ کورد دوروست ئەکات و لەژێریا ئەنووسی:

«عەزیزم شەهسوارێکە گوزەرکا گەڕ بە ئەلبورزا»

«ئەکا ضەربێ سمی ئەسپی لە خارا تووتیا پەیدا»

بەڵی! چونکە ئازایێتی ی کورد هەمیشە بۆسەرکەوتنی خۆی نەبووەو بۆبەرزکردنەوەی خەڵك بووە، دەبیّ هەر وێنەی ناشرینی بۆ بکێشریّ.

بابێینەوە سەر باسی «شەرەف خان» ئەوباسی فەرمانرەوایی «حەسەن وەیهی» لە «ئیبنی میسکویە» وەرگرتووە، باسی «عەییاری» لە «ئیبنی الئەثیر» وەرگرتووە، باسی بنەماڵەی مەر وانی لە «یافعی» هەلینجاوە، باسی لورستانی گەورەو لورستانی بچوکی لە «زوبدەت التەواریخ»و «تەئریخی گوزیدە» وەرگرتووە باسی سەردارانی کەلوری لە «ظەفەرنامە»و «مەطلەع السەعدەین» هەلئینجاوە وباسی دەوڵەتی «ئەییوبی» لە «ئەلکامل»ە دەهێناوە تاد... ئەم سەرچاوانە، چاوی ئەوانە کوێر دەکەن کە دەڵێن «شەرەف خان» خۆی دەنگ و باسەکانی هەڵبەستووە..

بابێینە سەر باسی «شەمسی محەمەد» هەروەکو لە سەرەتادا وتم: زۆر ماندوبووە بۆدانانی کتێبەکەی، بەڵام وا دیارە ناوی سەرچاوەکانی لە پاوەمانی کتێبەکەدا بە زنجیرە نووسیوەو بەرامبەریان ژمارەی داوە، لە دەروونی کتێبەکەدا دیباردی بۆ لاپەرەی ژمارەکان دەکات، ئەگەر ئەوکەسەی سەرنجی نووسینەکەی بدات وچاوی بە زنجیرەکە ئەکەویّ، نازانیّ ئەم ژمارەیانە، هیّ چ کتێب گەلێکن؟! تەنانەت کە ناوی «شەرەفنامە» دەبات ودیباردی بۆ لاپەرەکان دەکات مەبەستی چاپە فارسی یەکەی «پتروس گراد»ە کە ساڵی ١٢٧٨ك (١٨٦٢ز) چاپ کراوە واتا ـ ١٢٧ ساڵ لەمەوبەر.

من لەگەڵ ئەوەشدا کە بە سپاسەوە «شەمسی محەمەد» هەڵئەنێم نوو رەخنەم لێی هەیە:

- یەکەم: ئەوەیە کە هەواڵەکان پاش وپێش دەکات ویەك چێر، لە شەرەفنامەی نەکۆڵێوەتەوە شتێ لەلاپەرە (٣٨٠) وەردەگریت بە دوایا شتێکی دی لەلاپەرە (١٥) وەردەگرێ، ئەم کارەی ئەو کەسە ماندوو نەکات کە بیەوی بۆ توێژ ینەوە کتێبەکەی بخوێنێتەوە

- دووەم: ئەمەیە لە دەرونی کتێبەکەدا ناوی سەرچاوەکان نە نووسراوە، لەبری ئەوانە ژمارە دانراوە، ئەوی کتێبەکەی ئەوی لەبەر دەستا نەبێ، نازانێ مەبەستی کام سەرچاوەیە ئنجا با بێمە سەر رەخنە: (ل ـ ٨).

١ ـ لە هەواڵی ساڵی ٩٢٠ك (١٥١٤ زا) نووسیویە شەرەف خان باسی دەوڵەمەندیی جەمشید بەگی کوری روستەم پەگی «پالۆ» دەکات کە ولاتەکەی خۆی لە دەسەلاتی قزلباش (صەفەوییە) رزگار کردووە.. ونووسیویە: ئەم میرە ساڵی سێ هەزار تویشترە نێر (خرت = تەگە)ی لە پەزەکانی خۆی هەڵبژاردووەو بۆ فرۆشتن ناردویە بۆ «حەلەب» وهەر یەکە لەم تەگەیانە نالێکی لە مل کراوە، بەم جۆرە نزیکەی چل خەروار (دوازدە تۆن) نالیشی گەیاندۆتە بازار.» ئنجا «شەمسی ئەسکەندەر» رەخنەی لە هەواڵەکە گرتووە ونووسیویە: «شەرەف خان برێکی پیوە ناوەتاد..»

ئەوەی راستی بێ شەرەف خان ساڵی ٩٤٩ك (١٥٤٢زا) لە دایك بووە، ئەویش لە قوم کە یەکێکە لە شارەکانی ئێران وساڵی ٩٩٦ك (١٥٨٧زا) گەراوەتەوە ولاتی بتلیسی ئەگەر ئەم جۆرە هەواڵەی بیستبێ کە پر لە ئیشاڵ و درۆش بووبێ تاوانی ئەو نییە.

٢ ـ ئەلقاسی کوری شاهباز (کە یەکێکە لە میرانی مایدەشت ماهی دەشت) دەبوساڵی چل هەزار سەر ئاژەڵ بۆ، بەغدا بنێرێ» ئەمەش دیسان وەك هەواڵی پێشو (مبالغە)ی تێدایە، بەلام دیسانەوە تاوانی شەرەف خانی نییە

٣ ـ ساڵی ١٤٩٨زا (٩٠٤ك) لە فەرمانی سیورغاڵێکدا کە بە میر ئەسفەندیار بەگی کوردی میری ئەگیل دراوە. من لام وایە ئەم هەواڵەی «شەمسی محەمەد» بەڵەی تێ کەوتووە. فەرمانرەوایانی هەر سێ لقی ئەگیل لە هەرسێ پەلەکەدا (بولدوقانی ـ پالو ـ چەرموگ) کەسێکی وەهایان نەبووە سیورخالی) بدرێتێ کە «ئەسفەندیاری کوری شاە عەلی چەرموگ» ونە «ئەسفەندیاری کوری ئەمیر عیسای بولدوقانی» لە شەرەفنامەدا باسی وەهانییە. وادییارە «شەمسی محەمەدی» یا لە کتیبێکی تری وەرگرتووە یاخود، نامەکەی بەهەڵە یادداشت کردووە.

٤ ـ شەمسی محەمەد باسی ئەوەی کردووە گۆیا شەرەف خان «حەسەنە درێژ ی پادشای ئاق قویو نلوی» بە دادپەروە داناوە..

من لە شەرەف نامەدا، شتی وەهام، بەرچاو نەکەوتووە و بباوەریش ناکرێ «شەرەف خان» ددانێ خێری پیا بنێ. چونکە ئەمیر شەمس الدینی باپیرە گەورەی زاوای «قەرە یوسف قەراقویونلو» بووە، ئوزون حەسەن (حەسەنە درێژ) دوستوری داوە کە دۆستانی قەرە یوسف هەموزەبوون بکرێن، ولەسەردەمی فەرمان رەوایی «ئەمیر ئیبراهیم بتلیسی»دا سپای نادرە سەر بتلیسی کە دەبێ خاکی ولاتەکە بە توورەکە ببێژ رێ، ئەوە بوو «سلیمان بەگی بێژەن ئوغلی» شالاوی کردە سەربتلیس و سێ ساڵی تەواو گەمارۆیدا بە جۆرێ کە خەڵکیکی زۆر لە برسان وبەدررم وپەتا مردن وتەنیا ئەمیر ئیبراهیم حەوت کەسێ لە قەلاکە مابوون (!؟)

لەم سەردەمەدا «مەحمود ئوغلی» ناو کە «هۆزانڤان»ی پەسن و هەڵنانی سلیمان بێژەن بو، (وادییارە دڵی بە هەزاران ئاق قویونلویی سووتابێ) پارچە هەڵبەستێکی تورکیی لە هەڵنانی سلیمان دا هۆنییەوەو بۆی نارد؛ نوخشە هەڵبەستی پارچەکە ئەم فەردە بون

«شها! اول بدلیسك کوردی مطیع اولمازسلیمانە»

«ازلدن قالمە عادتدر چالشورلراو چاغ اوشە»

[واتا: ئەی پادشاه! کوردی بتلیس سەر بۆ سلیمان دانانەوێنن، لەبەرایی جیهانەوە ئەم یاسایە ماوەتەوە کە بەسەر کوانووەوە تێ ئەکۆشن] پاش ئەوە هەندێ خێرخوای ئاشتی خوار کەوتنە ناوبژ ی و بریار درا «ئیبراهیم بەگ» قەلاکە بداتە دەستەوە بەو مەرجەی خۆی و کەس و کاری لە مەرگ و ئازار دوور بن، بۆ ئەم پەیمانە ئەنگوستیلەی «ئوزون حەسەن» بۆشایەتی وبەڵگەیی و دڵنیایی نێررا بۆ ئیبراهیم بەگ ئنجا لە قەلاکە هاتە خوارەوەو رەوانەی لای ئوزون حەسەن کرا، وئەویش ناردی لە «قوم» داینا و سلیمان بێژەن بەم جۆرە چووە قەلای بتلیسەوە تاد... (شەرەفنامە چاپی فارسی لاپەرە ٥٠٤ ـ ٥٠٧ بەلام خاوەنی «ئەحسەن التەواریخ» ب١١/ لاپەرە/ ٥١٠) نووسیویە: ساڵی ٨٧٣ك (١٤٦٨زا) حەسەن پادشاە سلیمان بیگ بیجن (بیژەن)ی بە کۆمەڵەیێ لە میران و فەرماندەیانی گەورەوەو بە پێنج هەزار سوارەوە نارد بۆ داگیرکردنی بتلیس، وئەمیرەکان ئەمانە بوون: «ئەصلان بەگی زوالقەدر ـ ئەحمەد بەگی ئەسفەندیار بەگ ـ ایل آلدی بەگی چینی ـ ئەمیر محەمەد بەگی سەعدلو ـ ئەمیر خانی سەعدلو ـ کورەکەی سارو پیر

عەلی و شاهـ محەممەد دەخار لو) ئەمانە شالاویان کردە سەر بتلیسی .
ئەمیر ئیبراهیم کە زانی ناتوانی بەرانگاریان بکات دایکی خۆیی بە دییاری و دەهـەنـەیێکی زۆرەوە نارد بۆلایی (حـەسەن پادشاهـ) وداوای ئەمـانی کرد . پادشـاهـ لە گوناهی بوردو فەرمـانی دا بە میـرەکـانی سپاکـەی واز لە گەمـارۆی قەلاکـە بهێنن و بگەڕێنەوە) ئەمـەی لە (دییـار بەکری) وەرگرتووە (ب/٢/ لاپەڕە ٥٤٢ ـ ٥٤٣) بەڵام بەلای منـەوە قسـەکـانی شەرەف خان راسـترە . پێشینـان وتـویـانە : (خاوەن ماڵ چاتر ئەزانێ لە ماڵەکەیاچی هەیە!) وبەمەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە (شەرەف خان) بەو تاوانبارەی نەوتووە) دادپەروەر)

٥ ـ هەم دەربارەی ساڵی ٧٨٣ نووسیویە : عیزالدین شیر دەبو باجی تاخمـەی ئەو شارە بە ئەمیـر تەیمـور بدا) . ئەم عیبارەتەی (شەمس محـەمـەد) هەڵـەیـە ، فارسیـی یەکەی خراپ تەرجەمە کردووە . ئەمیر شەرەف نووسیویە : (پاش شەڕو شۆر جارێکی تریش عیزالدین بەر لوطفی ئەمیـرتـەیمـور کەوتـەوەو ... بوردو فەرمـانـرەوایی یەکەیدا یەووقـەباڵەی فەرمانڕەوایی بە (تاڵمەی سووری) تەیموری درایێ و ماوای گەڕانەوەی درا) . لاپەڕە (١٢٨) چاپی فارسیی قاهیرە) .

٦ ـ شەمسی محـەمـەد نووسیـویـە : لە ویلایەتی تبلیس دا جگە لە بازرگـانـانی ئاذەربـایجـان وئیرانی وئە رمەنی بازرگانانی روس و چین و بولغاری وهیندیش هەبوون)

دیسـانـەوە ئەم تەرجەمـەیـەی (شـەمسی محـەمـەد) هەڵـەیـە ، شەرفنـامـە نووسیـویـە : (گـەشتیـارانی جدە وزەنگبارو بازرگانانی خەط وختەن وروس وسەقلاب وبولغارو سەوداگەرانی عەرەب و عەجەم و ورەوەندەکانی بەشی زۆری جیهان هاتوچو بکەن ، مادام بە قومشی بەردەکـون کراوە کەی بتلیسـانـەڕۆن ، گونجـاییشی تری نی یـە!) لاپەڕە (٤٤٥ فارسی) . مەبەستی ئەوەیە بتلیس جێگەکەی ئەوەنـدە سەخت و بێ ڕێیـە تەنیـا لە رێگـەی قومشە بەردەکەوە رێ هەیە . مەرج نی یە خەڵقی ئەو ولاتانە هاتوچوی بتلیسی بکەن یانە!

٧ ـ شەمسی نووسیویـە : لەنـاو مەلاکـاندا ناوی شیخ عومەر کە لە بنەمـاڵـەی شیـخ نەجم الدینە . . . تاد . . .) . بەداخەوە شەمسی لێرەدا هەڵـەی کردووە شەرەفنـامـە نووسیویە : (عەمماری یاسر کە لەمـوریـدانی شیـخ ئەبـو نەجیب الدین سوهرەوەردییە وهەروا پیر شیخ نەجم الدین کوبرا ، خەڵقی بتلیسن . (لاپەڕە ٤٤٨ فارسی)

٨ ـ مەلا ئیـدریسی بتلیسی . . .) شەمسی محـەمـەد زۆر پیـاوانـە سەرگـوزەشتیکی تەواوی (حەکیم مەلا ئیدریسی بتلیسی) کردووەو هەڵی ناوە بەڵام وادییـارە نەیـزانیـوە کە (مـەولانـا حیسـام الـدین) باوکێتی! جالەم هەلەدا سەرگوزەشتی ئەنووسم :

أ ـ حیسام الدین عەلی بتلیسی کوری عەبداللاە حەنەفی صوفی ، یەکێ بولە زانایانی پایە بەرز ویەکێ بولە صوفی یە بەناوبانگەکان . طەریقـەتی نوربەخشیەی لە ئیران وەرگرتبو ، زنجیر ەی طەریقەتی ئەچـووەوە سەر شیـخ عەممار یاسری بتلیسی لە سەردەمی ژیانی دا زۆر کتێبی داناوە :

١ ـ شەرحی لەسـەر زاراوە صوفیتی یـەکـانی شیـخ عەبـدالـرەزاق کاشانی (الکنز الخفي)

٢ ـ تەفسیرێکی قورئان لە پێنج بەرگدا بە ناوی (جامع التنزیل والتأویل)

٣ ـ شەرحی (گـوڵشـەنی راز) بە فارسی . ساڵی ٩٠٠ك (١٤٩٤زا) کۆچی دوایی کراوە وپـەداخـەوە ژمـارە (٩٠٠) لە شەرەفنـامـە عەرەبی یەکەی تەرجەمەی من دابوتە (٧٠٠) وهەڵەیە .

ب ـ حەکیم مەولانا ئیدریسی بتلیسی :

کوری عەلی حسـام الـدین ، وهـەر لە بتلیس لە دایـك بووە ، خوێنـدنی لای باوکی و لە ئیـران تەواو کردووە ، نووسـەر و هۆزانڤان بووە . لە سەرەتـادا لە نووسینگـەی سولطان یەعقوبی ئاق قویونلودا سەردەفتـەر بووە ، پاشـان چووەتـە لای سولطـان بایەزیدی عوثمانی ورێـزی وەرگـرتـووە ، سولطـان داوای لێ کـردوو، مێـژووی بنـەمـاڵـەکەیان بنووسێ ئەویش بە پەیڕەویی (شانامەی فیردەوسی) هەر بە هەڵبـەست کتێبێکی مێـژویی نووسیـوە ، نزیکەی ٨٠ هەزار بەیت و ناوی ناوە (هـەشت بەهـەشت) بە ناوی هەشت سولطـانی عوثمانی یەوە کە ئەمانەن :

عوثمانی یەکەم (٦٩٩ ـ ٧٢٦ك = ١٢٩٩ ـ ١٣٢٦ زا
اورخان (٧٢٦ ـ ٧٦١ك =١٣٢٦ ـ ١٣٦٠ زا
مورادی یەکەم (٧٦١ ـ ٧٩٢ك = ١٣٦٠ ـ ١٣٨٩ زا
بایەزیدی یەکەم (٧٩٢ ـ ٨٠٥ك = ١٣٨٩ ـ ١٤٠٢ زا
محەمەدی یەکەم (٨٠٥ ـ ٨٢٤ك = ١٤٠٢ ـ ١٤٢١زا
مرادی دووم (٨٢٤ ـ ٨٥٥ك = ١٤٢١ ـ ١٤٥١ زا
محەمەدی دووم (٨٥٥ ـ٨٨٦ك = ١٤٥١ ـ ١٤٨١ زا
(محمد فاتح)
بایەزیدی دووم (٨٨٦ ـ٩١٨ك = ١٤٨١ ـ ١٥١٢ زا

وەك وتـراوە بریـار بوو خەڵاتێکی گەورە یا پایـەیێکی گەورەی بداتێ ، کە (بـایـەزیـد) دڵی رازی نەکـردووە ، گەڕاوەتـەوە بتلیسی

ئەویوە چووە بۆ (حەج)و لە حجازەوە هەرە شەی بۆ سولطان بایەزید ناردووە، کە لە دیباچەو پاومانی کتێبەکەدا باسی «درۆزنی و ناراستاڵی ئەو دەکــات. . . کە «ســولطـان سەلیم» بووە پاد شــای عوثمـانی ناردویــە بە شوێن ئیـدریـسـا وکـردویـە بە «راوێـژ» ولـەگـەڵ خۆی گێراوی‌یە. وبۆ کاروباری کوردستان و ئیران و عەرەبستان پرسی پێ کردووە. ئەوەی راستی بێ «مــەلا ئیـدریسی بتلیـسی» بلیمـەتێکی جیهـانی بووە زۆر هەوڵی داوە کە چەنـد فەرمـانڕەوایی سەربەخۆ لە کوردستـانـا دابمـەزرێنێ کە فەرمـانڕەوایی‌یەکان پایەداربن، ولەبەر ئەوەی کە سولطان لێی نەکەوێتە گومان ولە ملی نەدا، هەرگیز داوای پایــەی بۆخۆی نەکــردووە، وگــەرچـی حەزی لەوە بووە هەمــوو فەرمـانـڕەوایی‌یـە کوردەکـان لە سای ئەوا یەك دەوڵەت پێك بهێنن، بەڵام کوردەکان ئەوحەلە لە هەموو کاتێ زۆرتر عیلانەو خێڵەکی‌یان لێ‌یـان خوریـوە وگـەرچی مەلا ئیدریسیان بەناو بەسەرۆکی خۆیان زانیوە، بەڵام بۆ ئەوەی هەموویان سەر بۆیەك جۆرە ژیان شۆر بکەن ڕوویان نیشان نەداوە

مەلا ئیدریس جگە لە «هەشت بەهەشت» کتێبکیشی دەربارەی سولطان سەلیم داناوە وناوی ناوە «سلیمە». ئەم زانا هوشیارە ناودارە سـاڵـی ٩٢٦ك ١٥٢٠زا کۆچـی دوایی کردووەو لە ئەستــانبــول لە گورستانی (ئەبائەیوبی ئەنصاری) نێرژ راوە.

بەداخــەوە هەنـدێ نەخـوێنـدەواری نەزان شاڵاوی ئەبەنە سەرو جنێوی ئەدەنێ لەسەرئەوەی کە لە شەڕی «چالدیران»دا کوردەکانی کێشـاوە بەلای «عـوثمـانی»دا هەزار «رەحمـەت» لەگـۆری «مـەلا ئیدریسی بتلیسی» کە لە سای ڕابەری «ڕامیاری»و «خوێندەواری» ئەوەوە بە شاری بتلیسی بەوپچـوکی‌یـە بۆتـە جێگەی شانازی گەلی کورد، بەلافیشی نازانم بڵێم ئەگەر هەندێ هۆی پڕوپووچ «مەولانا خالیـدی میکایەلی شارەزوری لە سلیمانی ولە بەغدا نەڕەتاندایە، ئەویش ئەیتــوانی لەو سەر دارانــەی کە ناوی نابــوون خەلیفــەو هەمـوویـان لە پیـاوە گەورەکـانی ناسـراوی سەردەمی خۆیان بوون ئەیتــوانی بنـاغـەیێکی بەهێـز بۆ کوردواری دابمـەزرێنێ وەگـەر نە شێـخـیـکـی صوفی بۆچ «ســەیـد ئەحمــەدی سەردار، شیــخ عوبــەیــدیللای نەهــرێ، شیــخ عوثـمــانی خالیــد ئاغــای هەورامانی و. . . ئەکاتە خەلیفە؟ مەگەر دەرویش و صوفی هەژاری بێ دەسەلات ولەخوا ترس لەم شێخ و ئاغادەس ڕویانە بۆخەلیفەیی شایـەت تر نەبـوون؟! ئەگەر مەبەستەکە طەریقەت بوایە، ودەوڵەت دامەزراندن نەبوایە دەبو صوفی‌ی هەژار ببێ بە خەلیفە.

# نقد كتاب (شمسى محمد أسكندر) وتقريضه

جميل الروژبياني ـ بغداد

كان السيد شمسى محمد اسكندري الباحث الآذربايجاني طالبا في قسم التأريخ فكان يسمع انتقادات موجهة الى الأمير «شرف خان البدليسى» على محتويات كتابه «شرفنامه» في تأريخ الاكراد، من ان مؤلفه بنى كتابه على التخيلات جامعاً مواد الاخبار الخرافية والاقوال المبتورة من أفواه افراد العشائر الكردية المختلفة الطاعنين في السن نساء ورجالاً هناك وهنا، مضيفاً اليها ماسمعه من القصص الايرانية والطورانية ثم الاسلامية فاعتبرها من بطولات شعبه الكردي وبسالات أمته، دون سند تأريخي او دليل منطقي.

ولقد شاء القدر ان يختار (شمسى محمد اسكندرى» المنتهي من الدراسة كتاب «شرفنامه» لبحثه الجامعي (اطروحة) لنيل الآجازة العلمية (دكتوراه) به، فانصرف الى دراسة شرفنامه دراسة عميقة وغربل موادها غربلة دقيقة فوجد الكتاب أجل من ان ينتقد واعظم شأناً من ان ينتقص، وهو مقتبس من مصادر تأريخية موثقة، وناتج من جهد مبذول لسنين مستنداً على منابع وافرة، يحوي تأريخ شعب مسالم نبيل تعيش بأبنائه الذين تقاعسوا عن خدمته، هذا الشعب الكردي المتمسك بوطنه، المدافع عن بلده، المقاوم للمعتدي الغاصب.. وهو يداس تحت اقدام المحتلين الغاصبين منذ ان اضمحلت الامبراطورية المادية العريقة. فللمثال قامت الدولة البويهية (آل بويه) بقيادة عضد الدولة بغزو كردستان فقضت على الدولة الحسنويهية الكردية، وقامت السلاجقة وعلى رأسها طغرل السلجوقي بتهجير ابناء الشعب الكردي من مناطق سكناها وقضت على حكومة الشوانكاره الكردية، وغزت الخوارزميه بلاد الكرد فنهبتها ودمرتها الى ان لقى «جلال الدين خوارزم» حتفه بيد أحد الاكراد.. وأتى جنگيز المغولي وأخلافه فاحدثوا افظع المجازر في لرستان، وأغار هولاكو التتري على مناطق همدان واردلان وحلوان وشهرزور فدكها دكا، وانبرى تيمور الاعرج الايلخاني فارتكب اقسى انواع الوحشية من القتل والتدمير في مناطق كرمانشاه ودينور وحلوان ودرتنگ وطوز خورماتو(خويلنجان) حتى قتل ابنه عمر الشيخ بيد احد الاكراد، وغزت الدولة الآق قويونلية وعلى رأسها حسن الطويل بقيادة القائد سليمان بيژن اوعلو «بدليس» فحاصرها ثلاثة اعوام دون ان يظفر بها فأنشد الشاعر المداح للسلطان حسن باللغة التركية مطلعها:

«شها! اول بدليسك كوردى مطيع اولماز سليمانه
ازلدن قالمه عاد تدر چاليشورلر اوجاغ اوشه»

«ايها السلطان ان اكراد بدليس لايسنقادون لسليمان، فدأبهم منذ الازل اللعب بالنار»

وجاء دور القرهقويونليين فأحدثوا المذابح في الشعب الكردي ثم جاء دور الصفويين فقاموا بتدمير القرى وافناء الشعب وقد قيل في تلك المجازر ملاحم «دمدم» وملاحم «موكريان» وغيرها. اما العثمانيون الذين استطاعوا مقاومة الصفويين بفضل الامارات الكردية، ثم احتلوا قسما من الشرق الاوسط فكافأوا الاكراد بالغاء اماراتهم وتدمير بلادهم وجعلهم أعداء للشعب الأرمني، ونهب الثروات المادية والعلمية حتى المكتبات الخطية. علما بان هذه الحكومات الاسلامية كانت تزعم الاخوة الدينيه وتدعي نشر العدل والانصاف والحرية ثم لم يأل الحكام الانجليز واشياعهم ايضا من ابادة الاكراد هناك وهنا..

نعم ان «شمسى محمد اسكندرى» درس «شرفنامه» الحاوى لكثير من المآسي التي حل بالاكراد فوجد الكتاب مستنداً على مصادر موثقة مابين منابع عربية كاليافعي وابن الاثير، ومصادر فارسية وتركية، فكتب بحثه «الاكراد في القرن السادس عشر» فصفع به على أفواه منكري حقوق الشعب الكردي صفعة وعلى جباه الذين اعماهم التعصب الحاقد لطمة، وقد أجاد في بحثه حين تطرق الى ما قاساه الشعب الكردي من الآلام حتى العهد الأخير (رحمة الله).

فبارك الله في الاستاذ الفاضل ملا شكور مصطفى الاختصاصي في معرفة اللغة التركية قديمها وحديثها، بحرفيها اللاتيني الروسي والتركي، فقد حصل على البحث الذي كتبه «شمسى محمد اسكندري» وقام بترجمته الى اللغة الكردية بقلم السيال المبدع في اربع مقالات متابعة عرضها عليّ الواحدة تلو الاخرى لاجيل فيها النظر (مشكوراً فسنحت لي الفرصة فأخذت البحث مع المصادر التأريخية التي اعتمد عليها «شمسى» فوجدت البحث عميقاً دقيقاً، فأضفت اليه في الحواشي مافاته استدراكا اوتطرق اليه سهواًتصحيحا وتصويبا. وارجوان يستفيد القارىء من المقال....

کۆمەڵایەتی

# نەخشە هەڵکەندراوەکەی هۆرین و شێخان

کمال نوري معروف

ئەو ناوچە شاخاوی‌یەی کە سنووری عیراقی سەروو، وسەرووی ڕۆژهەڵاتی بەیەکەوە بەستۆتەوەو، درێژی سنوورەکەی بە درێژایی ڕوباری دیجلەیە لە ڕۆژهەڵاتەوە، بە کوردستان ناسراوە.

شوێنێکی دیارو دەرکەوتووی هەیە لە لای نێوەندە ئاساری‌یە زانستی‌یەکانەوە.. چونکە پڕە لە شوێنەواری ئاساری، جا ئیتر ئەگەر ئەو شوێنەوارانە گردبن، یان کەلاوەکۆن، یان نەخشی هەڵکەندراوی سەر بەرد.. ئەوەبوو ئەوروپاییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە تامەزرۆی ئەوەبوون بێنە دیدەنی ئەم شوێنەوارانە.. دیدەنیەکەش کاتێك دەستی پێکرد ڕۆژئاواییەکان گرنگی تەواویان بەکاروباری ڕۆژهەڵات دا بە ئامانجی زانینی دەنگوباسی گەلە لەناوچووەکانی بۆنەوە ئاساری‌یەکانی دوا ڕۆژ، چونکە تا ماوەیەکی نزیك لەمەوبەر کەس نەبوو نەهێنی‌یەکانی بزانێت، جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت لە زانا ڕۆژئاواییەکان کە زوبانە کۆنەکانیان ئەزانی.[1]

بەم هۆیەوە زۆر لەو زانا ڕۆژئاواییانە، چوونە دیدەنی ناوچەکە بۆ زانینی دەنگوباسی گەلە کۆنەکانی و نووسین دەربارەیان و بڵاوکردنەوەی ئەو زانیاریانە بۆگەلانی ڕۆژئاوایی خۆیان.. ئەم کارە وای لەو زانا ڕۆژئاواییانەی دیکەش کرد کە بە دوای مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵات و دەنگوباسی گەلەکانیاندا بگەڕێن و، هاوبەشی لەم کارەدا بکەن، کە چۆن لەوەوپێش گەڕۆك و مێژوو نووسەکان کردوویانە.[2]

بەشێکی ئەم گەڕان و پشکنین و هەوڵدانەیان تەرخان کرد بۆ گەڕان بە دوای نەخشی هەڵکەندراوی سەر بەرد کە دانیشتوانی کۆنی شیوی نێوان دووڕوبارەکە بۆیان جێ‌هێشتووین. ئەمە بووە هۆی ئەوەی زۆر لەو نەخشە بەردینانە بدۆزنەوە کە ڕادەی شارستانێتی ئەو گەلانە نیشان ئەدات..

ئەمانەش بە هەموویان دیاردەی تێکەڵاوبوونی شارستانێتی ژیانی ئەو سەردەمە دەرئەخەن.

ئەوەی لێرەدا باسی ئەکەین، نەخشێکی شاخاوی‌یە، لای خەڵکی کوردی ناوچەکە بە نەخشە هەڵکەندراوەکەی هۆرین و شێخان یان دەربەند بێلوولە ناسراوە.[3]

دەتوانین بە ڕێگەی خانەقین بگەینە گوندی هۆرین و شێخان، کە نەخشەکە ٩٢ کیلۆمەتر لێوەی دوورەو ئەکەوێتە باکووری‌یەوە، ئەم گوندەش مەرکەزی ناحیەکەیەو سەر بە قەزای خانەقینە.. لەوێشەوە بۆ دەربەندەکە.[4]

ئەم دەربەندەش کە دووربووە لە مەڵبەندەکانی شارستانێتی وڵاتی نێوان دووڕوبار، شوێنەوارێکی کۆنی شاردۆتەوە کە بەهۆیەوە لە سەدەی ڕابوردووەوە دووگوندی کوێستانی هۆرین و شێخانی بە کۆمەڵی شوێنەوارناسان ناساند.. کە لەنزیکیانەوە گوندی تاهیربەگی شەرەف بەیانی کوردی دێت.. کە لەمەرکەزی ناحیەکەوە پانزە کیلۆمەتر دوورە، لەوێشەوە بە سواری ئەسپ، یان بە پێ ئەتوانین بگەینە گوندی کوێخا محەمەدی شەرەف بەیانی کە ئەکەوێتە ناوگەلووی شاخەکەوەو نەخشەکەش ئەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی‌یەوەو بە بەرزی ١٥ مەتر لە شاخەکەوە تابلۆکە هەڵکەندراوە ئەبینرێت.[5]



دێ
شوێنەوار یان گردێکی شوێنەواری
لە: اطلس المواقع الاثرية في العراق،
١٩٧٦، ژمارە ٥٩
0 1 2 3 4 5 10 15
کیلۆمەتر
ژاڵەناو
سیروان

## کۆمەڵایەتی



ئەم وێنەیە لە کتێبی میدیای دیاکۆنۆفەوە وەرگیراوە

**وەسفی نەخشەکە**

ـــــــــــــــ نەخشـــەکـە وێنـەیـەکی بەردینـە لەرووی شاخـەکـەدا هەڵکـەنـدراوە. [٦] ئەمـەش پێك هاتووە لە کابرایەك، لەســـەر لاوەستـــاوە، کەوانێکی بەدەستی چەپ گرتـووەو ئامێـرێکی تیژیش بە دەستی ڕاستی‌یەوەیە، کە تەمسیلی هێزو توانای ئەکات و لە پشتی‌یەوە تیردانێك هەیە، پڕیەتی لە تیر. [٧]

پۆشـاکێکی لەبـەردایە، ناوەڕاستی لەشی داپۆشیوەو بە دوو هێڵ لێـوارەکـانی بە نەخش و نیگـاری شێـوە هێلکـەیی جوان کراوەو پشتێنێکی لەسـەر بەستـووەو تەورێکی پێدا کردوە. ملوانکەیەکی لە ملدایـە لە بەردی بەنـرخ دروست کراوەو لە ناوەڕاستیدا دروشمێکی بازنەیی کون کراوی پێدا هەڵواسراوەو، گوارەی لە گوێدایە. بەڵام مێزەرەکـەی سەری لە کڵاوێکی لبادی لێوار بچووك پێك هاتووە کە لە کڵاوی بابلیـەکـان ئەچێت. کابرا قاچی ڕووتەو بێ ڕیشە. لە شێـوەدا لە میـری سۆمـەری گودیـا ئەچێت. (بـڕوانـە: ئەنتـوان مۆرتکـات، هونەری لە عیراقی کۆندا، گۆڕین وقسە لەسەرکردنی دکتۆر عیسی سەلمان و سەلیم تەها تکریتی، تابلۆی ١٦٦، ل٢٠٨) [٨] ئەم شێـوەیـەش هەنـدێ پادشـاو جەنگـاوەری کۆنی سۆمەری پێش ئەومان ئەخاتەوە یاد، کەئەوانیش بێ ڕیش بوون. [٩] قاچی چەپی لە سەر لاشـەی دوژمنـەکـەی دانـاوە. دوژمنـەکـەی لەوەزعێکی شێوادا ئەبینرێت و قاچی ڕاستی بۆ پێشەوە درێژکردووەو قاچی چەپیشی بۆ پشتـەوە چەمـانـدوتـەوەو هەر دوو دەستیشی خستـوونـەتـە ناو یەکەوەو لە ژێر سمتی‌یەوە یەکیانی پێ گرتۆتەوە. پۆشـاکێکی کورتی لەبـەردایە ناوەڕاستی لەشی گرتۆتەوەو مێزەرێکی بە سەرەوەیـە لە مێـزەری هاوپەیمانە دیلەکەی پشتی‌یەوەی ناچێت، مێـزەرەکـە لە مێـزەری پیـاوانی خوری ئەچێت کە لەســـەر مۆرە لولەییەکان ئەبینرێن.

ئەمیش قاچی ڕووتـەو پاڵی داوە بە دیـوارێکـەوە، وەك کرنـۆشی بردبێت ئاوایە، لە پشت ئەمیشەوە، وێنەی دیلی دووەم ئەبینرێت کە تەمسیلی دوژمنێکی دیکـە ئەکـات. لە چەمـاندنەوەدایەو دەستی چەپی خستـوتـە سەر قاچی چەپی و بردویـەتـەوە بۆدواوەو قاچی ڕاستیشی بۆ پێشـەوە درێـژ کردووەو دەستی ڕاستی لە سەر دانـاوە، بەرزی کردۆتـەوە، ئەپـاڕێتـەوە، سەیـری کەسـەکـە ئەکـات. پۆشاکێکی لە بەردایە ناوەڕاستی لەشی داپۆشیوە، بەڵام مێزەرەکەی بە تەواوی لە مێـزەری ئەوکەسـەی ناوەڕاست ئەچێت کە لەبـەردەم خوادا وەستـاوەو سڵاو ئەکـات، شتێك چەناگەی داپۆشیوە. [١٠] و لە پشتی‌یەوە ستوونێك هەیە، نووسینی مێخی لەسەرە.

**نووسینەکە:**

ـــــــــــــــ نووسینـەکـە بریتی‌یـە لە سێ خانـە، هەر یەکێکیـان کراوە بە چوار ستـوون، ژمـارەی هیماکانیش (٤٦)ە [١١] چوار خانـەی تریش ئامـادە کرابـوون بەڵام بەکـار نەهێنـراون. نووسینەکەش بە زوبانی ئەکەدی‌یەو لە لایەن پسپۆڕان و شارەزایانی زوبـانی کۆن، بە چەنـد شێـوەیـەك خوێنـراوەتـەوە. ئەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە باسیان لێوە بکەین:

١ ـ «تـار... نی Tar ... ni... کوری... ئەم وێنـەیەی دانا. کاتێك گەڕاندیەوە (یا وەکو نوێی کردەوە). ئەوەی وێنەکە تێك بدات ـ نەوەو ناوی، شاماش و ڕامان (ئادەد) لە ناویان بەرێت».

٢ ـ «تار... دون نی Tar ... dunni ی، کوری ئیککی Ikki وڵاتەکەی خامـۆش کرد، یادگـارێکی دانـا، کاتێکیش کە کۆن بوو، نوێی کردەوە، هەچ کەسێك یادگارەکە لاببات تۆو ناوی، شاماش و ئادەد بیانبەن».

٣ خانـەی یەکـەم ودووەم لەوە ئەچن بە هیمای خواوەندێك دەست پێ بکەن و بە [بی ڕی نی] bi - ri - ni تەواو ئەبن.

«کـوری ئیککیپ شاخمـات Ikkipshahmat وێنـەیـەکی کرد، ئەوەی وێنەکە [بە جادوو تێك بدات؟»] با شاماش و ئیممیر Immer

(ئادەد) نەوەو ناوی (وێران بکەن؟)».

واتا ipshahmat ی دەقەکە بە تەواوکەری ناوی ئیککی زانراوە.[12]

٤ ـ «لی شیر ـ پیر ئینی، کوڕی ئیکیپ ـ شاحمات (!) بڕیاری ئەم نیگارەی دا، کاتێك بیگێڕێتەوە (بۆ ژێر دەسەلاتی خۆی) کیشوەری (زابان)ی (؟) وێنەکەو ـ جێ نشینانی ئەوو ناوی ئەولەناوئەبەن (خواکان) شاماش و ئادەد»..[13]

بۆ ئەوەشی خوێندنەوەی ناوی زابان ڕاست بێت پێویستە هیمای (Za) مان هەبێت... نێوان دوو هیمای (at)، (an)، بەڵام زۆر ڕوونە کە لە دەقەکەدا هیچ هیمایەکی وا نیە.. هەچ بەراوردییەکیش نێوان ئەم [ئـابـان] «ma - at a - ba - an» و [زابان]ی لای [پەردێ ـ ئاڵتون کۆپەری] دوورە لە ڕاستی.. چونکە ناوی دووەم نزیك سەرەتای هەزاری یەکەمی پێش زاین پەیدا بووە.

لە لایەکی ترەوە ناوی وڵاتی [ئاوان][14] مان هەیە کە وڵاتێکی زۆر کۆنەو کەوتبوە کوێستانەکانی ژووروی [ئیلام]، واتا نزیك ناوچەی شێخان.. وەرگێڕانێکی دەقەکەش ناوی [ئاوان]ی داناوە بۆ[ئـابان]، بەڵام بە گومانەوە: «... کاتێك وڵاتی ئاوان (؟)ی خستە پاڵ خۆ... هتد» ئەم وەرگێڕانەش ناوی کابراکە بە... ئیر پیـرین irpirin ئەخوێنێت. لای (W.Farber) لەگەڵ ناوی باوکیشی Ikkibehahmat، ئەیگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی بابلی کۆن.

یەکێك لەو پرسیارانەی وەڵامی تەواوی نیە، لە بارەی ئەوگەلەیە کە (تار... دون نی) بۆی ئەگەڕێتەوە. بێ گومان تار... دون نی ئەکەدی نەبوە.

هەیشـە تار... دون نی، بە [لـولـوبی]ی[15]، یان کوتی[16] ئەزانێت زانـراویشـە کوتی یەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاین لە خوارووی لۆلـۆییـەکـان ژیـاون، واتـا لە خوارووی شارەزوور، ڕۆژهەلاتی. نەخشەکەمان ناوی تار... دون نی، بە شێوەی [لی شیر پیرینی] بە ئەکەدی ئەزانێت،[17] بە واتای نەوەمان بمێنێتەوە..
بەڵام زۆربەی شوێنەوارناسان ناوەکە بە تار... دون نی ئەخوێننەوە.

پاشگری ni لە زۆر ناوە لۆلۆبیەکاندا هەیە، هەروەها دەنگی (i) لە کۆتـایی ناوەکـانـدا زۆر بڵاوە. ئەشتـوانین ناوی تار... دون نی لەگەڵ ئەم ناوانەی خوارەوە بەراورد بکەین: ساتۆنی [یان ساتۆمی] [هـەزارەی سێیەم پ. ز]، خودونی [یان خودون]، ئیتینی، سوانی (هەزارەی یەکەم پ. ز)... هتد.

برگەی [دون] لە ناوی دووەمـدا بە ڕوونی دیارە، (دون)ێکیش هەیـە کە ناوی خواوەنـدێکی شاری [لـەگشی] سۆمەرییـە..
هەروەهـا ناوی [کـاشی]ی [کـاردۆنیـاش] هەیـە، کە بە (شـاری خواوەنـد دونیـاش)[18] لێکـدراوەتـەوە، ئەشتوانرێت (یاش)ی ناوە کاشی یەکـان وەکـو پاشگرێك بزانرێت، بەم جۆرە ئەبێت نیشانەی خواوەنـدێتی نێـوان (تـار)و (دون نی) هەبـوبێت، ئەگـەر ئەمـەش ڕاست بێت، ناوی ئەم کابرایە هەر بە [تاردون نی] ئەمێنێتەوە.

بۆ ئەو ڕایەی کەسەکە بەکوتی[19] ئەزانێت، نە، ناوی (تاردون نی)ی و نە (لـی شیـر پیـرینـی) لە کوتی ئەچن.. چونکـە ناوە کوتی یەکـان بە پاشگری (ش) و (ئوش) (ush) و (ئان) و (ئاب) (ab) تەواو ئەبن. لە لایەکی ترەوە ناوی ئیککیپ شاحمات بە (خوری) زانراوە.[20]

ناوێکی هەزارەی سێـیەمی پێش زاینمـان هەیـە، بە سادارمـات Sadar mat کە هۆی وا هەیـە بە خوری بزانـرێـت و لەبـاسـی ئورکیش دا بینیمان.

**نەخشەکە لە ڕووی هونەرییەوە**

ــــــــــ ئەگـەر بە وردی سەیـری نەخشـەکە بکـەین، ئەبینین ئەو هونـەرمـەنـدەی ویستـویتی ئەم نەخشـە بەم شێـوەیەی هەڵبکۆڵێت، شـەپۆلی هونەری شێوی نێوان دووڕووبارەکە کاری تێکـردووە تیـایـدا ڕەنگی داوەتـەوە.. ئەمـەش شتێکی سروشتی یە بۆ هونەرمەندێ کە ڕێگەیەکی هونەریی باو لە کارەکەیدا بگرێت و کارەکەی بە پێی یاسای پەیڕەو کراوو تێکەڵاو کردنی لەگەڵ یاسـا میللی یەکانی دی ناوچەی شاخاوی کە نیشتمانی ڕەسەنی ئەو قەومەیە کە نەخشەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە، بنەخشێنێت.

یەکێـك لەو کارتێکـردنـە هونـەرییـەی کە لە نەخشـەکـەدا ئەبینـرێت، ئەو نووسینـە مێخی یـە ئەکـەدییـەیـە کە بەڵگـەی بڵاو بوونەوەو کارتێکردنی شارستانێتی ئەکەدییە.. هەتاوەکو لەناو دوژمنـەکـانیشیـانـدا..[21] هە روەها وێنەی پیاوی سەرکەوتو کە لە کەسی تاردۆنی دا ئەخـوێنرێتەوەو قاچی چەپی خستۆتە سەر لاشەی دوژمنـە کەوتـوەکـەی بەردەمی.. ئەمـەیش گرنگی تەواوی پێ ئەدرێت، چونکە خاڵی سەرەکی باسەکەیە، لەگەڵ وێنەی دوودیلە بەزیوەکە.. ئەمانە هەموویان لە بنەچەدا ئەگەڕێنەوە بۆ هونەری ئەکەدی.[22]

ئەمـەیش دیـاردەیەکی تازەیەوە ئەکەدییەکان هێنایان وخستیانە ناو هونەرەکەیانەوە کە تایبەتە بە کولتووری شارستانێتی تازەیان.

ئەو دوو دیلەی کە ئەبینـرێن لەسـەر نەخشـەکـە، لە ئەنجـامی هەمـوو جەنگێکی سەرکـەوتـودا روو ئەدات و لە لایـەن تەرەفی سەرکەوتووەوە ئەبرێن بۆ دیلێتی.

خاڵێکی دیکـەی گرنـگ دێتـە پێشـەوە، ئەویش دابـەشکـردنی نەخشـەکـەیـە بە چەنـد وێنـەیەکەوەو جوداکردنەوەیان بە چێوەیەکی دەرکەوتوو، وەکو لە نەخشەکەدا ئەبینرێت. . ئەم جوداکردنەوەیەش ڕێبـازێکی سۆمـەریانەیە . .[٢٣] ئەکەدییەکان لەوانیانەوە وەرگرتووەو پەرەیان پێداوەو پێشیان خستووە، بەو شێوەیەی لە نەخشەکانیاندا ئەبینرێت . .[٢٤]

هونـەرمـەنـدەکـە توانیـویەتی چارەسـەری هونەریی دوولایی لە تابلۆکـەدا بکـات، بە مانـای کاتێـك سەری میر لەسەر لا ئەبینێت، مێـزەرەکـەیشی لەسەر لا بۆ داناوە، وەکو جاران نەهاتووە کڵاوەکەی سەری بەرەو روو دابنێت، لە کاتێکدا سەری لەسەر لا وێنە کراوە .

ئەم پێشکـەوتنـەش لە هونـەردا وەکـو دەرئەکەوێت ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حامورابی .[٢٥]

هونـەرمـەنـدەکـە لە دەرهێنـانی ماسـولکەکانی سنگی تاردۆنیو باڵیـدا، توانیـویەتی بە وردیوبە شێـوەیـەکی سروشتی دەریـان بێنێت. . ئەمـەش بەڵگـەی ئەوەیـە هونـەرمـەنـدەکە ویستوویەتی لە شێـوازی کۆن دوور بکـەوێتـەوە کە شێـوە ئەنـدازیـارییەکەی تێدا ئەبینـرێت. بۆ ئەوەی کارەکـەی زیـاتـر نزیـك بێت لە شێـوە سروشتییەکەو، زیندوو تر بێت.

گۆڕینی نەخش و نیگـاری لێـواری پۆشـاکـەکەی تاردۆنی بۆ ئەو شێوە هێلکەیە کە ئەیبنیین، ئوسلووبێکی ئەکەدی کۆنە، لەوەو پێش لە پەیکەری شولگیو ئیدیئیلۆم دا بینیومانە .[٢٦]

هونـەرمـەنـدەکە توانیویەتی پشتێنەیەکی باریکی دوو لایی شێوە هێلکـەیی بەو شێـوەیـەی کە ئەبینـرێت بۆ دروست بکات، ئەمەش بەلای منـەوە، بەڵگـەی کارتێکـردنی هونـەریو بەردەوامی مانەوەی نیشان ئەدات و بەڵگەیەکی سەلمێنەرە بۆ بەهێزی ژیانەوەی هونەری ئەکەدی زیندوو.

ئەو شێـوە نەخشـەی لە سەر پۆشـاکـەکـەی تاردۆنی بینیمـان، ئەتـوانین لەسـەر جل و بەرگی مرۆڤـە وێنـە کراوەکانی سەر دیواری کۆشکی (مـاری)ش بیـاد بینین . .[٢٧] هەروەها لەسەر کراسەکەی شەمشی ئەدەدی یەکـەم، پادشـای ئاشـووری، کە لەسـەر میلی بەردینی ماردین هەڵکەندراوە . .[٢٨]

بوونی ملوانکـەی بەنـرخ لە ملی تاردۆنیدا کە لە ناوەراستیـدا دروشمێکی بازنـەیی هەیـەوگوارە لە گوییـدایـە . . ئەوەمـان بۆ دەرئـەخـات کە جیـاوازی چینـاییتی هەبـوە لەنـاوکۆمەڵداو، هێنانە بەرهەمی خشڵی کەسیش بەند بووە بە هونەری چینەکانی سەروو، ویاسـاو دروستبـوونی بنـاغـەی دەسـەڵاتـدارییەوە . .[٢٩] بەڵام ئەو دروشـمە بازنـەییـەی لە ملی تاردۆنیدایـە، لە شێوەدا لەو دروشمانە ئەچێت کە لەسەر هەندێك وێنەی ئایینی شاری ماری ئەبینـرێت . .[٣٠] هەروەهـا لەو دروشمە ئەچێت کە لەملی شەمشی ئەدەدی یەکەمدایە کە لەسەر میلە بەردینەکەی ماردین هەڵکەندراوە . .[٣١]

هونەرمەندەکە لەم نەخشەدا توانیویتی توخمێکی نوێ بخاتە ناو هونـەرەکـەیەوە کە لە وێنەکانی دیکەی پێشوودا نەبینراوە . . ئەویش هەڵـواسینی تەورە بە پشتێنـەکەی تاردۆنەیدا . . راستە ئەم دیاردەیە لەوێنەی پادشاکانی ئاشووریدا ئەبینرێت . . بەڵام بەشێوەیەکی ترەو لە برێتی ئەوەی تەور ببینین، شیر و خەنجەر ئەبینینیو مشتووەکانیان هاتـۆتـەدەرێ . . بەڵام لە سەردەمێکی دواتردا. بەمە هونەرمەندەکە توانیـویتی تەور وەکـو دیـاردەیـەکی هونـەری نوێ بخـاتـە ناو هونـەرەکـەیەوە، هەروەها وەکو چەکێکی بەرچاو کەوتووش هونەری جەنـگ وزیـرەکی جەنگـاوەری لە شەڕدا لەسـەر وەستاوە . . راستە بەکـارهێـنـانـی تەور لە شەڕدا بۆ سەردەمـی چاخـی ئەکـەدی ئەگەڕێتەوە، هەروەکو لە وێنەی نەرام سن دا لە نەخشەکەی دەربـەنـد[٣٢] گاوردا دەرئـەکـەوێت . .[٣٣] بەڵام ئەو تەورەی لە وێنـەکەی تاردۆنیدا ئەبینرێت جوداترە لەوەی دەستی نەرام سن . . ئەوەی تاردۆنـی لە شێـوەدا ڕێکـوپێکتـر دروست کراوەو لەو تەورە ئەچێت بە دەستی شەمشی ئەدەدی یەکەمەوەیە، (١٨١٤ ـ ١٧٨٤ ب . ز) کە لەسەر میلەکەی ماردین دۆزرایەوەو، ئەیبینین کە لەسەری دوژمنـەکـەی ئەداو لەبـەردەمیـدا کەوتـووە. هەروەهـا پشتێنـەکەی تاردۆنـی لەپـشتێنی شەمشی ئەدەدی یەکـەم و دیلەکـە ئەچێت کە لەسەر هەمان میل وێنە کراون .

بەڵام ئەو کەوانـەی بە دەسـتی تاردۆنییـەوەیـە لەوەی دەستی (ملشبـاك)ی کاشی ئەچێت . .[٣٤] ئەمـەش ئەوە ئەگـەیـەنێت کەوانـەکـەی تاردۆنـی چەکـێکی تایبـەتـە بە ناوچـەکـەی. . هەڵکـەنـدنیشی بەو شێـوە گەورەیـە، مانـای ئەوەمـان ئەداتێ خاوەنـەکـەی، خاوەنی هێـزو دەسـەڵاتێکی گەورە بووەو دەسەڵاتی بەسـەر ناوچەکەدا ڕۆیشتووە کە لەژێر فەرمانرەواییدا بووە. . بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە، وێنە کردنی بەو شێوە گەورەیە لەگەڵ درێژی

باڵای تاردۆنی دا ناگـونجێت و یەك ناگـرنـەوە . لێـرەدا ئەتـوانین بەراوردێـك لە نێـوان دەم و چاوی تاردۆنی و ئوورنـەمـودا بكەین كە لەسـەر میلەكـەی هەڵكـەنـدراوە . .(بـروانـە : ئەنتوان مۆرتكات ، تابـلۆی ١٩٤ ، ل٢٣٠)[٣٥] هەردوو دەم و چاوەكـەش لە رووی شێـوازی هەڵكـوڵینی هونـەری و شێوەدا لەیەكدی ئەچن و لە رووی خاسیـەتـە سەرەكی یـەكـانـەوە یەك ئەگـرنەوە : وەك چاویان بادەمی گەورەیـەو، لووتیـان گەورەو چەمـاوەیـەو كوتـاییـەكـەشیـان بەشێوە بازنـەیـەك هاتـۆتـەوەو چەنـاگـەشیـان گچكـەیە . . بەڵام وێنەكەی تاردۆنی لە خاڵێكـدا لەوێنـەكەی ئوورنەموجودا ئەكرێتەوە ، ئەویش بچـووكی دەم و چاوەكەیە ، بە پێچەوانەی دەم و چاوی ئوورنەمو كە گەورەیە . . بەمە هونەرمەندەكە توانیویتی لە دەرهێنانی دەم و چاوی تاردۆنی دا سەركـەوتن بە دەست بێنێت . . هەروەهـا توانیویتی لاقە رووتـەكـەی بە شێـوەیـەكی جوان دەربهێنێت و ماسولكەكانی لاقی زۆر ورد لەگەڵ ماسولكە بینراوەكانی دیدا نیشان بدات . . ئەمەیش بەڵگـەی ئەوەیـە هونـەرمـەنـدی نەنـاسراو وەستایانە كارەكەی تەواو كردووەو دەرخستنی ماسـولكـەكـانی جوڵانـەوەیانی نیشانداوە . بەو هۆیــەوە ئەتــوانیــن بەراوردێ لە نێـوان لاقـی تاردۆنـی و لاقـی خواپـەرستێـك كە وێنـەكـەی لەسەر میلێكی بەردین لە (ئەشجالی) هەڵكەندراوە بكەین . .[٣٦]

هەروەهـا لەگەڵ لاقی ئەو خوایەی كە چەقۆییەكی بەدەستەوەیەو ئەیەوێت عیفریتێك بكات بە دوو كەرتەوە . .[٣٧]

هەروەهـا هەمـان بەراوردكـاری بكـەین لە نێوان لاقی تاردۆنی و لاقی شەمشی ئەدەدی یەكەم لەسەر میلەكەی لە ماردین . . هەروەها هەمـــان بەراوردكـــاری لەگـەڵ بەشی خوارەوەی ئەو پیـاوانـەی كە وێنـەیـان لەنـاو وێنـە ئاینی یەكانی سەر دیوارەكانی هۆڵی پێشوازی كردن لە كۆشكی ماری دا بكەین . .[٣٨]

ئەمەش چەند لێكچواندنێك لە نێوان وێنەكاندا نیشان ئەدات لە رووی دەرهێنـانی هونـەری و شێـوەیانەوە . ئەمەیش ئەوە ئەگەیەنێت هونـەرمـەنـدەكـە لە ژێـر كارتێكـردنی هەنـدی ڕێبـازی هونەری دا بوو بێت لە دەرهێنانی وێنەكەیدا .

بەڵام ئەو دوو دیـلەی لەبـەردەمـی تاردۆنـی دا ئەبـینـرێن ، بە شێـوەیـەكی ساكـار و لە قەوارەیـەكی بچـووكدا دروست كراون . . ئەمـەش بەهـۆی ئەوەوەیـە كە دیلن و دوژمنیشن لە هەمان كاتدا . . ئەمـەیش سەیـركـردنی پیـاوی سەركـەوتـووە بەرانبـەر گەلانی ژێـر دەستـەی و وایـان دائـەنێت بەوەی مـنداڵن لە تەمـەنـداو لاوازن لە

لەشـدا ، خۆیشی بەهێـزە وەكـو لەوێنـەكـەیدا ڕەچاو ئەكرێ . . ئەم دیـاردەیـەش نەریتێكی كۆنـەو ئەتـوانین لەسـەر میلە بەردینـەكـانی ئەكەدی و پێش ئەوان بیان بینین .

وەستـانی دیلی دووەمی پشتـەوە لە وەستـانی وێنـەی ئەو كەسـە ئەچێت كە چەماوەتەوە بەرانبەر بەو خوایەی لەسەر تەختەكەی دانیشتووە . .[٣٩]

ئەم لەیـەك چوونـەش ئەوە ئەگـەیـەنێت هونـەرمـەندی نەناسراو بەتـەواوی ئوسـلووبی هەڵكـوڵینی هونـەری چاخی بابلی كۆنی زانیبێت ، بەمـە هونـەرمـەنـدەكـە توانیـویتی نەخشـەكـەی لە مەوزوعێكدا بكێشێت ، زۆر پەلهاوێژ بێت و مانایەكی دیاریكراوی بەدەستەوە دابێت .

**ڕای ئێمە بەرانبەر نەخشەكە**

لەگـەڵ هەمـوو ئەو شتانەی باسم كردن ، سیـمـای ئەو كەسـانـەی كە لەسـەر ئەم میلەبـەردینـە وێنـەكـراون . . بە تاردۆنی پیـاوی سەركەوتووشەوە ، تیشك ئەخەنە سەر ڕەسەنایەتی ئەو ڕەگەزانەی كە لەناوچەی زاگرۆسدا دانیشتوون .

هەر ئەوەش بوو پاڵی نا بەزانـای ڕەگـەز ناسی فەرەنسـایی .A.T AME) بەراوردێكی وێنـەكـانی سەر نەخشەكە بكات بەو وێنانەی كە لە ڕێگـەی نێـوان ئازەربـایجـان و ناوچـەی شۆشـدا بینیـونی ، وای بۆچووە ، وێنەكان گشتیان بۆ بنەچەیەك ئەگەرێنەوە كە ناوچەی زاگرۆسە . .[٤٠]

بەراوردێكی ئاسـایی لە نێـوان شێوەی ئەو دوو دیلەو، وێنەی ئەو كەسـانەی كە لەسەر مۆرە لولەییەكان كراون و بیری میتانی لە بارەی گەردوونەوە نیشان ئەدەن . . دەرئەكەوێت كە لەیەكتری ئەچن . .[٤١]

هەروەهـا شوێنـەوار ناسی قەوقـازیش ب . ب پیـوتروسكی لەم ڕووەوە ئەڵێ : «ئـەو وێنـانـەی كە تەمسیلی لۆلۆییەكان ئەكات لەسەر حەوجـۆشـەكانیان لە هەزارەی دووەمی پێش زاین ، لەو جۆرانەن كە هۆرییەكانیان بۆ دیلێتی[٤٢] بردووە .

**سەر ئەنجامی باسەكە**

ئەوەی دەربـارەی نەخشـەكـە باسمـان كرد ، دوای بەراوردكـردنی بەوێنـەو نەخشـە جیـاجیـاكـانی دی . . هەروەهـا دوای گۆڕینی نووسینـە مێخی یـەكـەو زانینی ناوی پیاوی سەركەوتوو ، وئامانج لە نەخشاندنی میلەكەو دانانی . . ئەگەینە ئەم ئەنجامانە :

## کۆمەڵایەتی

١ ـ ئەم نەخشە هەڵکەندراوە لەوە ئەچێت سەردەمەکەی لەچاخی هەژدەی پێش زاین تێپەر نەکات. . ئەمەش لە ئەنجامی ئەو بەراوردکاری‌یە هاتە گۆڕێ کە کردمان لەگەڵ نەخشە جیاجیاکانی تردا، هەروەکو لەوەو پێش باسمان لێوەی کرد.

٢ ـ تاردۆنی. . لۆلۆییەو (٤٣) کەسێکە نووسینە مێخی‌یەکە بەو شێوەیە ناوی ئەخوێنێتەوەو زاناکانی زمانە کۆنەکانیش ئەیبەنەوە سەر ئەوقەومە. . بەڵام نازناوی پادشاییتی نیە، لە وانەیە میرێك، یان فەرمان ڕەوایەك بوبێت، لە پایتەخت جودا بوبێتەوەو بە ناوی خۆیەوە ناوچەکەی فەرمان ڕەوا کردبێت.

وەکو زانراویشە لەوچاخەدا زۆر لە میرەکان، یان فەرمان ڕەواکان جیابوونەتەوەو خۆیان فەرمان ڕەوا بوون سەر بە کەس نەبوون. ڕێی تێ ئەچێ هەڵنەگرتنی نازناوی پادشاییتی لە لایەن میرەوە، هەر لەبەر ئەوە بوبێت خۆی وانیشان نەدا بەربەرەکانی پادشا دەست ڕۆیشتووەکان ئەکا. . بۆئەوەی وازی لێ بێنن لە ناوچەکەیدا فەرمان ڕەوا بکات. . بۆیە ئەبێت بە هەڵگرتنی نازناوی میر کۆتایی هێنابێت. وەکو دەریش ئەکەوێت هاو فەرمان ڕەوای پادشای شەمشی ئەدەدی یەکەمی ئاشووری بێت. . (١٨١٤ ـ ١٧٨٤ پ. ز)

٣ ـ ئەو دروشمە بازنەیەی بە ملی تاردۆنی‌دا هەڵواسراوە لەوانەیە دروشمێکی تایبەت مەند بێت بە میرەکان، یان فەرمان ڕەواکان، یان چینی سەرەوەی کۆمەڵ.

٤ ـ ئەو دوو دیلەی لەسەر میلەکەن. . دوور نیە خوری بن. . ئەگەر ئەمە ڕاست بێت. . مانای ئەوەیە میری لۆلۆیی ناوچەی خوری‌یەکانی لەسەرووی ناوچەکەی خۆی کە دەشتی شارەزوورە گرتووە. . وەکو ئاشرایە خوری‌یەکان لەوچاخەدا لە زۆر شوێنی کوردستان دا ژیاون. . لە نزیك دیاربەکرو دەشتی ڕانیەو. هتد لەوانەشە بەشێك لەو خوری‌یانە لەو ناوچەیەدا لەو سەردەمەدا ژیابن.

### پەراوێزەکان:

* ـ لەوانەیە جۆرە پەیوەندی‌یەك لە نێوان ناوی (هۆرین)ی گوندو. . هوری (خوری ـ حوری) قەوم هەبێت و یەکەم لە دووەمی‌یەوە وەرگرتبێ‌و تیایدا ڕەنگی دابێتەوە.

١ ـ د. محمود الامین. استكشافات أثرية جديدة في شمال العراق، سومر، الجزء الثاني، المجلد الرابع، ايلول ١٩٤٨، ص١٨٠.

٢ ـ د. محمود الامین، نفس المصدر السابق، ص١٨٠.

٣ ـ ئەم نەخشەو قەڵایەکی کۆن کە پاشماوەی شارێکی کۆنی تێدایەو بە بەردو گەچ دروست کراوە، ئەکەونە سەر شاخێك لە دەربەندی سەروو.

ئەوەی سنووری عیراق و ئێران لێرەدا جیا ئەکاتەوە، ڕیزە شاخێکە درێژ بوتەوەو دوو دەربەندی پێك هێناوە. . یەکەمیان دەربەندی خواروو، یان دەربەندی بیلوولە، بەڵام ئەوەی سەروویان بە دەربەندی سەرتەك یان شێخان ناسراوە. . ئەم دوو دەربەندەش لە کۆتایی هێڵی سنووری عیراق و ئێران دا یەك ئەگرنەوە.

مامۆستا (تیری داتران)ی فەرەنسایی لە کتێبەکەیدا کە بە ناوی هێرشی هەشتەمی سەرجۆنی دووەمەوەیە (٧٢١ ـ ٧٠٥ پ. ز) دەڵێت: پاشماوەی ئەو شارە، هەر ئەو شارەیە کە سەرجۆنی دووەم لە هێرشەکەیدا لە باکوورەوە بۆ عیلام ناوی بردووەو پیدا تێپەریوە کە لە زابی گەورەوە تا ڕۆژهەڵاتی دیجلە ئەگرێتەوەو لەوێشەوە بۆ بەرەو خوارو. . گەرانەوەیشی بە هەمان ڕێگەدا لە ڕۆژهەڵاتەوە کە ڕێگەی شاخاوی‌یەو ئەکەوێتە نێوان سنووری عیراق و ئێران. . سەرجۆن شایش خۆی ئەڵێت: بە شاری لۆلۆدا تێپەریم. مامۆستا (سدنی سمیث)یش ڕای وایە، شاری ناوبراو هەر ئەو شارە بێت کە ئەکەوێتە دەربەندی شێخان.

برو.سە. ،صبارة هورین ـ شیخان، المرقمة ٢٧ / ٤١، المحفوظة في مديرية الاثار العامة ـ قسم التحريات.

٤ ـ طه باقر وفؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة السادسة ـ بغداد ـ حلبجة، ١٩٦٦، ص٢٤.

٥ ـ اضبارة هورين ـ شيخان، المصدر السابق.

٦ ـ نفس المصدر السابق.

٧ ـ طه باقر وفؤاد سفر، المصدر السابق، ص٢٤.

٨ ـ انطوان مورتكات، الفن في العراق القديم، ترجمة وتعليق دكتور عيسى سلمان وسليم طه التكريتي، مطبعة الأديب البغدادية. بغداد، ١٩٧٥، ص٢٠٨

٩ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٠٩.

١٠ ـ اندري بارو، بلاد اشور، ترجمة وتعليق دكتور عيسى سلمان وسليم طه التكريتي ١٩٨٠، بغداد، ص٣٦٠.

11 G.G CMERON Historyof EarLyIran, London, 1968. p, 410

ـ لێرەدا سوپاسی برای نووسەر فاضل قەرەداغی ئەکەم، کە یارمەتی دام، لەو بەشەی پەیوەندی بە نووسینە مێخی‌یەکەوە هەیە، لە سەرچاوەی ناوبراوەوە بۆی گۆڕیمە کوردی

12 - G.G Cameron, op. Cit, p, 410

١٣ ـ ئی، م، دیاکۆنۆف، میدیا، گۆڕینی بۆ کوردی برهان قانع، دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی ١٩٧٨، چاپی یەکەم، ل٦٨٠

١٤ ـ ئاوان. . ناوێکی کوردی‌یەو مانای یەکگرتنەوەی دوو ڕوبار، یان دوو جۆگە ئاو ئەگرێتە. . لەم جۆرە ناوانەش لە کوردستاندا زۆرن.

١٥ ـ لۆلۆ. . یەکێکن لەقەومەکانی زاگرۆس و ناویان بە چەند

جۆرێك لەسەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووەو چەند مانایەك ئەبەخشێت. . (نەرام سن)ی پادشای ئەکەدی باسی سەرکەوتنی خۆی بەسەریاندا ئەکات لەمیلی بەردینی سەرکەوتندا، کە ئێستاکە لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە پاریس. . گەلی کوردیش لە پاشماوەی ئەوقەومەو قەومەکانی دی وەکو: کوتیو میدی گەلێکی دییە.

بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ١٩٨٦، اجزء الاول، دار الشؤون الثقافية العامة، وزارة الثقافة والاعلام، ص٣٧١.

١٦ ـ کوتی. . یەکێکن لە قەومەکانی زاگروس کە لە سەرووی عیراق لە ناوچەی کوردستان دانیشتوون. . بە مانای خوارووی ناوچەی دانیشتنی لۆلۆییەکان. . ئەمانە لەکەوتنی بنەماڵەی ئەکەدیدا ڕۆڵی سەرەکی خۆیان بینیوە. . بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: الدكتور سامي سعيد الاحمد، العراق القديم، الجزء الثاني ١٩٨٣، ص٨٧.

١٧ ـ ئی، م، دیاکۆنۆف، هەمان سەرچاوەی پێشو، ل٦٨٠.

ـ دیاکۆنۆف لێرەدا کەوتۆتە هەڵەوە میلەکەی گێراوەتەوە بۆ کوتییەکان. . ئەم هەڵەیشی لەوەوە هاتووە کە پەنای بردۆتە بەر نووسینە مێخییەکە بۆ زانینی ناسنامەی خاوەنی میلەکە، کە بە شێوەی (لی شیر پیرینی) خوێندویەتەوەو وای بۆچووە ناوێکی قەومی ناوبراوە، بۆیە گێراویەتەوە بۆیان. . بۆ ئەمە بڕوانە: ئی، م، دیاکۆنۆف، هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٧٩ ـ ١٨٠.

١٨ ـ د. سامي سعيد الاحمد، فترة العصر الكاشي مجلة سومر الجزء الاول والثاني، المجلد التاسع والثلاثون ١٩٨٣، ص١٣٥

١٩ ـ ئی، م، دیاکۆنۆف، هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٧٩ ـ ١٨٠.

٢٠ ـ خوری. . یەکێکن لەو گەلانەی لە کۆنەوە لە سەرووی عیراق ژیاون و زوبانەکەیان نزیکە لە زوبانی ئۆرارتی. . (بە مانای زوبانی ناوچەی ئەرمینیای کۆن) چەند جۆرێك لە پاشماوەی هونەرییان دۆزراوەتەوە، کە ئەگەڕێنەوە بۆ ناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زاین. . وەکو پەیکەری شێری حەوجۆش لە نیسارییو پەیکەری پادشای ئەورکیش. .

بڕوانە: اندري بارو، المصدر السابق، ص٣٣٨.

٢١ ـ الدكتور هاري ساكز، عظمة بابل، ترجمة وتعليق الدكتور عامر سليمان، المدنية، ١٩٧٩، ص٧١.

٢٢ ـ دەستووری ئەکەدی کۆن بۆ پیاوی سەرکەوتوو. . بۆ جاری دووەم لەسەر نەخشێکی هەڵکەندراو لە میلێکی بەردین لە چاخی ژیانەوەدا دەرکەوت، کە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوای شوسن. . لەم نەخشەدا سەرۆکی ئەرکانی سوپا ئەبینین قاچی خستۆتە سەر یەکێك لە دوژمنە بەزیوەکانی کە ئەنداسۆی میری زابشالییە. . ئەمەش گەورەترین بەڵگەی سەلمێنەرە بۆ بەهێزی ژیانەوەی هونەری ئەکەدی لە زەمانی بنەماڵەی سۆمەرو ـ ئەکەددا.

بڕوانە: اطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٣٣.

٢٣ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٨٨.

٢٤ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص١٦٤، ١٧٩.

٢٥ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٣٧.

٢٦ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢١٧.

٢٧ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٣٩.

٢٨ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٤٠.

٢٩ ـ ارنو لدهاوزر، فلسفة تاريخ الفن، ترجمة رمزي عبده جرجس، مراجعة د. زكي نجيب محمود، مطبعة جامعة القاهرة، القاهرة ١٩٦٨، ص٣٢٨.

٣٠ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٣٩.

٣١ ـ انطوان مورتكمات، المصدر السابق، ص٢٤٠.

٣٢ ـ ئەم نەخشە هەڵکەندراوە ئەکەوێتە خوارووی ناحیەی قەرەداغ لە پارێزگای سلێمانی. . پێك هاتووە لە پیاوێکی جەنگاوەری ڕیشدار، لەسەر لا وەستاوەو سەیری لای چەپ ئەکات. . درێژییەکەی دە پێیەو کڵاوێکی خڕی لێوارپانی لە سەردایە، ئەو بەشەی ڕیشی لە چەناگەیەوە نزیکە تاشراوە لە دوای ئەو بەشەوە تاڵەکانی ڕیشی پێچاو پێچ هاتوونەتە خوارەوەو درێژبوونەتەوە تا گەیشتۆتە لای باسکی چەپی کە چەماوەتەوە بەلای لاشەکەداو چەماوەیەکی شێوە وەستاوی لەسەر پشتێنەکەی دروست کردووە. . کەوانێکی بە دەستەوەیەو پۆشاکەکەی بۆ سەرەوە کراوەتەوە. . ئەو پشتێنەی بەستوویەتی چوار قەدەو، بەلاشەکەوە پێچراوەو لە تەنوورەیەك ئەچێت. دەستی ڕاستی بۆ دواوە بردۆتەوەو کوتەکێکی پێ گرتووە. . قاچی ڕاستی باش دەر نەکەوتووە، بەڵام چەپی بەرز کردۆتەوە بۆ لای ئەژنۆی، وەکو خاوەنەکەی بیەوێت بەسەر شاخەکەدا سەربکەوێت. . ئەو بەردەی هەڵکۆڵراوەو ئەکەوێتە ژێر تەنوورەکەوە، لەبەر هەر هۆیەك بێت تێکچووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ژێر هەر قاچێکیدا وێنەی کەسێك ئەبینرێت، کەوتۆتە سەر زەویو قەوارەکەی چوارییەکی وێنەی کابرای جەنگاوەرەو، قاچ و پرچیان لە سەریانەوە بەرەو خوار بووەنەتەوەو لەشێوەی کەوتندان. بۆ ئەمە بڕوانە: ادمونـدس، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجس فتح الله، بغداد ١٩٧١، ص٣٢٢.

ـ بۆ سەردەمی ئەم نەخشەو خاوەنەکەی چەند ڕایەکی جیاواز هەیە. . لە باسێکی تردا بۆی ئەگەڕێینەوە.

٣٣ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص١٨٢.

٣٤ ـ اندري بارو، المصدر السابق، ص٣٧٧.

٣٥ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٣٠.

٣٦ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٦٣.

٣٧ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٦٩.

٣٨ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٤١.

٣٩ ـ انطوان مورتكات، المصدر السابق، ص٢٧٧.

٤٠ ـ ئي، م، دياكونوف، المصدر السابق، ص١٧٨.

٤١ ـ ستين لويد، فن الشرق الادنى القديم، ترجمة محمد درويش، ص١٥٦، ١٥٧.

٤٢ ـ ئي، م، دياكونوف، المصدر السابق، ص٦٨٣ ـ ٦٨٤.

٤٣ ـ ئەم ڕایەم تەواوکەری ڕاکانی پێش خۆمە، کە پسپۆرانی زوبان و مێژووی کۆن بۆی چوون و ناسنامەی پیاوی سەرکەوتوویان بۆ ساخ بۆتەوە.

# منحوته هورين ـ شيخان

كمال نوري معروف

تقـع منحوتـه هورين ـ شيخـان الى الشمال من قضاء خانقين على بعـد ٩٢كم منهـا . . وهي تمثـل شخصـاً واقفاً بهيئة جانبية، يمسـك بيـده اليسـرى قوساً وباليد اليمنىٰ آلة منبلة التي تمثل قوته وجبروته وخلفه جعبة سهامه المحشوة بها، وهويرتدي وزرة تغطي وسـط جسمـه ذات شرشبة امامية بخطين وبهيئة بيضوية، يتمنطق بحزام حاملاً عليه فأسه، وفي عنقه قلادة من الاحجار الكريمة . . في وسطها شعار مدور مثقوب. اما غطاء رأسه فعبارة عن خوذة من اللبـاد ذات حاشيـة قليلة السمـك، تشبه اخطية رؤوس البابليين، وهو حافي القدمين وبدون لحية.

وقد وضع قدمه اليسرى على جسد عدوه . . ونشاهد العدو في وضعيته التضرع، مادا ساقه اليمنىٰ الى الامام ومثنياً ساقه اليسرى جاعلاً اياها الى الخلف، وشابكاً يديه جاعلاً اياهما تحت وركيه. وهـويرتـدي لبـاسـاً قصيـراً، يغطي وسـط جسمـه، وعلى رأسـه غطـاء . . وهـو حافي القـدمين ايضـاً. وقـد أتكأ على الحائط في وضعيـة الخشـوع، طالبـاً الامـان. كمـا توجد خلفه صورة اخرى لاسير ثان تمثل عدواً آخر. وخلفه عمود من الكتابة المسمارية.

ويعتقـد البـاحثـون استنـاداً الى الكتـابـة المسمـاريـة ان هذه المنحـوتـه ترجع الى العصر البابلي القديم . . واسم صاحبها يقرأ بصيغة تاردوني، وهو من اللولوبيين.

الا ان خلال مقـارنـاتي العديدة بين هذه المنحوتة والمنحوتات الاخـرى، توصلت الى مجمـوعـة استنـتـاجات التي تلقي الضوء على اصل هوية المنحوته وهي :

١ ـ ان هذه المنحـوتـه من الممكن لاتتعـدى فتـرتها الزمنية القرن الثامن عشر قبل الميلاد.

٢ ـ ان تاردوني ينسب الى اللولوبيين . . وهوشخص لايحمل لقب الملك . . ومن الممكن امـا ان يكـون اميـرا اوحاكمـا استقل عن السلطة المركزية ليحكم المنطقة باسمه.

٣ ـ ان الشعار المدور المعلق في عنق تاردوني من الجائز ان نقول انه شعار خاص بطبقة الامراء او الحكام او علية القوم.

٤ ـ من الجائز ان نقول، ان الاسيرين الموجودين على المسلة هما من الخوريين . . وان امكن هذا فمعناه ان الامير اللولوبي هذا قام بغـزو منطقـة الخـوريين الى الشمـال من منطقتـه، وهـوسهـل شهـرزور . ومن المعلوم ان الخـوريين عاشـوا في ذلك العهد في مناطق عديدة في كردستان . . قرب ديار بكر وسهل رانيه . . ولهذا من المحتمـل ان نقـول إن قسمـاً من هؤلاء الخـوريين عاشوا في تلك المنطقة في سابق العهد.

# ڕێبازی مێژووی زمانی کوردی

محمد أمین هەورامانی

**خوێنەری بەڕێز، ئەم بەشە وتارەی ئێرە، بەشی دووەمی ئەم وتارەیە دەبوایێ لە بەشی یەکەمی‌دا، کە لە ژمارەی پێشوی ئەم گۆڤارەدا بلاو بوویەوە، بەشی‌یەکەمی لێ بنووسرابایەو بۆیە داوای لێ بووردن دەکەین و ئەم وتارەی ئێرەش، بە بەشی دووەمی، ناوی دەبەین.**

## بەشی دووەم

**(٩) ـ زمـانی کوردیی کۆن، یاخـود زمـانی کۆنی کورد، لەنێـوان سالانی (٨٠٠ ـ ٣٠٠)ی پێش زایین دا.**

بۆ لێکـدانـەوەی زاراوی زمـانی کۆنی کورد، هیـچ جۆرە، نووسـراوێـك، یان نەقشەهەڵکە ندراوێك، کەبە ناوی میدیەکان، یان بە ناوی ئەو خەڵـکـەی کەلـە سەردەمـی میـدیـەکـان و فەرمانڕەوایی‌یان دا، لە کوردستان دا ژیابن، تائێستە بەر دەست نەکەوتووە!!

ئەوجا، ئەگەر وەهابێ، دەبێ پەنا، بۆ چ جۆرە ڕێبازێکی دیکە. ببرێ!!

(ئا) ـ ئێمە، لەم پشکنینەی ئێرەدا، پەنامان بردووە بۆ:

(١) هەنـدێ ناوی (میـدی)و هەنـدێ (قـەد)و (ڕەگ)و (ڕیشـە)ی کەرەستـە زمان، کە لەزمانی میدیەکانەوە، لەملاو لەولاوە، بە ناوی میدیەکانەوە، یان بەناوی کەرەستەزمانی میدی‌یەوە ناو دەبرێن.

(٢) هێنـانـەکـایـەی ئەو ناوی شاهـە ناوچەییانەو ئەو نیمچەشارانەو ناوی ئەو ناوچەو ڕووبارانە، کەلە سەرچاوە ئاشووریەکانەوە، ناویان هاتووەو بەهی میدی دەزانرێن.

(٣) هێنـانـە ناوەوەی ئەو ناوە جۆر بەجـۆرانـەی، کە هەریـەکێ لە شاهـەکـانی میـدی، لەسـەرچاوەی جۆراوجۆری بێگانەدا، هەیان بووە، یان ناوبراون.

(٤) بەراورد کردنی هەریـەکی لەو کەرەستانە، لەگەڵ هاووێنەیان، لە (ئاڤێستا)داو لەزمانی کوردیی ئێستادا.

(بێ) ـ بۆیـە ئەوماوە درێـژەیـەمـان بۆدانـاوە، یان بۆیـە ماوەی فەرمـانـڕەوایی هەخـامـەنشیـەکـانمـان لەگەڵ هینی میدیەکان دا، گرێداوە، چونکـە هەخـامـەنشیەکان، لە هەموو ڕوویەکەوە نیشتنە سەر کەلـەپـووری میـدیـەکـان و جگـە لە ناوی شاهـەکـان، یاز فەرمـاندەرکردنی شاهانەیان، کە بە شێوەی پارسی کۆنەو کەفەسەرە بە کەرەستەزمانی میدیەوە، هیچ جۆرە ڕۆشنبیری‌یەکی نوێ‌و جیاواز لەوەی هی میدی یەکان، نەیان هێنایە کایەوە.

بەشێـوەیـەکی ڕوونتـر، ماوەی فەرمـانڕەوایی هەخامەنشیەکان، بەردەوامی فەرمانڕەویی هەخامەنشیەکان و میدیەکان بووە.

(پێ) ـ ئەو (ڕەگ = ڕیشـە)و (قـەد)و ناوە (میـدی)یـانـەی، کە دەستنیشـان کراون وگومانی نامیدی‌یەتیان لێ ناکرێ، دەیانکەین بە (پێـوەر) بۆلەسـەنگی مەحەك دانی کەرەستەووشەی زمانی کوردیی ئەمڕۆو بەوپێیە، پێناسەیان دیاریی دەکەین.

**(١٠) ـ هەندێ ڕیشەو قەدی زمانی میدی، کە لەناو زمانی پارسی کۆن دا، گەشەیان سەندووە.**

+ ڕیشـە [ـ = Θ]ی پارسی کۆن، کە بەدوای دەنگـەبـزوێن د دێ، هەروەك لە وشـەی (ئـەثـەهەم = aΘaham)ی پارسی کۆن دا بەواتـای (من وتم) هاتـووە، لە ڕیشـەی [س = s]ی میـدی‌یـەوە

هاتووەو گەشەی سەندووە.

واتـە، لە میـدیدا، قەدە ناوی (سـەهـ = sah)، کەلـەنـاوی (ئـەسـەرگـەرتـە = Asa - garfa) ی میـدیـیـەوە وەرگیـراوەو لە ئاڤیستـاش دا، بۆوێنـە، وشـەی (مـەسیشتـە = masišta) ـ (کـە بەواتای، درێژترین، هاتووە)یش هەیە.

یان، لە پارسی کۆن دا، وەك (ئـەنـگە = ئەئەنغە) کە بە واتای (بـەرد) هاتـووە، لە (ئەسان = ئەسەن asqn) ی میدیـیەوە گەشەی سەنـدووەو بەرامبـەری (ئەسەنگە)ی ئاڤیستایی یە، کە هەر بە واتای (بەرد) هاتووە.

+ قەدی [تر = θr]، تەنها لەزمانی میدیو ئاڤیستایی دا، بەدیی دەکرێ، کەچی لەپارسی کۆن دا، [چ - ç]یە.

+ قەدی [تر = θr]، تەنها لەزمانی میدیو ئاڤیستایی دا، بەدیی دەکرێ، کەچی لەپارسی کۆن دا، [چ - ç]یە

بۆوێنـە، لەپـارسی کۆن دا (puça = پوچـە)، بەواتـای (کـوڕ) هاتووەو لە پارسی نوێ ش دا (بەچە = baça) یە، بەڵام لە ئاڤیستادا (پوثرە = puθra) یە.

یاخـود ـ (لـەسـەر هەمـان، قەد دەڕۆین) ـ لە پارسی کۆن دا (خشـەچـەم = xsaçam) بەواتـای (شـاهـەنشـاهیەت) هاتووە، کە بەرامبەری، لە ئاڤیستادا. وشەی (خشەثرەم = xsaθrəm) ە. بەڵام، لەزمـانی میـدیدا وشەی ناساکاری (خشەثرینە = Xsaθrita) هەیە، کە ناوی شۆڕشگێرێکی میدیەکانە.

+ ڕیشەی (تر = tr) ی پاش بڕگەی هەوادار (پڕتاو)، لە ئاڤیستادا هەیـەو لەزمـانی (میـدی)ش دا، لەگـەشەکردن دا بووە، کەچی لە هەندێ کەرەستەی زمانی پارسی کۆن دا، نەماوە.

بۆوێنـە، لە ئاڤیستـا (ئـوشتـرە = uštra) بە واتای (وشتر) هاتووە، کەچی لەپـارسی کۆن دا، (ئـوشـە = uša) یە، هەروەك لە فرەیـزی (ئوشەباری = uša - bari) دا، دەردەکەوێ.

وێنـەی زمـانی میـدی ـ ش، بۆ ئەووێنـەیەی سەرەوە، هەروەك ئەـەی لەم ناوە میـدیـیـەدا هەیـە، کە بە ناوی (ئـوڤـەخشتـرە = Uvaxštra) وەیە.

+ قەدی [سپ = sp -]، لە زمانی میدییو زمانی ئاڤیستایی دا، هەیـە، کەچی ئەم قەدە، لەزمـانـی پارسی کۆن دا سواوەو بەرەو ڕیشەی [s] ڕۆیشتووە.

بۆ وێـنـە، لە پارسـی کۆن دا (ئـەسـە = asa -) بەواتـای ئەسپ هاتـووە، کەچی لەزمانی ئاڤێستایی دا، (ئەسپە = aspa) یەو لەزمـانی میـدیش دا لەوشـەی (ڤیشتـاسپـە = Vištaspa) دا، هەمان قەد، هەیە.

یان، لەوشـەی پارسی کۆن دا، کە (ڤیسـە = visa) ) یەو بە واتای (هەموو) هاتووە، هەر ڕیشەکەی تیادا ماوەتەوە، کەچی لە ئاڤێستادا بۆ بەرامبـەری هەمـان وشـە، وشـەی (ڤیسپـە = vispa) یەو لە سانسکریتیش دا، بووە بە (ڤیسڤە = Visva).

لەگـەڵ، ئەوەش دا، لەپـارسی کۆن دا، وشـەی ناسـاکـاری (ڤیسپـەزەنـە = vispazana) هاتـووەو هەمـان قەدی تێـدایـە، بەڵام فۆنـەتیکی ئەم وشـەیـە، لەسـەر ئاوازو شێوەی دەنگسـازیی زمانی میدیە. (تەماشای: Kent old Persian Grammar. P. 54 -).

+ قەدی [خم = xm] لە زمـانی میـدیو ئاڤیستایی لەکۆنەوە، هەر ماوەتـەوە، کەچی لە پارسی کـۆن دا بووە، بە [هم = hm] بەڵام لە ڕێنووس داو هەروەها لەرەمزی دەنگیش دا، [h] بووە بەژێرەوە.

بۆوێنـە لە میـدیدا، وشـەی (تـەخمـە سپادە = Taxmaspāda) هەیـەو لە ئاڤێستـاش دا (تەوخمەن = taoxman) هەیە، کە بە واتای (تۆو) دەدات، لە پارسی کۆنیشی دا (تەوما = tauhmā) هەیە، کە بە واتای (خێزان) هاتووە. (تەماشای: Kent . O .P .G .p.37).

بەهـەرحـاڵ لەم بەراوردە سەرپێیـەی نێـوان زمـانی میـدیو ئاڤێستاییو پارسی کۆن دا، کەلە ڕووی (قەد)و (ڕیشە)وە ـ (یاخود بابڵێین، وشەسازی) ـ کرا، گەیشتینە ئەوەی، کە بڵێین:

١ ـ کۆنسونانتی [S] لەزمانی میدیو لە زمانی ئاڤیستایی داە دەبێ [ث = θ]، لەزمانی پارسی کۆن دا.

ـ هەروەها [Z] میدیو ئاڤیستایی، دەبێ بە [d] لە پارسی کۆن دا.

ـ [سپ = SP] ی ئاڤیستاییو میدی، دەبێ بە [س = S] لە پارسی کۆن دا.

ـ [زب = Zb] ی ئاڤیستاییو میدی، دەبێ بە [ز = Z] لە پارسی کۆن دا.

ـ (تێبینی: لەگـەڵ ئاگاداریکردنی جێگاو دیاریکردنی بەرودوای هەریەکێ لەوانە).

ـ [خـم = Xm] ی میـدیو ئاڤێستـایی، دەبێ بە [م = (h)m] ، لە پارسی کۆن دا. (تەماشای، ل ـ ٣٧، Kent).

ـ [تر = tr] ی میدی وئاڤێستایی، دەبێ بە [چ = ç] لە پارسی کۆن دا.

- [ثی ـ Θi ] ی میدیو ئاڤێستایی، دەبێ بە [شی = ši] لەپارسی کۆن دا.

ئەو وشانەی کەلەپارسی کۆن دا، بەدیی دەکرێن، بۆوێنە، وەك (خشایەثیە = xšāyaeya]، هی پارسی کۆن (نین)، بەڵکو وشەیەکی میدی میرایەتی‌یەو تەنها بەگۆڕانی ئاوازەی کۆتایی، توێکڵی پارسی کۆنیان لەبەر کردووە.

ئەمـانـە هەندێ، وێنەی پارسی کۆنن، بۆ ئەم وێنەیەی سەرەوە. (ئـوڤـا ـ مەرشیوش = uvā - maršiyuš)، کە بەواتای (مردن) هاتووە. (هەشیەم = hašyam)، کەبە واتای (راست) هاتووە.

ئێمـە، یان هەرکـەسێـك، کە حەزی لە پشکنین ولێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە زانیـاریـانـە بێ، توانای لێکۆڵینەوەی زمانی میدی دەبێ، ئەگـەر هاتـوو پەنـای بردە، بەر ئەو هەنـدەکـەلەپووره زمانیەی کە لە میـدیـەکـانـەوە بەجێ ماوەو ئەگەر هاتوو ئەو توانایەی لە چوارچێوەی بەراوردن کردن، ' گەڵ زمانی ئاڤێستایی‌و میدی‌دا، بەکاری هێنا.[(١)]

ئەم کورتـە بەراورد کردنـە سەرپـێـیـەی سەرەوە، ئەوەی بۆ روون کردینەوە، کە زمانی میدی‌و هی ئاڤێستایی‌یەك زمان بوون وـ هەروەك لەمەوپێش تریش وتمان ـ لەو بەراوردەدا، ئێمە پەنامان بەر جۆرە کەرەستە میدی‌یە بردووە، کە لێرەدا، دەیان خەینە بەرچاو.

یەکـەم، هەنـدێ کەرەسـتـە، کە لەپارسی کۆن دا هاتووە، بەڵام کە سیەتیە میدی‌یەکەی بە تەواوی پێوەیە.

+ ناوی جێگا:

- (ئەسگەرتە =Asagarta). ناوی ناوچەیەکی میدیایە.

- سیکەیەو ڤەتیش = Sikayauvatiš). ناوی قەڵایەکی میدی‌یەکانە.

- (باختریش = Bāxtriš). ناوی ناوچەیەکی رۆژهەڵاتی ئێرانە، بەڵام لەرووی کەسـایـەتی دەنگسـازی‌و وشـەسـازی‌یـەوە، میـدی راستەورەوانە. (تەماشای: کەنت. ـ (P.P.G) - j - 8).

- (زرەنـکـە = Zranka)، هەروەهـا، ئەمـیش ناوی ناوچـەیـەکی رۆژهـەڵاتی ئێـرانـە، بەڵام لەدەنگسـازی‌و وشـەسـازی‌دا، زادەی زمانی میدیەکانە.

+ هەندێ ناوی کەسی:

- (تەخمە = taxma)، بەواتای (ئازا)، (لێهاتوو) هاتووە. ئەمەش لە ناوی (تەخمەسپادە = Taxmaspāda) ی میدی‌یەوە هاتووە.

- (خشـەتـریتـە = Xsaerita) ناوێکـە لە ناوی (فـرەڤـەرتیش = Fravartiš) بەڵام کەرەستە زمانیەکەی لەبەر کراوە.

- (ئوڤەخشترە = Uvaxštra)، ناوی یەکێکە لە شاهەکانی میدیا.

- (ڤیشتـاسپـە = Vištāspa)، گوایـا، ناوی باوکی (داریوش)وبەم جۆرەش (هیستەسپەس = Hystaspes) هاتووە.

- (ئەسپەکەنا = Aspacanā): یەکێکە لە یاریدەدەرەکانی داریوش (میدی‌یە).

- (ڤیندەفەرنا = Vindafanā)، یەکێکە لەیاریدەدەرەکانی داریوش (میدی‌یە).

+ هەندێ وشە، کە ناوونیشانی میرایەتی‌یان هەڵگرتووە!

- (خشایەثیە = Xšāeiya)، بەواتای (شاهـ) هاتووە.

- (ڤەزرەکە = Vazraka)، بەواتای (گەورە بوزورگ) هاتووە.

- (ڤیسپە ـ زەنە = Vispa - zana)، بەواتای (هەموو پیاوەکانی لایە) هاتووە

+ هەندێ وشە، کە پەیوەندیان، بە دینەوە هەیە:

- (زوورە = Zūra)، بەواتای (خراپ، پیس، شەڕانی) هاتووە.

- (ڤەرکە ـ زەنە = Varka - zana)، ناوی مانگێکە، لەمانگەدینی‌یەکان.

+ هەندێ ناوی ئامرازی کشت وکاڵ:

- (ئەسەنە = asana). تایبەتی یە بەکشت و کاڵەوە (هەسان).

- (کاسەکە = Kāsaka)، ناوی بەردێکی گرانبەها.

+ هەندێ جۆری تێکەڵاو:

- (پارسە = Pārsa). پارس. نیشتمانی پارس (بەشێوەی میدی)ە

- (پـەرثـەڤـە = Pareava). پارث. ناوچەی پەرثیەکان (نیشتمانی پەرث)ە، بەشێوەزمانی میدیەکان.

**(١١) ـ ئەو ناوانـەی، کە لەمـەڵاو (سـەرچـاوەی جۆراوجـۆری بێگـانـەوە)** بە ناوی (نـاوچەو شارو شاروچکەو روویارو کێوو. . .) میدیاوە بڵاو بوونەتەوە.

(ئا) ـ (ماد):

وشەی (مـاد) لـە پـارسی هـەخـامـەنشی‌دا، بـەنـاوی (مادە = Māda) ەوە هاتـووە کە بەرامبەر وشەی (میدي)ی ئەمڕۆیە. وڵاتی (مادە)یش لەو دەمەدا بریتی‌بووە لەم ناوچانە:

+ کەپەدە = Kapada

+ نیسایە = Nisāya

+ رەگا = Ragā

ناوی (مـادە)، لەلای ئاشـووریـەکـان، بە شێـوەی (مـادای mādāi) یان (ئامادای = āmādāi)، یان (ماتای = mātāi) هاتووە.

لەزمانی عیلامی دا، بووە بە (ماتا ـ پێ = mātā - pe)، لە زمانی عیبری کۆن دا (مادا = mādā) یەو بە یۆنانی کۆنیش (مادۆی = medoi = mādoi) یە. لەئەرمەنی کۆن دا (مارك = mār-k) ە.

دیاکۆنۆف، وامان تێدەگەیەنێ، کە ئەگەرجی قەدی (مات = māt) قەدێکی کۆنەو واتای ناوەنژادو جوگرافیایی خەڵکێ دەدات و بە زۆری لە سەرزەمینی ئێران دا بەکار هاتووەو بە تایبەتی ئەمە بەنیشتمانی خەڵکێ وتراوە، کە لەسەدەی نۆیەمی پێش زایینی دا، (ئەو خەڵکە لە ناوچەکانی ئێران دا) بە زمانێ ئاخافتوون، کە بە هەمان ناوەوە ناونراوە، یان ناویانگی هەبووە، ریشەیەکی لەزمانە ئێرانیەکان دا نی یە!!

ئێمە، لەو رووەوە، کە دیاکۆنۆف، بۆی چووە، واتە، ئەو واتەیەی، کە (وشەی (ماد = مات) ریشەی لە زمانە ئێرانی یەکانا نەبێ!) لەگەڵیدا نین و بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەوەوە، بۆی چووین و لاشمان روونە، کە قەدی (مات) لای هەموو خێزانێکی ئێرانی یەوە بەکار هاتووەو حاڵی حازریش ئەو بەکار هاتنە هەر درێژەی کێشاوەو ئەگەریش، بە گۆتەکەی دیاکۆنۆف بوایە، دەبوایێ وەها نەبوایێ!

بەهەرحاڵ، ئەوەی دیاکۆنۆنۆف وتوویەتی، (لە لاپەرە ٢٢١ ـ ی میدیادا ـ بەزمانی کوردیی) خۆی هەشار داوە.

ئەوەیشی، کە ئێمە لەم رووەوە، بەدەستمانەوەیە، لێك دانەوەی وشەی (مادە)یەو بەم جۆرەی خوارەوەیە:

قەدی (مەتە = mat) و قەدی (مەزە = maza = مەئە = maea)، نەك تەنها، ئێرانی یە، یان هیندۆ ـ ئێرانی یە، بەڵکو هیندۆ ـ ئەورپاییشەو وشەی (مادەر)ی پارسی و (مەزە = mother) ی ئینگلیزیی، لە هەمان قەدەوە دروست کراون و لەبنەرەت دا، بە واتای نیشتمان، یان وەك ئەمڕۆ لە ناوی زمانی کوردیی دا دەوترێتەوە، بە واتای (دایکی نیشتمان) هاتووە. لە بنەرەت دا، قەدەکە ئاریانی کۆنەو لەوانەیە، لە دەوروبەری هەزارەی یەکەمی پێش زایینی دا وەك کەرەستەیەکی رەواو باو، بۆبەدەستەوەدانی، واتای دایك و بەکار هاتبێ و هەروەها بۆ جۆری واتای دیکەش.

کەرەستەی (مات) لەکەرەستە زمانی سەرپاکی زمانە ئێرانی یەکان دا بەکار هاتووەو رووالەتی (مەزد) لەوشەی (ئەهرومەزدە = Ahuramazda) دا وەر گرتووەو هەرووەها رووالەتی (مەت)ی لە وشەی (هەگمەتان = Hagmatāna) دا، وەر گرتووە.

لەوشەی (دەخمە = daxma) دا، قەدی، (مە) بەشی کۆتایی یەکەی پێك هێناوەو ئەم وشەیەش لەلایەن پارسی کۆنەوە بەکار هێنراوە، جگە لەمەش لە ناوی میدیدا ئەم (پارچەیە = ma) و هەروەها لە ئاڤێستاش دا، هەر، بەکار هاتووە.

بەشێوەیەکی روون تر، وشەی (دەخمە = daxma) لە ئاڤێستادا، بە واتای پاڵەوان، قەڵا، سەرداب توونی جەنگ بەکارهاتووەو هەر ئەم وشەیە، لە زمانی پارسی هەخامەنشی دا، بە هەمان واتا هاتووە، بەڵام لەزمانی میدیەکان دا، وەك (پارچە زمانێك) لە کەرەستەی پێکهێنانی ناوێك دا، کە ئەویش (تەخمەسپادە = Taxmaspāda) یە، بەکار هاتووە. زۆرتریش لە ناوی قەڵا دەکات، تاوەکو هی ناوچە.

ناوی سەردەمی میدیەکان و هی پێش تری ئەوانیش، تا ئەمڕۆ، لە ناوچە جۆر بە جۆرەکانی کوردستان دا، هەر ماونەتەوەو هەندێ لەوانەش، بە پامان وزامانی و بەبێ گۆران بە هۆی لێکدانەوە، بە هۆی پێشبەند، یان پاشبەندەوە رواڵەتیان، بەلای گۆران دا چووەو هەندێکشیان، بەیەکجاری شوێنەواری ناویان نەماوەو بە ناوێکی نوێوە ناو دەبرێ، یان هەر، لە هیچ روویەکەوە شوێنەواریان نەماوە! [٢]

ئێمە، بە هۆی پەنا بردنە، بەر دەنگسازیی و وشەسازی و یاسایانەوەو بەراوردکردنیان لەگەڵ هاوجۆرو هاوواتایان دا لەناو زمانی پارسی کۆن داوهی ئاڤێستایی دا، دەگەینە، ئەو ئەنجامەی، کە ئەو ناوە میدیایی بێ، یان نەء! ئەویش بە هۆی:

یەکەم، لە رووی بەراوردەوە، لەمەوپێش تر، بەتایبەتی لەخاڵی سەرەکی (دە)دا، گەیشتینە، ئەو ئەنجامەی، کە کەرەستەزمانی میدیەکان (ئەوەی کە بۆمان بەجێ ماوەو، سەرچاوەی جۆراوجۆر بەکەرەستەی میدی لەقەڵەم داوە) لەگەڵ هی زمانی ئاڤێستادا یەکێکەو چ جۆرە جیاوازییەك لە نێوانیان دا، نەهاتووەتە کایەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە زمانی ئاڤێستا (گاتەکان) زمانی دینی و رەسمی میدیەکان بووەو زمانی پارسی کۆنیش، شێوەزارێکی جیاواز لە زمانی ئاڤێستاو هی میدی بووە.

دووەم: هەندێ ناوی ناوچەو ناوی کێوو ناوی [٣] شارو ناوی دێهات، لە سەرچاوە ئاشووریەکان دا، بەرچاو دەکەون و، کە زووربەی زۆریان ئێستە وەك خۆیان ماونەتەوەو هەندێکیشیان، هەر ئەو دەمە، ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا هاتووە، یان گۆڕدراون!

بۆوێنە، لە سەرچاوە ئاشووریەکان دا (سەرگۆنی دووەم، نێوان ساڵانی ٧٢١ ـ ٧٠٥. پ. ز) ناوی ناوچەی (خارخار) هاتووەو

هەروەهـا ناوی فەرمـانـرەواكـەی كە (كـەیـابـا) بووە هاتـووە . هەر لەهەمان كات دا ناوی ناوچەی (ئیٚلیٚپی = ELLIPI ) یش هاتووە .

ئەگەر ئەمروٚ، ئیٚمە، بە جوگرافیای روٚژئاوای ناوچەكانیٚ ئیٚران دا بگـەریٚین، دەبینین لە چەنـد ناوچـەیـەك دا، ناوی (خـورخـورە) هاتـووە، لەبـەر ئەوە، ئەمـە وامـان لیٚ دەكـات، كە بروامـان بەوە هەبیٚ، كە (خـارخـار) تا ئەمـروٚ ناوی ماوەتـەوە، لەگـەلٚ نەختیٚ ئالٚ وگوٚر لە دەنگە بزویٚن دا .

بە هەرحـالٚ، ئاوی (خـورخورە)و ناوچەی خورخورە، كەوتوونە سەر بەشی ژووروی سیروان و ناوچەی سەردەشت ـ ی ئەمروٚوە، كە زوٚرتر روٚژئاوای (سەقز) دەگریٚتەوە .

لە ناوچـەی هەورامـان دا، كانی (خـورخـورە) هەیە، هەروەها ناوی جیٚگـا كە كەوتـوونەتە بناری شاخەكانی هەورامان لە ناوچەی پشت جوٚگـەدا، بە ناوی (خـارگیٚـلاٚن)و (خـەرپـانی = خارپانی)و (خـورمالٚ)ەوە هەن .

هەر لە هەمـان ناوچـەدا، زوٚر نزیـك بە خورمـالٚ، ناوچـەی (ئیٚلانیٚ) هەیە .

دیـارە، (ئیٚـلاٚنیٚ)ی ئەمـروٚ لە (ئیٚلیٚپی)ی ئەو دەمـەوە هاتـووەو ئاشكراشە، ئەم ناوی (ئیٚلیٚپی)یە، ناوی ئاشووریەكانە، چونكە ئەو جوٚرە (قەد)و ریشەیە لە زمانی میدیو ئاڤیٚستایی دا بەدیی ناكریٚن .

وەختیٚ ئەم وتەیە، بەراست دەزانین، ئەگەر هاتوو بوٚ ناوە جوٚر بە جوٚرەكـانی (هـەولیٚر)ی سەردەمی ئاشووریەكان و هەخامەنیشەكان گەراینـەوە، كە چوٚن، ناوی (هـەولیٚـر) لای هەخـامـەنیشـەكـان (ئەربیٚرا) بوو، كەچی لە لایەن ئاشووریەكانەوە، بە (ئەربیلا) ناو دەبرا!

ئیٚمـە ئەگـەر لە ناوی (كـەیـابـا) ورد ببینەوە، بوٚمان هەیە، بەم جوٚرەی خوارەوە وردی بكەینەوە :

ـ (كـەی، نازنـاویٚكی كوٚنی ئاریـانەیە، بەواتای، خودا گەورە، فەرمانرەوا، سەرپەرشتیكەر، هاتووە .

ـ (بـاب)، وەك پاشبـەنـدیٚـك لە (ڤـاگ)ەوە هاتووە . هەر لەبەر ئەوەی نووسـراوەكـە، بە زمـانی ئیٚرانی نی یە، لەبەر ئەوە، ئەو ئالٚ و گوٚرەی بەسەردا هاتووە .

حالی حازر، (ڤـاگ) بەرەو (بـاگ) یان (بـەگ) گوٚردراوە، بەو پیٚیـە، (بەگ) یان (بەگ)، بە واتای سەرپەرشتیكەر، چاودیٚریكەر، ئاگـاداریكـەر، هاتووەو زوٚرتریش بوٚ كشت وكالٚ و زەویوزار بەكار هیٚنراوە بەم پیٚنە دەبیٚ، (كەیبابا) دەربەگ بوویٚ، یان فەرمانرەوای كشت وكالٚی دیٚهات بوویٚ .

بوٚشمان هەیە، بەم جوٚرە، بەشی دووەمی (كەیبابا) ـ واتە (بابا) ـ لیٚك بدەینەوە .

(بـاب) بە شیٚـوەی نائیٚرانی، بە واتای (قاپی = دەرگا) هاتووەو، بە شیٚوەی (ئیٚرانی)یش، كە (باو)ە، یان (بەو)ە، بەواتای (سنوور) دیٚ، لە هەردوو حالٚـەتـەكـەش دا، بە هەمـوویـەوە، بەواتـای (دەرگاوانی خوا) یان (خوای سنوور) دیٚ .

(بیٚ) ـ ناوی پایتـەختی میـدیـەكـان، كە (هـەگمـەتـانـە = Hagmatāna) یە، وشەیەكی دیكەی سەرەیە، كە لیٚی بكوٚلٚریٚتەوە .

وشەی (هەگمەنانە = Hagmatāna) پیٚك هاتووە، لە :

+ هەنگەنە = hankana - هەگە = haga

+ مەتا = - matā -

+ ـ نە = - na -

وشەی سەرەی (هەنكەنە = hankana) بەواتای (هوٚز)، (گەل،) (عەشرەت)، (پوورە)، (تیرە)، (رەگەز) . . . هاتووە .

ـ پارچەی (مەتا = matā)، لەبنەرەت دا، (مەت = mat) ەیەو لەبەر باری (میٚـەتی)، بووە بە (مـەت = mata)، كە بەواتـای (نیشتمان)، (دایك) هاتووە .

ـ پاشبـەنـدی (ـ نە = na) بوٚدوٚخی (جیٚگـا) بەكـار هاتـووە . بەهەمووبەوە بەواتای جیٚگای، یاخود (مەلٚبەندی هوٚزی ماد) هاتووە (تەماشای لیٚكدانەوەی (مەت، یان مات) بكەرەوە .

**(١٢) ـ بەم، بوٚنەیەوە، وا هەندیٚ ناوی میدی دەخەینە بەردەم:**

+ هەندیٚ ناوچەی میدیەكان .

ـ ئەسەگەرتە = Asagarta

ـ كەپەدە = Kapada

ـ نیسایە = Nisāya

ـ رەگا = Ragā

+ هەندیٚ شار .

ـ هەگمەتانە = Hagmatāna

ـ كودروش = Kudurus̄

ـ ماروش = Mārus̄

+ هەندیٚ قەلاٚوكەمپی سوپایی .

ـ سیكەیەوەتیش = Sikayavatis̄

ـ تەخمە سپادە = Taxmaspāda

+ ناوی ئەو هوٚزانەی، كەیەكیەتی (ماد)یان پیٚك هیٚنابوو:

- (بەوسە = Biusai).
- (پەرەتاکن = Paretākenoi).
- (ئاریزانتی = Arizāntoi).
- (سترەوکنات = Strouknātes).
- (بەودی = Boudioi).
- (ماگی = māgoi).

(دیاکۆنوف، ل ـ ٢١٨).

+ ناوی هەندێ شاهی میدیەکان و ناوی هەندێ شۆڕشگێڕیان :

- (کەی ئەخسار = Cy - axāres)، کە بەم جۆرەش ناوی هاتووە، (ئوڤەرشترە = Uvarštra)، ناوی شاهێکە، لە شاهەخانی میدیا.[٤]

- (زەرەثوشترە = Zarathušhtra) ناوی پەیامبەری دینی‌یە یاخود شاهی دین.

- (ئەمشەسپەند = Amshaspand)، سەرۆکی پەری‌یان.
- (ڤەرە هرەن = Varahran): بەهرام، پالەوانێکە.
- (فرەورت = Phraortes). ناوی مانگەو ناوی (فرێدون)یشە.
- (خشەثریتە = Xšaerita)، ناوی شۆڕشگێڕێکی میدی‌یە.
- (گەوماتە = Gaumāta)، ناوی شۆڕشگێڕێکی میدیە.

+ هەندێ ناوی دیکە.

- (نـومـۆ = Nomos)، کە بەواتـای (نامە)ی ئێستادەگرێتەوەو ناوی ئەو (یـاسـاو دەسـتـوور)ە بووە، کە لە سەروکـلاوی شاهی میـدیـا، (دیاتاکۆ)دا، پەیرەوی پێ کراوە.

- (سـەتـراپ = satrāp)، کە سەرکـاری میـرایـەتی بووە، بۆ جێ بـەجێ کردنی فەرمـانـەکـانی میـرایـەتی لە ناوچەیەك دا، زۆر ...یکە، لە (پارێزگار)ی ئەمڕۆوە.

(١٣) ـ ئەنجامی ئەم بەراوردە :

بەپێی ئەو کەرەستـە مۆفـۆلـۆژی یەی، ئەو ناوە میدیای‌یانەی، کە بەجێ ماون و لەسـەرچـاوەی جۆراو جۆردا هەڵ گۆرزاون و بەراورد کردنیـان لەگـەڵ هەمـان جۆرە کەرەستـەی زمانی ئاڤێستایی و زمانی پارسی کۆن دا، وا، بەرچـاو کەوت، کە زمـانی ئاڤێستـایی و زمانی میدیەکان، هەریەکێ بوون، یان زمانی ئاڤێستایی شێوە زمانی دینی میدیەکان[٥] بۆوە، بەم پێیە ـ (ئەگەر هێشتا هەر زۆرتری پێ دەوێ) ـ وەرگـرتـەیـەکی (گات)ەکانی ئاڤێستا، وەك وێنەی کوردیی کۆن، وەر دەگرین و دەیخەینە بەر سەنگی مەحەکی زمانناسی‌یەوە.

لەوانـەیـە، لەم ڕووەوە، ئەو پرسیارە بێتە پێشەوە، کە بۆچی هەر تەنیـا (گـاتەکان) دەوترێ و سەرپاکی ئاڤێستا ناکەوێتە، چوارچێوەی ئەم تێ بینی‌یەوە!

وەرامی ئەمەش، ئەوەیە، کە گاتەکان سروودی دینی هۆنراوەن و هیـــچ جۆرە ئاڵ و گۆڕیکیـان بەسـەردا نەهـاتـووەو بەپێچـەوانـەی بەشەکانی دیکەوەن، کە شێوەزاری پیرە دینی‌یەکان کاریان تێ کردوون!!

(١٤) ـ زمانی گاتەکان.[٦]

وەرگرتەیەك لە گاتەکان :

لە لاپەڕە (٨١)ی (گاتها)ی (پیرداود) ـ ەوە وەرگیراوە (ڕوونووس کراوەتەوە).

ڕووبەر گرتنەوە (ترانسلیترەیشن)ی ئاوازەی وشەکان، بەپێی لاتینی بەم جۆرە دەگرێتەوە:

tat θwā parasā araš moi vaočā Ahurā
kē hvapā raočās-čā dāt tamās-čā
kē hvapā x$^{v}$afnam-čā dāt zaēmā-čā
kē yā ušā aram piθwā xšopā-čā
yā manaoθriš čazdōŋhvantəm araθahyā

ڕووبـەرگـرتنـەوەی ئەم وەرگـرتـەیـە، بەپێی ڕێنـووسی ئەمڕۆی کوردیی، بەم جۆرە دەگرێتەوە:

وتەت ـ ثوا پەرسا ئەراس مۆی ڤەوچا ئاهورا
کێ هڤەپا ڕەوچاسچە دات تەماسچا
کێ هڤەپا خڤەفنەمچا دات زەیماچا
کێ یا ئوشا ئەرەم پیثوا خشە پاچا
یا مەنەوثریش چەزدۆنگ هڤەنتەم ئەرەثەیا

**لێك دانەوەی کەرەستەی نێو ئەم وەرگرتە هۆنراوەیە.**

**دێری یەکەم:**

ـ (تەثـا = tat):

ڕانـاوە، بۆ کەسی سێیـەمی تـاك، لێـرەدا، لەحـاڵـەتی بێ لایـە (نـەنێر، نەمێ)ن دا، بەکار هاتووەو لەدۆخی بەرکاردایەو بە واتای (ئـەـ= ئەم) هاتـووە. بۆشـمـان هەیە، کەبڵێین ڕاناوی ئاماژەیەو بۆ نزیك بەکار دەهێنرێت.

ئەم ڕانـاوە، یان ئەم ڕانـاوی ئامـاژەیـە، لە دەم و دۆخـی جۆربەجۆردا، ڕوواڵەتی جۆر بەجۆری هەیە.

بۆوێنـە، لەدۆخی (کـارا)داو بۆ کەسی سێیـەمی تاك دەبێ بە (ئەیەم = ayam) و لەکۆی هەمان دۆخ دا، دەبێ بە (تای = tāi).

بەڵام لەکۆی بێ لایەنی هەمان دۆخ دا، دەبێ بە (تا = tā).

بەهـەرحـاڵ، ڕانـاوی ئامـاژە (تـەت = tat) بە واتـای (it) ی. ئینگلیزی هاتووەو لەکوردیی ئەمڕۆش دا بە ڕوواڵەتی (ئەمەتا) بەکار دێ.

ـ (ثوا = θwā):

ڕانـاوی کە سێیـەو بۆ کەسی دووەم بەکـار دێ و لە دۆخی (هۆ= Instr) دایـە لەدۆخی (کـارا)دا بۆ هەمـان کەس، ڕوواڵەتی (توڤەم = tuvam) وەردەگـرێ و لەدۆخی (کـۆ)ی هەمـان کەس دا، ڕوواڵـەتی (یەڤاکەم = yavākam) وەر دەگرێ.

بەهەرحاڵ، ڕاناوی (ثوا = θwā) بە واتای (تۆ) هاتووە.

ـ (پەرسە = parsa):

(پـەرس) ڤەدی چاوگـی (پـرسـیـن)ەو حاڵی حازر لە کوردیی ئەمڕۆدا، هەروەك خۆی بەکار دەهێنرێ.

ـ (ئەرەس = aras) یان (ئەرەش):

ئەمـە، ئاوەڵنـاوەو لەزمـانی کوردی ئەمـڕۆدا بووە بە (ڕاس = ڕاست)، کە هاودژی، یان دژ واتای (چەوت = درۆ)یە.

ـ (مۆی = moi):

ڕانـاوی کەسی یـەکـەمی لکـاوەو لە دۆخی خستنـەپـاڵ دایەو لە دۆخی بەرکارداو بۆ هەمان کەس، ڕوواڵەتی دەبێ، بە (ما = mā) و لە دۆخی بەرکـارو بۆ (کـۆ)ی هەمان کەس، ڕوواڵەتی دەبێ، بە (نا = nās).

ئەم ڕاناوە لکاوە، لێرەدا، بە واتای (بەمن) هاتووە.

ـ (ڤەوچا = vaočā):

فرمانی داخوازییە، داواکردنەو حاڵی حازر، لە شێوەی ناوچەی هەورامان دا، (ڤاچە = واچە)،* بە واتای (بێژە = بڵێ)، بەکار دەهێنرێت.

بەهۆی ئەم وشەیەوە، ئەم زمانە، بە ناوونیشانی زمانی (ئێریەن ـ ڤاچ)ەوە ناو دەبرێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەر بەو ناوەوە ناوبراوە. (لەم ڕووەوە، تەماشای فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ بکەرەوە!).

ـ (ئەهورا = Ahurā) ناوی خودایە، یاخود یەکێکە لە ناوەکانی (خودا).

**دێری دووەم:**

- (کێ = ke):

ئەم ڕاناوە، لە کوردیی ئەمڕۆیش دا، بە هەمان ئاواز و هەمان واتایەوە بەکار دێت. ئەرکیشی ڕاناوی کەسی پرسە.

- (هڤەپا = hvapā):

ئەم وشەیە، ناساکارەو پێك هاتووە لە دوو پارچەی لێك دراوو لەوانیش (هڤە = - hva) و (پا = - pā) ن.

پارچەی (هڤە) بە واتای (هاوردیە)، (هێناویە) هاتووە. پارچەی (پـا)ش، بە واتـای (پێ) هاتــووە. بە هەردووکیـانــەوە واتـای (کـردوویـە)، (بنیـاتی ناوە) دێ و لەبریی ئەم وێژەیەش، لە هەندێ ناوچـەی کوردەواریی دا، (کردوویە وەپا)، (هاوردیە وەپا)، (بنیاتی ناوە) بەکار دەهێنرێت.

بۆ، وێنە دەوترێ: ئەو منداڵەکەی (هاوردە وەپا). واتە، ئەو پێی پێ گـــرت و فێــری ڕۆیـشتنـــە ڕێـــوەی کرد. یان. دەوتـــرێ: ئەو نەخۆشەکەی (هاوردە وەپا)،

واتە، ئەو نەخۆشەکەی هەڵساندەوە.

- (ڕەوچاسچا = raočas - čā):

ئەم وشەیەش ناساکارە. بریتی یە، لەوشەیەکی سەرەو پاشبەندی (دیاریکردن)یان پاشبەندی (پێناسین)، واتە:

- (ڕەوچــاس = raočās)، کە بەواتــای ڕۆژ، یاخــود ڕوونــاکی هاتووەو بنـەرەتـەکەی (ڕەوچ)ەو ئەوی دیکەشی کۆتایی دۆخێکە لە دۆخەکانی (ناو).

- (چــا = - čā)، پاشبــەنـدێکــە بۆ پێنـاسین بەکـار دەهێنـرێت. لەکـوردیی ئەمـڕۆدا، (کـە = - ka) و (ی = ) لەگەڵ (ناو)و (ئاوەڵناو) دا، بۆ پێناسین و دیاریی کردن، بەکار دەهێنرێن.

- (دات = dāt):

ئەم وشـەیـە، (کار = فرمان)ە لەدەمی ڕابوردوودا (دروستی کرد) هەر لەهــەمـان (قـەد)ەوە، واتـە، قەدی (دات) هەندێ وشەی دیکە لەکــوردیی کۆن داپێــك هاتــوون و ئەوانیش: (داتـە = dāta)، کە بەواتـای (دەسـتـوور)و (یـاسـا)و (داد) هاتووە. (داتەر = dātar)، کە بەواتای؛ (دادوەر = خاوەن داد)، (داهێنەر) (بەداد) هاتووە.

(تەماشای، فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، ل - ١٣٦، بکە)

(تەماسچا = tamās - čā):

ئەم وشـەیـە، لە دووپـارچـە پێـك هاتـووە. پارچـەی یەکەمیان وشـەیـەکی سەرەیـەو ئەویش (تـەم = tam)ەو لەگـەڵ کۆتایی دۆخی ناودا، کە پێکەوە (تەماس) یان، پێك هێناوە.

پارچەی دیکەیان، (چا = čā) یە، کە پاشبەندی (پێناسین)ە.

لە زمـانی کوردیی ئەمـڕودا، وشـەی (تـەم)و (تـەم ومـژ) بەکار دێت و لام وایە، هەریەکێ لەئێمە واتای تێ بگات، بەڵام لەکوردیی کۆن دا (تـەم بە واتـای (تاریکی) هاتووەو بێگومان بوونی (تەم)یش دەبێ بە هۆی داکەوتنی، یان بەرپابوونی تاریکی.

**دێری سێیەم:**

لە سەرەوە، وشـەی یەکـەم و دووەمـان لێك دایەوەو ئالێرەش داو لەدێـری چوارەمیش دا، دووپـات کراونـەتـەوە، بۆیە پێویـست، بە پات کردنەوەی لێکدانەوە ناکات!!

- (خڤەفنەم - چا = xafnam - čā):

وشـەی خڤـەفنـەم - چا، پێـك هاتـووە، لە وشـەی (خڤـەف)و کۆتایی دۆخ و پشبەندی (چا)ی پێناسین و دیاریی کردن.

حاڵی حازر، لە کوردیی ئەمڕۆدان (خەفتن، خەوتن) بە هەمان واتا، بە کاردێت.

وشەی (دات)مان، لەسەرەوە لێك دایەوە.

- (زێیماچا = Zaemā - čā):

وشەی (زەیماچا) ناساکارە و پێك هاتووە، لە:

- (زێیمـا)، کە ئەمیش (نـاو)ەو کۆتـایی دۆخـەکـەیە، واتە پێك هاتـووە، لە وشـەی سەرەی وەك (زەیێ) کە ناوەو بەواتـای بە ئاگـا، نەنووستوو، بزێو، ژیگەڵ، هاتووە (ما)ش، وەك کۆتایی (دۆخ)ەو لە حاڵەتی (بەرکار)دایە.

- پاشبـەنـدی (چـا)ش، هەروەك لە دێرەکانی پێشەوەدا لێکمان دایەوە، ئامرازی پێناسین و دیاریی کردنە.

**دێری چووارەم:**

ئامـرازی پرس و پاشبـەنـدی ناوونیشـان هەڵدەر، لێرەدا یەکیان گرتووەو بەرامبەری (کێ یە)ی کوردیی ئەمڕۆیە، یان بەواتانی (کێ یەکە)یە.

- (ئوشا = UŠā):

- (ئوش) یان (ئوس)، لە کوردیی ئەمرۆدا، بەهەمان واتا، بەکار دەهێنـرێت. واتـە، وشـەی (خۆش)و (ئوسا) هەردووکیان بەهەمان واتا دێن. بۆ وێنە دەوترێ:

- کێ یە، ئەو کاریە (خۆش) کرد؟

- کێ یە، کە (ئوسایی) ئەو کارەی کردووە؟

کەوابوو (ئوش)، بە واتای (ئوسا)، بەواتای (کردگار) دێت

- (ئەرەم = aram):

بەبیــروڕای من، وشـــەی (ئــارەم = ārəm) و (ئــەرەم = aram) هەردووکیان، دوو ڕووالەتی ئاوازەداری یەك (قەدد)ن.

بەهــەرحـال، وشەی (ئارەم = ārəm) بەواتای (ئارام)و (هێمن)و (کپ)ی ئێستای ناو زمانی کوردیی هاتووە.

هەر لەم قەدەوە، وشـەی ناسـاکـاری (ئـارمەیتی)، کە بە واتای (هاوسەریەتی) هاتووە، پێك هاتووە؟

وشــەی (ئەرەم)ی ئێرە، بە واتای (ئارامی) هاتووە، ئەمەیش ئەو دەمــەیـە، کە کەوتـووەتـە نێـوان دەمی ڕۆژ بـوونـەوەو دەمی کۆتیی شەوەوە، کە لە هەنـدێ ناوچـەی کوردەواریی دا، (کـازیـوە، دەمەو بەیان، سپێدە)ی پێ دەڵێن.

ـ(پیثوا = piəwa):

ئەم وشــەیـە، ناوی (کات)و کۆتایی (دۆخی) وەرگرتووە. واتە، ئەم ناوە، لە دۆخی بەرکار دایەو ئەو کۆتایی‌یەی، هی ئەو دۆخەیە،

لە قەدی (پیت = pit) بیان (پیث = piə) هەنـدێ وشــە دروست بوون و ئەوانیش: (پیتی‌مـا)یــە، کە بە واتــای (پێـوان) هاتـووەو (پی‌تـو)، کە بە واتـای (پێ‌خۆر) هاتووەو (پەیتی‌بەند)، کە بە واتای (پێ‌بـەنـد) هاتـووە. ئەودیـاردەیەی، کە شایەنی ناوهێنانە، بوونی قەدی (پیت)، یان (پی)یە، لە سەرپاکی وشە پێکهاتووەکان دا.

بەهەرحال، وشەی (پیثوا) یان (پیثڤا) بەواتای (نیوەڕۆ) هاتووە، کە لەبنـەڕەت دا (پیتهڤـەر ـ پیشخۆر) دەگرێتەوەو ئەمەش ناوەڕاستی (خور) یاخود، (ڕۆژ)، دەگرێتەوە.

ـ (خشەپاچا = xšapā - čā):

ـ خشەپا، ناوەو بەواتای (شەپ ـــ شەو) هاتووەو کۆتایی‌یەکەش کوتایی دۆخە، کە لەباری (بەرکار)دایە.

ـ (چا = čā)، هەروەك لەوەوپێشتر وتمان، بۆ پێناسین و دیاریی کردنە.

دیری پێنجەم:

ـ (یـا = yā)، ئامـرازی پەیـوەسـتـە، بەواتـای (ئـەوە)یـان (کە)ی ئەمرۆی کوردیی هاتووە

ـ (مەنەوتریش = manaoƟris).

ئەم وشەیە، ناساکارەو پێك هاتووە، لە (مەنەهـ = manah) و لە (کۆتایی دۆخی)و لە (ثریش = تریش = Ɵris).

ـ (مـەنـەهـ = مەنـە)، بە واتـای (مـەند)، (ژیر)، (ئاوەزدار)، (بەئاوەز)، (داناوزانا) هاتووە، کەوابوو ئاوەڵناوە.

وشــەکــە، بە هەردوو بەشەکەیەوە، بە واتای: مرۆڤی (بەئاوەز)و (داناوزانـا) هاتـووە، یاخـود بەواتـای (مرۆڤی بیرۆکەر) = (مرۆڤی وردبیر) هاتووە.

ـ (چەزدۆنگە هڤەنتەم = čazdoghvantam):

ئەم وشـەیـە، ناسـاکـارەوپێـك هاتـووە، لە زۆرتر، لە قەدێك، واتە: بەلای کەمی‌یەوە، لەسێ پارچە پێکهاتووە.

بەهەرحال، بەواتای (چۆنیەتی دروستکردن) هاتووە.

ـ (ئەرەثەیا = araƟahyā):

ئەم وشـەیـە ناوی ئاوەڵناوی (ڕاست)ە واتە، لە (ڕاست)ەوە ئەم ناوە پێك هاتووەو ئەویش بە واتای (ڕاستی)، یان (ڕاستی‌یەکە) هاتووە.

**واتای دێر بە دێری، بەشێوەیەکی گشتیی:**

١) ـ لێت ئەپرسم، بەڕاستی پێم بێژە، ئەهورا!

٢) ـ کێ دروستی کرد، ڕۆژ و شەو؟

٣) ـ کێ دروستی کرد، خەوو هەدەر؟

٤) ـ کێ سازی‌دا، شەبەق و نیوەڕۆو شەو،

٥) ـ کە پیاوی ژیر بیر لە ڕاستی‌یەکەیان دەکاتەوە؟

**(١٥) ـ دۆخی ناوەکان (کۆتایی جۆر بەجۆری ناو):**

لە زمــانی کوردیی کۆن دا، کۆتـایی (نــاو)و(ئـاوەڵنـاو)وهی (ڕانـاو)یش بەپێی جۆری ئەرکی لە ڕستـەسـازی‌دا، کۆتـایی جۆر بەجـۆری هەبـووەو ئەوکۆتـایی‌یـانـەش، نزیکەی هەشت جۆرن، لەهەشت (دوخ)دان.

بۆ وێنــە، ئەگـــەر ناوێکی، وەك وشـەی (ئـەسپـە = aspa) مان وەرگــرت، لە دۆخـە جۆربەجـۆرەکـان دا، ئەم کۆتـایی‌یـە جۆر بە جۆرانە وەردەگرێ!

پێشەکی، وشەی (aspa) بۆ نێرەو تاکە (کەحالی حازر ـ ئەسپ ـ دەوتـرێ). بۆبەرامبـەری (مـایین = ماین)ی ئەمـرۆی زمـانی کوردیی، واتە، مێی (ئەسپ) (ئەسپا = aspā) بەکار هێنراوە. (١)

**جۆری دۆخەکان.**

+ (کارا = .N): (ئەسپە = aspa)

+ (بەرکار = .Acc): (ئەسپەم = aspam).

+ (دیارخەر = G): (ئەسپەهیە = aspa - ya).

+ (کارابزر = .Abl): (ئەسپات = aspāt)

+ (بەرکاری ناراستەوخۆ = Dat): (ئەسپای = aspāi).

+ (یاریدەدەر = .Lnsrt): (ئەسپا = aspā).

+ (ئاوەڵکاری‌جێگا = .Loc) (ئەسپەی = aspai).

+ (بانگەوازیی = Vo.): (ئەهورا = Ahurā)

بەم جۆرە، دەبینین، کە وشـەی (ئـەسپـە)، لە هەریـەکێ لەو دۆخانەدا جورە رووالەتێکی تایبەتی هەیە.

(تەماشاه، ئاڤێستای کوردیی، ل ـ ١٢٤ ـ ١٢٥ ـ بکە)

بەو پێیـە، لەکـاتی لێ کـۆڵینەوە، لە (ناو)و (راناو)و (ئاوەڵناو)ی کوردیی کۆن، دەبێ ئاگـاداریی ئەوکۆتـایی یـە جۆر بە جۆرانـە بکرێن و بەوردیی بخرێنە بەرچاو و نەبنە هۆی سەرلێ شێواندن!!

**(١٦) ـ لێکدانەوەی هەندێ کەرەستەی ناو ئەم وەرگرتە ـ گاتە ـ یە:**

**ـ یەك، هەندێ راناو.**

+ (تەت = tat): راناوی ئاماژەی نەلکاوە. ئالێرەدا، وەك راناوی لکاو سەر ژمێر دەکرێ و بۆ (بێ لایەن)ە. لێرەدا، لە ئەرکی سەرشانی دا، وەك (بەرکار)ی پرپیۆزیشن، هاتووە.

جگـە، لەم رووالـەتـە، لە کاتی (کۆ) کردنەوە (کۆ)داو لە دۆخی (کارا)و (بەرکار)دا، رووالەتی (تا = tā) وەر دەگرێ.

لەکـوردیی ئەمـرۆدا، رانـاوی، ئامـاژەی (ئـەم) بۆ نزیـك و بۆ (بێ لایـەن)و بۆ (لایـەنـدار) بەکار دەهێنرێت و ئەو جیاوازی یەی کە ئەوسا هەبووە، لەو رووەوە، ئێستا نەماوە.

هەر لەبـەر ئەوەی، لە ئەرکی بەرکـاری پرپیـۆزیشن دایـە، ئەم شیرازەیەی وەرگرتووە، واتە:

+ (لە) + (ئەم) ← (لە) + (ێ) — (لێی).

ئەمە، لە کوردیی ئەمرۆیش داو لە شیرازەو چوارچێوەی بەرکاردا ئەو راناوی ئاماژەیە، بەو جۆرەی لێ دێ.

+ (ثوا = Θwa):

ئەم، رانـاوە، بەم رووالـەتـانـەشەوە، بەرچاو کەوتووە؛ (تڤا)، (تـوا). ئەمـە، بۆ کەسی دووەمی تاکەو لە دۆخ وباری ناواخنی دا، یاخود (لکاو)دایە.

لەکـاتی نەلکاوی دا، بۆ کەسی یەکەمی تاك و لە دۆخی کارادا، (رووالـەتـی ئەزەم = azam) وەر دەگـرێ و بۆ کەس دووەمـی تاك و هەمان دۆخ، رووالەتی (تڤەم = tuvam) وەردەگرێ، کە لە کوردیی ئەمرۆدا، (ئەز)و (تۆ)ن.

بەو پێیەمی سەرەوە، فرەیزی (تەت ثوا)، بەپێی کوردیی ئەمرۆ، بەم جۆرە دەگرێتەوە.

لێتی = (لە) + (ـ ێ ـ) + (ـ ی ـ) + (ـ ت ـ) + (ـ ی).

واتە:

ـ (لە)، پرپیۆزیشنە.

ـ (ـ ێ)، ئامرازی لکاندنە.

ـ (ـ ی ـ)، زانـاوی ئامـاژەیـەو بەشێـوەی ناواخن دەرکـەوتـووەو ئاماژە بۆ (شتێ) دەکات.

ـ (ـ ت ـ). راناوی لکاوە، بۆ کەسی دووەمی تاکە.

ـ (ـ ی)، راناوی ئاماژەیەو لکاوە، بۆ شتەکە دەگەرێتەوە.

ئەگـەر هاتـوو، ئەم فرەیـزەمـان، بەشێـوازێکی دیـاریی تر دەرخست، بەم جۆرەی، لێ دێ.

ـ (ئەمە لە تۆ . . . .) = ـ (کوردیی ئەمرۆ ـ یاخود (لێتی).

ـ (تەتثوا . . . . = tatewa) گاتەکان

ـ (ین از تو. . . . .) پارسی نوێ (گاتها ـ پورداود).

لەم بەراوردەدا، بۆمـان دەردەکـەوێ، کە کوردیی ئەمـرۆ، لەگـەڵ یاسـای پێکهـاتنی فرەیـزی ناوگـاتـەکـان دا (تەتثوا) کە بەرامبەری (لێتی) کوردیـیـە، یەك دەگـرێتەوە، کەچی لەگەڵ پارسی ئەمرۆدا پەکیان نەگرتووەتەوە!!

+ کێ = ke):

کێ، راناوی پرسە، بۆ (نیر)ەو بۆ (مێ)و بۆ تاکە.

ئەم رانـاوی پرسـە، ئەم رووالـەتانەی هەیە؛ (کە = ka)، (کێ = ke) و (کا = kā).

لە کوردیی ئەمـرۆدا، (کێ) بۆ نیـرومێ)و بۆ (تـاك) بەکـار دێ، بەلام لە پارسی نوێدا، ئەمـە بووەبـە (کیست) ـ تەماشای، گاتها ـ پور داود ـ ٦٩)و بۆ هەمان مەبەست بەکار دێ.

بە هەرحـاڵ، ئەم رانـاوی پرسـە، لە (گـاتـەکان)دا. بەم جۆرە بەکار هاتووە:

ـ (کێ هڤەپا = کێ ڤەپا)، (گات).

ـ واتە: کێ کردیە وەپا = کێ دروستی کرد = کێ هێنایە پا (کوردی).

ـ کیـست کە خوب کنش، (پارسی نوێ. پورداود ـ گاتها، ل ـ ٦٩)

+ (چە = čā):

لێـرەدا، (چـا = čā) وەك رانـاوێ، یان وەك ئامرازێ، بۆ دیاریی کردن، یان بۆ ناسین بەکار هاتووە.

بۆ وێنە، دەوترێ:

ـ (تەن = tan) = پیاو.

ـ (تەنچە = tan - ča) = پیاوەکان یاخود ئەم پیاوانە (نەك، پیاوان.)

- (تاس = tās) = ژ ن .
- (تاسچە = tas - čа) = ژنەکان یاخود ئەم ژنانە (نەك، ژنان) .
یاخود، لێرەدا (ئەم وەرگرتەیە) هاتووە :
- (رەوچە ـ چە = raocas - ča)، واتە : (رۆشنایی‌یەکە یاخود ئەم رۆشنایی‌یە)
- (تەمەسچە = tamas - ča)، واتە : (تاریکیەکە)
**- دوو، هەندێ (کار = فرمان) لەم وەرگرتەیەدا .**
+ (ڤەچە = vača)، فەرمانی داخوازی‌یەو بەواتای (بێژە)، (بڵێ)، (واچە = ڤاچە) هاتووە .
بنەڕەتی ریشەکەی = (ڤچ = vč) یان (ڤك = vk) ەو قەدەکەشی، (ڤەچ = vač)، یان (ڤە ـ ڤەچ = va - vač) ە .
کەوابێ، دەمەکانی بەم جۆرە دەگۆڕنەوە :
- (ڤەچ = vač): (بێژ = ڤاچ = واچ) لەکوردیی‌دا، کە دەمەکەی دەمی رانەبوردووە .
- قەدی (مەرەڤ = mrav) و قەدی (ئەوگ aug) وەك قەدی رانەبوردوو، بەهەمان واتای (ڤەچ = vač) هاتوون .
بەم بۆنەیەوە، ئەم رستانە، سوودیان دەبێ :
- (ڤەڤەچە = va - vača)، واتە : (گوتی، وتی) .
- (ڤەچە = vača)، ، واتە : (بژێت . دەڵێت)
- (ڤەڤەچات = vavācāt)، واتە : (ئەگەر بێژێت! !)
- (ڤەڤەچەت = vavačat)، واتە : (ئەگەربیگوتایێ) .
- (پەرسە = parsa)، قەدی رانەبوردووە، بە واتای (پەرس، پرس) لەرستەی (دە + پرس + م)دا، هاتووە .
- (مەن = man)، قەدی رانەبوردووە، بەواتای (بیر) لە رستەی (بیر دەکەمەوە) داهاتووە یاخود، بە واتای (مەند) هاتووە .
- (دات = dāt)، قەدی رابوردووەو بەواتای (دای‌هێناوە) هاتووە .
**- سێ، هەندێ ناوی نێو ئەم وەرگرتەیە .**
+ (داتەر = dātar) ناوی (کارا)ی کاری (دات = dāt) ەو بە واتای (داهێنەر = دروستکەر = خودا)، (باوك)، (خودا)، هاتووە .
لە دۆخی (کارا)و(تاك)و(نێر)دا، (داتا = dātā) یەو لە دۆخی (بەرکار)و (تاك)و (نێر)دا، دەبێ بە (داتارەم = dātār - am).
وشەی (ماتەر = mātar)، کە بە واتای (دایك) هاتووەو وشەی (دوگدەر = dugdar) کە بە واتای (کیژ = دۆت) هاتووە، هەر بەهەمان شێوە پاشبەندی (کۆتایی) دۆخ وەر دەگرن .
+ (ئەهورە = Ahura)، لە دۆخی (کارا)دایە .

+ (ئەهورا = Ahurā)، لە دۆخی بانگەوازیی دایە، بۆیە پاشبەندەکە، (کۆتایی‌یەکەی) دەنگی درێژ بوویەوە . (ئەهورە) ناوی خودانی تاك و تەنیایە .
+ (تەم = tam)، ناوی تاریکی‌یە، (بەرکار) .
+ (رۆچ = raoč)، ناوی رۆشنایی‌یە، (بەکار) .
+ (خڤەف = xvaf)، خەو، (بەرکار)
+ (زەم = zām)، ـ ئاگایی (بەرکار) ـ (زێم = zaem) یشی پێ دەوترێ .
لە (خڤەف)و (زەیەم) مەبەست لە(مردن)و (ژیان)ەوەیە .
+ (ئەرەم، پیشوە، خشەیە)ش، بە واتای رۆژ بوونەوەو نیوەڕۆو (شەو) هاتوون .
- چوار، لەرووی دەنگەوە .
ئەو دەنگانەی، کە لەم وەرگرتەیەی سەرەوەدا هاتوون، سەرپاکیان لە کوردیی ئەمڕۆدا، بەشێوەزارەکانەوە، هەن و بە رەسەن سەرژمێر دەکرێن .
دەنگی [ث]، کەلەم وەرگرتەیەدا، بەزۆری هاتووە، لە شێوەی هەورامانی‌دا، بە زۆری ماوەتەوە، بەڵام لە پارسی نوێ‌دا، جگە لەو وشە عارەبیە قەرز کراوانە، وشەی دەنگی (ث)دار، نی‌یەو بەرچاو ناکەوێ!

**پەراوێزەکانی بەشی دووەم،**

(١) ـ بۆ زۆرتر زانین، لەم رووەوە، تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە :
R.G. Kent, OLd Persian, Grammar
American OrientaL Societ, 1953.
بەکورتی، ئەم بەرهەمە، بریتی‌یە، لە : بەشی رێزمانی زمانی پارسی کۆن و دەستنیشان کردن، بۆ هەندێ زمانی دیکەی ئێرانی .
هەر لەم بەشەدا، ناوی نووسراوە کۆنەکان (پارسیەکان)، یەکە یەکەو جێگا بەجێگا دیاریی کراون .
هەروەها، لەم بەشەدا، باسی دەنگسازی‌و وشەسازی ورستەسازی زمانی پارسی کۆن کراوەو ئەوەی کە جێگا سەرنج راکێشان بێ لێرەدا، ئەوەیە، کە ئەم مامۆستایە، زۆر بەزانایانە، ترازووی بەراورد کردنی بەکار هێناوەو لەکاتی بەراورد کردنیش دا، بەپێی توانا دەستی بۆ ئاڤێستاو زمانی میدی راکێشاوە .
لەبەشی دووەمیشی‌دا، هاتووەتە سەر لێکدانەوەی تێکستەکۆنەکان، بەڵام لەبەشی سێیەمی‌دا، زیاتر بەرەو بەراورد کردن و لێك دانەوەی هەندێ وشەی پارسی کۆن رووی ناوە .

(٢) ـ تەماشای (د. جەمال رەشید، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی وڵاتی کوردەواری)یەوە، بکە

ئەم بەرهەمەی کاك د. جەمال، چەند بەشێکی زۆر گرنگی کۆ کردووەتەوەو هەربەشێ لەو بەشانە، جۆرە لێکۆڵینەوەو پشکنێکی نوێ دەخەنە، بەردەست خوێنەری کورد.

د. جەمال، لەبەشی پێنجەم دا، چەند ناوێکی خستووەتە بەر رۆشنایی دەمەتەقێ ـ وە.

ئێمە، لەو دەمەتەقێیانەی ئەو، کە لەبارەی ناوە جۆر بەجۆرەکانەوە کردوویەتی: سوودێکی زۆرمان وەر گرتووەو هەندێ لایەنی ناڕۆشنیانێ، بەهۆیانەوە بۆرۆشن بوویەوەو لەگەڵ ئەوەش دا، لەگەڵ هەندێ لەو لێکدانەوانەدانیم.

٣) ـ هەندێ لەم ناوانە، لەلایەن دیاکۆنوف ـ (میدیا ـ بە کوردی) وەو لەلایەن، د. جەمال رەشیدو فاضل قەرەداخی ـ (هاوکاری ـ ١٠٤٥) ـ یەوە، پات کراونەتەوە.

(٤) ـ مەردۆخ، (لە تأریخ کردوکردستان وتوابع)، لە (لاپەرە ـ ١٧٤)دا، ناوی شاهەکانی میدیای بەم جۆرە هێناوە.

کە یقیاد، کەیکاوس، توس، فریبەرز، کۆئەکسار، ئازدیان، لەهراسب، کشتاسپ، بەهمەن، همای، داریوشی = (دارا).

لەهەندێ سەرچاوەدا، لە بریی (کەیقوباد) (ئارباس) هاتووەو لەبریی (کوئەکسار)یش (خواخشتر) هاتووە. هەندیکیش، بە (توس)، (دیوکس) دەڵێن.

بە هەرحاڵ، ئەو ناوانەی، کە مەردۆخ وەك ناوی شاهەکانی میدیا ریزی کردوون، جێگای دەمەتەقێ ولێکۆڵینەوەی ترن و زۆرتریان پێ دەوێ.

دیاکۆنوف، بەدەمی (کتسیاس)ەوە، ناوی شاهانی (ماد) بەم جۆرە دەخاتە روو (ل ـ ٢ ـ ٥٢ ـ دیاکۆنوف ـ میدیا ـ کوردی):

ـ ئارپاك (ئارپاکس) = Arbakes

ـ ماندائوك (مائودائوکس) = Maudaukes

ـ سوسارم = Sosarmos

ـ ئارتیك = Artukas

ـ ئاربیان = Arbianes

ـ ئارتی = Artaios

ـ ئارتین = Artunes

ـ ئاستیبر = Astibaras

ـ ئاسپند = Aspandas

ـ ئاستیك = Astuigas

من بەش بەحاڵی خۆم، ئەم ناوانەی سەرەوە، بەوجۆرە ناوخوێنمەوە، چونکە سەرپاکیان لەسەرچاوەی گریکییەوە گوێزراونەتەوە، بۆیە، هەموویان کۆتایی گریکییان پێوەیە، ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی ترەوە، شێوەی خوێندنەوەکەیان، جۆری ئاوازەی دەنگە بزوێنەکانی ناوەوەی ناو هەرکەرەسەو شەیەك. دوورە لەراستییەوە.

بەشێوەیەکی تر، هەریەکێ لەو ناوانە ـ (لەبەربوونی چەند دەنگەبزوێنێ لە ناو هەریەکێ لەو ناوانەدا) ـ بەچەند شێوەوەو ئاوازیەك دەخوێنرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش دا، وەك وریشەی زمانی میدی، لە سەرپاکی ناوەکان دا بە دیی دەکرێ و زوربەیان بە (قەدێ) دەستیان پێ کردووە، کە واتای هاوکاریەتی و ئارامییان پێوەیە، هەندێکی دیکەشیان (قەدێ)، کە واتای (ئەسپ)ی پێوەیەو ئەوانی دیکەشیان، ریشەی هۆزی (ماد)یان هەڵ گرتووە.

پێش ئەوەی، ئەم خاڵە بەجێ بهێڵین، دەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ، کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێو ئەو ناوانەی، کە مەردۆخ ریزی کردوون و ئەوانەی، کە دیاکۆنوف باسی کردوون و ناوی هێناون.

(٥) ـ ماگی، لەگەڵ دینی زەردەشتیدا، ئەم تەواوکەری ئەوە، یاخود، کە ناوی دینی زەردەشتی هاتە ناوەوە. ناوی (ماگا)ش لە پەردەی مێشك داو ئاوێنەی چاودا دەردەکەوێ.

(ماگە)، بەچەند رووالەتی ناوی هاتووە. لە ئارامیدا (مەجوشا)یەو بە عیبری ـ ش (مەج)ی پێ دەوترێ و لە لایەن ئاشوریەکانیشەوە بە (مەج)و بە (ماج) ناویان هاتووە.

لای گریکەکان، ئەم ناوە، بەرەو رووالەتی (مەگز = Magos) چووەو لەوە دەکات، لە ئارامییەکانەوە وەریان گرتبێ و ئەوجا گەیشتبێتە لای لاتینییەکان، بۆیە ئەوانیش بە ناوی (مەگوز = Magus) ەوە ناوی دەهێنن.

ئەم وشەیە، لە فەرهەنگی نوێی ئەوروپاییدا، رووالەتی (ماجی = ماگی = Mgi) وەرگرتووە. لەوەش دەکات، کە ئەم وشەیە، لەپێش بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتییەوە چووێتە ناو زمانی عارەبییەوە.

هەندێکی تریش لایان، وایە، کە وشەی (مجوس)ی عارەبی، بەهۆی سریانییەوە، لەلاتینییەوە، یان گریکییەوە بۆ ناو زمانی عارەبی هاتبێ! بەو پێیەی، گوایا کۆتایی وشەکە چ لەعارەبی و چ لە

لاتینی و چ لەگریکیدا، یەك جۆرەو ئەو کۆتاییەش تایبەتی یە، بەگریکی یەوە

هەندێکی دیکەش، لایان وایە، کە لە بنەرەت دا، وشەی (مجوس) سامی (ئاشووری، ئارامی، عیبری، . . ) بی و ئەوجا، چووەتە ناو زمانی گریکی یەوەو ئەو رووالەتی وەرگرتووە.

بەپێی فەرهەنگەکەی فۆرست - (فەرهەنگی ئینگلیزی و عیبری) - دەبێ وشەکە عیبری بێ. چونکە فۆرست دێتە سەر ئەوەی، کە دەڵێ؛ وشەی (ماگ = ماج)ی عیبری پەیوەندی بەوشەی (ماه-)ی سانسکریتی یەوە هەیەو هەردووکیشیان، لە بنەرەت اد، بە واتای (حەکیم وزانا) هاتوون.

بەدەمی (هیرۆدۆتس)ەوە، وەها دەگێرنەوە، کە (ماگ) بە کۆمەڵێ حەکیم وزانای میدیەکان وتراوەو ئەو کۆمەڵە حەکیم و زانایانەش، شەش جۆر بوون و لە (تەورات)یش دا، وا هاتووە، کە هەندێ، لەو ماگا (حەکیم وزاناو ئەستێرەناسانە)نە، بۆپیرۆز بایی لەدایك بوونی (مەسیح، لە قدس)دا ئامادە بوون.

هەندێ زاناو پشکێنەر، وای بۆچوون، کە ماگا - کان، تیرەیەکی دینی و خوێندەواریی میدیەکان بوون و خاوەنی زانستگەدەی دینی بوون، کە لەو زانستگەدەیەدا، پیروزانای دینی یان پێ گەیاندووەو بەملاو بەولای ناوچەکانی میدیاو ئێران دا، بە پێی پێوست، بۆ رابەری دینی ناردوویانن.

من، بەش بەحاڵی خۆم، وەها بۆی دەچم، کە (ماگ = ماج = ماغ = مەگۆس = مەگۆز = موگ = مۆغ = مگ = مج = مغ) ناوی دینی نەبێ و ئەویش لەبەر ئەم هۆیەی خوارەوە:

- (مادە)، وەك ناوی هۆزێ، کە خاوەنی زەوی و زارن و خاوەنی فەرمانن، یاخود فەرمانرەوان، لەوڵاتێك دا، کە ئەویش وڵاتی میدیا بووە (کوردستانی ئەمرۆیە).

- (ماگە)ش، بەپێی ئەو لێك دانەوە، کە (مادە) لێك دراوەتەوە، (تەماشای، خاڵی سەرەکی ۱۱ - ئ، بکەرەوە)، دەبێ لە دوو وشە پێك هاتبێ و ئەوانیش:

- (ما -)، هەروەك لەهەمان خاڵی سەرەکی دا لێکمان دایەوە (تەماشای خاڵی سەرەکی ۱۱ - ئا، بکەرەوە)

- (- گاو)، کە بەواتای (بەهێز)، (فەرمانداو)، (خودا)، (دروستکەر)، (داهێنەر) هاتووە.

بەو پێیەی سەرەوە، دەبێ وشە ناساکارەکە، بەم جۆرە بگرێتەوەو ئەویش (ماگاو) = (ماگا)، کە واتای (هۆزی زاناو دیندار، هۆزی رابەری دینی) دەگرێتەوە.

ئەمەش بێگومان، ئەوە دەگەیەنێ، کە پیاوی دینی، یان رابەری دینی، ناوی ماگی لێ نەنراوە!! بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ، کە پیاوی دینی (پیر) لە هۆزی (ماگ) بووەو، رەوا نەبووە، کە جگە لەو هۆزە، لە هۆزێکی دیکەی میدی، پیری دینی پێ بگەیەنرێت!

ئەمەش پتر، باری چینایەتی روون دەکاتەوەو ئەمرۆیش ئەو جۆرە چینایەتیە، لە ناو ئەهلی هەقق و لە ناو ئێزیدیایەتی دا هەر باوە!

(٦) - خواڵێ خۆشبوو، مامۆستا پورداو، بە دووجۆرە کتێب، بە دووجۆرە لێکدانەوە، گاتەکانی لێك داوەتەوەو ئەوانیش، بەم ناوو نیشانەوەن:

- گاتها - سرودهای پیغمبر ایران - سپیتمان، زرتشت، نشریة أنجمن زرتشتیان ایرانی، بمبیء - ۱۹۵۲.

- اوستا، نامه مینوی آیین زرنشت. پورداود - تاران - ۱۳۳۳.

ئەوەی، کەلەبەراوردی نێوان هەردووکیان دا، بەدی دەکرێ، ئەوەیە، کە مامۆستا پورداوو، ناوبەناو دارشتنی هەندێ لێکدانەوەی گۆڕیوەو بێگومان ئەوەی دوایی یانی بە راستتر زانیوە!

لەلایەن (ئەی. جی. ئاربەری) شەوە، وەرگرتەیەکی گاتەکان لێك دراوەتەوەو ئەوەشی، کە لەم رووەوە بوترێ، ئەوەیە، کە ئەو جۆرە رووبەر گرتنەوە (ترانسلیترەیشن)یەی لاوازەو بەتەواوی وێنەی ئاوازەی وشەکان و هۆنراوەکە بەدەستەوە نادات.

(لەم رووەوە، تەماشای، ل - ۲۳۳ - ی تراث فارس - ئەی. جی ئاربەری - عارەبی بکە).

(۷) - بۆزۆرتر زانین، دەربارەی (ناو)و (ئاوەڵناو)و (راناو)و کۆتاییەکانیان، لەدۆخە جۆربەجۆرەکان دا، [تەماشای، (ل - ۱۲۱ تا ۱۹۸ - ئاڤێستا بەزمانی کوردیی - محەمەد ئەمین هەورامانی) بکەرەوە].

سەرچاوەکان:

سەرچاوە، بەزمان کوردیی.


۱ - میدیا. ئی. م. دیاکۆنۆف. برهان قانع، لەفارسی یەوە کردوویەتی بەکوردی. لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی چاپخانەی (دار الحریة - بغداد) ساڵی ۱۹۷۸.

۲ - لێ کۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی کوردەواری. د. جمال رشید. لەبڵاوکراوەکانی، دەزگای رۆشنبیری و

بڵاوکردنەوەی کوردی. چاپخانەی (دارالحرية ـ بغداد)، ساڵی ١٩٨٨.

٣ ـ زمانی ئاڤێستا. سۆکولۆڤ. وەرگێران و لێ‌دوان و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی کوردیی ئەمڕۆدا، محەمەد ئەمین هەورامانی. لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی. چاپخانەی (دارالحرية ـ بغداد)، ساڵی ـ ١٩٨٨.

٤ ـ فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ، کوردیی کۆن وەی نوێ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی. لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریەتی رۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان. لەچاپخانەی (سومر ـ بغداد) چاپ کراوە، ساڵی ١٩٨٧.

٥ ـ دەقەکانی ئەدەبی کوردی ـ علاءالدين سجادی ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ لە بڵاوکراوەکانی کۆڕ ـ ساڵی ١٩٧٨، بەغدا

٦ ـ مێژ ووی ئەدەبی کوردی. علاءالدين سجادی. چاپی دووەم، چاپخای ماعرف ـ بەغدا، ساڵی ١٩٧١.

٧ ـ فەرهەنگی (فرهنك فارسى كوردى، نوشته شكرالله بابان، ١٣٦١)

٨ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی ١٩٧٥، بەغدا، وتاری؛ (طه باقر ـ جولات تأريخية بين مواطن الأثار في شمالى العراق).

٩ ـ شەرفنامەی شەرفخانی بدلیسی ـ هەژار کردویە بە کوردی، لەبڵاوکراوەکان کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری،

بەغدا، ١٩٧٣.

١٠ ـ لەبابەت مێژ ووی ئەدەبی کوردییەوە. دکتۆر مارف خەزنەدار، لەچاپخانەی (المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة) ساڵی ١٩٨٤، لە بەغدا لەچاپ دراوە.

**سەرچاوەی عارەبی.**

١ ـ زرادشت الحكيم، نبى قدامى الايرانين ـ حياته وفلسفته. تاليف حمد عبدالقادر، عضو مجموع اللغة العربية بالقاهرة. مكتبة نهضة مصر ومطبعتها ـ الفجالة ـ القاهرة، ١٩٥٦م ـ ١٣٧٥هـ.

٢ ـ من تراثنا اللغوي القديم، مايسمى في العربية بالدخيل. طه باقر، عضو المجمع العلمي العراقي و استاذ الآثار، والحضارة في كلية الأداب، جامعة بغداد. مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠م.

٣ ـ دراسات كردية في بلاد سوبارتو. د. جمال رشيد. مطبعة ار آفاق عربية، بغداد ـ ١٩٨٤.

٤ ـ ايران في عهد الساسانيين. تأليف كريستنسن، ترجمة يحى الخشاب، مراجعة عبدالوهاب عزام. مطبعة لجنة التأليف ولترجمة والنشر ـ القاهرة، ١٩٥٧

٥ ـ الفنديداد. اهم الكتب التي تتألف منها الأبستا. نقله من الفرنسية وعلق عليه الدكتور داؤد الجلبي الموصلى. طبع بمطبعة الاتحاد الجديدة بالموصل سنة ١٩٥٢

٦ ـ تراث فارس. كتب فصوله اساتذة من المستشرقين. اشترك في كتابته واشرف على نشره ا. ج. أربري. نقله الى العربية من اساتذة كلية الأداب جامعة القاهرة محمد كفاحي، احمد ساداتي، السيد يعقوب بكر، محمد صقر خفاجة، احمد عيسى. اشترك في كتابته وراجع ترجمته يحيى الخشب. دار احياء الكتب العربية، عيسى البابي الجلبني وشركاؤه. ١٩٥٩ القاهرة.

٨ ـ كتاب تنسر. اقدم نص عن النظم الفارسية قبل الاسلام. نقله الى اللغة العربية يحى لخشاب، عميد كلية الأداب، جامعة لقاهرة. مطبعة مصر وشركة مساهمة مصرية ١٩٥٤.

٩ ـ خلاصته تأريخ الكرد وكردستان. من اقدم العصور التأريخية حتى الأن للعلامة المفضال معالي محمد أمين زكي بك. سنة ١٩٣١، ونقله الى العربية وعلق عليه الاستاذ محمد علي عوني ١٩٣٦. مطبعة السعادة، بجوار محافظة مصر، سنة ١٩٣٩.

١٠ ـ حملة العشرة الاف. الحملة على فارس. المؤرخ الاغريقي زينوفون، ترجمها عن الانكليزية يعقوب افرام منصور، منشورات مكتبة بسام موصل ١٩٨٥.

سەرچاوەی فارسی .

١ ـ گاتها ـ سرودهای پیغمبر ایران سپیتمان زرتشت . نشریه‌ی أنجمن زرتشتیان ایراني . بمبی ١٩٥٢ . گزارش پورداود

٢ ـ تأریخ زبان فارسی . بقلم دکتر پرویز ناتل خانلری . جلد أول چاپ . ششم ، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران ٢٣

٣ ـ فرهنگ فارسی آپهلوی ، تالیف دکتر بهرام فروشی ، سلسلة انتشارات أنجمن آثار ملی ، شماره (١٠٣) تهران .

٤ ـ تأریخ مردوخ . تالیف آیة اللهشیخ محمد مردوخ کردستانی . چاپخانهء آرتش (تأریخ کردووکردستان و (توابع) . کتبفروشی غریقی ـ سنندج

٥ ـ دستورنامه درصرف ونحوزبان پارسی . دکتر محمد جواد شکور. استاذ دارنشر العالي ، دانشگاه تهران ، موسسة مطبوعات الشرق ١٩٦٧ تهران .

٦ ـ اطلاعات عمومی (جدید) . گردآورنده ریاحی پور ـ مرکز پخش زرین ، انتشارات زرین ٢٥٣٦ شاهنشاهی ، تهران .

٧ ـ تأریخ مشرق قدیم . حسن پیرنیا (مشیر الدولة) مرکزپخش عطار. تهران .

٨ ـ أوست ، نامه مینوی ، آیین زرتشت . گزارش استاذ ابراهیم پورداود. چاپ شرکت سهامی آفست ـ تهران ١٣٤٣ ـ انتشارات مروارید تهران .

٩ ـ نشریه انجمن فرهنگ ایران باستان ـ سال چهارم ، شماره (٣) اسفندما ١٣٤٥ چاپ راستی تهران .

١٠ ـ زرتشت و دربار ویشتاسب شاه ، دکتر بهران فروشی.

١١ ـ آوستا ، نوشته وتالیف هاشم رضی . ناشر سازمان انتشارات فروهر، تیرماه ١٣٦٣

١٢ ـ فرهنگ بهدینان . گرد آوری حمشیدسروش سروشیان ، بامقدمه استاذ ابراهیم پورداود . بکوشش منوچهرستوده چاپخانه‌ی دانشگاه تهران ، درخرداد ١٣٣٥ چاپ شد .

١٣ ـ جستجوی حقایق تاریخی در داستانهای ملی ایران . نوشتهء دکتر دبیح الله صفا ـ نشریه انجمن فرهنگ ایران باستان سال چهارم شماره (٣) اسفندماه ، ١٣٤٥ ، چاپ راستی ـ تهران

1 - Cld Persian, Grammar, Texts, Lexicon bu
RoLand G. Kent, Profssor Emeritus of Indo - European Linguistics
University of PennsyLvania
American OrientaL Society
New Haven Connecticut, 1953.

2 - An Avesta Grammar, in Comparison with Sanskrit by
A.V. WiLLiams Jackson of CoLumbia CoLLege,
New york City, Part - 1
Stutrgart W. Kolhammek 1892

3 - S.N. SokoLov, The Avestan Language.
Nauka, PubLisbing House
CentraL Department of OrintaL Literature Moscow 1967

4 - The HoLy - BibLr, Containing the OLd and New Testaments
TransLated out of the originaL tongues and with the
former transLations diLigentLy compared § revised
set forth in 1611
and commonLy known as the King James Version
Instituted in the year 1816
New York

5 - EngLish Verse, VoLume V.
.ong fellow to Rupert Brooke, London University Press
ʼlatLew ArnoLd. P. 297 - 324

# تاريخ مسيرة اللغة الكوردية

● محمد أمين هوراماني ●

ان المصادر من الوثائق المدونة والمنقوشة والتي بامكانها ان تزودنا مباشرة، بالمعلومات الضرورية الكافية عن وصول اجداد الكرد القدماء والميديين وثقافتهم ولغتهم قليلة جداً، أو تكاد تكون معدومة لحد الان.

ورغم ذلك، بامكاننا ان نحصل على معلومات قيمة ومفيدة جداً عن الميدين والكرد ولغتهم وثقافتهم وتأريخهم وعلاقاتهم المختلفة والمتنوعة مع الشعوب المجاورة لكنها بصورة متفرقة وفي بعض الأحيان متضاربة وذلك في خفاياو بطون بعض الكتب والمصادر الأجنبية المختلفة التي كتبت ونشرت عن الشعوب الايرانية وحولها فيما إذا اعتمدنا على الطريقة العملية الكفيلة بتمحيص تلك المعلومات وإنتقائها.

فقد أعتمد هنا، في أول الأمر وكلياً على جمع المعلومات من المصادر الأجنبية الكثيرة المختلفة والمتنوعة، ودرس، جميع جوانب تلك المعلومات والمصادر، ومن ثم وضع تلك المعلومات في ميزان الدراسة المقارنة، أخذة بنظر الاعتبار الجوانب التأريخية واللغوية والدينية والسياسية والجغرافية والاقتصادية لبلاد كوردستان وفي المراحل المختلفة إبان الحكم الميدي والهخامنشي والهيليني والاشكاني والساساني والعربي الاسلامي، وعن طريقها، وحسب رأينا، أنتقينا معلومات كافية، وعلى ضوئها توصلنا الى :

أن اللغة الكوردية الحالية المتمثلة بلهجاتها (باستثناء المفردات الدخيلة والغربية فيها) بموادها الأولية النقية، هي حفيدة اللغة الميدية وعليه والظروف التي مرت فيها، منذ مرت (اللغة الكوردية) بمراحل متعددة ومختلفة وبفترات زمنية متفاوته، يمكن حصرها بصورة تقريبية في المراحل التالية:

١ ـ مرحلة اللغة الكوردية القديمة.
٢ ـ مرحلة اللغة الكوردية الوسطى.
٣ ـ مرحلة اللغة الكوردية وظهور الـهجات.
٤ ـ مرحلة ظهور اللغة الكوردية الأدبية (الكوردية الحديثة)

فللدراسة اللغة الكوردية القديمة، التجأنا الى ثلاث نقاط رئيسة، ألا وهي :ـ

أ ـ دراسة بلاد كوردستان لفترة اكثر من سبعة قرون قبل الميلاد وبصورة خاصة من الناحية الجغرافية والدينية والأقتصادية والتأريخية والثقافية والقصد منها تشخيص اللغة المتداولة بين شعوب بلاد كوردستان لتلك الفترة.

ب ـ عدم أهمال المعلومات التي تشرت عن بلاد كوردستان و شعوبها ولغتها وتأريخها، سوى أكانت تلك المعلومات منشورة في المصادر الأجنبية أم في المصادر الكوردية والعربية، والاستفادة منها.

جـ ـ فقد فُقد أثر بعض المفردات اللغوية، للغة الميدية المتمثلة ببعض الاسماء وبعض المفردات والكلمات، التي التقطت قسم منها ضمن تدوينات اللغة الفارسية القديمة وبعض المصادر الأخرى التي نشرت معلومات قيمة عن الشعوب القديمة لبلاد ايران القديم، فهذه المفردات تشمل بعض الجذور والسيقان اللغوية للكلمات والمفردات الميدية من اسماء لشخصيات ميديه، وأمكنة استراتيجية مهمة أخرى.

فاستناداً، الى تلك المواد الأولية اللغوية الميدية، استطعنا ان نشخص كلمات ومفردات ميديه اصيلة في اللغة الكوردية الحالية، وعليه سلكنا طريقة الدراسات المقارنة بين تلك المواد الأولية اللغوية وبين مثيلاتها في اللغة الفارسية القديمة وبينها وبين اللغة الأڤستيه (الگاتات)، وبينها وبين اللغة الكوردية الحالية، تبلورت لدينا نتائج مهمة، وكالآتي.

١ ـ هناك تشابه كثير بين اللغة الميدية واللغة الفارسية القديمة
٢ ـ هناك تشابه كثير جداً بين اللغة الميدية واللغة الأڤستية
٣ ـ هناك تشابه كثير جداً بين اللغة الميدية واللغة الكوردية

الا ان أوجه التشابه الموجود بين اللغة الميدية واللغة الأڤستية اكثر بكثير مما هو موجود بينها وبين اللغة الفارسية القديمة، وبالاحرى أن اللغة الأفستية تعتبر لهجة من لهجاتها الدينية، وعلى هذا الاساس، استند المقال هنا، على دراسة المقتطف الشعري من (الگاتات) لغرض تحليلها لغوياً، كنموذج للغة الكردية القديمة، لغرض مقارنتها باللغة الكوردية الحالية من حيث الأصوات وتكوين وتركيب ونحت الكلمات وتكوين الجمل.

# ڕستەی شوێن کەوتووی مەرج

د. کوردستانی موکریانی
کۆلێجی ئاداب - زانکۆی
سەلاحەددین

سەرەتا

بابەتی ڕستەی شوێن کەوتووی مەرج لەنێو هێندێك بەرهەمی ڕێزمانیدا زۆر بەکورتی باس کراوەو هەتا ئێستە وەکو بابەتێکی سنتاکسی سەربەخۆ لێی نەکۆڵدراوەتەوە، هۆی ئەمەش بۆ کەمی لێکۆڵینەوە لە بواری سینتاکس دا دەگەڕێتەوە.

مامۆستا نوری علی أمین لە د ڕێزمانی کوردی،[1] دا سەبارەت بەو پارچە ئاوەڵکاری‌یەی کە مەرجە دەڵێت

(لە ڕستەی مەرجی‌دا ئەو پارچەیەی، کە شوێن کەوتووەو وشەی مەرجی تیایە پێی ئەڵێ: پارچەی مەرجی، وەك:-

ئەگەر بخوێنیت دەرئەچیت.

ئەو پارچەی، کە وشەی مەرجی تیا نی‌یەو شا پارچەیە، پێی ئەبێژ ڕێ (پارچەی وەرام) وەك:

کە برسیت بوو، نانەکە بخۆ.

مامۆستا نوری علی أمین لەم بەرهەمەی‌دا دوو لاپەڕەی بۆ مەرج تەرخان کردووەو تێیدا ئەو فرمانانەی مەرجی ڕوون کردۆتەوە، کە لەنێو ڕستەی سەرەکی و ڕستەی شوێن کەوتوودا بەکارهاتوون، ئەوەی شایەنی باسە ڕستەی دووەمی خاڵی شەشەم پێوەندی بە ڕستەی شوێن کەوتووی مەرجەوە نی‌یە..

پروفیسۆر قەناتی کوردۆ لە بەرهەمی (زمانی کوردی)[2] لاپەڕە ((٧١ و ٧٢))ی بۆ ڕستەی تێکەڵ تەرخان کردووەو، لەم باسەدا بایەخی بەو ئامرازانە داوە، کە هاوبەشی پێك هێنانی ڕستەی تێکەڵ دەکەن، بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە، کە ئەم ئامرازانە لەگەڵ چ جۆرە ڕستەیەکی شوێن کەوتوو بەکاردێن، بەڵکو هەر ناوی بردوون و ڕستەیەکی تێکەڵی بە وێنە بۆ هێناونەتەوە، بۆ وێنە دەربارەی ڕستەی شوێن کەوتووی مەرج، هەر ناوی ئامرازی ئەگەر (هەگەر)ی بردووەو ئەم ڕستەیەشی بەوێنە هێناوەتەوە:-

ئەگەر دخوەزی، وەرە.

د. ن. مەکەنزی لە لاپەڕە (١٣٦ - ١٣٩)[3]ی بەرهەمە ڕێزمانیکەی‌دا باسی مەرج دەکات، بەڵام نەك وەکو بابەتێکی ڕستەسازی، بەڵکو لەنێوی‌دا بە ووردی بەکارهێنانی جۆراوجۆری کاری دەست نیشان کردووەو ئەو دەمکاتانەی کاری خستۆتە ڕوو، کە لە مەرج و وەڵامی مەرج دا بەکاردێن، بەبێ ئەوەی بگاتە یاسایەکی گشتی بۆ بەکارهێنانەکانی کار لەم بوارەدا.

ئەوەی شایەنی باسە ئەم جۆرە دابەش کردنی کارە لە لایەن مامۆستا (نوری علی أمین)ەوەش لەو بەرهەمەی، کە لەمەوبەر ناوم بردووە بەرچاو دەکەوێت و دیارە هەردوو مامۆستایان د. ن. مەکەنزی و نوری علی أمین بۆچوونیەتی بەکارهێنانی کار لە زمانی کوردی‌دا لە باری مەرج دا پێڕەوی ڕێزمانی زمانی ئینگلیزی‌یان کردووە، بۆیە

ئەم باسە لە بەرهەمی هەردوولایان دا لێك نیزیکە.

مامۆستایان کەریم ئەیوبی و ی. سمیرنۆڤا لە بەرهەمی دیالێکتی کوردی موکـری لاپـەرە (١٤١) دا[٤] نیـوی ئەم جۆرە رستـە شوێن کەوتـوەوە دەبەن لەگەڵ ئەو ئامرازە سینتاکسی یانەی هاوبەشی دارشتنی دەکـەن ولەو ئامـرازانـەش ناوی ئەگـەرچی و ئەگـەر یان بردووەو رستەیەکیش بەوێنە دێننەوە.

مامۆستـا محەمـەد ئەمین هەورامـانی لە بەرهەمی زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا[٥]، کە باسـی رستــەی لێکــدراو دەکات وەکو ئامرازێکی پەیوەست ناوی ئامرازی گەیەنەری (ئەگەر) دەبات و رستەیەکیش بە وێنە بۆ دێنێتەوە.

زەری عارف یوسوپوڤا لە بەرهەمی شێوەی سلێمانی ـ زمانی کوردیدا[٦] لە لاپەرە (١٢٧ ـ ١٢٨) دا لەم بابەتە دواوەو ئەو ئامرازە گەیـەنەرانەی باس کردووە، کە بۆ ئەم دۆخە بەکاردێن وەك (ئەگەر، هەر ـ کە، هەرچـەنـد، کە) و لە رووی شوێـنـی رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج دا دەڵێت (بـە شێـوەیەکی گشتی ئەم جۆرە رستـەیـە دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکیەوە، هەرچەندە هێندیك جار دەکەوێتە دوای رستەی سەرەکیەوە.

لە رووی دەمکـاتی ئەو کارانـەی هاوبـەشی دارشتن گوزارەی رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج دەکەن رستەکە دابەش دەکاتە سەر دوو جۆرە رستـەی شوێن کەوتـووی مەرجی، یەکەمیان گوزارەکەی بریتی دەبێت لە کارێکی رابـوردووو رانـەبـوردووو داهـاتووی ئیخبـاری ویـا دەمکـاتی رانـەبوردووی داهاتووی ئیلزامی، بەڵام جۆری دووەمیان دەمکاتی کارەکە رابردووی ئیلزامی دەبێت. زەری خان بۆ ئەم بارانە چەند رستەیەکی سەرکەوتووانەی بە وێنە هێناوەتەوە.

تۆژەری ئەم لێکۆڵینەوەیە لە لاپەرە (٨٤)ی بەرهەمی (سینتاکسی رستەی سادە)[٧] دا باسی رستەی شوێن کەوتووی مەرجی کردووە، پێشەکی پێناسەیەکی کردووەو نێوی دوو ئامرازی گەیەنەری مەرجی (ئەگەر، هەکە)ی بردووە، کە لەگەڵ ئەم جۆرە رستەیەدا بەکاردێن و شوێنی رستـەی شوێن کەوتـووی مەرجی لەنێـو رستـەی تێکـەڵ دا دەست نیشان کردووەو ئەم لێکدانەوانەشی بە رستە روون کردۆتەوە.

## رستەی شوێن کەوتووی مەرج

رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج لەنێـو رستەی تێکەڵ دا مەرجی روودانی رووداو دیـاردە روون دەکـاتـەوە، رستـە شوێن کەوتووەکە واتـای ئەو مەرجـە دەبـەخشێت، کە رووداوەکـەی لەنێـو رستـەی سەرەکی دا روودراوە، ویـا لە داهـاتوودا روو دەدرێت، ویا گەرەك بوو روو بدرێت.

رستــەی شوێن کەوتــووی مەرج وەکـو هەمـوو جۆرەکـانی دی رستـەی شوێن کەوتـوو لە رووی پێـك هاتنی سینتاکسیەوە هەروا لە رووی واتـاوەش هەرگیـز بەتـەنیـا بەکـارنـاسیەت، چونکە واتاکەی ناتـەواوەو دارشتنـە سەتـاکـیێکـەشی نیوەچڵە، بۆیە لەم دوو روەوە بەندیواری بە رستەی سەرەکی نێو رستەی تێکەڵ دا هەیە، بۆوێنە، کە دەڵێین :ـ

*(ئەگەر ماڵت لە شووشە بوو)*

ئەم رستـەیـە لە رووی واتـاوە پێك هاتنەوە ناتەواوە، لەم هەردوو لایـەنی واتـاو پێـك هاتنێـوەی چاوەڕێی تەواوکـردنی دەکرێت، کە رستەکەی دوای خۆی ئەم ئەرکەی بۆ جێ بەجێ دەکات، کە وتراوە *(ماڵی خەڵکی بەردە باران مەکە)*

بە هەبـوونی ئەم دوو رستــەیــە تێکـرا رستـەیـەکی تێکـەڵیـان پێـك هێناوە، کە واتی تەواو دەبەخشێت و لە رووی پێك هاتنەوەش هیـچ کەم و کورتـایەکی تێدا بەدی ناکرێت، ئەوەی شایەنی باسە رستەی شوێن کەوتووی مەرج لەنێو رستەی تێکەڵ دا بۆ هەموو رستە سەرەکیێکە دەگەڕێتەوە، نەك بۆ بەشێك لە بەشەکانی.

ئامـرازی گەیـەنـەری سینتاکسی نێوان رستەی شوێن کەوتووی مەرج ورستـەی سەرەکی دا ئامـرازی (ئەگەر)، کە کەوتۆتە سەرەتای رستــەی شوێن کەوتــووی مەرجــەوە، هەروا لە زمـانی کوردیدا هێنـدیـك ئامرازی دیش هەن، کە هاوبەشی پێك هێنانی ئەم جۆرە رستـە تێکـەڵـە دەکـەن، بەڵام بە رادەیـەکی کەمتـر بەکاردێن، وەك (هەکە، کە، هەر ـ کە).

رستــەی شوێن کەوتــووی مەرج لە رووی رووداو ئەگــەری رووداني دیـاردەو رووداودا دابـەش دەکـرێتە سەر دوو جۆرە رستەی شوێن کەوتوو:ـ

## ١ ـ رستەی شوێن کەوتووی مەرجی رووداوی تەواو

لەم جۆرە رستـە شوێن کەوتـووەدا ئەو مەرجـەی، کە لەنێو رستە شوێن کەوتـووەکـەدا هاتـووە، رووداوی رووداوەکەی لەنێو رستەی سەرەکی دا روودراوە ویا لە داهاتوویەکی خێرادا روو دەدرێت.

دەمــکــاتــی کاری گوزارەی رســتــەی سەرەکی و رســتــەی شوێن کوتــووی مەرجی رووداوی تەواو هەمـوو دەمکـاتـەکـانی کار دەگـرێتـەوە، تەنیا کاری رابردووی ئیلزامی نەبێت، کە لەم دۆخەدا لەگەڵ رستەی سەرەکی دا بەکار نایەت.

بۆ وێنـە لەم رستـانـەی ژێـرەوەدا کاتی رووداني رووداوی کاری گوزارەی رستەی شوێن کەوتوو و رستەی سەرەکی رابردووی ئیخباریە :-

*هەکە یەکێ زانی، دەرگەهەك بۆ فولکلۆری کوردی، ۸۷*
*ئەگـەر ئەم بۆیـام بوویـەوە دایکـە دڵسـۆزەکـەی، ئەویش بۆیەك بە یەکیان بوو بووە خوشکێکی کەرە دڵسوزو، شار، ۳۳*
*ئەگەر هەر چیەکی کردبێت، لە ئەنجامی هەستێکی پیرۆزەوە بووە، فریشتەکانی سەر زەمین، ۳٤*

لەم دوو رستـانـەی خوارەوەدا کاتی رووداني رووداوی گوزارەی رستەی شوێن کەوتوو و رستەی سەرەکی رانەبووردووی ئیخباریە :-

*خۆ ئەگـەر ئەمـەیش نالەبارو گونجاوە، بەڵام بەڵگەم بە دەستەوەیە، کە سەدەی بیســتــەم شتی ناشیــاویش بەبــاو دەزانێت، لاکێشــە روونـاکەکان، ٦٩ .*
*ئەگەر پێ نەحەسا، ئەو بخودێ کەڤیت، پاربیت کوردی - ٦٩*

لەوانـیـە کاتی رووداني رووداوی گوزارەکـە وەکـو رستـەکـانی پێشوو لە یەك سات دا نەبن، بەڵام هەر ئیخباری دەبن، بۆ وێنە لەم زستـانـەی ژێـرەوەدا کاتی گوزارەی رستـەی شوێن کەوتووی مەرج رابــردووی ئیخبــاریــە، بەڵام کاتی گوزارەی رستـەی سەرەکی رانــەبــووردوی ئیخبـاریـەو هێنـدیـك جار لە باری فرمـان ویـا داخوازیش دا دەبێت :-

*ئەگــەر گۆت نە، دێ دارێ خولســەری وی دت؛ دەرگـەهـەك بۆ فولکلۆری کوردی، ١٩*

*ئەگەر دیێت، پێی بڵێ براکەت چاوەڕێت دەکات .*
*ئەگـەر هات وپێـویستیم بە پارەبوو، ئامادەیە دەستم بگرێ، مردنی دێوەرەیە ك، ۷۲*

هەروا دەمکـاتی گوزارەی رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج بۆی هەیــە بریتی بێت لە دەمکــاتی ئیلزامی، بەڵام گوزارەی رستــەی سەرەکی دەمکاتەکەی ئیلزامی نابێت، بۆ وێنە :-

*خۆ ئەگەر بهاتبا بەرەو چایخانە، یان دوکانەکەی مەکتەب چووبام، ئەوا کاکـە پێشی پێ دەگـرتم و بە خۆشی، یان ناخـۆشی بەرەو پاش دەیگێرامەوە، چیرۆکەکانی مەم، ۲۲*
*ئەگـەر قایـل بووایە بەوەی جاری نابوتی بۆلێ بدەن، ئەوا لە هەموو قەرزەکان رزگاری ئەبوو، فریشتەکانی . . ، ۷۲*

## ۲ - رستەی شوێن کەوتووی مەرجی رووداوی ناتەواو

لە رستــەی شوێن کەوتـووی مەرجی رووداوی ناتـەواودا ویـا خۆزگـەی هاتنـەدی ئەگـەرەکـەدا، رووداو، ویـا دیـاردەی رستەی سەرەکی نایــەتــەدی، مەرجی نەهــاتنــە دیشی لە رستــەی شوێن کەوتــوودا وەکــو گریمــان وگەرەکییـەك روون کراوەتـەوەو باس کراوە، بۆیـە دەمکاتی دەربرینی گوزارەکەی دەمکاتی ئیلزامی دەبێت و لەکاتی رابوردوودا، بۆ وێنە :-

*ئەگـەر ئەو نیـوەشـەوە تووشی یەکیـك ببوویتـایە سەرت لە دیمەنی سەران رووی خەلکی شار سوڕدەمـا، کە لە هەیـوانە فراوانەکەدا کۆ ببوونەوە، چیرۆکەکانی مەم، ۱۳*
*لاوێك بیویستایە ببوایە بە راوکەر تیری بەرەو دارستان دەهاویشت، ئەگـەر بیـویستـایـە ببوایە بە شوان تیری بەرەو رانەمەڕ دەهاویشت، جەژنانە، ٥٩*

## رستەی شوێن کەوتووی مەرج بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری - ئەگەر -

ئامـرازی گەیـەنـەری ئەگـەر لە دیـالێکتی کرمـانجی ژوورووو

دیالێکتی کرمانجی خواروودا بۆپێك هێنانی رستەی شوێن کەوتووی مەرج بە شێوەیەکی فراوان بەکاردێت و دەکەوێتە سەرەتای رستە شوێن کەوتووەکەو لەگەڵ رستەی سەرەکی دا رستەی تێکەڵ رۆدەنێن، بۆ وێنە

*ئەگەر بەرە بەتۆز نەبێت، ساحیبی دای ناوشێنێت، پەندی کوردی، ٣٤*

*ئەگەر بەرە بە تۆز نەبێت* رستەی شوێن کەوتووی مەرج

*ساحیبی دای ناوشێنێت* رستەی سەرەکی

*ئەگەر زلکەك لڤی، ئەڤە ئەو یاریکەر کەت، یارێت کوردی، ٦٠*

*ئەگەر زلکەك لڤی* رستەی شوێن کەوتووی مەرج

*ئەڤە ئەو یاریکەر کەت* رستەی سەرەکی

*ئەگەر ئەوسا چارێکت بۆ ئەمرۆ کردباو زەخیرەت بۆ پایزو زستان دانابا، ئێستە ئاهـ و ناڵەی خۆت بە دیاری بۆمن نەدەهێنا، بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی*

*ئەگەر ئەوسا چاریکت بۆ ئەمرۆ کردباو زەخیرەت بۆ پایز و زستان دانابا* رستەی شوێن کەوتووی مەرج

*ئێستە ئاهـ و ناڵەی خۆت بە دیاری بۆمن نەئلەهێنا* رستەی سەرەکی

ئامرازی گەیەنەری ئەگەر هێندێك جار لە نووسین و لە قسەکردن دا لە دیالێکتی کرمانجی ژوورو و دیالێکتی کرمانجی خواروودا بە شێوەی کورت کراوەی (گەر) بەکاردێت و دیسانەوە هەر دەکەوێتە سەرەتای رستەی شوێن کەوتووی مەرجەوە :-

*گەر کەسێ نەزانی خودانێ مامکی وێ بێژت هون دێ چ دن من دا بووە بێژم، دەرگەهەك، ٨٧*

*بەڵام ئافرەت ئەوەی چاکە، چەند خۆشیویستری سەد ئەوەندە دڵ رەق دەبێ، گەر وەهاش نەبێت، دنیای نێوەکات و دەبێتە بێشتە خۆشەی دەمی خەڵك، ملوانکەی ئەڵماس، ٤٢*

شێوەیەکی دی ئامرازی گەیەنەری ئەگەر لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا بەرچاودەکەوێت، کە ئەویش شێوەی (هەکەر) وەیا (هەگەر)، کە ئەوێش دەکەوێتە سەرەتای رستەی شوێن کەوتووەوەو هەمان دەوری ئامرازی گەیەنەری (ئەگەر) دەگێرێت، بۆ وێنە :-

*هەکە چ ئەندام ژ تیپەکێ نەمان ئەڤە ئەوتیپ نەشیا هەڤدك دیاریێ دا، یارێت کوردی، ١٥٣*

ئامرازی گەیەنەر لە رستەی شوێن کەوتووی مەرج دا هەمیشە دەکەوێتە سەرەتای رستە شوێن کەوتووەکە، بەڵام لە بارێك دا ئەگەر ئارەزوو بکرێت زیاتر بایەخ بە دەوری بکەری رستەکە بدرێت، ئەوە بکەرەکە بە پێش ئامرازی گەیەنەرەکە دەکەوێت، هەروەکو لەم سێ رستانەی خوارەوەتا بەرچاودەکەوێت، کەوا (پیاو، ئەوانەو تۆ) بەپێش ئامرازی گەیەنەری (ئەگەر // گەر؛ کەوتوون :

*پیاو، گەر وەزیفەی گەورەی نەبێت، هەرگیز میداڵی تیپی شەرەفی بەدەست ناکەوێت، ملوانکەی ئەڵماس، ٣١*

*ئەوانەی مێژ ووی شاری ئەستەموول دەنووسنەوە، گەر بێت و مێژ ووی مەلەکانی دەشتی (فلۆري) و راوکەرانی فەرامۆش بکەن، ئەوا بەلای منەوە نووسینەکانیان پولێك ناهێنێ و رەنج خەسار دەردەچن، باڵندەکانیش کۆچیان کرد، ١٦*

*تۆ ئەگەر ئەمەت بەلاوە سەیرەو سەمەرەیە ئەی چۆن دان بەوەدا دەنێیت، کە نیازم وایە تەمەنی مرۆڤ ئاوێژ وو بکەمەوە، لاکێشە رووناکەکان، ٥٤*

هێندێك جار دوو رستەی شوێن کەوتووی مەرج، کە بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری ئەگەر، هەکەر درێژ راون یەك لە دوای یەك دێن و بە هەردوویان بەپێش رستەی سەرەکی دەکەون، وەك :-

*ئەگەر گەنجینەی قاروونت هەبوو، ئەگەر بانبانگیش بیت، بێ سوودە، لاکێشە رووناکەکان، ٦٥*

*هەکەر پێ حەسا، هەڤرکێ وی دێ کەڤیت، هەکەر پێ نەحەسا ئەو بخوە دێ کەڤیت، یارێت کوردی - ٧٤*

شوێنی رستەی شوێن کەوتووی مەرج وەکو شێوازێکی بنەرەتی لەنێو رستەی تێکەڵ دا بەپێش رستەی سەرەکی دەکەوێت، بەڵام

هێندێك جار ئەویش بە دەگمەن وا رێك دەکەوێت بکەوێتە دوای رستەی سەرەکیەوە، وەك :ـ

*ئەم دشێن بێژین گوند نەبوچیروك بێژەك لێ نەبا، ئەگەر نەپتربان، دەرگەهەك بۆ. . .، ٢٠*

| | |
|---|---|
| *ئەم دشێن بێژین گوند نەبوچیرەك* | *رستەی سەرەکی* |
| *بێژەك لێ نەبا* | |
| *ئەگەر نە پتر بان* | *رستەی شوێن کەوتووی مەرج* |

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ئامرازی گەیەنەری ئەگەر // هەگــەر // هەکــەر شێــوەی کورت کراوەی هەیــە، کە ئەویش (هــەکــە)یــە و ئەم شێــوەیش دەکــەوێتــە سەرەتــای رستـــەی شوێــن کەوتــووی مەرجــەوە و دەوری بە یەك گەیـشتنی رستــەی شوێن کەوتووی مەرج بە رستەی سەرەکی لە رستەی تێکەڵ دا دەگێرێت :ـ

*شیرۆی گوت : وبابۆدا من راست دبێژیت، هەکە دێچین ما هەوە خوله چ گرتیـیە، خان ومان ، ١٧*

*هەکە یەکێ زانی، زانی، دەرگەهەك بۆ. . ، ٨٧*

*هەکــە راست بیت لەدوی هزرا من، وهتــا نهــۆژی ئەزلســەروێ بوەرێــی مە، وی صەرف عەرەبی بکــوردی نڤیــسی یــە، عەلی تەرەماخی، ١٧*

*هەکــە دروڤینــا خوەدا دفنــدو فیلێت خوە بــ سەر نەکــەت وهەڤرکێ ویدا، ئەڤە ئەوکەت، یارێیت کوردی، ١٤٣*

(هـەکە) لە هێندیك ناوچەدا لە شێوەی (هەکو) بەکاردێت وهەر ئەو رۆڵـەش دەگێــرێت لەنێــو رستــەی تێکەڵ و، کە ئامرازی گەیەنەری (هەکە) دەیگێرێت، بۆ وێنە :

*هەکوئێکی زانی هەڤالێ وی یێ ژ بیرڤە چووی هندی برێ وهێزتێ هەی دێ هەڤالێ خوە پێ راکێشێت، یارێیت کوردی، ١٥٣*

## رستەی شوێن کەوتووی مەرج بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەری (کە)و (هەر ـ کە)

*ئامــرازی گەیــەنــەری (کــە) لەنێــو ئامــرازی گەیــەنــەران دا بۆ پێــك هێنــانی بەشێکی زۆری جۆرەکــانی رستــەی شوێن کەوتوولە هەمــــوان چالاکتــرە، بۆ وێنــە هاوبــەشی دارشتنی رستــەی شوێن کەوتــووی نیهــاری، گوزاەیی، دیــارچــەری، بەرکــری، کات دەکــات، هەروا بۆ پێــك هێنانی رستەی شوێن کەوتووی مەرجیش بەکاردێت، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر تەسك و نەفرە.*

*شوێنی ئامــرازی گەیــەنــەری (کــە) لە سەرەتــای رستــەی شوێنە کەوتووی مەرج دا دەبێت، بۆ وێنە :ـ*

*کە گەورە نەمــان، بچــوك زوولەنــاودەچن وخۆراناگرن، پەندی کوردی، ٣٤*

شوێنی رستــەی شوێن کەوتووی مەرج لەنێو رستەی تێکەڵ دا، کە بە یارمــەتی ئامــرازی گەیــەنــەری (کــە) دەست پێ دەکــات، دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکی :ـ

*کە خەون راست بێ، چ نایەتە دی، پەندی کوردی، ٥٩*

| | |
|---|---|
| *کە خەون راست بێ* | *رستەی شوێن کەوتووی مەرج* |
| *چ نایەتەدی* | *رستەی سەرەکی* |

ئامــرازی گەیــەنــەری (هــەر ـ کە ـ) ئەویش وەکــو ئامــرازی گەیــەنەری (کە) بۆ پێك هێنانی رستەی شوێن کەوتووی مەرج کەم بەکاردێت و هەمیشەش دەکەوێتە سەرەتی رستەی شوێن کەوتووەوە :ـ

*هەر چاکەیەکت بەسەر منەوە هەبێت، پێم بڵێ*

*هەر ـ کە تیشکێکی رووناکیت بەدی‌کرد، خۆرمان لێ هەڵ دێت.*

ئەو رستــە شوێن کەوتــووی مەرجــەی، کە بە یارمــەتی ئامرازی گەیەنەری (هەر ـ کە ـ) پێك دێت، دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکی نێو رستەی تێکەڵەوە، بۆ وێنە :ـ

*هەر ـ کە ـ چیــرۆکێکی بنــووسیبــا، هەستی بە ئاســودەیی دڵ و دەروونی دەکرد.*

ئەورستــە شوێن کەوتــووی مەرجــەی، کە بە یارمــەتی ئامــرازی گەیــەنــەری (هــەر ـ کە ـ) پێــك دێت، بۆی هەیــە کانیش پێشــان بدات، هەروەکو لەم رستەیەدا هەستی پێ دەکرێت :ـ

*هەر ـ کە ـ لە خەو هەستا، شیرەکەی بۆ بگرەوەو دەرخواردی بدە.*

ئەوەی شایــەنی باســە ئامــرازی گەیــەنــەری (ئــەگەر) بۆی هەیە شوێنی ئامرازی گەیەنەری (هەکە، کە، هەر ـ کە) بگرێتەوە، بەبێ

ئەوەی شوێنی پێـك هاتنی سینتاکسی رستە شوێن کەوتووەکە واتای رستە تێکەڵەکە بە گشتی بگۆڕێت، بۆ وێنە لەم رستانەی خوارەوەدا بۆ هەر ئامـرازێکی گەیـەنەری لە ژ ووروو ناوبراودا رستەیەك بەوێنە هێندراوەتەوەو یەکسەر ئامرازەکەی بە ئامرازی گەیەنەری (ئەگەر) گۆردراوەتەوە :ـ

*هەکە دێ‌چین، ما هەوە خولە چ گرتی‌یە .*
*ئەگەر دەی‌چین، ما هەوە خولە چ گرتی‌یە .*

*کـە گـەورە نەمان، بچووك زوولە ناو دەچن .*
*ئەگەر گەورە نەمان، بچووك زوولەناو دەچن .*

*هەر چاکەیەکت بەسەر منەوە هەبێت، پێم بڵێ*
*ئەگەر چاکەیەکت بەسەر منەوە هەبێت، پێم بڵێ*

## چەند رستەیەکی شوێن کەوتوو لەنێو رستەیەکی تێکەڵ دا

هێنـدێـك جار رستـەی شوێن کەوتووی مەرج هەر خوی بەتەنیا لەنێـو رستـەی تێکـەڵ دا نابێت، بەڵکو رستەیەکی شوێن کەوتووی دیشی لەگەڵ دا دەبێت و بە هەردوویان تێکرا واتای رستەی سەرەکی نێو رستەی تێکەڵەکە زیاتر روون دەکەنەوە، بۆ وێنە :ـ

*گەر بە چاکی لێیـانـەوە ووردبینـەوە، دەبینی، کە چۆن کەروڵاڵ دەبن و توانـای بیستن و قسـەکـانیـان لەلاوە نامێنێ، ملوانکـەی ئەڵماس، ٤٢*

| | |
|---|---|
| *گەر بە چاکی لێیانەوە وورد بینەوە* | *رستەی شوێن کەوتووی مەرجە* |
| *دەبینی* | *رستەی سەرەکی‌یە* |
| *کە چۆن کەروڵاڵ دەبن و توانای بیستن و قسەکانیان لەلاوە نامێنێ* | *رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری‌یە* |

*ئەگـەر پێم باوەڕدەکـەی، ئەوەی کە لەوکـاتـەدا لە دڵمـا پەنگی دەخـواردەوە، هەسـتێکـی پڕ لە رق و خەشـم بوو، ملوانکـەی ئەڵماس، ٤٧*

| | |
|---|---|
| *ئەگەر پێم باوەڕ دەکەی* | *رستەی شوێن کەوتووی مەرجە* |
| *ئەوە هەستێکی پڕ لە رق و خەشم بوو* | *رستەی سەرەکی‌یە* |
| *کە لەوکاتەدا لە دڵما پەنگی دەخواردەوە* | *رستەی شوێن کەوتووی کاتە* |

*ئەگـەر خاوەن کارەکـە لەودەمـەدا بەسـەردا هات ولە هەر یەکێـك بپرسێ لە کوێم، هەموویان سوێندم بۆ دەخۆن، کە هەر تازە ئەوێم جێ هێشت، مردنی دیوەرەیەك، ٧١*

| | |
|---|---|
| *ئەگەر خاوەن کارەکە لەو دەمەد بەسەردا هات ولەهەر یەکێك بپرسێ لە کوێم* | *رستەی شوێن کەوتووی مەرجە* |
| *هەموویان سوێندم بۆ دەخۆن* | *رستەی سەرەکی‌یە* |
| *کە هەر تازە ئەوێم جێ هێشت* | *رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری‌یە و بۆ بەرکاری رستەی سەرەکی دەگەڕێتەوە .* |

### ئەنجام

رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج، کە مەرجی رووداني رووداوو دیـاردە روون دەکـاتـەوە، جۆرێـکـە لە جۆرەکـانی رسـتـەی شوێن کەوتوو لەنێو رستەی تێکەڵ دا .

رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج لە رووی رووداو وروونـەدانی دیاردەو رووداودا دابەش دەکرێتە سەر دوو جۆرە رستەی شوێن کەوتوو:ـ

١) رستەی شوێن کەوتووی مەرجی رووداوی تەواو
٢) رستەی شوێن کەوتووی مەرجی رووداوی ناتەواو

ئامـرازی سینـتـاکسی نێـوان رستـەی سەرەکی و رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج لەنێـو رستەی تێکەڵ دا بە یارمەتی ئامرازی گەیـەنـەری (ئـەگـەر // هەگەر // هەکەر، هەکە، کە، هەر ـ کە ـ)یە، ئامـرازی گەیەنەری (ئەگەر) لەم بوارەدا لە هەموان چاکترەو شوێنی ئەم ئامـرازانـەش بەشێـوەیەکی سەرەکی دەکەوێتە سەرەتای رستەی شوێن کەوتوویی مەرجەوە .

رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج بۆبەشێك لە بەشەکانی رستەی سەرەکی ناگـەرێتـەوە، وەکـو هێنـدێك لە رستە شوێن کەوتووەکانی دی، بەڵکـو بۆ هەمـوو رستە سەرەکێکە دەگەرێتەوەو وەکو یاسایەکی گشتی رستـەی شوێن کەوتـووی مەرج لەنێـو رستـەی تێکـەڵ دا دەکەوێتە پێش رستەی سەرەکێوە.

پەراوێز

١ - نوری علی أمین، رێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ٥٥ - ٥٨
٢ - ك.ك. کوردۆیێف، زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦١، ٧٢
٣ - د.ن. مەکەنزی، لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکانی کوردی، بەرگی - ١، لەندەن ١٩٦١، ١٣٦ - ١٣٩
٤ - کەریمی ئەیـوبی و ی.آ. سمیرنـوڤا، دیالێکتی کوردی موکری، لینینگراد ١٩٦٨، ١٤١
٥ - محـەمـەد ئەمین هەورامـانی، زاری زمـانی کوردی لە ترازووی بەراوردا بەغدا، ١٩٨١، ٣١٢
٦ - زەری آ. یوسوپۆڤا، شێوەی سلێمان زمانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٨٥، ٢٦
٧ - د. کوردستانی موکریانی، سینتاکسی رستەی سادە، بەغدا، ١٩٨٦، ٨٣، ٨٤

سەرچاوە

١ - آ.ن. گفۆزدیف، زمانی رووسی هاوچەرخ، بەرگی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٦٨
٢ - ن.س. ڤالگینا، سینتاکسی زمانی رووسی هاوچەرخ، مۆسکۆ، ١٩٧٣
٣ - ی.م. ستیپانۆف، زمانی رووسی بۆ هەمووان، مۆسکۆ، ١٩٧٨

ئەو سەرچاوانەی رستەیان لێ دەرهێندراوە

١ - احمد عبدالله زەرۆ، حەیرانۆك، بەغدا، ١٩٨٧
٢ - احمد محمد اسماعیل، باڵندەکانیش کۆچیان کرد، (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٨
٣ - ئازاد حەمە شەریف، مردنی دێوەرەیەك، (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٤
٤ - خالد حسین، دەرگەهەك بۆ فولکلۆری کوردی، بەغدا، ١٩٨٥
٥ - رەشید فندی، علی تەرماخی، (؟)، ١٩٨٥
٦ - عەبدوللا سەراج، لاکێشە رووناکەکان، بەغدا ١٩٨٥
٧ - علی فتاح دزەیی، ملوانکەی ئەڵماس، (وەرگێرانە)، ١٩٨٦
٨ - عمر شیخ الله دەشتەکی، پەندی کوردی، بەرگی سێیەم، بەغدا، ١٩٨٥
٩ - دوکتور عیزەدین مستەفا رەسول، جەژنانە، (وەرگێرانە)، بەغدا، ١٩٨٢
١٠ - محمد حسین بناقی، یارێت کوردی، بەرگی ئێکێ، هەولێر، ١٩٨٧
١١ - محمد مولود (مەم)، چیرۆکەکانی مەم، بەرگی دووەم، هەولێر، ١٩٨٤
١٢ - د. کوردستانی موکریانی، بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، هەولێر، ١٩٨٤

# الجملة التابعة الشرطية

د. كردستان مكرياني
كلية الآداب - جامعة صلاح الدين

تبين الجملة التابعة الشرطية شرط وقوع الحدث أو الظاهرة في الجملة الرئيسية ضمن الجملة المعقدة.

تنقسم الجملة التابعة الشرطية من حيث وقوع الحدث أو عدم وقوعه الى قسمين رئيسيين :-

١ - الجملة التابعة الشرطية الحقيقية وهي الجملة التي يتحقق فيها حدوث الحدث.

٢ - الجملة التابعة الشرطية الفرضية وهي الجملة التي كان من المفروض وقوع الحدث فيها.

تصاغ الجملة المعقدة مع الجملة التابعة الشرطية بواسطة اداة الفصل (ئەگەر // هەگەر // هەکەر، هەکە، کە، هەر - کە) والتي تقع في بداية الجملة التاسعة والملاحظ ان اداة الوصل (ئەگەر) ضمن هذه المجموعة من الادات أوسعهم استعمالاً.

لا تعود الجملة التابعة الشرطية الى قسم من أقسام الجملة الرئيسية، بل تعود اليها كاملة، وتسبق الجملة التابعة الشرطية الجملة الرئيسية بالنسبة لموقعها ضمن الجملة المعقدة.

# هەندێ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو لە کوردیدا

پرۆفیسوری یاریدەدەر
محمد معروف فتاح

سەرەتا

لە نووسینەوەی ڕێزمانی هەموو زمانێکدا، ڕێزماننووسەکان بەگوێرەی چەند تایبەتی یەکی وشەسازی و ڕستەسازی و واتایی ئاسایی چەند بەشێکی ئاخاوتن لەیەکتری جیا دەکەنەوە. لەسەرەتاداو بۆ ماوەی سەدان ژمارەی ئەم بەشانە لەنێوان هەشتاو دە بەشدابوون و هەمووشیان لەگرنگیدا وەك یەك سەیر دەکران.[1] دوای ئەوەی لەم دواییەدا ڕۆنانییەکان بەسەر پۆلینە دێرینەکەدا چوونەوە، ئێستە زۆربەی زمانەوانی دوو کۆمەڵەی سەرەکی جیا دەکەنەوە.[1] پۆلە سەرەکی یەکان یان سەربەخۆکان کە بریتین لە ناو ئاوەڵناو وکار وئاوەڵگار[2] پۆلە لاوەکییەکان (ناسەربەخۆکان) وەك ئامرازو (ئامرازی نیشانەو پرسیارو بەستن و سەرسوڕمان ژمارەو پرتکەکان (بەرناوەکان)[2]

یەکێك لە جیاوازییە گرنگەکانی نێوان ئەم دوو کۆمەڵە لەوەدایە کە کۆمەڵەی یەکەم بەهۆی شێوەوە لەوەی دووەم جیا دەکرێتەوە کە پاشگری [ـ ەکە] و [ـ ێك] وئەلۆمۆرفەکانیان وەردەگرێ (چرا، چرایەك، چرا (یە)کە، لەکاتێکدا کار هەندی پێش کارو [هەل ـ ،ڕا ـ ،دا ، ڕۆ ـ] پێشگری [دە ـ ، بـ ـ ، ] لەگەڵدا دەبینرێ کە هەرگیز لەگەڵ ناودا نایەن ـ دیسان بۆ جیاکردنەوەی ئاوەڵناو لەناو دەتوانین پشت بەپاشگری بەراورد کردنەوە [ـ تر / ـ ترین] ببەستین کە بەزۆری هەر بە ئاوەڵناوەوە دەلکێ. بەپێچەوانەی ئەمەوە، پۆلە لاوەکییەکان بەشێوە لەیەکتری جیا ناکرێنەوە چونکە خاوەنی نیشانەیەکی مورفولوجیانەی تایبەتی نین. لەبەر ئەمە بۆ جیا کردنەوەیان دەبێ سەیری شوێنیان لەڕستەدا بکەین. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەندێ لە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە ئاسایی سەر بەدوو پۆل یان زیاتر دەبن. واتە، ئەندامانی ئەم کۆمەڵە دەچرژێنە ناو یەکترییەوە. بۆ نموونە، ئەم، هەندێ جار جێناوەو (ئەم دەروات) هەندێ جاری تر ئاوەڵناو (ئەم پیاوانە ناهێڵن) بەپێی شوێنی لەڕستەکەدا.

دیسان جیاوازییەکی تری نێوان ئەم دوو کۆمەڵە لەوەدایە کە کۆمەڵە لاوەکییەکان ئاسایی کۆمەڵێکی یان پەیرەوێکی بچووکی داخراو پێك دێنن کە ژمارەیان کەمەو بە ئاسانی دەبژێررێن و سنووریان بۆ دادەنرێ بۆ نموونە، جێناوەکانی کوردی لە هەشت تێناپەرن. ئامرازی نیشانە تەنیا دوانن و ئامرازی پرسیاریش خۆیان نادەن لەبیست. بەپێچەوانە شەوە، ژمارەی کارو ناو لە زمانەکەدا بەئاسانی بۆ دانانرێ و سەرژمێر ناکرێن

دەبێ تێ بینی ئەوەش بکەین کە پۆلە ناسەربەخۆکان لەوەدا پەیرەوێکی داخراو پێك دێنن کە (١) واتای هەر ئەندامێك لە پۆلەکە لەو پەیوەندییەوە دێ کە لەگەڵ ئەندامانی تری پۆلەکە لەناو پەیرەوەکەدا پەیدای دەکات. بۆ نموونە، هەندێ لە واتای جێناوی ئەو لەوەوە دێ کە بەرامبەر من و تۆو ئەوان و ئێوە دەوەستێ. بە واتایەکی تر، واتای ئەو = نەمن، نەتۆ، نەئەو، نەئەوان، نەئێوە = کەسی سێیەمی تاك. دیسانەوە واتای ئەو لەڕستەی ئەو کووە هات دا لەو جیاوازییەوە دێ کە لەگەڵ ئەم دا هەیەتی لەڕستەی ئەو کورە هات دا. بەم پێیە، واتای بەرناوەکانی وەك بە یان لە لەکوردیدا نازانرێ، تا بەراورد نەکرێ لەگەڵ واتای هەموو بەرناوەکانی تری زمانەکە. (٢) ئەندامانی پۆلە لاوەکی یەکان نەك هەر کەمن و ودەژمێررێن، بەڵکو ئەندامی نوێش بەئاسانی وەرناگرن، واتە لە دەیان وسەدانساڵدا ئامرازێکی پرسیاری نوێ یان بەرناوێك یان ئامرازێکی بەستن ئاسایی خۆیان ناکەن بەزمانێکدا لەکاتێکدا کە دەیان و سەدان ناوو ئاوەڵناوو کاری نوێ لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دادەتاشرێن و دەخوازرێن و دەچنە ناو زمانێکەوەو دەبنە بەشێك لە

کەرەسەی بنچینەیەکی . بەم جۆرە دەبینین کە بە پێچەوانەی پۆلە لاوەکی یە کانەوە پۆلە سەرەکی یەکان دەرگایان والآیە بۆ وشەی نوێ .

هەر چەندە جیا کردنەوەی بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆو ناسەربەخۆ (کارکەر) لە خۆیدا هەنگاوێکی گەورە بوو بەرەوچاکردن ، پۆلینە دێرینەکە ئەوەندە کون و کەلەبەری تێدایە کە بەمە چارەسەر ناکرێ و خەوشە سەرەکی یەکەی کە هەندێ وشە لەهەمان کاتدا سەر بەدوو بەشی جیاوازی ئاخاوتن یان زیاتر دەبن هەر دەمێنی و ماوەو ئەو گیروگرفتانەی کە لە ئەنجامی ئەمەوە دێنە سەر ڕێگەی لێکۆلینەوە بەردەوام سەر دەشێونن (بڕوانە بەشی دووەم بۆچونیەتی چارەسەر کردنی ئەم گیروگرفتە لەم لێکۆلینەوەیەدا) .

مەبەستی سەرەکی لەنووسینی ئەم لێکۆلینەوە یەئەوەیە کە ئاوەڵناو لەزمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ یێك ناهێنێ بەڵکو زۆر نزیکە لەناویان هەر ناوە یان بەشێکە لەناو جگە لەمەش کوردی لەخۆیدا زمانێکی ئاوەڵناو ویست نییە بەوەدا کە ژمارەی ئاوەڵناو لەزمانەکەدا کەمەو ئەمانەش چەند ناوچەیەکی واتایی کەم دادەپۆشن . دیسان پلەو پایەی ئاوەڵناولەم زمانەدا هەرگیز ناگاتە پایەو گرنگی ناو و کار . لێکۆلینەوەکە بەگشتی دەیەوێ ئەوە بسەلمێنی کە کوردی تەنیا خاوەندی سێ بەشە ئاخاوتنە : ناوو کار وپرتك[٣]

بۆ سەلماندنی ئەم روانینەکە لەگەڵ بۆچوونی زمانەوانەکانی پێشتردا کەم و زۆر ڕێك ناکەوێ لێکۆلینەوەکە دەکەین بە (٥)بەشەوە (جگە لەسەرەتاو ئەنجام) لە بەشی دووەمدا چەمك و سنووری ئاوەڵناو دیاری دەکەین و ئاوەڵناو لەچەندێن وشە پاك دەکەینەوە کە بەهۆی تەم ومژی پۆلینە دێرینەکەوە لەزۆر لێکۆلینەوەدا بە ئاوەڵناو دانراون . لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەگەینە چەند تایبەتی یەکی ئاوەڵناو کە بەهۆیانەوە ئاوەڵناو لە ئاوەڵناو ئاسا جیا دەکەینەوە لەبەشی سێیەمدا لەووشە کەمانە دەدوێن کە بە هەموو پێوانەکانی بەشی دووەم ئاوەڵناون و دەیان کەین بە چەند پۆلێکەوەو دەوری پۆلینەکە لەڕیز بوونی جووتە ئاوەڵناو وزنجیرە ئاوەڵناودا دەر دەخەین . بەشی چوارەم بریتیە لە هەڵسەنگاندنێکی باری ئاوەڵناو لەزمانەکەدا . لەکۆتایی بەشەکە دباس لەوە دەکەین کە ئاوەڵناوی کوردی هەموو تایبەتی یەکی ناوی تێدایەو خاسیەتیەکی خۆی نییە کە لە ناوی جیا بکاتەوە . لە بەشی پێنجەمدا لەپۆلێکی نوێ زمان دەدوێن کەزمانەکانی گێتی دەکات بەسێ بەشەوە : (١) زمانی ئاوەڵناوی و (٢) زمانی کاری و(٣) زمانی نێوان . لێرەشدا هەموو ڕاستی یەکانی کوردی ئەوە دەردەخەن کە کوردی لە زمانە نێوانەکانە . ئەمەش

دەکەینە بەڵگەیەکی تر کە ئاوەڵناو لە کوردیدا ئەرکێکی گەورەی پێ نەسپێراوەو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ دروست ناکات . ئەنجامی لێکۆلینەوەکە لە چەند خاڵێکدا بەسە . ئەو تێبینیە نوێیانەدا دەچێتەوە کە لێکۆلینەوەکە بۆ یەکەم جار دەیان گاتێ

(٢) چەمك و سنووری ئاوەڵناو:ـ

یەکێك لە کەم و کورتیە هەرە گرنگەکانی پۆلینە دێرینەکەی بەشەکانی ئاخاوتن لەوە دایە کە هەر لەسەرەتاوە جیاوازی نێوان وشەو شێوەکانی وشەی بەرچاو نەکەوگرتووەو وشە نەك هەر لەم پۆلینەدا بەڵکو لە هەموو بەرهەمەکانی ڕێزمانی دێریندا بەدووواتای زۆر جیاواز بەکار هێنراوە . واتای یەکەمی وشە لەو کاتانەدا دەردەکەوێ کە دەگوترێ «ڕۆیشت» و «ڕۆیشتم» و «دەڕۆم» هەموویان یەك وشەن یان چەند شێوەیەکی (فۆرمێکی) جیاوازی یەك وشەن ئەم جۆرە لێکدانەوەیەی وشە لەفەرهەنگدا دەبێنرێ ، چونکە هەموو ئەو کارانە لەژێر سەرباسی «ڕۆیشتن»دا دێن وباسیان لێوە دەکرێ . دووەم واتای وشەش لەو بارانەدا دەردەکەوێ کە دەگوترێ بۆ نموونە ، لەسەد وشەدا باس گەشتەکەی ئەوساکەت بکە لەبارێوادا «دەڕۆی»و «ڕۆیشتن»و «دەڕوات» . . . هتد هەر یەکەیان بە وشەیەکی جیاوازو سەربەخۆ دەژمێرێ و سەد وشە کە پڕ دەکاتەوە . بۆجیاکردنەوەی ئەم دوو بەکارهێنانە جیاوازەی وشە ، لێکۆلینەوە نوێیەکان زۆر جار دووزاراوەی جیاواز بەکار دێنن : لێکسیم و (بەواتای وشە) شێوەکانی وشە[٥]

جیا نەکردنەوەو لێك نەدانەوەی ئەم دوو واتا جیاوازەی وشە لە پۆلینکردن و دیاری کردنی بەشەکانی ئاخاوتندا پۆلینەکە تەواو تێك دەدات لەبەر ئەوەی هەندێ وشە سەر بەدوو بەش یان زیاتر دەبن . بۆ نموونە ، وشەی کەر لەکوردیدا جارێك دەبێ بەناو (منداڵەکە لە کەرەکەیدا) وجارێکی تر ئاوەڵناو (منالێکی کەر بوو) وردبوونەوە لەم دوو نموونەیەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنی کە ئێمە ڕەفتار لەگەڵ دوو شتی جیاوازدا دەکەین ، واتە جارێك لەو شەکە خۆی دەدوێن (لێکسیم) وجارێکی دووەم لە فۆرمێکی جیاوازی وشەکە (شێوەکانی وشە) . بەواتایەکی تر ، ئەگەر وشەکە خۆی لە شێوە جیاوزەکانی وشە جیا بکەینەوە ، ئیتر تووشی ئەم تەنگ وچەڵەمەی دووروویی و (الازدواجیة) تێکچرژانە نابین لە دابەشکردن وجیاکردنەوەی بەشەکانی ئاخاوتنداو هەر لێکسێمێك دەچێتە بەشێکی سەربەخۆوەو بواری تێکەڵ بوون نامێنێ .

بۆ ئەوەی بەتەواوی کەڵك لەم بنەمایەی جیاکردنەوەی دوو واتا

## ـ هەندێ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو

دێرینەکەی وشە وەربگرین تابتوانین بە یەکجاری دووروویی تێکەڵ بوون و چوونە ناویەکتری بەشەکانی ئاخاوتن نەهێڵین پێویستمان بەوە دەبێ دووجۆرپۆلین بهێننە کارەوە یەکێکیان بۆدابەشکردنی وشە یان لێکسیم لە ژێر ناوی بەشەکانی ئاخاوتندا وئەویتریان بۆ پۆلینکردنی فۆرمەکانی وشە لەژێر ناوی پۆلە شێوەکان وەك لە خوارەوەدا دەبینین.[٦]

| (١) بەشەکانی ئاخاوتن | (٢) پۆلە شێوەکان |
|---|---|
| ناو | ناوئاسا (ناویی) |
| ئاوەڵناو | ئاوەڵناو ئاسا (ئاوەڵناوی) |
| کار | کار ئاسا |
| ئاوەڵکار جێناو | ئاوەڵکار ئاسا |
| پرتکەکان | |

جیاوازی سەرەکی نێوان پۆلینی یەکەم دووەم لەوەدایە کە لە پۆلینی یەکەمدا (بەشەکانی ئاخاوتن) کەرەسە زمانیەکان بەپێی تایبەتی واتایی ووشەسازی دابەش دەکرێن. بەڵام لەپۆلینی دووەمدا شوێن وئەرکی کەرەسە لەرست دا دەورێکی هەرە گرنگی لە دابەشکردندا دەدرێنێ بەم پێیە وشەیەك کە ناوبێت بەپێی بەشەکانی ئاخاوتن، دەشتوانێ لەهەمان کاتدا وەك ئاوەڵناوئاسا لە رستەدا ئەرك دەگێرێ: ئەو پیاوە کەرە، بەم رەفتارە وشەکە نابێ بە ئاوەڵناو

شایانی تێبینیە کە جیا نەکردنەوەی دوو واتا دێرینەکەی وشە لەو کارو بەرهەمە رێزمانیانەی کە لە بارەی بەشەکانی ئاخاوتنی کوردییەوە کراو ئاوەڵناوی قەبە کردووەو قەبارەیەکی گەورەتر لەخۆی داوەتێ و هەڵی ئاوساندووەو وای لە هەندێ زمانەوان کردووە ئاوەڵناو لە تای تەرازووی ناووکاردا دابنێن ویەك گرنگی یان بدەنێ. ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کەنەیان توانیوە ئاوەڵناو وئاوەڵناو ئاسا لەیەکتری جیا بکەنەوە بۆنموونە، لەلای مەکنزی هەموو ئەو وشانەی لەم رستانەی خوارەوەدا هێڵیان بەژێردا، هاتووە بەئاوەڵناو دانراون:

(١) ئەو کورە هات[٧]
(٢) چوار کەس هاتنە لای
(٣) شتی وا نیە
(٤) ماڵەکە لە چ شوێنیکە؟ لەفلان شوێنە
(٥) بە هەموو شتی تورە دەبێ.
(٦) هەر کەسێك بێت خەلاتەکەی دەدەمێ.

ئەوەی ئەم وشانە لە ئاوەڵناو نزیك دەکاتەوە لایەنی واتاو وشەسازی نیە، بەڵکو تەنیا ئەرکەکەیان لەرستەدا. بەواتایەکی تر، هەموو ئەم وشانە دیارخەرن ولەبەر ئەوەی دیارخەری لەئەرکە چالاکەکانی ئاوەڵناوە، ئاسایی ئاوەڵناوێك دەتوانێ جێگەیان بگرێتەوە، با هەموو کاتێ لەهەمان شوێنی رستەکەشدا نەبێ سەیر ئەوەیە کە ئەو وشانەی لە خوارتریشەوە هێڵیان بەژێردا هاتووەو هەر دیارخەرن، کەچی نە مەکنزیو نەکەسی تر بە ئاوەڵناویان دانانێ:

قاپێك چێشت
دەستکێ گوڵ
کۆمەڵێ منداڵ

دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە وشە هێڵ بەژێردانراوەکانی ١ ـ ٦ ئاوەڵناوی راستەقینە نین و (هەرچەندە ئاوەڵناوئاسان) چەندین رێگەو تاقیکردنەوەی رێزمانیش لەئارادا هەیە بۆسەلماندنی ئەم راستیە وەك:

(١) بەپێچەوانەی نزیکەی هەموو ئاوەڵناوێکی کوردییەوە پاشگری پلەکانی بەراورد وەرناگرن * ئەوتر، ئەوترین، چوارتر، چوارترین، واتر، واترین، چتر، چترین، فلانتر، فلانترین، هەمووتر، هەمووترین، هەرتر، هەرترین

(٢) هەموویان (جگە لەوا) بەدوای دیارخەردا نەهاتوون و بە (یا)ی ئیزافە پیەوەی نەلکاون، واتە جێگەی نموونەیی ئاوەڵناویان نەگرتووە.

(٣) هیچ لەم وشانە ئەوبیرانە دەرنابرن کە ئاسایی لەزۆر زماندا بەهۆی ئاوەڵناوەوە دەردەبرین وەك رەنگ، بارستایی وقەوارەو رواڵەت وتەمەن و بەها (بروانە بەشی سێیەم)

شایانی سەرنجە کە جیاکردنەوەی ئاوەڵناو لە ئاوەڵناو ئاساو لەو وشەو کۆمەڵە وشانە پاك دەکاتەوە کە لەبەشەکانی تری ئاخاوتنەوە دەهێنرێن و ئەرکی ئاوەڵناویان پێ جێبەجێ دەکرێ. ئەمانە لەکوردیدا بەزۆری ناوو ئاوەڵناو وکارن وەك ئەم نموونانەی خوارەوە روونی دەکەنەوە:

ناو: کورێکی لاو، جامێکی زیو، شیری دایك
باخچەی منداڵان، دەرزی قەوان، پیاوێکی حەفتا ساڵە
ئاوەڵکار: کتێبەکەی ئەوێ ئەویانە ئێرە ئێرانە

## ـ هەندێ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو

ماری ئەوسا گشتەکەی ئێستا
کار (لەشێوەی ناوی بەرکاردا یان بکەردا)
چاو دەرپۆقیو، لووت خوراو، سەربەقوڕاچوو
نەدوو، خۆخۆر، نەزان، پەك کەوتوو
دزنەبەر، چاولەدوو

هۆکارێکی تریش کە بە هەڵـە چەمکی ئاوەڵنـاوی لای هەنـدێ زمانـەوان فراوان کردووەو بە ناڕەوا قەبـارەو بارستـاییـەکی گەورەتـر لەخۆیی داوەتێ، بەتـایبـەتی لەو بەرهـەمـە ڕێـزمـانیـانەدا بەرچاو ئەکـەوێ کە لەسـەر بنچینـەی مۆرفیم دا نەرێـژ ڕاون، لەم کارانەدا دیـاری کردنی بەشـەکانی ئاخاوتن بۆ هەموو کەرەسەیەکە تاکە وشەو وشـەی لێکـدراوو دارێـژ ڕاوو کۆمـەڵـە وشـە. بەم پێیـە هەمـوو ئەم کەرەسانەی خوارەوە لەم جۆرە بەرهەمانەدا بە ئاوەڵناو دادەنرێن

(١) وشەی دارێژ ڕاو: غەمبار، زێرین، لماوی، بەناز، بێ‌ناز
(٢) وشەی لێکدراو: دڵرفین، دڵ تەزێن، دڵسۆز، دڵپاك
(٣) کۆمـەڵـە وشـەی (فرێز) چاولەدوو، جامانەبەسەر، دزنەبەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەموو ئەم کەرەسانە بەئاوەڵناو ناژمێرێن چونکە لێرەدا ئێمـە دوای ئەو کارە ڕێـزمـانیـانە دەکەوین کە لەسەر بناغەی مۆرفیم دادەرێـژ رێن و لەمـانـەش لە هەمـوویاندا تەنیا مۆرفیمی سەربەخۆ (وشـەیـەکی سادە) بەگـوێـرەی بەشـەکانی ئاخاوتن پۆلین دەکرێ. واتـە، هەروەك چۆن لەوشـەیـەکی دارێـژ ڕاوی وەك: منـداڵـەکە، منـداڵـەکـان و منـداڵێـك دا تەنیـا مۆرفیمی منداڵ بە ناو وادەنرێ، بەهـەمـان دەستـوور لەغـەمبارو زێرین و لماوی و بەناز و بێ‌نازیشدا هەر کەرتە سەربەخۆکە (غەم و زێرو ناز و کەم) دەتوانرێن پۆلین بکرێن.[٨]

کەواتـە بەگـوێـرەی ئەو بۆچوونـەی لەم لێکـۆڵینەوەیەدا دەخرێتە ڕوو، ئاوەڵناو سێ تایبەتی تێدایە کەدەبێ هەموو کاتێ لە وشەیەکدا هەبن تا وشەکە بە ئاوەڵناو دابنرێ:

(١) لەڕووی واتاوە ئاوەڵناو بێت. واتە بۆدەربرینی یەکێك لەو ناوچە بیـریانە هاتبێت کە لەکوردیدا ئاسایی بەهۆی ئاوەڵناوەوە دەردەبرێت وەك ڕەنگ، تایبەتی شت، بارستایی. ... . . بڕوانە بەشی سێیەم)
(٢) لەڕووی فۆرمـەوە ئاوەڵنـاو بێت بەواتـایی ئەوەی کە بتـوانێت پاشگری ڕێزمانی [ـ تر، ـ ترین] وەربگرێ لەباری بەراورد کردندا:

شیلان لەهەموویان ئاقڵترە.
شیلان ئـاقـڵـتـرین کچە
خانۆکەی من لە ئەوسا خانۆکەی تۆ گەورەترە.

(٣) لەڕووی ئەرکەوە ئاوەڵناو بێت، واتە:
(أ) لەدەوری دیـارخـەردا بەهـۆی ئامـرازی (ی) ئیـزافـەوە بەدیـار خراوەکەی پێشیەوە بلکێ: پیاوێکی ئازا
(ب) بتوانێ کاری لێکدراو دروست بکات بەیاریدەی کارێکی دارێژ ڕاو:[٩] ناز دەکات، گەورەی کرد، ناسك بوو، نازدەکا
(جـ) لەگەڵ هەندێ کاردا ئەرکی تەواوکەر بەجێ بهێنێ:

بەئازام زانی دانا ژمارد
بەژیرم هاتە بەرچاو
بەزنگی تێ گەیشتم
کورە زەرد هەڵ گەرا
چیاکان لەدوورەو سەوز دەچنەوە

(د) بەهۆی ئاوەڵکاری ڕادەیان کەرەسەی ترەوە پلەو ڕادەی دیاری بکرێ:

کورێکی زۆر وریا بوو
کورێکی تابلێی زرنگە

(هـ) لەپلەی بەراووردا پێش دپارخەر بکەوێ
لەبەرزترین کۆشکدا دەژی

(ن) لەپلەی باڵای بەراوردا، بتوانێ «هەرە» پێش خۆی خات
هەرە جوانی شارەکە بوو

بەم پێیـە کە چەمکی ئاوەڵنـاو وا تەسك دەکەینەوە ژمارەو هەندێ بەکـار هێنـای ئامـرازی نیکـانـەو ئامـرازی پرسیار و ئەو ئاوەڵناوانەی بەنیسبی ناودەبـرێن و ئەو دیـارخەرانەی کە وەك مۆرفیمی سەربەخۆ ئاوەڵنـاوین وکۆمەڵە وشە وشەی لێکدراو ـ ئەمانە هەموویان لەخانەی ئاوەڵناو دەردەکرێن و دەچنە بەشی تری ئاخاوتنەوە.

بەم جۆرە ئاوەڵناو لە کوردیدا قەبارەو بارستایی ڕاستەقینەی خۆی وەردەگرێ و لەو دەردەچێ لەگرنگی و گەورەیی دا هاوشانی ناو وکار بێت

٣ ـ ئاوەڵناو لەڕوانگەی واتاوە:

کە بەوردی لەواتـای کەرەسـەکـانی زمان ورد دەبێەوە دەبینین کە زمـان بەگشتی دەربـرینی هەنـدێ بیـر دەخـاتـە ئەستـۆی بەشێکی تایبـەتی ئاخـاوتنـەوە. بەواتایەکی تر، هەندێ بیر لەئاستی ژێرەوەدا ڕاستـەوخـۆ پەیـوەنـدی لەگـەڵ هەنـدێ بەشی ئاخـاوتندا بەستووەو تارادەیـەك لەگـەڵ بەشـەکـانی تـردا ئەو پەیوەندیە پتەوەیان نیە. بۆ نمـوونـە، ئەو وشـانـەی «ڕووداو» یان «چـالاکی» پیشـان دەدەن بە زۆری لەزمـانـدا کارن وەك: دەخـۆم، دەڕۆم، دەشکێنم. دیسـان

ئەوانـەی «خـزمـایەتی» یان «شمەك» دەگەیەنن هەر ناو دەبن وەك : ئامـــزا، برا، باوك، دایـك، دار، بەرد، گەلا . . . . هەروەهـا ئەو وشـانـەی رەنگ یان تایبەتی کەسی یان خاسیەتی شت دەردەخەن : سپی، رەش، ژیـر، ئازا، گەرم، سارد. بەتـایبـەتی لەو بەشـەی ئاخاوتنن کە بە ئاوەڵناو دادەنرێ.

لەبەر ئەوەی ژمـارەی بەشەکانی ئاخاوتن و جۆری دابەشبوونی بیـرەکـانی بەسـەریـانـدا لەزمـانێکـەوە بۆزمانێکی تر دەگۆڕێ، (بۆ نمـونـە، هەمـوو زمـانێـك ئاوەڵنـاوی نیـە[10] ئەوەی لەم بارەیـەوە بەتەواوی دەرکەوتووە ئەوەیەکە هەموو زمانێك ناووکاری تێدایە)[11] ئاسـاییـە کەبیـروچکـەیـەك لەزمانێکدا بەهۆی بەشێکی ئاخاوتنەوە دەبیرڕێ و لەزمانێکی تردا بەهۆی بەشێکی ترەوە[12] لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ دان بەوەدا بنێن کە دابـەشبـوونی بیـرەکـانی بەسـەر ئاخاوتندا لەچوارچێوەی پەیرەویکدا دەبێ و هەندێ لەم پەیروانە تەواو سەرتاپاو بلاون بەواتـای ئەوەی لە هەمـوو زمـانـەکـاندا یەکە، هەروەك چۆن بیـری «شت» هەر بەنـاو وبیـری «جـوولـە» هەر بەکـار وبارستاییش (گەورە، بچووك، درێژ) هەر بەئاوەڵناو دەردەبڕێت.

ئەوبیـرانەی دەربرینیان خراوەتە ئەستۆی بەشێکی ئاخاوتنەوەوە دیـــــان وەنــەبێ بێ سنــوور وبێ پـــایـــان بن بەپێچـــەوانـــەوە، لێکـدانەوەیەکی وردو قووڵی واتای ئەو وشانەی کە لەچەند زمانێکدا بەئـاوەڵنـاو دانـراون، دەمـان گەیـەنێتـە ئەوراستیـەی کە بەشێکی ئاخـاوتنی وەك ئاوەڵنـاو چەنـد بیـریکی سەرەکی کەم دەردەبری کە ژمـارەیـان لەحەوت[13] تێ ناپەرێ. ئەم بیرانەشی بەئاسانی دیاری دەکـرێن و لەو بیـرانـە جیـا دەکـرێنـەوە کە بەهـۆی کار یان ناو یان بەشێکی تری ئاخاوتنەوە دەردەبرێن.

ئەوەی تێبینی دەکـرێ لەم رووەوە ئەوەیـە کە ئاوەڵناو (بەچەمکە ئەسکـەی کە لەبـەش یەکـەم دا سنـووری بۆدانراوە) بەتایبەتی ئەم بیرانە دەردەبرن : بارستای، رەنگ، تایبەتی فیزیکی شت، تایبەتی کەسی، خێرایی، تەمەن، بەها[14]

بێگومان ئەو حەوت بیرەی سەرەوە سەرچاوەی هەموو ئاوەڵناون لە هەمـوو زمـانـەکـانی گێتی دا، واتـە زمـان نییە ئاوەڵناوەکانی سەر بە یەکێـك لەم بیـرانـە نەبێ بەلام دەبێ بزانین هەر زمـانـە بەجـۆرێك کەڵـك لەم سەرچـاوەیە وەردەگرێ. واتا، مەرج نییە هەموو زمانێك هەمـــوو ئەم جۆرانـەی هەبێ، یان ئاوەڵنـاوی هەبێ کە تەمـەن یان خێـرایی پیشـان بدات، هەر زمـانـە بەئـارەزوو لەم چوار چیـوەیـە دەرنـاچێ : بۆ نمـوونـە : هەنـدێ ئاوەڵنـاوەکـانی تەنیـا بارستـایی و تەمـەن و بەهـا دەردەبـرن، [15] هەندیکیان ئاوەڵناویان نییە خێرایی و تەمەن نیشان بدات، [16] زمان هەیە ئاوەڵناوی نییە تایبەتی کەسی دەربرێ، [17] زمانیش هەیە کە خاوەندی ئاوەڵناو نییە

٣ ـ ١ پۆلێنکی واتایی ئاوەڵناو

بەگـوێـرەی ئە بیـروچکـانـەی دەری دەبرن، ئاوەڵناو لەکوردیدا دەکـرێ بەچـەنـد پۆلێکـەوە هەر یەکـەیـان تایبـەتی خۆی تێدایە کە لەوانیتری جیای دەکاتەوە : پۆلەکانیش ئەمانەن :

(١) ئاوەڵنـاوی بارستـایی : وەك : گەورە، بچووك، درێژ، کورت، بەرز، نزم باریـك، ئەستـوور، پان، تەسـك، زل، کەتـە، قەبە، گچکـە. . . . هتـد ئەم جۆرە لەرووی رستـەسازیەوە خاوەندی ئەم تایبەتیانەی خوارەوەیە :

(أ) ئاوەڵنـاوی بارستـایی جووت دەبـەستن و هەر یەکەیان کۆتاییەك دەگرێ وپلەی تریش لەنێوان دوو جەمسەرەکەدا هەیە.

(ب) یەکێك لەئاوەڵناوەکان هەمیشە گەرمەو (ئیجابی) ئەویتر سارد

(ن) یەکێك لەئاوەڵناوەکان، بەتایبەتی گەرمەکەیان لەهەندی رستەدا (بەتایبەتی رستەی پرسیار) بێ لایەن دەوەستی واتە تایبەتییەکە پیشان نادات. بۆ نموونە، ئاوەڵناوی درێژ، یان، گەوە، بەرز لەم رستانەدا بێ لایـەنن چونکـە بەواتـای درێـژ، پان، گەورە یان بەرز نایەن هەر وەك لەوەلامی پرسیارەکاندا دەردەکەوێ :

دارەکـە چـەنـــد درێژە؟ (٨٠سم)
خـانۆکـە چـەنـد گـەورە دەبێ؟
(زۆر بچووکە)
شەقامەکە چـەنـد پانە؟ (سێ مەتر)
چیایەکە چەند بەرزە؟ (زۆر نزمە)

(جـ) تەنیـا ئاوەڵنـاوە گەرمـەکـە لەوڕۆنـانەدا بەکار دێ کە چەندێتی پێشان دەدەن :

ـ شەقامەکە سێ مەتر پانە
ـ شەقامەکە سێ مەتر تەسکە
ـ درەختەکە دوومەتر بەرزە
ـ درەختەکە دوو مەتر نزمە
قوڵی رووبارەکە دوومەترە
ـ تەنکی رووبارەکە دوومەترە
ـ بەرزی دارەکە چەندە؟
ـ ـرمی دارەکە چەندە؟

(جـ) ئەم ئاوەڵنـاوانـە بەراووردیـان پێ دەکـرێ وبەمەش پەیوەندی

ئاوەژ ووبی دێتە کایەوە وەك لەم رستانەدا دەردەکەوێ

هێلی أ ل ب درێژ ترە

کەواتە: هێلی ب لە أ کورتترە

ئەم دار ە لەوداره بەرزترە

کەواتە: ئەوداره لەم داره نزمترە

ئەم پەتە لەوەی تۆ ئەستوور ترە

ئەوەی تۆ باریکترە لەمە.

: ئەم ئاوەڵناوانە لەگەڵ کاری بوون دا بۆ بارستایی پیشان دان ناچنە رستەی فرمانەوە، واتا، فرمانیان پێ دروست ناکرێ:

* یان بە

* درێژ بن، مناڵینە

* کورینە بەرز بن

* ژنەکە باریك بە

هەر کاتی لەرستەی فرماندا هاتن، ئەوا واتاکانیان گۆڕاوە، واتا گوێزراونەتەوە بۆ پۆلی تر وەك ئەم نموونانە روونی دەکەنەوە

درێژ بە (لەهەندێ شێوەدا بەواتای پاڵ بکەوەدێ)

خۆت باریك کە (واتە، رێژیم بکە، بوو بە ئاوەڵناوی‌تر)

بەرزبە (رەوشتت بەرزبێ)

قووڵ بە (بەرگەی شت بگرە)

ئەم پۆلە ئاوەڵناوە لەرووی وشە سازیشەوە چەند تایبەتیەکیان تێدا دەبینرێ کە لە پۆلەکانی تردانییە وەك

(أ) زۆر بەیان بەهۆی پاشگری [ ـ ی] دەبنە ناوی رووت: بەرزی، نزمی، کورتی، گەورەیی، بچووکی . . .

لەگەورەو بچووکی تێ ناگات

بەرزی دارەکە چەندە؟

(ب) بەشێکی زۆریان بەهۆی پاشگری [ ـ ئای]وە دەبنە ناو وهەندێکیان نیشانەی کۆبە دوایاندا وەردەگرن و نیشان دەدەن:

بەرز / بەرزایی / بەرزاییەکان

نزم / نزمایی / نزماییەکان

ئەستوور / ئەستوورایی

(ت) ئەم جۆرە ئاوەڵناوانە بەبێ باریدە ئاوەڵکاریان لێوە پەیدا نابێ

* درێژ دانیشت

بەڵام: بەدرێژی پێوام

بەپانی بەدەرگاکەوە ناچێت

(جـ) لەبەر ئەوەی ئەم ئاوەڵناوانە پێچەوانەی خۆیان هەیە، بەهۆی پێشگری ترەوە نابنە پێچەوانە: گەورە: * ناگەورە، بەرز * نەبەرز بەرز (بڕوانە: کارامە، ناکارامە شارەزا، نەشارەزا.)

(٢) ئاوەڵناوی رەنگ: وەك: سپی، سەوز، رەش، قاوەیی، خۆڵەمیش. . ئەم پۆلە ئەم تایبەتیانەی خوارەوە یان تێدایە:

(أ) بەشێوەی جووت نایەن، بەڵکو بەیەن لەکۆمەڵی کە هەموویان لەدەوری چەخی کۆبوونەتەوە، واتا زاراوەیەکی گشتی گردیان دەکاتەوە (رەنگ) و بە هەموویان بوارێکی واتایی پێك دێنن

(ب) پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەکە لەوەدایە کەیەکتری جیاوازن. [١٨] واتە دووانیان لەیەك سیاق داپێکەوە نایەن: بۆ نموونە کەگوتمان پانتۆڵەکەی رەشە، ئیتر هەمان پانتۆڵ قاوەیی نابێ.

(جـ) هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵەش خۆیان دەتوانن جارێکی‌تر بنەوە بەچەق و (زاراوەی گشتی) رەنگی‌تر لەدەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە: بۆ نموونە: پەمەیی و جگەری وقرمزی لەدەوری «سوور» دێن و بوارێکی واتای بچووکتر لەناو بواری رەنگدا دروست دەکەن.

(ت) ئەمانە تاکی گەرم وتاکی ساردیان نییە ولەهیچ سیاقێکدا بێ لایەن ناوەستن: بۆ نموونە کە دەپرسین: کیژەکە چەند سپیە؟ ئەوا دانمان بەوەدا ناوە کە سپیەو رەش یان سوورکەڵە نییە.

(حـ) وەك ئاوەڵناوی بارستایی ئەمانەش لەگەڵ کاری بوو ، ـا رستەی فرمانیان لێ پێك نایەت: سپی بە، سووربە، رەش بن

(حـ) هەر چەند ئاوەڵناوی رەنگ دەخرێتە پلەکانی بەراووردەوە، لەدوو لایەنەوە ئەمانە لەم بارەدا لەئاوەڵناوی بارستایی جیا دەبنەوە:

(١) پەیوەندی ئاوەژ وو نایەتەکایەوە: بۆنموونە: رستەیەکی وەك: هەژان لەشیلان سپیترە، ئەوە ناگەیەنێ کەشیلان رەشترە یان ز دترە. . . (٢) بەراوردەکە لەنێوان کەم یان زۆری یان رادەو پلەی رەنگەکەدایە، نەك لەنێوان رەنگێك و یەکێکی تردا، بۆ نموونە رستەیەکی وەك: تۆڵەو سوورتری، ئەوە دەگەیەنێ هەر دووکتان سوورن بەڵام پلەی سووری لەتۆدا لەپلەی سووری لەودا زیاترە، نەك پلەی سووری تۆ لەپلەی سپێتی ئەو زیاتربێ.

لەرووی وشەسازیەوە ئاوەڵناوی رەنگ ئەم خاسیەتانەی تێدایە:

(١) پاشگری [ ـ ێتی] یان[ ـ ی ] دەیان کاتە ناو: سووری، سوورێتی، سەوزێتی سپێتی، زەردێتی . . .

(٢) لەگەڵ پاشگری [ ـ ئای] ئاشنایەتیان هەیەو دەیانکات بەناو وواتاکەشیان بەتەواوی دەگۆڕێ، هەر چەندە لەگەڵ هەموویاندا

نایە : سپی سپیای ماست وشیر، سەوز سەوزایی (شوێنی گژ وگیای تێدا ڕووا بێت، زەردایی و ڕەشایی

(٣) لەگـەڵ هەنـدێ پاشگـری تریشـدا دێن بۆ پیشـانـدانی پلەی ڕەنگـەکـە وەك [ ـ کەلـە ، ـ فل ، ـ واش ] : سپیکـەلە ، سوورکەلە ، ڕەشکەلە ، سوورفل ، سپیواش

(٤) بەواتـای ڕەنـگ ئاوەڵکـاریان لێ دروست ناکـرێ ، بەپـاریدەو بێ‌پاریدە هەر کاتێ لەشێوەی ئاوڵنادابن ، ئەوا واتای تریان هەیە :

مووروٚکە ڕەش ڕاهات

٣ ـ ئاوەڵناوە ڕووالەتی یەکان!

ئەمـانـە بریتین لەو ئاوەڵنـاوانـەی کە تایبـەتی نیزیکی دەردەبڕەن وەك : ڕەق ، نەرم ، گەرم ، سارد ، تاڵ ، شیـرین ، قورس ، سووك ، گران ، هەرزان ، ساف ، تفـت ، ڕاسـت ، خوار ، لار ، لەڕ ، لاواز ، باش ، خراپ ، جوان ، خۆش ، کۆن ، نوێ . . . . . هتـد .

ئەمـانـە بەزۆری خاسیـەتی شت دەردەخـەن ، بەڵام وەك خوازە بۆ باس لێکـردن لەکـەس و گیـان لەبـەریش بەکـاردێن . ژمـارەیەکی کەمیان بەتایبەتی بۆ مروڤ و گیانلەبەرە (قەڵەو ، ژیر ، تووڕە ، شاد) .

گرنگترین تایبەتی ئەم کۆمەڵە ئەمانەی خوارەوەیە :

(١) هەنـدێکیـان جووت دەبـەستن (گران ، هەرزان) ، هەندێکیان بەکـۆمـەڵ دێن و (سـارد ، فێنك ، شلەتین ، گەرم) هەندێکی تریان تاك (ئاشکرا) ، نەبەرد . . )

(٢) هەندێ جار پەیوەندی هاوواتایی یان دژ واتایی دووانیان لەیەك دەدالـە لێکـدراوێکی بەسـتـراودا ، لەم کاتانەدا ئاسایی درێژەکەیان (ئەوەی بڕگەی زیاترە) دەچێتە دواوە ، ئەوانەی لەدرێژ یدا یەکسانن هەنـدێ‌جـار پاش وپێش دەکـەون . لەڕ ولاواز ، تاڵ وشیـرین ، کۆن ونـوێ ، باش وخـراپ ، ئەم جۆرە لێکـدانـە لەڕەنگـەکەیشدا دەبێ (سـەوز و سوور ، ڕەنگـاوڕەنگ) بەڵام لەئاوەڵناوی بارستاییدا بەبێ گۆڕینی واتـا ڕوونـادات (ئـەستوورو باریك ، ـ پان وتەسك ، بەرزونزم (قسەی ڕەق و نابەجێ)

(٣) زۆربەی ئەو ئاوەڵناوو ڕۆوالەتی یانەی بەجووت دێن ، تاکێکیان گەرمـەو ئەوتریان سارد : چاك وخراپ ، کۆن ونوێ ، تاڵ وشیرین ، ساردوگەرم ، ڕاست وچەوت . . . . . هتد

(٤) ئەو تایبـەتیـەی ئەمانە لەئاوەڵناوی بارستایی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەمـانـە لەهیـچ جۆرە ڕستـەیەکدا واتای خۆیان نادۆڕێنێ ، واتە بێ‌لایەن ناوەستن ئەو پیاوە چەند چاکە؟ زۆر

(٥) لەبـاری بەراوردکـردندا وەك ئاوەڵناوی بارستایی ڕەفتار ناکەن ، واتـە ڕستەکە ئاوەژ وو ناکرێتەوە بەبەکار هێنانی دژەکەی . ڕستەیەکی وەك : ئەم چایـە لەوەی تۆ شیـرینتـرە . ئەوناگـەیەنێ کەئەوەی تۆ لەم چایە تاڵترە .

(٦) دیسـانـەوە لەبـاری بەراووردا واتای ئاوەڵناوەکە پێشەکی بەسەر دیـار خراودا ناسـەپێ : ڕستەیەکی وەك «شیلان لەتۆ جوانترە» ، ئەوە ناگەیەنێ کە شیلان جوانە .

(٧) بەپێچەوانەی ئاوەڵناوی بارستایی و ڕەنگەوە ئەمانە لەگەڵ کاری «بوون»دا ڕستەی فرمان پێك دێنن :

سارد بەلەگەڵیان

کچم لەگەڵ خەڵکدا باش بە

قسە خۆش بە

دڵ ساف بـە

(٨) ئەو ئاوەڵنـاوە ڕووالـەتی یانەی دژ ی خۆیان نییە ، بەهۆی «نا / نە» دەبن بەدژ : شارەزا ، نەشارەزا ، خۆش ناخۆش

(٩) بەزۆری ئەم ئاوەڵنـاوانـە بەپاشگری [ ـ ی ] دەبنە ناووزۆرکەم پاشـگـری [ ـ ئیـتـی و ـ ئایی ] وەر دەگـرن : خۆش خۆشی ، سارد ساردی ، شاد شادی ، ناخـۆش ناخـۆشی (بڕوانە : چاکە ، خراپە ، کۆنیتی کۆنی . . . )

(١٠) زۆربـەیـان لەڕستـەدا وەك ئاوەڵکار بەکار دێن بێ ئەوەی شێوە بگۆڕن : سووك ، توند ، قایم ، هەرزان ، گران ، قورس . . .

دەرگاکە سووك قایم ، توووند دابخە

کتێبەکەم هەرزان گران کڕی .

(١١) بەزۆری ئەم ئاوەڵنـاوە ڕووالـەتیـانـەن کە بە هۆی پاشگـرو پێشگری دارشتنەوە لەبەشەکانی تری ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن :

خـەم خەمبار ، شەرم شەرمن

زێر زێرین ، ئارد ئارداوی

بـار بـەبار بێ‌بار

شایانی سەرنجە کە دوو جۆرەکەی تر هەرگیز ئەم جۆرە گیرەکانە [ ـ ین ، ن ، ـ بار ، بە ـ ، بێ ] وەرنـاگـرن و ئاوەڵنـاوی بارستـایی و ئاوەڵناوی ڕەنگە سەرەکی یەکان لەبنچینەدا ئاوەڵناون ، واتە لەبەشی تری ئاخاوتنەوە ناتوانرێ داناشرین .

٣ ـ ٢ ڕەنگدانەوەی پۆلینەکە لەڕیزبوونی زنجیرە ئاوەڵناودا :

هەنـدێ زمـانـەوان لەویـاوەڕەدان کەزنجیـرە ئاوەڵنـاو دەتـوانن لەکـوردیدا جێگـەی خۆیـان بگـۆڕنـەوە بێ ئەوەی واتـای ڕستەکە بگۆڕن . هەڵەی ئەم جۆرە بۆچوونانە لەوەدا دەردەکەوێ کە هەندێ

راستی زمانەکە فەرامۆش دەکەن لەوەداکە :

(١) هەندێ جووت و زنجیرە ئاوەڵناو بەجۆرێك دەچنە ناویەکترەوەکە بەئارەزوو پاش وپێش ناکرێن، واتەیەك جۆر ریزبوونیان دەبێ : پاك وخاوێن، توونـدوتیژ، تێروپر، گەورەو بچووك، ژن وپیاو. . .

ماڵەکە گەورەو بچووك لەبەر دەرگا وەستا بوون.

* ماڵەکە بچووك و گەورە لەبەر دەرگا وەستابوون.

(٢) لەزنجیرە ئاوەڵناودا ئەو ئاوەڵناوەی لەپلەی بەراووردێ، دەبێ بکەوێتە دواوە : ئاشەوانەکەی نزیکمان ئاردێکی وردوباشتری بۆ خەڵك دەهاری.

ئاشەکەیان قایم و چەسپتر دەکرد

* ئاشەکەیان چەسپترو قایم دەکرد.

(٣) ئەو ئەوەڵناوی پەیوەندی رێزمانی لەگەڵ وشەی تری رستەکەدا هەیە مادە بێ لەکۆتایی زنجیرەکە شوێنی بدرێتی.

ئەوانە دەوڵەمەندو گەورەی سەرتاپای وڵاتەکە بوون.

* ئەوانە گەورەی سەرتاپای وڵاتەکەو دەوڵەمەندبوون.

(٤) ئەو ئاوەڵناوەی دیارخەری تایبەتی خۆی هەیە پێش ئاوەڵناوەکانی تر دەکەوێ :

منالێکی زۆر ئازاو چالاك بوو.

منالێکی چالاك و زۆر ئازا بوو.

گرنگی ئەو پۆلینە واتاییەی (٣ ـ ١) لەوەدا دەردەکەوێ کە هەموو ئەوراستیانەو چەند راستیەکی تری زمانەکە لێك دەداتەوە. بەڵگەنەویستەکە هەر کاتی ژمارەیەك ئاوەڵناوبەدوایی یەکتریدا هاتن دەبێ بەپێی پەیرەوێك رێز بکرین، واتە رێزکردن لەخۆوە بێ یاساو دەستوور نابێت هەروەك ئاسایی ونائاسایی ئەم رستانەی خوارەوە دەری دەخەن :

لەکۆشکێکی شینی گەورەی شووشەبەندا دەژی.

؟ لە کۆشکێکی شووشەبەندی گەورەی شین دا دەژی.

؟ سوخمەیەکی سوورو زەردی لەبەردابوو،

سوخمەیەکی زەردو سووری لەبەردابوو.

؟ فلیمەکە سپی و رەش بوو.

؟ فلیمەکە رەش و سپی بوو.

ئەوەی شایانی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کە رێزبوونی ئاوەڵناوی یەك جۆربەندە بەدرێژی ئاوەڵناوەکانەوە، واتە ئەو ئاوەڵناوەی ژمارەی برگەکانی زۆر بێت، ئاسایی دەچێتە دواوە وکورتەکە پێشەوە دەگرێ :

ئەندازیارێکی وریاو شارەزایە

؟ ئەندازیارێکی شارەزاو وریایە

منالێکی وریا گوێ رایەڵ بوو.

؟ منالێکی گوێ رایەڵ وو وریا بوو.

کە ئاوەڵناوەکان لەدرێژ ییدا یەکسان بن، زیاتر لەیەك ریزکردنی پەسەند لەزمانەکەدا دەبینرێ :

ئەندازیارێکی کارامەو شارەزایە.

ئەندازیارێکی شارەزاو کارامەیە

لەرێزکردنی رەنگەکاندا گوێ راهاتن دەورێکی گرنگ دەبینی بەتایبەتی چونکە رەنگە سەرەکی یەکان هەموویان لەدرێژیدا چوون یەکن. دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کەهەندێ جووت بوون لێرەدا بونەتە ئیدیەم وهەڵ ناوەشێنەوە (زەردو سور = رەنگاو رەنگ، رەش وسپی = بێ رەنگ. . .

منالێکی سووروسپیە

* منالێکی سپی وسوورە

کراسێکی سەوزو سووری لەبەردایە.

* کراسێکی سوورو سەوزی لەبەردایە.

هەروەها دەگوترێ، سەوزوشین نەك* شین وسەوز

لەرێز کردنی زنجیرە ئاوەڵناوی هەمە جۆردا هەر درێژی ئاوەڵناوەکە نییە کە دەوری گرنگی هەیە، بەڵکو رێز بوون پەیوەندی بەجۆری ئاوەڵناوەکەوە هەیە، بەگوێرەی ئەو پۆلینەی لەپێشترەوە دامان. بۆ نموونە کە ئاوەڵناوی رەنگ وڕووالەت، یان رەنگ و بارستایی پێکەوە دێن، بەزۆری رەنگ پێشی دەکەوێ :

گۆمێکی شینی مەنگ.

گۆمێکی شینی بەرین.

دیسان کەر هەر سێ جۆرەکە زنجیرەیەك دروست بکەن و هەموویان پێکەوە بینە دیارخەر بۆناوێك، ئەوا بەزۆری رەنگ دەچێتە پێشەوە وبارستایی دوای دەکەوێ و ئاوەڵناوی رووالەت دەچێتە کۆتایی :

گۆمێکی شینی گەورەی مەنگ لەنزیك ماڵەکەوە بوو.

؟ گۆمێکی گەورەی شینی مەنگ لەنزیك ماڵەکەوە بوو.

؟ گۆمێکی مەنگی گەورەی شین لەنزیك ماڵەکەوە بوو.

دەبێ دواجار تێبینی ئەوە بکەین کەئەم مەیلە (النزعە) رەنگ + بارستایی + رووالەت بەسەر درێژی وکورتی ئاوەڵناودازاڵە، واتە

لەکاتی بوونی چەند ئاوەڵناوێکی هەیە لەچەشن دا یەکەم جار بەپێی ئەم مەیلە ریز دەبن، دوایی ئەمە دەستووری دووەم (ئاوەڵناوی درێژ بۆدواوە) جێبەجێ دەکرێ وەك لەم رستانەدا دەبینرێ:

کورە سوورکەڵە درێژە چالاکەیان هەلبژارد.

چاوە رەشە گەورە زینەکانی لەتاریکیدا دەدرەوشانەوە

پیاوێکی رەشی کەتەی کۆڵکن لەم

بەرەوە وەستا بوو

گوڵە سوورە جوانەکەی لێ کردەوە.

پالتۆیەکی بۆری درێژی کۆنی پیناوی لەبەردەکرد.

سمێڵە سپی یە باریکە تەنکەکەی بادەدا

قەندێکی درێژی سەرزلی بەدەستەوە بوو.

(٤) باری ئاوەڵناو لەکوردیدا

هەموو ئەو راو تێبینیانەی تائێستا لەبەشەکانی پێشتری لێکۆلینەوەکەماندا خراونەتە روو دەربارەی ئاوەڵناو وچۆنیەتی پاکردنەوەی لەئاوەڵناو ئاساو بژارکردنی لەوخلتانەی (ئامرازەکان) بەدرێژی میژەو پێوەی لکاون وبە بەشێك لەئاوەڵناو لەقەڵەم دراون و پۆلینە واتاییە وردو پڕ بە پریەکەمان ـ ئەمانە هەموویان پەنجە بۆ ئەوە رادەکێش. کە ئاوەڵناو ئەو بەشە ئاخاوتنە هەروا بەرین و پەلە هاوێژ و بالاو گرنگ نییە لەکوردیدا کە هەندێ زمانەوان تێی گەیون وتەنانەت گومانی ئەوەشی لێ دەکرێ کە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆبێ لەم بەشەدا چەند بەڵگەیەکی بەهێزی تریش لەسەر لاوازی ولەقی و بێهێزی شوێنی ئاوەڵناو لەکوردیدا دەدەین:

(١) لەناو ئەو ناوچە بیریانەی کە لەزمانەکانی گێتیدا بەزۆری بەئاوەڵناو دەردەبڕێت و کە ژمارەیان بەحەوت ناوچە دانراوە، ئاوەڵناوی کوردی تەنیا لەگەڵ سیانیاندا ئاشنایەتی هەیە بەواتایەکی تر ئاوەڵناوی کوردی زۆربەی ناوچەی ئاوەڵناوییەکانی بۆ بەشەکانی تر چۆڵ کردووە گرنگترین ناوچەی چۆڵ کراو ناوچە تایبتیە هۆشەکییە مرۆڤیەکان و بەهاو خێرایی وتەمەنە هەرچەندە هەندێ لەو ئاوەڵناوانەی رووالەت دەگەیەنن، دەگوێزرێنەوە بۆ ناوچەی تایبەتی هۆشەکی، بەلام بەمەش ئەو کەلێنە وشەییە دانەپۆشری کەکەمی یان نەبوونی ئاوەڵناو لێرەدا دروستی کردووە، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی داپۆشینەکە تەنانەت لەناوچە رووالەتیش خۆیدا زۆر لاوازو پێویستێکی زۆر بە پرکردنەوە هەیە. لەپێناوی بەهێزکردنی «داپۆشینی» ناوچەکەو پرکردنەوەی بۆشای ئەم دوو ناوچە گرنگە، کوردی ناچار بووە یەکێك لەم رێگانە بگرێ:ـ

(١) خواستنی ئاوەڵناوی ئامادە بەتایبەتی لەزمانی عەرەبیەوە کە لەم ناچەیەداله خۆی دەوڵەمەندترە

(٢) گواستنەوەی وشە لەبەشەکاتی تری ئاخاتنەوە وبەکار هێنانیان وەك ئاوەڵناو ئاسا لەو شوێنانەدا کەزمانی تر ئاوەڵناو بەکار دێنێ٧ ئەم جۆرە گواستنەوەیەش بەسێ رێگە دەبێ:

(أ) بەگۆرینی فۆرم بە هۆی گیرەکەوە (١) پێشگر: هێز (ناو) بەهێز (ئاوەڵناو) بێهێز (ئاوەڵناو، بار (ناو) لەبار (ئاوەڵناو (٢) پاشگر: کرم (ناو) کرمێ (ئاوەڵناو)، شەر (ناو) شەرانی (ئاوەڵناو)، فێل (ناو) فێلباز (ئاوەڵناو)

(ب) بێ گۆرینی فۆرمی وشە گوزراوەکە: هێرشەکەی ئەوسا (ئاوەڵکار)، باخچەی ساوایان (ناو)

(ت) لێکدانی دووو وشە یان زیاتر بەزۆری لەبەشەکانی تری ئاخاوتنەوە بەبێ ئامراز یان بەیاریدەی ئەمان: خێر + نە + بینین] خێرنەدیو، دز + نە + بردن] دزنەبەر، چاولەدەر. . . . هتد ئەمانەش تەنیا وەك ئاوەڵناو ئاسا رەفتار ناکەن بەڵکو لەهەمان کاتدا، ناویشن (ناوی بکەر یان بەرکار)

(٢) گەورەیی وفراوانی ئەو کەلێنەی کەکزی وکەمی وگرانی ئاوەڵناوی رووالەت و تایبەتی هۆشەکی لەکوردیدا دروستیان کردووەتەنانەت بەو سێ رێگەیەی سەرەوەش ناگیرێ (بە هۆی بەکار هێنانی بەشەکانی تری ئاخاوتنەوە). لەبەر ئەمە، کوردی زۆر جار ناچار دەبێ رستەیەکی تەواو (بکەر + کار) لەجیاتی ئاوەڵناوێك بەکار بێنێ. ئەمەش دیاردەیەکی دابراو نییە بەلکو بەبلاوی لەئێستەی زمانەکەدا دەبینرێ:

ئەو تێکەلاوانە لەیەکتر دەچن تێکەلاوی لەیەکتر چوو تێکەلاوی چوون یەك (خلیط متجانس)

دەشێ بەکانزادا بکێشین کانزا دەشێ بۆ پیاکێشانی پێدا دەکێشرێ دەتوانین کانزا راکێشین بۆ راکێشان دەبێ رادەکێشرێ

شایانی سەرنجەکە دەیان و سەدان ئاوەڵناوی زمانی تر بەم رێگەیە وەردەگێرێ بۆ کوردی، بەتایبەتی بەبەکار هێنانی کارێکی بکەر نادیار[١٩]

(٣) لەئەنجامی کەمی و کزی ئاوەڵناوی رووالەت و دروستکردنی بەورێگایانەی سەرەوەو لەبەر ئەوەی ئاوەڵناوی رەنگ وبارستایی لەخۆیاندا ژمارەیەکی کەم و داخراون، ئاوەڵناوی کوردی دەتوانرێ بەپەیرەوێکی داخراوی ژمارە دیاریکراو سەیر بکرێ. بەتایبەتی

## - هەندێ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو

کەلەگەڵ ناو کاری کوردی لەژمارەدا بەراوردەکرێ ئەم ڕستیە زیاتر دەچەسپێ. بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە ئاوەڵناو لەکوردیدا پترنابێ، چونکە ئاوەڵناوی ڕووالەت سەرێکی کراوەیەو هەمێشە لەرێگای خواستنەوە خواستنی وشەی ئامادە یان خواستن لەرێگەی وەرگێرانەوە دەتوانێ خۆی فراوانتر بکات، بەڵام ئەمانە زیاتر بەئاوەڵناو ئاسا زیاد دەکەن نەك بەئاوەڵناو.

(٤) ئاوەڵناوی کوردی نەلەرووی وشەسازیو نەلەرووی رستە سازیەوە لەزۆربارردا لە هەندێ بەشی تری ئاخاوتن، بەتایبەتی ناو (جێناو) جیل ناکرێنەوە وئەمەش زیاتر دەمان خاتە گومانەوە کە ئاوەڵناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆبێ لەکوردیدا، یان ئەودەورە گرنگەی هەبێ لەزمانەکەدا وەك هەندێك باوەڕیان وایە. ئەم سروشت و رەفتارەی ئاوەڵناو لەئاوەڵناوی نزیك دەکاتەوە کەبە ئاسانتر دەتوانین نەبوونی لەکوردیدا بسەلمێنن جگە لە هەرگیز وچەند ئاوەڵکارێکی شوێن وەك: (ئێرە، ئەوێ هەموو ئەووشانەی دەوری ئاوەڵکار دەبنین ناون). لەیەکچوون و نزیك بوونەوەی ئاوەڵناو ئاوەڵکار لەهەلکەوت و سروشتدا شتێکە چاوەڕێ وپێش بوونی دەکرێو ئەمەش بەلای منەوە یەکێکە لەچاکەکانی ئەوبۆچوونەی لێرەدا دەخرێتە روو. (بڕوانە بەشی ٤ ـ ١ بۆ درێژی ئەم باسە)

٤ ـ ١ ئاوەڵناوی کوردی بەشێکە لەناو:

بەئاسانی دەتوانین لەرووی فۆرم و ئەرکەوە ئاوەڵناوی کوردی بەبەشی لەناو دابنین وەك بەم راستییانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

(١) راستی وشەسازی:

(أ) گیرەکە رێزمانییەکان: هەموو ئەوپاشگرە رێزمانیانەی کە بەناوەوە دەلکێن، دەتوانن لەگەڵ ئاوەڵناودا بەهەمان ئەرك وواتا بەکاربێن: لەمانە نیشانەی ناسیاریو نەناسیاریووکۆوتاك وخۆیەتی وراناوی خزاو:

ناو

---

پیاو: پیاوەکە، پیاوێك، پیاوەکان

ئەو پیاوە، پیاوان

پیاوەکانیم (هەڵبژارد)

لەناو پیاوەکاندا

ئاوەڵناو

---

جوان: جوانەکە، جوانێك، جوانەکان

جوانان، جوانەکانم «هەڵبژارد»

ئەو جوانە، ئەوجوانانە

لەناو جواناندا، لەناو جوانەکاندا

تاکە پاشگرێکی رێزمانی کە بەزۆری لەگەڵ ئاوەڵناودا بەکار بێت، نیشانەی بەراوورده [ ـ تر، ترین] ـ جوانتر، جوانترین * خانووتر * خانووترین . . . . ئەمەش ئاوەڵناوی لەبەشەکانی تری ئاخاوتن پێ جیاناکرێتەوە چونکە لەگەڵ هەندێ ئاوەڵکارو ناویش دا بەکاردێن: دژەرگاکە توندتر پێوەیدە، بایەکەی قایمترکرد، لەئێوە پیاوترە، کەرترین کەسی ئەم جیهانەیە . . . . .

(ب) گیرەکی دارشتن: زۆربەی ئەوپاشگرە دارشتانەی کە دەچنە سەر ناو بەهەمان واتاو لەگەڵ ئاوەڵناویش دا دێن، واتە هاوبەشن وەك

(١) [ ـ ی]: منالی، کویری

(٢) [ ـ ئیتی، ئایەتی، ەیەتی]: برایەتی، دۆستایەتی، پیاوەتی، گەورەیەتی، بەرزێتی، سپێنی

(٣) [ ـ ە] شەوە، ئاگرە، خراپە، چاکە [٢٠]

(٤) [ـ ەڵان] بەردەڵان، نەرمەڵان

(٥) [ ـ ەن]: پووشەن، رووتەن

(٦) [ ـ ەمەنی]: چایەمەنی ـ ساردەمەنی

(٧) [ ـ ێنە]: ماشێنە زەردێنە

(٨) [ ـ ئانە]: کورانە، پاکانە

(٩) [ ـ ۆڵ]: ئاسکۆڵ، نەرمۆڵ

(١٠) [ ـ ندە]: باڵندە، درندە

(١١) [ ـ ئایی]: دارایی، شیفایی [٢١]

(١٢) [ ـ ۆڵە]: بەرخۆڵە، نەرمۆڵە

(١٣) [ ـ ەك]: کوتەك، بەرزەك

کەواتە ئاوەڵناویش وەك ناوی نابەرچەستە وناوی شوێن و جێگەو ئامێریان لێ دروست دەکرێ وبچووکیش دەکرێنەوە (ناسکۆڵە)

(٢) راستی رستەسازی: ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێ ئەوەیە کەناو وئاوەڵناو لەرووی رستەسازیشەوە لەیەکتری جیاناکرێنەوە، بەواتایەکی تر، ناودەتوانێ هەموو ئەوئەرکە رێزمانیانە ببێنی کە لەرستەی کوردیدا جی بەجێ دەکاو بەپێچەوانەشەوە وەك لەم نموونانەدا دەردەکەوێ:

(١) ئەرکی بکەر: ناوو ئاوەڵناو هەر دووکیان چالاکانە دەتوانن

دەوری بکەر ببینن : [٢٢]

ناو

---

ماڵێك مناڵەکە مناڵەکەیان

خۆی کرد بەژ ووردا

کتێبە گەورەکەیانم بۆ بێنە

پیاوی دەوڵەمەند قەدری پارە دەزانێ

ئاوەڵناو

---

جوانەکە جوانەکەیان، جوانێك خۆی

کردبە ژ ووردا

گەورەکە یانی بۆ بێنە

دەوڵەمەند قەدری پارە دەگرێ

(٢) ئەرکی بەرکار:

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| کتێبەکەی هەڵبژارد | جوانەکەی هەڵبژارد |
| بە مناڵەکە داناردی | بەگەورەکەدا ناردی |

(٣) ئەرکی ئاوەڵکار

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| لەناوکچاندا نازباوە | بۆجوانان هەمووشتێ دەلوێ |
| لەگەڵ کچاندا دەگەرێ | لەگەڵ جواناندا دەگەرێ |

(٤) ئەرکی دیارخەر

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| کوری مامۆستاکە گەیشت | کورە چالاکەکە گەیشت |
| ئەوانە کوردی دواروۆژ ن | ئەوانە کوری ئازان |

(٥) وەك بەشێك لەکاری لێکدراو

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| مناڵەکەتان وازی شەر دەکەن | خۆیان تێر ئامادە دەکەن |

(٦) وەك تەواوکەر لەگەڵ کاری بوون و هەندێکی تردا[٢٣]

| ناو | ئاوەڵناو |
|---|---|
| بەپیاوی تێ گەیشتم | بەئازای تێ دەگەم |
| بەمامۆستام زانی دانا | بەدانام زانی دانا |
| بەبرام لەقەڵەم دا | بەماقوولم لەقەڵەم دا |
| بەپیاوم دەژمارد | بەژیر دەژمێررێ |
| ئەو مامۆستایە | ئەو ئازایە |
| ئەوان پیاو بوون | ئەوان بەرز بوون |

٥ ـ کوردی زمانێکی ئاوەڵناوی نییە :

بەڵگەیەکی تریش بۆ ئەوەی کە ئاوەڵناو لەکوردییدا بەشێکی ئاخاوتنی هێندە فراوان و گرنگ نییە کەسەربەخۆ بێت لەوەدا دەردەکەوێ کە کوردی لەو زمانانە نییە کە ئاوەڵناو تیایاندا زاڵ وپەل هاوێژ بێت. بەپێی باری ئاوەڵناو چۆنیەتی سروشتی دژ واتایاتی لەناویاندا، هەندێ زمانەوان[٢٤] سێ جۆر زمانیان جیا کردۆتەوە :

(١) زمانی ئاوەڵناوی: کەتیایاندا هەر حەوت ناوچە واتاییەکە (بروانە بەشی سێیەم) ئاوەڵناو «دای دەپۆشی» و ئەو ئاوەڵناوانەی کەدژ واتایان هەیە، دژەکانیشیان لەهەموو روویەکەوە هەر ئاوەڵناون.

(٢) زمانی کاری: کەتیایاندا هیچ لەو ناوچەواتاییانە بەهۆی ئاوەڵناوەوە دەرنابرین و ئەو وشانەی کەدژ یان هەیە، گەرمەکەیان ئاوەڵناو یان ناوەو تاکە ساردەکەشیان کارە.

(٣) زمانی بێ لایەن (ناوەند) کە ئاوەڵناو بۆ هەندێ لەناوچە واتاییەکان بەکار دێنی و لە دژ واتاییشدا، هەندێکیان هەر دووتاکەیان، سارد و گەرمەکە، ئاوەڵناون، بەشێکی تریان (بەتایبەتی ئەوانەی کردە پیشان دەدەن) تاکێکیان ئاوەڵناوەو ئەویتریان کار

وەك پۆلێنەکە (بروانە بەشی ٣ ـ ٢) روونی دەکاتەوە کوردی لەزمانە ناوەندەکانە، ئەم تێبینیانەی خوارەوە زیاتر ئەم راستیە جێگیر دەکەن.

(١) لەو ناوچە واتاییانەدا کەئاسایی ئاوەڵناو تیایاندا بەکار دێ لەزمانی تردا، ئاوەڵناوی کوردی لەهەندێکیدا نابینرێ. کەمی ئاوەڵناو وەك لەپێشترەوە روونمان کردەوە لەناوچەی واتای تەمەن و بەهاو تایبەتی هۆشەکی مرۆڤدا دەردەکەوێ. چاوپیاخشاندنێکی سەرپێی وخێرا بەو شەو رۆنانەدا کەباس لە «تەمەن» دەکەن

لەکوردیدا، ئەم راستیە دەخاتە روو: کورێکی شانزە ساڵ (فرێزی ناوی)، پیاوێکی بەساڵداچوو، لەتەمەنی منداڵیدا، لەگەنجیدا، لەپیریدا، بەپیری، بەگەنجی، بەلاوی، بەگەورەیی. . . .

دیسان بەڵگەنەویستەکە ئاوەڵناوی کوردی زۆر بەتەنکی ناوچەی رووالەت دادەپۆشێ کزیو هەژارییەکی تەواویش لەو ئاوەڵناوانەدا دەبینرێ کەناوچەی تایبەتی هۆشەکی دەگرنەوە. کەواتە پڕیو دەولەمەندی وپێزی تەواوی ئاوەڵناوی کوردی تەنیا لەناوچەی رەنگ و بارستاییدایە لەهەموو ناوچەکانی تردا کوردی کەلێنی وشەی زۆرەو بەهۆی خواستن و وەرگێران و لێکدان وداتاشین لەکەرەسەی خۆماڵی سەر بە بەشە جیاجیاکانی ئاخاوتنەوە بەردەوام دەیەوێ پڕیان کاتەوە

(٢) دیسان کەلەوشەدژ واتاکانی کوردی ورد دەبینەوە بەمەبەستی لێکۆلینەوە، هەمان راستی دووپات دەبێتەوە کە کوردی زمانێکی ناوەندە وئاوەڵناو تێدا پەل ناهاوێ، بەتایبەتی لەوەدا کەدژ واتای ئەو ئاوەڵناوانەی کردەپیشان دەدەن لەکارەوە دادەتاشرێن وەك لەم نموونانە دا دەردەکەوێ:

| ئاوەڵناوی بار | | ئاوەڵناوی کردە | |
|---|---|---|---|
| ئاوەڵناو | دژەکەی | کار ئاوەڵناو | دژەکەی |
| گەرم | سارد | کاڵ خواردن | برژاو، کوڵاو، گەیوو |
| گەورە | بچووك | ساغ مێوە | شکاوە |
| نەرم | رەق | گەیوو | بوردوو |
| درێژ | کورت | ئاشکرا | شاراوە |
| پان | تەسك | بێدەنگ | بزێو |
| قووڵ | تەنك | زیندوو | مردوو |
| چاك | خراپ | زیندە | مردە |

(٦) ئەنجامی لێکۆلینەوەکە

بەپێچەوانەی هەموو ئەو کارانەی بەرلەمە لەبارەی ئاوەڵناوەوە کراون و گەیشتوونەتە دەستم، بەتایبەتی بەپێچەوانەی ئەو لێکۆلینەوە نوێیانەی ئەم ساڵانەی دوایی (١٩٧٥ ـ ١٩٨٨)، لێکۆلینەوەکە رێبازێکی تەواو جیاواز دەگرێ وبەرێنمایی زمانەوانی سەردەم و دەستکەوتەکانی رێزمانی جیهانی باری ئاوەڵناوی کوردی هەڵ دەسەنگێنێ و ئاوەڵناو سەرلەنوێ دابەش دەکاتەوە وشوێن راستی خۆی لەزمانەکەدا دەداتێ. رێچکە شکێنی لێکۆلینەوەکە لەم رووانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ: (١) چەمکێکی تارادەیەك نوێ دەدات بەئاوەڵناو لەهەموو ئەو خلتانە پاکی دەکاتەوە کەپێوەی نووساون و لەگەلیدا جیا نەکراونەتەوە. (٢) پۆلێنکی واتایی نوێی ئاوەڵناو دەخاتە روو بەگوێرەی بنەمای وشەسازی و رستەسازی وواتایی ئاوەڵناوی رەنگ و بارستایی و رووالەت لەیەکتری جیادەکاتەوەو گرنگی رێز بوونی چووتە ئاوەڵناو و زنجیرە ئاوەڵناودا دیاری دەکات (٣) زانستیانە دەی سەلمێنی کە ئاوەڵناوی کوردی بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن پێك ناهێنی و (٤) بەڵکو زمانی زمانی کوردی لەخۆیدا ئاوەڵناو ویست نییە بەوەی دەورێکی لاوەکی بە ئاوەڵناو دەسپێری و هەندێ بیروچکەی واتایی کە ئاسایی ئاوەڵناو دایدەپۆشی لە زمانی تردا زمانەکە بەهۆی بەشەکانی تری ئاخاوتنەوە پڕیان دەکاتەوە.

**پەراوێزەکان**

(١) Lyoas , 1̄98I, 109

(٢) ئەم جۆرە پۆلێنە تارادەیەك لەکارەکەی د. مەکارەس دەبێ دەبینرێ، هەر چەندە ئەو باسی بەشی سەربەخۆو ناسەربەخۆ ناکات وجگە لەناو وکار وجێناو هەموو بەشەکانی تری لەژێر پرتکدا داناوە (Mccarus. 1959. 45.

(٣) لێرەدا ئاوەڵناو جێناو دەچنە ژێر بەشی ناوەوە وئامرازەکانیش هەریەکەیان بەشێکی سەربەخۆ پێك دێنن.

(٤) لەوانەیە دانانی ئەمانە بە ئاوەڵناو هەر لەبەر ئەوەبێ کە ئاوەڵناو دەتوانێ جێگە یان بگرێتەوە ئەمە لەباری کێشەکە ناگۆڕێ چونکە جێگە لەئاوەڵناو ناو وکەرەسەی تریش دەتوانێ لەو شوێنانە دابنین، کەواتە بۆچی ناویان ئاوەڵناو بێت؟

(٥) Lyons, 1981, 10

(٦) christopherson, 1971, 62

(٧) Mackenzie, 1961 - 68 - 69

(٨) Lyons, 1981, 112

(٩) محمد معروف فتاح ١٩٨٩

(١٠) Dixon, 1977 , 20

(١١) ibid, 21

(١٢) بۆنموونە وشەی worth لەئینگلیزیدا ئاوەڵناو، لەعەرەبی و کوردیدا تەنیا بەکار دەردەبڕێ: دەهێنێ = یستحق = worth

(١٣) Dixon. 977. 3I

(١٤) تایبەتی ئیستریکی بزێتیە لەرووالەتی شت وەك : سارد، گەرم، تاڵی، نەرم. . هتـد تایبەتی هۆشەکی کەسی بە تایبەتی لەمرۆڤ وگیان لەبەردا دەبینرێ: ژیر، زیرەك، تورە، بەهاش ئەو تایبەتیانەن کەناراستە خۆ بۆ دیار خراو دەگەرێنەوە

(١٥) Hausa, Igbo (Dixon, 977, 21)

(١٦) Venda (ibid, 22)

(١٧) Yurak (ibid, 22)

(١٨) د. کوردستان موکریانی، ١٩٨٣، ل٤٢

(١٩) نموونەی تر لەم بابەتە ئەو ئاوەڵناوە ئینگلیزییانەن کەبە (able -) دواییان دێ کەبەزۆری. بەناو وەردەگیرین وەك توانای تواندنەوە، راکێشان، خوێندنەوە، شکاندن. . . . .

(٢٠) بروانە د. ئەورەحمانی مارف بۆ نموونەی‌تر (رێزمانی کوردی (ناو) بەغدا، ١٩٨٠)

(٢١) بەرای د. ئەورەحمانی [ - ئایی] هەر دەچێتە سەر ناو [هەمان سەرچاوە، ل٢٦)

(٢٢) بەرای د. کوردستان موکریانی (١٩٨٣، ٤٠) ئاوەڵناو لەرۆڵی نیهادا زۆر کەم بەکار دێ ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە ئاوەڵناو بەواتایەکی گەورەتر بەکار دێنی، بەجۆرێك کە هەندێ بەکار هێنانی ئامرازی نیشانە وپرسیار بگرێتەوە

(٢٣) کۆمەڵە کاری هەن کەرێگەی ئاوەڵناو دەدەن، بەڵام ناویان لەگەڵدا نایەت وەك : هەڵ گەرا، چووەوە. . . .

مناڵەکە شین هەڵەگەرا

گردەکان سەوز دەچوونەوە

ئەمانە بەنموونەی دژ ناچن چونکە ئەم دووکارەکە «گۆران» پیشان دەدەن لە ئاوەڵناوی رەنگ و بەو لاوە رێگەی ئاوەڵناوی تریش نادەن

* شەقامەکە درێژ نزم دەچۆوە
* کچەکە جوان هەڵ گەرا
* چیاکان بلند دەچنەوە

(٢٤) Dixon 77 - 58

**سەرچاوەکان**

ا - بەزمانی کوردی

١ - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، رێزمانی کوردی (ناو)، چاپخانەی کۆر، ١٩٨٠

٢ - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کورتە هەلسانگاندێکی شەش کار لەلێکولینەوەی ئاوەڵناودا، روشنبیری‌نوێ، ژمارە ١١٧، ١٩٨٨

٣ - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ئاوەڵناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیە، روشنبیری نوێ، ژمارە ١١٨، ١٩٨٨

٤ - د. ئەورەحمانی حاجی مارف، جۆرەکانی ئاوەڵناو لەرووی واتاوە، روشنبیری نوێ، ژمارە ١١٩، ١٩٨٨

٥ - د. کوردستانی موکریانی، ئاوەڵناو لەرستەی کوردیدا بەکەرەستەی کرمانجی خواروو وکرمانجی ژوورو (دا)، کاروان، ژمارە ٥، ١٩٨٣

٦ - لێژنەی زمان وزانستەکانی. رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆری انیاری کورد، بەشی یەکەم ١٩٧٥ ل٤٧٥ - ٤٩٦

ب - بەزمانی ئینگلیزی

(1) Bolinger, D, (1967) «Adjectiues in English Lingua 18, 1 - 34

(2) Dixon, R. M. W. (1977 where have allh adjectives gone. studies in lomg uage, Z,Z 19 - 80.

(3) Givon, Talmy (1970) Ivotes on the somantic structure of Englishadjectives longuage, VL, 46, 816 - 37.

(4) Lehrer A (1985) Markedness and Antonomy Journal of linguistics, voL. 21 No2

(5) Lyons, J (1981) Language and Linguistics, An Tntroduction, London cambridoe Unirersity poess

(6) Mackenzice D.N (1961) Kurdish Dialeet studies I London: OXFord uniresity Press.

(7) McCarus (1958) A Kurdish Grammar washington: Washington Plandograph Company

(8) Quirk etal, (1974) A Concise Grammarof Contemporory English, New York :Horceurt Brace Jovanovich. Chapter 5.

(9)Soane. y. B. (1913) Gvammar of the Kurmanji cork urdish Longuage. London.

(10) Christopherson, P. and Sandved A. O. (1971) Ar advanced English Grammar, London: Lowe and Brydone

# بعض الملاحظات عن الصفة في اللغة الكردية

محمد معروف فتاح

تناول البحث موضع الصفة في اللغة الكردية ويناقش مسألة في غاية الأهمية وهي أن اللغة الكردية بخلاف الاراء السائدة حالياً ليست لغة وصفية ولا هي من اللغات التي تجنّد الصفة أصلاً وأن الصفة منها لا تشكل جزءاً مهماً من أقسام الكلام بل يمكن ويصح اعتبارها صنفاً من الاسماء حيث أنها أقرب الى الأخير من النواحي التركيبية والنحوية والدلالية.

ومن أجل الكشف عن بعض حقائق جديدة عن الظاهرة ودحض بعض الأفكار التقليدية السائدة عنها ثم تقسيم البحث الى ستة اجزاء ويستعرض الباحث في المقدمة الأسس المتبعة في تقسيم الكلام في اللغات عامة فيميز بين الاقسام الرئيسة للكلام (الاسم والفعل مثلاً) والاقسام غير الرئيسة (الحروف مثلاً) ويؤكد أن الصفة الكردية تنتمي الى الصنف الأخير. ويحاول الباحث في الجزء الثاني تحديد مفهوم الصفة لتنقيته من الشوائب التي كثيراً ما تعلق بها ويتوصل الى ضرورة تميز الصفة عن العناصر اللغوية التي تعمل عملها في النحو (كالفعل والاسم مثلاً) كما نميز حالياً في دراساتنا بين الظرف والظرفية والفعل والفعلية... الخ ويؤكد مرة أخرى على أن الاساس في تصنيف العناصر اللغوية يجب أن يبني على نظرية المورفيم وأن العناصر المستقلة (الكلمات البسيطة) فقط يمكن أن تضف الى اقسام الكلام. وطبقاً للاسس الجديدة في تميز الصفة التي يتوصل اليها الباحث في الجزء الثاني فان الصفة الكردية تتقلص الى حجمها الطبيعي التي تشكل جزءاً صغيراً من العناصر اللغوية الكردية على العكس من الاسماء والافعال التي تتبوء مكاناً مهماً في اللغة نفسها، وتشبه الصفة في هذا المجال الظروف والحروف. ويقدم الباحث في الجزء الثالث من بحثه تصنيفاً جديداً للصفة مبنية على الناحية الدلالية فيميز بين الصفات الدالة على المظهر والحجم واللون بيناً أن هذه الأصناف تتباين من الناحية الصرفية والدلالية والنحوية.

وهنا يتوصل الباحث الى ملاحظة أخرى تخالف الاراء السابقة وهي أن هناك نسقاً معيناً في تتابع الصفات في اللغة الكردية، حيث أن صفات اللون تسبق صفات الحجوم والحجوم تسبق الصفات الدالة على المظاهر وأن عامل «الطول» (عدد المقاطع) قد تعرقل هذا التتابع. وفي الجزء الرابع يتطرق الباحث الى مكانة الصفة في اللغة الكردية مؤكداً أن الصفة من الاقسام المقيدة شأنها في ذلك الظروف والحروف وأنها لاتعدو كونها صنفاً من الاسماء ويأتي بشواهد وبراهين عديدة لتأكيد رأيه. في الجزء الخامس يقدم البحث تصنيفاً عاماً للغات، فيميز اللغة الوصفية عن اللغة الفعلية مؤكداً بأن اللغة الكردية تنتمي الى اللغات التي تحتل وسطاً بين هذين الصنفين وأنّها أقرب الى لغة فعلية أكثر من الوصفية.

ويقدم الباحث في الختام ملخصاً بأهم الملاحظات التي يتوصل اليه عن الصفة وهي ملاحظات أصلية تطرح للمرة الأولى وتختلف في مجملها عن الاراء السائدة التي طرحت عن الموضوع في العقدين الأخيرين.

# ئاوەڵکردار لە ڕووی واتاوە

د. عبدالرحمن حاجی معروف
بەشی کوردی ـ کۆلێجی پەروەردە
زانکۆی بەغدا

لە کتێبی «مختصر صرف و نحوی کوردی»ی مامۆستا سەعید صدقی کابان . (ئاوەڵکردار)یش وەك (ژمارە) لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا باس کراوە و بە جۆرێك لە جۆرەکانی ناو دانراوە. وێڕای ئەوەش، سەرپاکی ئەو باسەی لەو بەرهەمەدا پێوەندی بەو کێشەیەوە هەیە، بریتییە لە چەند دێڕێك لەبارەی (ناوی کات)و (ناوی شوێن)ەوە، کە تێید وتراوە:

«ئیسم دوو قیسمە: ۱ ـ ئیسمی زەمان، ۲ ـ ئیسمی مەکان.

ئیسمی زەمان ـ ئیسمێکە مەعنای زەمانی تێدا بێ، یەعنی دەلالەت لە زەمان بکا. وەکو: شەو، ڕۆژ، سەعات، دەقیقە، دوێنێ، پێری، وەقت، مانگ، سال، پار، پێرار . . .

ئیسمی مەکان ئیسمێکە دەلالەت لە مەکان بکا. وەکو: سەر، ژێر، پێش، پشت، تەنیشت، دوور، نزیك، ئێرە، ئەوێ، لا، ناو. . .» (ل۲٤).

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە کتێبی «ڕێزمانی کوردی»دا (٢) ئاوەڵکرداری بە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ داناوە و لە ڕووی واتاوە شەش جۆری دیاریکردووە:

١ ـ ئاوەڵکرداری کات ـ ئەو (ئاوەڵکاری تافی)ی پێ وتووە (ل ١٨٧ ـ ١٨٨).

٢ ـ ئاوەڵکرداری شوێن ـ ئەو (ئاوەڵکاری شوێنی)ی ناوناوە (ل ١٨٨).

٣ ـ ئاوەڵکرداری چەندێتی ـ ئەو (ئاوەڵکاری چەندی)ی پێوتووە (ل١٨٩).

٤ ـ ئاوەڵکرداری چۆنێتی ـ ئەو (ئاوەڵکاری ئاوەڵناوی)ی پێوتووە (ل١٨٩ ـ ١٩٠).

٥ ـ ئاوەڵکرداری نەفی ـ ئەو (ئاوەڵکاری نەفی)ی پێوتووە (ل١٩٠ ـ ١٩١).

٦ ـ ئاوەڵکرداری وەرام ـ ئەو (ئاوەڵکاری وەرامی)ی ناوناوە (ل١٩١ ـ ١٩٢).

لە کتێبی «ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی»ی مامۆستا جگەرخوێن دا[٣] لە باسی بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا باسی (ناوی کات)و (ناوی شوێن) کراوە (ل٢١ ـ ٢٢). لە لاپەرە (٥٥)یشدا چەند دێرێك دەربارەی (حال) بەرچاو دەکەوێ.

لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد نۆ جۆر ئاوەڵکرداری جیاکردووەتەوە:

١ ـ ئاوەڵکاری چۆنێتی
ـ ئاوەڵکاری زەمانی
٣ ـ ئاوەڵکاری شوێنی
٤ ـ ئاوەڵکاری وەسفی
٥ ـ ئاوەڵکاری تەرتیبی
٦ ـ ئاوەڵکاری تەئکیدی
٧ ـ ئاوەڵکاری تەکراری
٨ ـ ئاوەڵکاری نەفی
٩ ـ ئاوەڵکاری پرسیاری[٤]

د. چەرکەزی بەکۆ لە کتێبی «زمانی کوردەکانی سۆڤێت»دا لەرووی واتاوە بایەخی بە چوار جۆری سەرەکیی ئاوەڵکردار: (١ـ چۆنێتی؛ ٢ ـ چەندێتی؛ ٣ ـ کات؛ ٤ ـ شوێن) داوە.[٥]

مەکارۆس لە باسی وشەی یاریدەدەردا لە دوا لێکۆڵینەوەی پێشبەند لە لاپەرە (٧٨ ـ ٧٩)دا لە ئاوەڵکردار دواوە.[٦] لە سەرەتادا لەرووی واتاوە چوار جۆر ئاوەڵکردار: (١ ـ کات؛ ٢ ـ شوێن؛ ٣ ـ چۆنێتی؛ ٤ ـ چەندێتی)ی دیاری کردووە (ل٧٨). . . دواتر بۆ ئاوەڵکرداری کات وشەکانی (دەم دەم، دەرحاڵ، دووسبەی، دوایی، دوێنێ، ئێستا، هێشتا، ئیمرۆ/ ئەمرۆ، ئەمساڵ، ئەمشەو، پار، پێرار، پاشەڕۆژ، سبەی/ سبحەینێ، یەکسەر)و بۆ ئاوەڵکرداری چۆنێتی وشەکانی (پێکەوە، وا، خاسەتەن، ئنجا)و بۆ ئاوەڵکرداری شوێن وشەکانی (ئێرە، ئەوێ)و بۆ ئاوەڵکرداری چەندێتی وشەکانی (چەند/ چەن، گەلێ (ك)، هەموو، هەندێ (ك)، هەر، هیچ، نەختێ (ك)، زۆر)ی کردووە بە نموونە.

* *

*

لە بەرایی نیشاندانی ئەوەی چی دەربارەی «ئاوەڵکردار لە ڕووی واتاوە نووسراوە، دەگەینە ئەو سەرنج و ئەنجامانە:

١ ـ هەندێ لە نووسەران ئاوەڵکرداریان لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ناودا باس کردووە، وەك: سەعید صدقی کابان، جگەرخوێن. . . برێکیش لە باسی وشەی یاریدەدەردا لێی دواون، وەك: مەکارۆس. . . زووربەی زۆریش مامەڵەی بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیان لەگەڵ کردووە، وەك: نووری عەلی ئەمین، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، د. چەرکەزی بەکۆ.

٢ ـ زووربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە ڕووی واتاو چۆنێتی بەکارهێنانەوە لە ئاوەڵکردار نەدواون، وەك: تۆفیق وەهبی، محەمەد ئەمین هەورامانی، د. ر. ل. تسابۆلۆڤ، د. زاری یووسف. . . وگەلێکی دی. ئەو بەشەی کەمەش کە لێی دواون جیاوازییەکی زۆر لە دابەش کردنەکانیاندا بەدی دەکرێ. بۆ نموونە مامۆستا نووری عەلی ئەمین شەش جۆری دیاری کردووە: (١ ـ کات؛ ٢ ـ شوێن؛ ٣ ـ چەندێتی؛ ٤ ـ چۆنێتی؛ ٥ ـ نەفی؛ ٦ ـ وەرام). لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد نۆ چەشنی یادداشت کردووە: (١ ـ چۆنێتی؛ ٢ ـ کات، ٣ ـ شوێن؛ ٤ ـ وەسفی؛ ٥ ـ تەرتیبی؛ ٦ ـ تەئکیدی؛ ٧ ـ دووبارەکردنەوە؛ ٨ ـ نەفی؛ ٩ ـ پرسیار). . . لەگەڵ ئەوەدا، کە هەندێ جۆری دیارو گرنگی ئاوەڵکردار دیاری نەکراوە، وەك: (ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێ بەجێ بوون؛ ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست. . .)، کەچی چەند جۆرێکی ئەوتۆ جیاکراوەتەوە، وەك: (ئاوەڵکرداری پرسیار؛ ئاوەڵکرداری وەرام. . .)، کە بە هیچ چەشنێك لەگەڵ هەڵکەوتی زمانی کوردیدا ناگونجێن.

٣ ـ هەندێ ئاوەڵکردار خراونەتە نێو جۆرێك ئاوەڵکردارەوە، کەچی سەر بە جۆرێکی دین. بۆ نموونە، مامۆستا نووری عەلی ئەمین ئاوەڵکرداری (پشتاوپشت. . . پشەوپاش. . .)ی بە ئاوەڵکرداری شوێن داناوە، بەلام لە ڕاستیدا ئاوەڵکرداری چۆنێتین. . . ئاوەڵکرداری (زۆر، کەم، فرە، گەلێك، نەختێ. . .) ئاوەڵکرداری چەندێتین و خستوونییە پاڵ ئاوەڵکرداری وەسفی. . . یاخود (هەمیشە)، کە ئاوەڵکرداری کاتە

لەگەڵ ئاوەڵکرداری چەندێتیدا دایناوە . . .

٤ ـ زۆر وشە ئاوەڵکردار نین و بە ئاوەڵکردار لە قەڵەم دراون ، بە وێنە وشـەکـانی (بـەهار . . . زستان . . . شـەو . . . ڕۆژ . . . ساڵ . . . سەدە . . . ) ، کە ناون مامۆستا نووری عەلی ئەمین بە ئاوەڵکرداری دانـاون . . . هەروەهـا ئامـرازی نەفی (نـا ، نە . . . )شی هەر بە ئاوەڵکـردار لەقـەڵـەم داوە . . . مامـۆسـتـا جگـەرخـوێن ، نەك هەر وشەکانی (شەڤ . . . ساڵ . . . ڕۆژ . . . ) ، کە ناون و (سێیەك ، چارێـك . . . ) ، کە ژمـارەن وەك ئاوەڵکـردار تەماشاکردووە ، بەڵکو هەنـدێ پاشـگـریـشـی : (ـ گە ، ـ لان ، ـ سـتـان . . . ) هەر بە ئاوەڵکـردار دانـاوە . . . لیـژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ئامـرازی پرسیـاری : (کەی ، چۆن ، لەکوێ ، چەند . . . ) بە ئاوەڵکـرداری پرسیـاری ناوبـردووە . . . کەچی بەپێچەوانەوە گەلێ وشـە و دەستەواژە ، کە ڕوون و ئاشکرا ئاوەڵکردارن ، نە ناوبراون و نە یادداشت کراون .

٥ ـ لە زمـانی کوردیـدا شتێـك نی یـە بە (ئاوەڵکرداری پرسیار)و (ئـاوەڵکـرداری وەرام) دابنـرێن . . . ڕاستـە جۆرە ئاوەڵکردارێك بە نێـوی (ئـاوەڵکـرداری نەفی)یـەوە هەیـە و وشـەودەستـەواژەی وەك (هـەرگیـز ، هەرگیـزاو هەرگیـز ، بەهیچ جۆرێ . . . ) دەگرێتە خۆ ، بەڵام نەك ئەو ئامرازی نەفی‌یانەی هەندێ نووسەر کردوویانەتە نموونە .

لە لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردیدا بۆ بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵکردار بە زۆری دوو دەستە وشـە بەدی دەکـەین . دەسـتـەی یەکـەم ، وشەی وەك : (ئێستـا ، ئەمـرۆ ، دوێنێ ، سـەنە ، هاوینێ ، پار . . . ئێرە ، لێـرە ، لەوێ ، لەژێر ، لەسەر . . . ) . . . دەستەی دووەمیش ، وەك : (خـێـرا ، هێـدی ، باش ، خراپ ، لەســەرخــۆ . . . زۆر ، فرە ، کەم . . . ) . . . بەپێی تایبـەتێتی واتـا دەکـرێ دەستەی یەکەم ناوی (ئــاوەڵکــرداری بارودۆخ) وەرگــرێ و دەستــەی دووەمیش ناوی (ئـاوەڵکـرداری دیـارخـەر)ی لێ بنرێ . بەڵام بەراودکردنی ئەو دوو دەستـە وشـەیـە ـ (ئاوەڵکرداری بارودۆخ)و (ئاوەڵکرداری دیارخەر) ئەوەمـان بۆ ئاشکـرا دەکـا ، کە لە نێـوانیـاندا جیاوازی هەیەو وا دێتە پێش چاو ، ئەو وشـانـەی لە نێـو بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵکرداردا خریان دەکەینەوە وشەی هەمەچەشن بن .

باس لەوەیـە وشـەکـانی (ئێستـا ، ئەمرۆ . . . ئێرە ، لێرە . . . )ی دەستـەی یەکـەم و وشەکانی (خێرا ، هێدی . . . زۆر ، فرە . . . )ی دەستـەی دووەم چ لە ڕووی واتـانـاسی و چ لە ڕووی ڕێـزمـان (وشەسازی و ڕستەسازی)یەوە لەیەك دوورن .

وشـەکـانی دەسـتـەی (ئێسـتـا . . . ) واتای بارودۆخی ڕووداوێك دەردەبـڕن و بە هیـچ چەشنێـك خاسیـەت و چۆنێتی ڕووداوەکـە ڕانـاگـەیەنن و دەربارەی نیشانەکانی هیچ نالێن . بەوێنە کە دەوترێ (ئـەو لێـرە دەژی) ، دیـارە وشەی (لێرە) پەنجە بۆ شوێنی ڕووداوەکە ڕادەکێشێ . یاخـود ئەگـەر بڵێین (دوێنێ چووم بۆ سلێمـانی) ، ئەوە وشەی (دوێنێ) کاتی ڕوودانەکە دیاری‌دەکا .

وشـەی دەسـتـەی (خێرا . . . ) ، بەپێچەوانەوە بارودۆخی ڕووداو ڕانـاگـەیـەنێ . پەنجـە نە بۆ شوێن ، نە بۆکات ڕانـاکێشێ ، بەڵکـو خاسیـەتی چۆنێتی ڕووداوەکـە نیشان دەدا . بۆ نموونە وشەی (زۆر) لە ڕستەی «ئەو زۆر پێکەنی»دا خاسیەتی چۆنێتی ڕووداوەکە دیاری دەکـا و جیـاوازی لەگـەڵ ئاوەڵکـرداری (لێـرە) ـ «ئەو لێرە دەژی»دا زۆرە ، کە بەتەواوی بە خەتێکی دی‌دا دەڕوا .

لەڕووی دەوری ڕستەسازی‌یشەوە ، وشەکانی دەستەی (ئێستاو وشەکانی دەستەی (خێرا) وێك ناچن .

وشـەکـانی دەسـتـەی یەکـەم لە ڕواڵـەتیـانـدا دیـارە ، کە هیـچ پێـوەنـدییان بە جۆری ڕوودانەکەوە نی‌یە و بەتایبەتی بەو بارودۆخەوە کە تێیـدا ڕوودەدا . وشـەکانی دەستەی یەکەم وەك بارودوخ (کات ، شوێن . . . ) خۆیـان دەنـوێنن و هەر لە بینینی ئەودەورەشـەوەیـە بە (بـارودۆخ) ناویـان دەبـەین . جا بۆیـە لەبـاری ڕستەسازی‌یەوە لەو ناوانـە نزیـك دەبنـەوە ، کە لە ناوەڕۆکیاندا واتای حاڵ هەیە . بەوێنە (ئەو لێرە دەژی)و (ئەو لە شار دەژی) . . .

ئەم وشانە کە ڕواڵەتیان هیچ پێوەندییەکی بە ڕووداوەوە نی‌یە ، بە کردارەوە نالکێن و لە گەڵیـدا دەستـەواژەیـەکی وا پێـك ناهێـنن ، کە دیوی ناوەوەیان پتەو پێکەوە بەند بن

هەرچـی وشـەکـانـی دەسـتـەی (خـێـرا . . . )ن لە بواری ڕستـەسـازی‌دا بە شێـوەیـەکی دی خۆیـان دەنـوێنن ـ واتە هەمیشە دەوری ڕوونکـردنـەوەی شێـوەی حاڵـەتی ڕوودان دەبینن ، کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ (بارودۆخ)ەکانی دی ڕستە (کات ، شوێن . . . )دا جیاوازن .

نیشـانـدانی ڕووداو لەڕووی چۆنێتی‌یـەوە ، دەبێتـە هۆی پێکەوە بەستنی ئەو ئاوەڵکـردارانـە بە کردارەوە و پێکهێنـانی دەستـەواژەی وەسفی لێـیـان . لەم بارەدا پێـوەنـدی ئاوەڵکـردار بە کردارەوە ، وەك پێوەندی ئاوەڵناو بە ناوی دیارخراوەوە وایە . بەوێنە (ئەو زۆر دەنوێ) ـ (نوستنی زۆر) ؛ (ئەوان شێرانە دەمرن) ـ (مردنی شێرانە) .

لەبەر ئەوەی ئاوەڵکرداری دیارخەر خاسیەتی چۆنیی نیشان دەدا، بۆیە مەرج نی یە هەر چۆنێتی ڕووداو ڕابگەیەنێ، بەڵکو دەشێ پەنجە بۆ چۆنێتی خاسیەتی شتی دیش ڕابکێشێ. بۆ نموونە ئاوەڵکرداری جۆری (خێرا . . .) دەتوانێ لەگەڵ ئاوەڵناویشدا یەك بکەوێ، بەوچەشنەی کە ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا یەك دەکەوێ. وەك (زۆر جوانن) - (جوانی زۆر) . . . ئەگەرچی بەگشتی ئەوجۆرە دەستەواژانەی لە ئەنجامی یەك کەوتنی ئاوەڵکردار و ئاوەڵناوێك دێن، سنووری بەکارهێنانیان تەسکەو گەلێ جاریش لەڕووی شێوازەوە لەبار نین.

ئەو دوو دەستە وشەیە لە ڕووی وشەسازیشەوە هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە . . . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا دەستەی یەکەم بەسەر مۆرفیمدا دابەش ناکرێن و پێوەندیی هەمیشەییان بە وشەی بەشە ئاخاوتنی دییەوە نی یە. ئەگەرچی بەپێی خاسیەتی پێکهاتنی وشەسازییان دەشێ لە گرووپی دیاریکراودا یەك بگرن، بەڵام ئەو گرووپانە تەنیا لەناو ئاوەڵکردار خۆیدا دابەش دەبن . . . بەڵێ لە هەندێ حاڵەتدا وا دێتە پێش چاو کە دەشێ بۆبەرانبەر ڕاگرتنی ئاوەڵکردارێك لە بەشە ئاخاوتنێکی دییەوە وشە بهێنرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو پێوەندییە ئەگەر هەشبێ یەکجار لاوازە . . .[1] ئەمە لە زمانی ئینگلیزیدا بەوچەشنەیە، ئەگینا لە زمانی کوردیدا چ (ئاوەڵکرداری بارودۆخ) و چ (ئاوەڵکرداری دیارخەر) سادە و ناسادەیان هەیە و پێوەندییان بە بەشە ئاخاوتنی دیشەوە هەیە و زۆربەیان لە ناوەوە وەرگیراون.

هەرچی وشەکانی دەستەی دووەمن، پێکهاتنی وشەسازییان چۆن لە زمانی کوردیدا، بەهەمان شێوە لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە و لە بنەمای هەموویاندا ئاوەڵناو هەیە - واتە ئەم ئاەڵکردارانە لە ڕووی وشەسازییەوە پێوەندیی پتەویان بە ئاوەڵناوەوە هەیە و لەسەر بناغەی ئاوەڵناو ڕۆنراون.

ئاوەڵکرداری دیارخەر جگە لەو ڕوونی و ئاشکرایی یەی لە پێکهاتنی وشەسازیدا هەیەتی، هەروەها لە ڕووی زۆری و چالاکی بەکارهێنانیشی یەوە لە ئاوەڵکرداری بارودۆخ جیادەبێتەوە، چونکە وەك ئاشکرایە، نزیکەی هەموو ئاوەڵناوێك دەشێ وەك ئاوەڵکردار بەکاربهێنرێ. هەر لەبەر ئەو هۆیەشە، کە لە ئاوڵکرداری دیارخەردا ڕەنگ دانەوەی خاسیەت و تایبەتێتی یەکانی ئاوەڵناو هەیە. بەوێنە لە ڕووی ڕستەسازی یەوە، ئاوەڵناو چۆن دەبێ بە دیارخەری ناو، ئاوەڵکرداریش بە هەمان شێوە دەبێ بە دیارخەری کردار . . . لە ڕووی مۆرفۆلۆژی یشەوە ئاوەڵکردار وەك ئاوەڵناو دەتوانێ نیشانەی پلەی بەراورد و پلەی باڵا وەربگرێ . . .

وێکچوونی «ئاوەڵکرداری چۆنێتی» لەگەڵ ئاوەڵناودا لەڕووی واتا و وشەسازی و ڕستەسازییەوە، پرسیارێك دێنێتە گۆڕێ: ڕەنگە «ئاوەڵکرداری چۆنێتی» دەستەیەك وشەی سەربەخۆ نەبن و تەنیا فۆرمی ڕێزمانیی ئاوەڵکردار بن، لە بارێکدا کە ئاوەڵناوەکە وەسفی ناوێك نەکا، بەڵکو وەسفی کردارێك یان ئاوەڵناوێکی دی بکات؟.

ئەگەر ئەم بۆچوونە وەربگیرێ، ئەوە دەبێ ددان بەوەدا بنرێ، کە لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناو وەك بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن دوو فۆرمی هەبێ: ١ - فۆرمی ئاوەڵناوی - واتە لە بارێکدا کە دەبێتە دیارخەری ناو یان جێناو؛ ٢ - فۆرمی ئاوەڵکرداری - واتە لە بارێکدا کە دەبێتە دیارخەری ناو یان جێناو؛ ٢ - فۆرمی ئاوەڵکرداری - واتە لە کاتێکدا کە دەوری دەرخستنی کردار یان ئاوەڵناو دەبینن . . .

بەوپێی یە دەبێ لە زمانی کوردیدا بۆ دەرخستنی ناو و ئاوەڵناو و کردار یەك بەشە ئاخاوتن هەبێ، کە ئەو بەشە ئاخاوتنەش ئاوەڵناوە . . . هەروەها دەبێ ئاوەڵکرداری دیارخەریش لە ڕیزی ئاوەڵکردار لاببرێ. بێتو ئەمە وەربگیرێ، ئەوسا دەبێ جگە لە بوونی تایبەتێتی پلەی بەراورد، هەروەها گێڕانی دەوری ئاوەڵکرداری یش دابنرێ و بەمانە لە بەشە ئاخاوتنی ناو و بەشە ئاخاوتنەکانی دی جیابکرێتەوە.

لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی هەندێ جیاوازی لە نێوان (ئاوەڵکرداری بارودۆخ) و (ئاوەڵکرداری دیارخەر)دا هەیە،[2] بەڵام یەکێتی پتەوی دەور و ئەرکیان شایەتی ئەوە دەدەن لە نێو یەك بەشە ئاخاوتندا دابنرێن، کە ئەو بەشە ئاخاوتنەش (ئاوەڵکردار)ە.

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵکردار لە ڕووی واتاوە بەسەر دوو دەستەی سەرەکی دا دابەش دەبێ:

یەکەم - ئاوەڵکرداری دیارخەر

دووەم - ئاوەڵکرداری بارودۆخ

## - ١ -
## ئاوەڵکرداری دیارخەر

ئاوەڵکرداری دیارخەر خاسیەتی ڕووداو، یان نیشانەی چۆنێتی و چەندێتی، یان جۆری بەجێ هێنان ڕادەگەیەنێ و دەتوانی سێ جۆری لێ دیاری بکرێ:

١ ـ **ئاوەڵکرداری چۆنێتی:**

ئاوەڵکرداری چۆنێتی واتای چۆنێتی ڕووداو یان دەلالەت نیشان دەدا. وەك:

خێـرا، هێـدی، هێمن، جوانْ، باش، خراپ... بەژیـری بەسـواری، بەگـورجی، بەخـۆشی، بەپـەلە، بەگوڕ، بەکوڵ... لەسـەرخـۆ، لەسـەرلا، لەسەرسنگ، لەسەرپشت... بانەوبان، شاخەوشاخ... ڕند، خراپ، تەمز، ئارام...

چەند نموونەیەك:

ورد ـ

به باغچەی پاشادا ورد گەڕام، خوارو ژوور،
زەرد هەبوو، بۆم چنیت؛ چنگە نەکەوت گوڵی سوور.

(گۆران، ل١٧)

بەخۆشی ـ

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە

(پیرەمێرد، ل١١٩)

ڕند ـ

هەردوو ماعـرا گوهداری خەبەردانا وان دکرن؛ وانا ڕند بهیست چ گلی عەلی مەمەد گلی کر.

(کوردۆ، ل٣٨)

دەبینین وشـەکـانی (خێـرا، هێـدی، جوان... بەپـەلـە... لەسەرخۆ... لەسەرسنگ... بانەوبان... ڕند...) ڕووداو لە ڕووی چۆنێتی‌یـەوە دیـاری‌دەکـەن. ئەم جۆرە ئاوەڵکـردارانـە لە دیـالێکتی کرمـانجی خواروودا وەڵامی پرسیـاری (چـۆن؟)ـ[٩] (چـلۆن؟، کوو؟)و لە دیـالـێـکتی کرمـانجی ژوورروودا وەڵامی پرسیاری (چەوا؟، چاوا؟) دەدەنەوە.

ئەگـەرچی بەشێکی زۆری ئاوەڵکـرداری چۆنێتی لە بنـەڕەتـدا ئاوەڵـنـاون، وەك (خـێـرا، هێـدی، هێـمـن، جوان، باش، خراپ... لەسـەرخـۆ... بەپـەلـە... ڕنـد...)، بەڵام کاتێ چۆنێتی کردارەکـە دیـاردەخـەن، وەك: (شـەمـاڵ خێـرا دەنوسێ؛ نەسـرین هێـدی دەڕوات؛ لانـە جوان دانیشتـووە...) دەبنـە ئاوەڵکـردار. هەر لەبـەر ئەوەشـە، ئەو جۆرە وشـانـە تەنیا لە ڕستەدا دەردەکەون، کە سەر بە چ بەشە ئاخاوتنێکن.

٢ ـ **ئاوەڵکرداری چەندێتی:**

ئاوەڵکـرداری چەنـدێتی، چەنـدێتی ڕووداو، ڕادەی توونـدیی ڕووداو، ئەنـدازەی چەنـدێتی ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار دیاری دەکا و لە دیـالێکی کرمـانجی خواروودا وەڵامی برسیاری (چەند؟)؛ (کەم؟ یان زۆر؟)، (تـاچ ڕادەیـەك؟)... و لە دیـالێکتی کرمـانجی ژوورروودا وەڵامی پرسیاری (چقا؟)؛ (چقاس؟) دەداتەوە.

أ) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بەهێز بوون:

زۆر، فرە، گەلێ/ گەلێك، یەکجار، تەواو... پڕ... گەلەك...

زۆر ـ

منیش چونکە بە عومری خۆم ئەحواڵی وام نەدیبوو، زۆر ئەترسام.

(لەخەوما، ل٣٠)

دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە
ناحەزی ڕووڕەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕێ

(بێکەس، ل٨٣)

گەلێ ـ

لە گەرووی شمشاڵ، لە تەلی کەمان
گەلێ هەڵساوە ئاوازی جوان جوان

(گۆران، ل١٠)

گەلەك ـ

مەمێ تاخم عەجباند گەلەك خەلاتێن باش دانە
سەراجانە تاقم گشکی خەملاندینۆب چینانە

(مەمێ ئالان، ل٤٥)

ب) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بێ‌هێزبوون:

کەم/ کەمێ/ کەمێـك، پچێـك، نەختێ/ نەختـەك، تۆزێ/ تۆزێك... کێم...

کەمێ ـ

توخوا ئاوەکەی بۆن گوڵاوەکە
بۆ سەرچاوەکە کەمێ لاوەکە

(پیرەمێرد، ل١٢٥)

نەختێ ـ

بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان کە
دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە

(بێکەس، ل١٥٢)

ئاوەڵـکـرداری شوێـن، شوێـنی ڕووداوی کارێـك یان ڕووی بزووتنەوەی شتێك نیشان دەدا و وەڵامی پرسیاری (لە کوێ؟)[١٨] لە [١٩]

کوێنـدەرێ؟..)؛ (بـۆکوێ؟)؛ (لـە کوێـوە؟) دەداتـەوە. لە دیـالێکتی کرمـانجیی ژووروو‌شـدا پرسیـارەکـە (ل کوی؟)؛ (کویدا؟)؛ (ژ کوی؟)... یە. وەك:

سەر، ژێر، خوار، بن، کن، پاش، پێش،[20] ناو/ نێو، دەر، بەر، تەنیشت، چەپ، ڕاست... لەسـەر، لەژێـر، لەخـوار، لەبن... لە سەرەوە، لە ژێرەوە، لە خوارەوە، لە بنەوە، لە پێشەوە، لەنـاوەوە، لە ڕاستـەوە، لەچـەپـەوە... بۆلای سەرەوە، بۆلای ڕاست، بۆلای چەپ... ئێـرە،[21] ئەوێ، لێـرە، لەوێ،[22] لێرەوە، لەوێوە[23]... تا ئێرە، تا ئەوێ... لە هەموولا، لە هیچ کوێ... نك/کـن، ژ خارێ، ل خارێ، دنـاف، ژێـرێ، ژ ووری، بنرا، ڤرا، دوورڤا...

لەژێر، لەپاڵ ـ

لەژێر ئاسمانی شینا،
لەپاڵ لوتکەی بەفرینا،
کوردستان گەرام،
دۆڵاودۆڵ پێوام
(گۆران، ل28)

لەنێو ـ

جۆشش و تابە لەنێو دیدەیی گریانمدا
چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی طۆفانمدا
(نالی، ل89)

لەوێ ـ

... لەوێ بەچەند پلیکانەیەکدا سەریان خستم
(لە خەوما، ل41)

ل نك ـ

میری و پادشاهی موویەك ل نك مەلایی
نادەم ب مولکێ عالەم یەك ذەررەیەك عنایەت
(جزیری، ل151)

لڤر، ناف ـ

مێرکی گوتێ: دێ لڤر بە حورمەت هەرم ناف باژێر
(خالید حسین، ل8)

بەشێکی ئەم ئاوەڵکردارانـەش. وەك (سەر، ژێر، ناو، پێش، پاش، چەپ، ڕاست...) لەبنەڕەتدا ناوی شوێنن و دەمێك دەبن بە ئاوەڵکرداری شوێن، کە جێگەی ڕوودانی کردارەکە دیاری بکەن.[24]

**٣ ـ ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست:**

ئاوەڵـکـرداری هۆ و مەبـەست پەنجـە بۆ هۆی ڕوودانـەکـە ڕادەکێشێ و مەبـەستی بەجێ هێنـانی کارێـك دەردەخـا و وەڵامی پرسیـاری (بـۆچی؟)؛ (لـەبـەرچی؟)؛ (ب چ مەبەستێك؟)... دەداتەوە. وەك:

لە بێ ئەقڵیدا، لە توورەییدا، لەتـرسـا، لەبـرسا، لەخۆشیدا بەخۆرایی، لەبەر ئەوەی، چونکە، بە دەم خەوەوە... لەداخا، لە قینا، بە ئەنقەست...

چونکە ـ

هیچ گوێ نادەیتە دەردو ئاواتم
چونکە ئەیزانی بێ دەسەڵاتم
(بێ کەس، ل76)

**٤ ـ ئاوەڵکرداری تەئکیدی:**

ئەم جۆرە ئاوەڵکـردارە تەئکیـد کردنـە سەر بەجێ هێنانی کارێك نیشان دەدا. وەك:

هەڵبەت، هەر...، بێ گومان، /بێ سێ و دوو/، بێ چەندوچوون...

هەڵبەت ـ

وتیان نابێ، هەڵبەت ئەمە شتێکی لەژێر سەردا هەیە.
(لە خەوما، ل33)

... ئەو تۆزە پر و پیتەیشیان کە ماوە هەڵبەت بردوویانە.
(لە خەوما، ل36)

**٥ ـ ئاوەڵکرداری دووبارەکردنەوە:**

ئاوەڵـکـرداری دووبـارەکـردنـەوە پەنجـە بۆ دووپـات بوونـەوەی ڕوودانەکە ڕادەکێشێ. وەك:

دووبـارە، دیـسـان، سەرلـەنـوێ، جارێکی دی/ جارێکی تـر، هەرجارە/ هەرجارێ/ هەرجارێك/ هەرجارەکی... ئەمجارەش...

دیـسان ـ

بولبولی طەبعم ئەوا دیسان ئەنا خوانی دەکا
نوکتە سەنجی و، بەذلە گۆیی و، عەنبەر ئەفشانی دەکا
(نالی، ل101)

ئەمجارەش ـ

... دواجـار سەیـرم کرد، گەورەم ئەمجـارەش بە دەنگێکی بەرزەوە وتی...

سەرلەنوێ ـ

تازە سەوزەگیا سەرلەنوێ ئەڕوێ
مەل لە ماجەرای عەیش ونۆش ئەدوێ
(گۆران، ل١٦٨)

**٦ ـ ئاوەڵکرداری نەفی:**

ئەم جۆرە ئاوەڵکـــردارانــە نەفی کردارەکــە ڕادەگــەیــەنن. وەك: هەرگیــز، هەرگیــزاو هەرگیز، بە هیچ جۆرێ، بە هیچ چەشنێ، بە هیچ شێوەیەك، بە هیچ ڕەنگێ، بە هیچ کلۆجێ...

هەرگیز ـ

عاجز مەبە هەرگیز لە درۆ و ئیفکی حەسوودان
دونیایە، دەبێ سەگ بووەرێ، شیعەبکا سەب
(نالی، ل١٣٤)

هەرگیزاو هەرگیز ـ

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکی‌یە بێ برەی ئاریز
(گۆران، ل١٠)

هەندێ وشە و دەستەواژە چۆن لە دەستەی ئاوەڵکرداری دیارخەر دادەنرێن، هەر بەو چەشنە دەشێ بخرێنە نێو دەستەی ئاوەڵکرداری بارودۆخیشەوە.

بۆ نمـوونـە (زوو، یەکسەر، دەست بەجێ، درەنگ...) چۆن پەنجـە بۆ چۆنێتی ڕوودان ڕادەکێشن، بە هەمـــان چەشن دەتـوانن کاتی بەجێ هێنانی کارێك نیشان بدەن. واتە دەشێ «ئاوەڵکرداری چۆنێتی»و «ئاوەڵکرداری کات» بن.

ئاوەڵکرداری وەك: (بەخۆرایی، بە دەم خەوەوە، بە ئەنقەست، لەترسـا، لەبرسـا...) چۆن دەشێ هۆ و مەبەست نیشان بدەن و سەر بە دەستـەی گەورەی (ئـاوەڵکـرداری بارودۆخ) بن، هەروەهـا مانـای چۆنێتی‌یشیـان تێدایە و چۆنێتی ڕوودانیش ڕادەگەیەنن، بۆیە دەلوێ لە دەستەی گەورەی (ئاوەڵکرداری دیارخەر)یش دابنرێن.

ئاوەڵکـرداری (دوور، لەدوور، لە دوورەوە[٢٥]... نزیك[٢٦]، لە نزیـك، لە نزیکـەوە...) لەگـەڵ ئەوەشـدا کە واتـای ئەندازە و پێــوانــەیـان تێـدایـە، بەڵام بە شێـوەیێکی سەرەکی وەسفی کردار دەکەن و بۆیە ڕاسـت وایە، بەر لە هەر شت بە ئاوەڵکرداری چۆنێتی دابنـرێن... وێـرای ئەو دوو ئەرکـە، هەروەهـا پەنجە بۆ شوێنیش ڕادەکێشێت و بۆیـە هەڵـە نی‌یە، ئەگەر لە تەك ئاوەڵکرداری شوێندا باس بکرێن.

**پەراوێزەکان:**

(١) سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوي کوردی، بەغدا، ١٩٢٨، ل٢٤.

(٢) نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١٨٧ ـ ١٩٢.

(٣) جگەرخوین، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی، بەغدا، ١٩٦١.

(٤) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦، ل٢٩٠ ـ ٢٩٥.

(٥) ج. خ. باکایێف، زمانی کوردەکانی سۆڤیەت، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل٢١٤ ـ ٢١٨.

(6) Ernest N. Maccarus, A Kurdish Grammar, New - Yourk, 1958.

(٧) ئا. ئی. سامیرنیتسکی، وشەسازیی زمانی ئینگلیزی، مۆسکۆ، ١٩٥٩، ل١٧٥.

(٨) شایـانی باسـە، جیاوازی نێوان ئەو دوو دەستە ئاوەڵکردارەی کوردی، زۆر کەمترە لەوەی لە زمانی ئینگلیزی و هەندێ زمانی دی‌دا هەیە.

(٩) بەرانبـەر وشـەی (چـۆن)و هاوواتـاکـانی، لە زمانی بلوچیدا (چۆن)و لە زمانی ئاوێستادا (ئا) هەیە.

(١٠) لە ئاخـاوتنی سلێمـانیـدا (بـە چ تەحرێ؟)و لای کوردەکانی سۆڤیەت (چ تەعر؟؛ ب چ تەحرێ؟)... بەکاردێ:

.... چاوا ئەوی نێچیرا خوە دیتبوو، چاوا گرتبوو، یانی ب چ تەحری کوشتبوو.

(کوردۆ، ل ٣٧)

(١١) لەت لەت.

(١٢) بەرانبەر (پێکەوە)ی کوردی لە ئاوێستادا (هەدە)و لە هیندیی کۆندا (ئیهە، کوهە، سەهە) هاتووە.

(١٣) بۆ (کـەی)و هاوواتـاکـانی لە ئاوێستـادا (دا)و (کـەدە)و (یـەدا) هەیە و لە پشتۆشدا (کلە) دەوترێ.

(١٤) بۆ (ئێستە / ئێستا) لە ئاوێستادا (ئەدا)و (تەدا) هەیە.

(١٥) بۆ (چێشتەنگاو)ی کوردی لە زمانی بلوچیدا (چەشتی) بەکاردێ.

(١٦) بۆ (هەمیشـە)ی کوردی لە ئاوێستادا (همدە) وتراوە.

(١٧) شایانی باسە، لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ئەو ڕاستی‌یەی خستووەتە پێش چاو (بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی، بەغدا، ١٩٧٦، ل٢٩١).

(١٨) بۆ (لـە کوێ)و هاوواتـاکـانی لە ئاوێستادا (دە)و لە زمـانـە هینـدو ئێرانی‌یەکاندا (دهە) بەرچاودەکەوێ.

(١٩) بەرانبەر (کوثرە)ی ئاوێستا لە کوردی‌دا (بۆ کوێ) وهاوواتاکانی بەکار دێن.

(٢٠) (پێش) لە فارسی ناوەڕاستیشدا هەر (پێش).

(٢١) بۆ (ئێره)ی کوردی له ئاوێستادا (ئره) هاتووه و له فارسیی ناوەراستیشدا (ئێنەر) بەکارهاتووە.

(٢٢) بەرانبەر (لێره، لەوێ)یش له ئاوێستادا (ئ تره) وتراوه.

(٢٣) بەرانبەر (لەوێوه)ی کوردی له ئاوێستادا (ئەڤەدە) دەبینرێ.

(٢٤) لیژنەی زمان و زانستەکانی کوردی زا... کە... د پەنجەی بۆ ئەو تایبەتێتییە راکیشاوه (بروانه: ریزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەپێی لیکۆلینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی. بەغدا، ١٩٧٦، ل٢٩٢).

(٢٥) بەرانبەر (لەدوور، له دوورەوه)ی کوردی له ئاوێستادا (دوورات) هەیه.

(٢٦) وشەی (نزیك)ی کوردی بەرانبەر (نەسنه)ی ئاوێستا دەوەستێ.

# الظرف من حيث المعنى

د. عبدالرحمن معروف
قسم اللغة الكردية بكلية الأداب
بجامعة بغداد

بعد بيان بعض ماكتب في اللغة الكردية حول الظرف، توصل الكاتب الى عدد من الاستنتاجات والملاحظات، ومنها:

١ - تحدث عدد من الكتاب عن الظرف ضمن الحديث عن الاسم.. وتحدث عنه عدد اخر منهم ض.ن البحث عن الكلمة المساعدة.. أما الاكثرية الساحقة فقد تحدثت عنه بوصفه جزءا مستقلا من الكلام

٢ - ان الاكثرية الساحقة من الباحثين في قواعد اللغة الكردية لم يتحدثوا عن الظرف من حيث المعنى وكيفية الاستعمال.

اما القسم الضئيل منهم الذين تحدثوا عنه فيلاحظ اختلاف كبير في تقسيماتهم، فمنهم من ذكر اكثر من ذلك. ومع ان بعض الانواع الظاهرة والمهمة من الظرف لم يسجل (كالظرف الصوري، او كيفية التحقق، اوظرف السبب والمقصود)... فقد فصلت اقسام اخرى (كظرف السؤال، وظرف الجواب) لاتنسجم باي حال مع واقع اللغة الكردية.

٣ - ادخلت بعض الظروف ضمن انواع اخرى منها مع انها تابعة لانواع غيرها.

٤ - هناك كلمات كثيرة ليست ظرفا، ومع ذلك فقد سجلت كذلك مثل الربيع.. والشتاء.. والليل والنهار.. والسنة.. والقرن) حيث اعتبرت ظرفا، اوان ادوات النفي (مثل لاوكلا) و(متى وكيف واين وكم) للسؤال والثلث والربع و... من اسماء العدد، اعتبرت ظروفا، وكذلك اعتبرت بعض اللواحق مثل (گه، لان، ستان) ظروفا.

٥ - ليس هناك في اللغة الكردية مايعتبر ظرف سؤال اوظرف جواب، ومع ذلك فان معظم الكتاب قد ثبتوه. صحيح ان هناك نوعا من الظروف يسمى (ظرف النفي) ويشمل اشباه جمل مثل (ابدا، ابدا ابدا، باي حال من الأحوال)، ولكن ليس كأدوات النفي التي حددها بعض الكتاب.

وبعد هذه النتائج وشرح واف للظرف بصورة عامة وايضاحه وبيان خصائصه في اللغة الكردية، حدد الباحث تسعة انواع من الظروف في هذه اللغة وهي:

١ - ظرف الكمية
٢ - ظرف الكيفية
٣ - الظرف الشكلي او كيفية التحقق
٤ - ظرف الزمان
٥ - ظرف المكان
٦- الظرف السببي والمقصود
٧ - الظرف التوكيدي
٨ - الظرف التكراري
٩ - ظرف النفي

وتحدث الظرف عن كل هذه الظروف ذاكرا لها نماذج في الادب الكردي مبديا ملاحظات كثيرة بشأنها.

# بابە تایەری عوریان
## «دەربارەی ژیان و بەرهەمی»[1]

د. عزالدين مصطفى رسول
کۆلێجی ئاداب زانکۆی صلاح الدين

گەشتێك بەسەرچاوەكاندا:

دەمێکە کە باسی شاعیرانی ناو «مێژ ووی ئەدەبی کوردی»ی مامۆستا عەلادین سوجادی دەکەم، هەربەوەوێنە رەنگینە یابەو پەیکەرە قەڵەمینە دەست پێدەکەم کە خامەی پەخشانە بەرزەکەی سوجادی بۆ شاعیری نەخشاندووە. دەبێ چی لەم وێنەیەی بابەتایەر رەنگینتر بێت کە خامەی سوجادی نەخشەی کێشاوەو فەرموویەتی:

(رەندو دێوانەو قەڵەندەر، خواناس و پارێزگارو هەردەگەر، بەسۆزی عەشقێکی مەعنەوی کوورەی دەروونی لەگڕدابوو، لە یادی دۆستێکی نهێنی دەمارەکانی لە خرۆشدابوو، شەیدای بارەگای یەزدان، هەردەگەری چۆڵ و بیابان، هاونیازی رۆژانی چرستانی دەماوەند و هاورازی شەوانی دیمەنی «مەیمەند». گاهێ لالە زاری زەوی بارەگای بووە، گاهێ جریوەی ئەستێرەی ئاسمان شەوچرای بووە، رۆحی لە لەوەر زاری ئەرواحدا لە هەموو گوڵێکی مژ یوە، دەمێ لەدنیا دوور بەدوور بووە، دەمێ لەئاهەنگ روو بەروو بووە. تاوێك لە دەشتی تەفەکوردا سەرگەردان بووە، کاتێك لەکۆڕی عەودالانی خواناسیدا مەیگێری مەعریفەت بووە هەندێ جار خۆی وون کردووە، هەندێ جاریش وون بووی دۆز یووەتەوە، هەناسەیەك دەروێشێکی نادان بووە، بینێکیش شێخێکی مەلەوان بووە، زەمانێك نەزانێکی پەك کەوتوو بووە، دەورانێکیش زانایەکی گەوهەرناس و دوورنلسیکی بێ وێنە بووە).[2]

لایەنێکی تر لەبایەخدان بەنووسینی سوجادی لەم بارەیەوەو بەوتەی ئەودەست پێکردن فەرز بوون لەبەر ئەوەیە، کە ئەو سەرچاوەیە یەکەم سەرچاوەی گەورەی کوردییە کە بابەتایەری خستبێتە ناوچوارچێوەی مێژ ووی ئەدەبی کوردییەوە و بەیەکەم شاعیری کوردی نووسی دانابێ.

هەرچەندە سوجادی پشتی بەنووسینی شارەزایانی گەلانی تر بەستووە، بەڵام، رای ئەوانی لەوەدا پەسەندنەکردووەکە بابە تایەر بەشاعیری کورد نەزانێ.

وەك وتمان ـ نرخی ئەو نووسینە لەوەدایە کە فراوانە، ئەگینا پێش سوجادی سەرچاوەی کوردیی تر دەبینین کە بابە تایەریان لە بێگانە سەندۆتەوە.

لەو سەرچاوانە کەلە بەر دەستدان ـ یا ئێمە ئاگاداریانین، نووسینێکی (محەمەد ئەمین زەکی)یە لە هەموویان کۆنترە. کەبابەتایەری لەریزی شاعیرانی کورد دا داناوە.[3]

(محەمەد ئەمین زەکی) هەر لەوگوڤارەدا بەتایبەتی دەچێتە وەسەر باسی بابە تاهیر ولە گۆشەی (کوردی بەناوبانگ)دا باسێکی چوار لاپەرەیی بۆتەرخان ئەکا.

لەوێدا یەکەم کوردە کەباسی کتێبی (راحة الصدور) دەکاو زانیارێکانی بەراست نازانێ. هەروەك ناوی کۆمەڵێ سەرچاوەی رۆژهەڵاتناسانی بردووە کەباسی بابەتایەریان کردووە. یەکەم سەرچاوەی کوردیشە کە «بیبی فاتیمە» بەخوشکی بابەتایەر دەزانێ و[4]

## لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

بەخۆشەویستیی دانانێت.

ئەم چەند لاپەڕەیەی گەلاوێژ لە وەرگێرانە عەرەبی یەکەی (کوردی بەناوبانگ) داجێی خۆی گرتووە.[5]

پیرەمێرد کە ئەم نووسینەی محەمەد ئەمین زەکی دەبینێ، ئەویش دەیەوێ بابەتایەر بەشاعیری کورد بچەسپێنێ و هەندێ شت لەو نووسینەزیاد بکا.

پیرەمێرد نووسیوی‌یە:

«... ئەمین زەکی بەگ، کەمن ئەلقاب بۆئەو بەنەنگ ئەبینم و بارەها بەسەریا هاتووم، لەنووسخەی «گەلاوێژ»دا لە بابەتاهیر دوواوە. ڕەزا تۆفیق فەیلەسوف وزۆرشاعیر: دیوانی بابەتاهیری تەرجەمەکردووە بەتورکی ولەئەستەموڵ تەبع کراوەو لەگەڵ خیام پێکەوە لەبەر گێکان.

ئەبێ (ئەمین زەکی بەگ) ئەوەی بەرچاو نەکەوتبێ، ڕەزا تۆفیق زۆرجوانی تەرجومە کردووە....، نازانم شێوەی کوردی‌یەکەی بەهەوێ کوردێکی سلێمانی یەوەحەل کردووە، یا هەرخۆی شارەزای هەمووزوبانێکە. ئەسڵ شێوەکەی (راجی)یە ڕەزا تۆفیقیش بەزوبانی راجی دانـاوەو ئازەری خاوەندی ئاتەشگەدەیش هەر بە راجی دانـاوەو بەهەمەدانیی ی ئەناسێ و تەخەلوسی شیعری (عوریانە) ئازەر ئەڵێ بابەتایەر دێوانەیێکی فەرزانەو هەمەدانێکی هەمە دانە، بەعاشقی شەدید ناوبراوە، لکی تەئریخی پیشەی من نی‌یە، ئەوەخوا بە ئەمین زەکی بەگی داوە.

تەنها ئەوەندە ئەزانم کە بابەتاهیر برای شێخ عەلی‌ی کۆسەی دۆڵپەمووەو کەراماتی زۆر بووە، ئیتر بەشی‌ی لەشیعرەکانیایە وا ئەیگێرمە سەر شێوەی خۆمان:ـ

من ئەو بەحرم کەوا کەوتوومە ناو زەرف
من ئەو نوقتەم کەوا کەوتوومە ناو حەرف
لەهەر ئەلفێ ئەلف قەدری لێ‌دێ
ئەلف قەددەم کەوا کەوتوومە ناو ئەلف...»[6]

ئەم وتارەی‌پیرەمێرد لەپاڵ شایەتی شاعیرو نووسەرێکی گەورەی وەك پیرەمێرددا دەربارەی کوردێتیی شیعرەکانی بابەتایەر وخۆی، ئاگادار کردنیشە دەربارەی وەرگێرانە تورکی یەکەی بابەتایەرو ئیشا رەتیشە کە ئەم شیعرانە بەزمانی (راجی) نووسراون، کەئەم ئیشارەتە لە سەرچاوەی تریشدا هەیە (راجی‌هەر کوردی) لوری‌یە. هەرچی باسی ئەوەیە کە بابەتایەر برای شێخ عەلی کۆسەی دۆڵپەمووە ئەوەیەکەم جارهەر پیرەمێرد باسی کردووەو ئەمەش کەرەسەیە بۆساغکردنەوەو لێکۆڵینەوە.

پیرەمێرد وەك گەلێك شاعیری ترمان هەندێك لە چوارینەکانی بابەتایەری بەزمانی سەردەم و شیعرەکانی خۆی دارشتۆتەوە

### بابە تایەر شاعیری کوردە:

عەلائەدین سوجادی کە لە سەرچاوەیەکی تردا دێتەوە سەرباسی بابەتایەر.[7] لەبارەی دیوانەکەی‌و شیعرە کوردی‌یەکانی‌یەوە دەنووسێ:

«لەراستیدا لە هەموو چاپەکانا گەلێ چوارخشتەکی واهەیە کە دوویان یەك ناگرنەوە. زیاتر ئەم جیاییەش لەوچوارخشتەکی یانەدان کە زۆرتر لەوشەکانی کوردین. ئەوانەی کە هەمووو وشەکانی وەیا زۆرتریان بەشێوەی زمانی فارسین، ئەوانە بەهی بابەتاهیر دانراون. بە پێچەوانەی ئەوە، ئەوانەیان کەزۆرتر لەوشەکانی بەشێوەی لوری کوردی‌یە، ئەوانەیان بەشوێنی گومان داناوون. هۆی ئەم جیبوونەوەو گومان پەیداکردنەش ئەوەیە ئەو کەسانە کە ئەم سروودانەی بابەتا هیریان لە چاپداوە لە باوەری ئەوانا ئەوانەی کە فارسی تەواون ئەوانەیان کردووە بەهی ئەو. ئەوانەی کە تێکەڵاون لەدوو شێوەی فارسی‌و کوردی ئەوانەیان بەشوێنی گومان داناوە!..

وەنەبێ ئەم ئیشەش کەکردوویانە وەیا ئەم جیاکردنەوەیە کە جیایان کردۆتەوە لەرووی دیراسەیەکی زانیاری‌یەوە بووبێ. بەڵکوخامەی چاپخانەیەکی بازرگانیی فارسی هەر ئەوەندەی لەدەست هاتووە کەشتی وابکا!.

لەگەڵ ئەوەدا لەبەر ئەووردکردنەوەیە کە لە پێشا باسمان کرد، ئێمە تەنها ئەو چوارخشتەکی‌یانە بەهی بابەتاهیر ئەزانین کە ئەوان ووتویانە شوێنی گومانە، کەهی ئەوبن. ئەوانەی کە ئەوان بەتەواوی بەهی ئەوی‌دا ئەنێن ئێمە ئەوانە بەجێی گومان دائەنێن، وەیا ئەتوانین بڵێین ئەوانە هەر هی ئەونین. چونکە چەشەی ڕستەو دیراسەی سەردەم و بوونی بابە تاهیر بە لوری‌ودانانی سروودی بەکوردی، ئەمانە هەموو دەری ئەخەن کەدوو بەیتەکانی ترهی ئەو نین...[8]

دەتوانین لەم وتانەی سوجادی زیادبکەین و بڵێین: ئەی بۆچ ئەوانەش هەر شیعری بابەتایەر نەبن ودەستکاری کرابن؟. کە دەستکاری کردن وبەرەوفارسی بردنیش لە چاپەکانی شیعری بابەتایەردا زۆر دیارو ئاشکرایە. هەروەها حەزمان دەکرد کە مامۆستا

سوجادی خۆی خاوەنی ئەم رایەیە چەند نموونەیەکی بۆ هەردوو لایەنی بیرەکەی بهێنایەوە ـ ئەوسا باشتر بیرەکەی خۆی پێ دەسەلماندین و رێگەی بریارێکی تازەی بۆ روون دەکردینەوە پاش ئەمە مامۆستا سوجادی دێتە سەر باسی بابەتایەر و دەنووسێ :

«بابەتاهیر هۆنەرێکی دەروێشی رەندی بێپەروا بووە، ئەو رێچکەیە کە گرتوویەتی رێچکەیەکی سادەی بێ گرێ بووە. ویستوویەتی دەوروبەرەکەی خۆی بەهەموو جۆر لەبیروباوەری خۆی تێبگەیەنێ، نەیوستووە رێگایەکی وابگرێ ناوی خۆی بەوە بەرز بکاتەوە کە گۆیا هۆنراوەکانی گرانن و بەگران ئەچنە دڵەوە، تابێنێ وشەی قەڵەوی فارسی بەکاربێنێ. تەنانەت زۆرکەس دووبەیتەکانی بابەتاهیر بە «تەرانە» ناو ئەبەن. تەرانە بۆ سروودێکا کە زۆر ئاسان و بێ گرێ بێ لەبەر ئەمە سروودی بابەتاهیر بەگوزارشتی ئێستە ئەبێ سروودێکی گەلی بێ. سروودێکیش کە بۆگەل بێ، ئەبێ وابێ، کە ئەو ناوچەیە بەبێ گیروگرفتی تێی بگا. ناوچەی بابەتاهیریش ناوچەیەکی کوردی بووە ئەبێ سروودەکانی بەو شێوەیە بێ، هەرشتێ لەو شێوەیە دەرچوو هی ئەو نابێ. ئەم دووبەرەکی و رێ نەکەوتنەو ئەم هی ئەو نەبوون و بەهی ئەو کراوەش لەبەر دووشتە.

یەکەم: ئەو گشت بلاوکەرەوەو بنکانە ـ ناشر و مؤسسە ـ کە سروودەکانی بابەتا هیریان لەچاپ داو، بلاوکەرەوەو بنکەیەکی فارسی زمان بوون، کەچاپیان کردووە، لەرووی بازرگانیەوە بووە، نەوەك لەرووی دیراسەیەکی زانیاریەوە. لەدووبەیتێکا هەرووشەیەکی هەرشێوەیەکی کوردی تووش بوون و نەیانزانیوە، خێرا ووشەیەکی فارسییان خستۆتە شوێنی و بەم جۆرە دیمەنی دوو بەیتەکانیان تێك داوە.

دووەم: لە راوێژی هۆنەردا گەلێ جاری وا ئەبێ یەکێك دێنێ چامەیەك دائەنێ. وەیا چامەیەك خاوەنەکەی دیارنییە، لەبەر ئەوەکەکابرا خۆی هیچ ناوێکی نییە، وەیا خاوەنێك بۆ چامەکەنییە، چاوەکە ئەکا بەهی هۆنەرێکی بەناوبانگ، بۆ ئەوە مەردم باوەشی بۆبگرنەوە، ئەوچامەیەئیتر بەهی هۆنەرە بەناوبانگەکە ئەناسرێ ولەراستیشدا هی ئەو نییە. بەلام ئەوانەی ئاشنای دیراسەی زانیاری و لێکۆلینەوەی رێچکەی ئەو کەسە وەیا ئەو زەمانەن جیای ئەکەنەوەو تێی ئەگەن کە ئەو هۆنراوانە هی ئەو هۆنەرە نین و بەمەبەستێك خراونەتە ناو هۆنراوەکانی ئەمەوە. زۆرتر لەدوو بەیتەکانی بابەتاهیریش بەوجۆرەن و کراون بەماڵی ئەو. لەگەڵ (9) ئەوەشا وانییەو هی ئەو نین

**دەربارەی ئەم رایانەش دەتوانین بڵێین :**

رەنگە ئەم دیوانە بەردەستانەی بابەتایەر لێ زیاد کراویان تێدابێ و چوارینیش هەبێ هی ئەو نەبێ و بەناوی ئەوەوە لەدیوانی ئەودا تۆمارکرابن. هەروەك هۆیەکی تر دەخەینە سەر ئەو هۆیانەی مامۆستا تۆماری کردوون و دەڵێین :

شیعری بابەتایەر لەناوخەڵکدا بلاو بووەو هەزار ساڵە بەسەر زمانی خەڵکەوەیە. مێژووی بەدیوان و نووسینەوەو تۆمار کردنیان زۆر دووای بەسەر دەمی خەڵکەوە بلاوبوونەوەیانە. لەبەر ئەوە هەر لە سروشتێکی لەسەر سروشتی فۆلکلۆر نزیکەوە واقەوماوە کە زۆر لەشیعری خەڵکی تریش بەناوی ئەوەوە تۆمار کراون. ئەم دیاردەیە بۆ شیعری «فەقێ تەیران و عەلی بەردەشانی دیارن، بەلام بۆشیعری بابەتایەر کەمترن چونکەتێکرا ئەو شیعرانەی تائێستا دەست کەوتوون بەناوی بابەتایەرەوە تۆمار کراون و چاپکراون خۆیان کەمن و خۆیان نەگەیاندۆتە ٤٠٠ چوارین. کەواتە ئەوەی شیعری بابەتایەر نییە ـ لەوناوەدا ـ کەمە. بەلام جارێکی تر. دەتوانین بڵێین، رەنگە زۆریان بەرەو فارسی بردن دەستکاری کرابن هەروەك جارێکی تر دەڵێین ـ خۆزگە نووسەر چەند نمونەی بۆ ئەم مەبەستانە بهێنایەوە تاباشتر ئەو بیرەی بەهەمووان بسەلماندایەو رێگەی ئەو بریارە گەورەیەی بۆ روونتر بکردینایەوە. سوجادی لەباسی نوسخەکای دیوانی بابەتایەردا دەنووسێ»

«مجتبی میتەوی» مامۆستای دانشگاه لە کتێبخانەی ئەستەموول هەندێ لە دووبەیتەکانی بابەتاهیری بەدەستنووس دەستکەوتووەو تاکاتی دەستکەوتنی ئەو دەستی هیچ بلاوکەرەوەیەکی بازرگانی نەگەیشتۆتێ.

ئەم دووبەیتانە بە تەواوی لەسەر شێوەی لوری کوردی وێشتوون. ئەم دووبەیتانە ئەوە بۆ ئێمە دەرئەخەن کە زمانی هۆنراوەی بابەتاهیر هەربەو جۆرە بووەو ئەوانەی کەوەکو ئەوەنین هەموو بەناوی ئەوەوە دانراون هی ئەو نین (10)

جارێکی تر خۆزگەی نمونەی بۆ ئەم قسانەی نووسەر دەخوازین و لەو بیرەی ئەو زیاد دەکەین و دەڵێین :

رەنگە ئەوەی شۆڤینییە فارسەکان دەیلێن ـ بەزاناو نەزانیانەوە بەمامۆستاو ناماموستایانەوە رەنگە زۆرتر دووربن لەم مەبەسەی ئێمە. ئەوان پێشتر بریاریان داوەو دەیانەوێ بەڵگە بۆ بەفارسی کردنی بابەتایەر بدۆزنەوە. ئێمەش قەناعەتمان وایە کەبابەتایەر

## لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

خۆی کوردەو شیعرەکانی کوردین و دەمانەوێ بەبەڵگەی ڕاست ئەم ڕاستی‌یە بسەلمێنین و ڕێگە کەشمان و ئەنجامیشمان و شێوەی سەلماندنیشمان لەگەڵ ئەواندا جیایە .

هەرچی دەربارەی کوردێتی بابەتایەر و کوردێتی‌ی شیعرەکانێتی باهەر بەقسەکانی وەرگێڕی سەرسۆرانیی چوارینەکانی بابەتایەر . دەست پێ بکەین کە دەڵێ :

«بەڕاستی گەنجینەیەکی وێژەیی ئێجگار هێژایە ، بەڵام ئەوەی کە سەرنجی تەماشاکردنی ڕاکێشام و دڵی گوشیم ئەوە بووکەگوایە ئەم چوارخشتەکیانەی بابەتاهیر فارسین : هەرچەندە بڵاوکەرەوەکەشی لەسەرەتاکەیا دان بەوەدا ئەنێ کە بە (لەحنی لوڕی) ووتراون ، بەڵام وادیارە بەلای کابرای بڵاوکەرەوەوە شێوەی لوڕی شێوەیەکە لەشێوەکانی زمانی فارسی : ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو تەعبیر لەنەزانی یاخود تەعبیر لە خۆنەزان کردن ئەکاتەوە ، کەسەرچاوەکەی لە شۆڤێنیەتەوە سەرهەڵئەدا»(١١)

دیارە هەروەك لەم قسانەوە دەرئەکەوێ ، موناقەشەی ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا کەبابەتایەر لەکورد دەستێننەوە دەیدەن بەفارس ، هەر لەسەر بابەتایەر نی‌یە ، بەڵکو لەسەر هەموو ئەو دیالێکتی لوڕی‌یەیە کە هەموو لادان بەوەدا دەنێن کە بابەتایەر شیعری خۆیی پێ نووسیوە .

ئەگەر هەر لەموختەبەردا تەماشای زمان بکەین و تەنیا جیاوازی‌ویەکێتیی «گرامەتیك و فۆنەتیك و بنەڕەتی فەرهەنگ» بکەین بە کەرەسەی موناقەشەو بریاردان بەسەر دیالێکتێکدا کەدیالێکتی کام زمانە؟ یاهەرخۆی زمانێکی سەربەخۆیە ئەوا ڕەنگە کێشە کە زۆر درێژ ببێتەوەو بەدوو تواناوە چوونەمەیدانی بووێت .

یەکەمیان ـ شارازیی‌یەکی تەواو لەزانستی زمانداو تەواوشارەزایی ئەوپێوانەو مەزندە زانستی‌یانەی کەزمانیان پێ لە دیالێکت جیا دەکرێتەوە ، یادەبنە هۆی سەربەیەك زمانیی دوو دیالێکت یابەپێچەوانەوە . کە ئەمە وەك وتمان شارەزایی‌یەکی گەورەی دەوێ و هەندێ بەدوودا گەڕانی مەیدانیی وردی دەوێ ، هەروەك هەندێك لێکۆڵینەوەی موختەبەریی هەندێ لایەنی ئەم مەسەلەیە ، وەك لێکۆڵینەوەی فۆنەتیك ئێستاوای لێ هاتووە ، کە تەکنیکی تازەو ئامێری ئەلەکترۆنیی بۆ بەکاردێت و بەوجۆرە موناقەشە دەبڕێتەوە .

دووەمیان ـ لەپاڵ ئەو شارەزیی‌یەدا ، دەبێ ئەو کەسەی خۆی دەهاوێتە ئەم مەیدانەوە شارەزایی‌یەکی مەیدانیی تەواویشی

لەودووزمانەدا کەبریار بۆیەکێکیان دەدات و لەو دیالێکتە خۆیدا هەبێت کە بڕیاری بۆ دەدات .

کەواتە هەر بڕیاری موختەبەری بەسەر دیالێکتێکی ئاوادا کە موناقەشەی لەسەرە ئاسان نی‌یەو تا ئێستا هەموو ئەوانەی هاتوونەتە ئەم مەیدا نەوەبەو دوو کەرەسە پتەوەوە بۆی نەهاتوون ، واتە یالایەنی شارەزایی‌یە زانستێکە کەلێنی تێدابووە ، یائەو لێکۆڵینەوە مەیدانی‌یەی مەسەلەکەیان نەبووە . هەرچی هەڵەی گەورەشە کە لەم مەیدانەدا دەکرێت ، ئەویش ئەوەیە کەهیچ حسابێك بۆ مەرجی چوارەم ناکەن ، کە بەلای ئێمەوە زۆر بنەڕەتی‌یە ، ئەویش ـ ڕای‌گەل ـ ە ، واتە خاوەن و هەڵگری ئەو دیالێکتە خۆی ڕای چی‌یە ، واتە هەربە ساکاروبێ لێکدانەوەی زانستی‌و شارەزایی ئەو زانستی زمانە کەلێت پرسی زمانەکەت چی‌یە ـ دەڵێ چی ـ

ڕەنگە لەم بارەیەوە زۆر جار کەسێکی سادە لەسنووری بێچووە دیالێکت و هەر دیالێکت خۆی‌وزمان نەزانێ‌وکەلێت پرسی ـ بەچ زمانێك دەدوێیت ، ناوی بێچووە دیالێکت بێنێ‌وبڵێ : بەموکریانی ، یابەبۆتانی ، بەڵام هەر ئەم کەسە پاش پرسیارێکی بچووك ـ موکریانی چی‌یە ، کوردی ، تورکی‌یە ، فارسی ، یەکسەر بە دەنگی بەرز بێت دەڵێت ـ کوردی‌یە .

کەواتە بۆ ئەم دیالێکتی لوڕی‌یەی بابەتایەریش ، مەسەلەی ڕای‌گەل نرخێکی گەورەی هەیە ، گەورەترین بەڵگەی ئێمە بۆ کوردێتی‌ی ئەوە دیالێکتەو شیعرەکانی بابەتایەر ئەوەیە کە لوڕ خۆیان بەکورد دەزانن . هەرچەندە ئەگەر موناقەشەی بەچاوی موختەبەر بینینی زمانیش بێنینە کایەوە ، هەرلایەنی کوردێتیی ئەودیالێکتە سەردەکەوێ . وتمان ڕای‌گەل گرنگی‌یەکی تەواوی لەم مەیدانەدا هەیە . مەسەلەش تەنیا لەبەر ئەوەنی‌یە ، کە ئێمە لە چەرخی ئازادی گەلان و بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەییدا دەژین و دەبێ سەرەنجامی گەلان لەهەموو مەیدانێکدا بەبڕیاری خۆیان بێت ، لەبەرئەوەش ـ کە ئەگەر تاقم وتیرەو کۆمەڵە خەڵکێك دیالێکتی خۆیان بەبەشی زمانێك زانی ، ئەوا خۆیان بەمێژ وو سامان و فۆلکلۆری ئەو زمانەوەدەبەستن وگەشەسەندنی دیالێکتەکەیان ، لەڕووی فراوان بوون وئیستیلاح دانان وبەکارهێنان و داچەسپاندنی زمانی ئەدەبی‌یە بەکگرتوودا هەر ڕوو دەکاتە ئەوزمانەوە لەگەڵ ڕێرەوی ئەو زمانەدا یەك دەگرێتەوە . کەواتە ئەگەر بە هەڵە فەرز بکەین کە دیالێکتەکەی بابەتایەر کوردی نی‌یەو دیالێکتی زمانێکی‌ترە ، یا چەشنە زمانێکی سەربەخۆیەو لەنێوان

دووزمـاندا وەستاوە، ئەوا سەرەنجامی هەربەکوردی بوونە، چونکە سەرەنجـامی ژیانی خاوەنانی ئەو دیالێکتە هەر بەکوردەوە بەستراوەو سەرەنجـامی دیـالێکتـەکەیان هەر سەرەنجامی زمانی کوردییەو ئەو دیـالێکتـەش لە ئەنجـامدا هەر دەبێتە یەکێك لەسەر چاوەکانی بەرەو پێش چوونی کوردیو پتـەو بوون و داچـەسپـانـدنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیو بەلای تردا ناروات.

بابێنـەوە سەر «گـەنجینە»و وەرگێرانە سۆرانییەکەی. وەرگێر کە باسی بابەتایەر دەکات هەندێك قسە دەگێرێتەوەو

«.. بەتـایبـەتی لەنـاوچـەی لورستـان و هەمەدانا بابەتاهیر زۆر ناســزاوە، قەبــرەکـــەی بۆتـە زیـارەتگـاو شوێنێکی پاك وپیـرۆز. شیعرەکانیشی وێردی زمانی گەورەو بچووکن، ئەمە بێجگە لەوە کە خۆر هەڵاتناسەکانیش ئیهتیمامێکی زۆریان پێداوەو زۆری لێ دواون.

چوارینەکانی بابەتاهیر زۆر سادەو رەوان وپرمانان، موحەسەناتی لە فزییـــان زۆرکـــەم تیـــابـەکـارهـاتـووە. بەراستی زمـانی دڵ و هەســت کردن و عاتیفــەن، راستــەوخــۆ هەر لەدەرووی دەمـــەوە دەرچـــوون، وەك مەلانـی بچـــووکـی پەل وپۆرەنـگین ئەنیشنـــە ناوهێـلانـەی دڵانـەوە، هەربـۆیەشە کە پتر لەهەزار ساڵە ووتراون و کەچی هەمیشە بەسەر زمانی خاسەو رەمەکی خەڵکی هەرێمەکانی لورستـــان و هەمـــەدانـــەوەن»[١٢] پاش ئەمـــە وەرگێـــر ـ هۆبۆئەم وەرگێـرانـەی دەهێنێتـەوە، کە بەلای ئەوەوە گواستنەوەی شیعرەکانی بابـــەتـــاهیـر لەنـاو کوردی لورستـان و هەمـەدانـەوە بۆمەڵبـەنـدی کوردنشینی ترو دەنووسێ:

«جـازۆر لام گران بوو کە زوربـەی خوێندەوارانی خۆشەویستی کورد زمـانمان لەم خۆراکەگیانییە بێبەش بن وتەنانەت لەناسینی فەیلەســوف و رۆشن بیـرو شاعیـرێکی ئاوا پایـەدارو دیاری هەزار ساڵ پێش ئەمرۆی کورد بێ ئاگابن. لەبەر ئەمانەو لەبەر ئەوەش کە بۆ هەمـوو کوردێـك و کوردی زانێـك روون ببێتـەوە چوارینـەکـانی بابەتاهیر کوردین و فارسی نین.

هەرچـــەنـــدە بەمـــرووری زەمـان هەنـدێ ووشـەوتەعبیـریش چەرخـــاوەتـــە سەر زمـــانی فارسی ئەم حەفتــاو حەفت چوارینـەم بەگـۆرینێکی کەم خستە سەر شێوەی کرمانجیی خواروو (سۆرانی) بەرادەیـەك هیـچ ووشـە یەکم لەهـەندێ لەم چوارینانە نەگۆریووەو هەروەکو خۆیم هێشتۆتەوە.»[١٣]

وەرگێـر لەپـەراوێـزیشـدا پەسـەنـدیی ئەو دابـەشکردنەی بەسەر دیـالێکتـەکـانی کرمـانجی خوارووداکردووە کە دەڵێت: کرمانجی خوارووە بریتییـە لەشێـوەکـــانی سۆرانی، سلێمـانی، سنـەیی، موکـریـانی. هەربـۆ بەڵگەی کوردێتی شیعرەکانی بابەتاهیر ـ دەبێ ئەوچـەنـد دێـرەش وەرگێـرین، کە وەرگێری چوارینەکانی بابەتاهیر بەعـەرەبی ـ محـەمـەدنەبەدری ـ نووسیـویەیە. وەرگێری عەرەبی کە زاری قسەکردنی خۆی لورییە لەم بارەیەوەوتوویەتی:

بابـــەتـــایـەری هەمـــەدانیی ـ لەقـەب ـ عوریـان ـ لەهـەمـەدان لەکـــوردستـــانی ئێـرانـدا لەسـەدەی چوارەمی، هجـریـدا چاوی بەرۆشنایی کەوت، بابەتاهیر شاعیرێکی کوردی لورە ـ

پاش ئەمە دەڵێ:

فارس دەڵێت گوایـە بابـاتـاهیر شاعیری فارسە، چونکە بەواتەی ئەوان شیعـرەکـانیی بەزمانی فارسی نووسیووە. بەلام راستی زۆر ئاشکرایە. چونکە ئەوزمانەی چوارینەکانی بابەتایەری پێ نووسـراوە فارسی نییـە، بەڵکـو دیـالێکتی لوری یەکـە یەکێکـە لەدیـالێکتـەکـانی زمـانی کوردیو خەڵکی پێشکـۆوپشتکـۆ، واتـە ناوچـەی لورنشینـەکـانی کوردستـانی ئێـران پێی ئەدوێن، هەموو کوردی فەیلی ئەودیـالێکتـە دەزانن ودەتوانن بەو دیالێکتە بدوێن ك چوارینـەکـانی بابەتایەری پێ نووسراوە، چونکە دیالێکتی خۆیانە ـ زۆر کەسیش لەفـەیلییـە پیرەکان ماون کە زۆریان لە چوارینەکانی بابەتایەر لەبەرەو لەم بۆنەو ئەو بۆنەدا دەیخوێننەوەو بەنمونە دەیهێننەوە.

لەبەر ئەوە بە فارسی دانانی بابەتایەر هەردرۆیەکی گەورەی بێ بنەرەتە»[١٤]

پێشـەکیی چاپـە جیـاوازەکـانی دیـوانی بابـەتـایـەر بۆزانین و لێکدانەوەی ژیان و شیعرەکانی دەبنە سەرچاوە.[١٥] لەیەکێك لەوچـاپـانـەدا[١٦] پێشـەکی یەك بە ئیمـزای (م. دەرویش)ەوە نووسـراوە، هەرچـەنـد نووسەر لەدێرییەکەمدا هەناسەی شۆڤێنیی خۆی پیشـانـدەداو چوارینـەکانی بابەتایەر بەفارسی دەزانێ، بەلام دوایی دەنووسێ:

گۆرانیی دڵ راکێشـەرو شاعیـرانـەولەیـەك حاڵـداسادەی ئەو، هەستی پـاك وبێ پێـچ وپەنـاوتێگەیشتنی دەروون (واتە ـ باطن)ی سۆفییەکی بەجۆش وخرۆش وزەوقی ساغ وسۆزی دڵی زانا (واتە ـ عارف)ێکی خاوەن دڵـەکـە ساڵـەهـایە راکێشەری باری سەرنجی چێـژداران بووەو هەمووکەسێك بە ئەندازەیەك تێگەیشتن و هەستی

لەم بەهــرەیــەوەر دەگــرێ وچێــژ ی لێ‌وەر دەگــرێ. ئەودووبــەیتــە کەمــانــەی کەلــەوەوە بەیــادگار ماونەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەنی ریــزە کاری‌و بەدایعی جیــاوازی شیعــری وعەرووزی نین یارێك لە ئەندێشەو ووردەکاریی شــاعیرانی گەورەی تێدانی‌یە، هەر لەوکاتەدا سادەیی‌و سروشت نازکیی بەتــوانــای ناوەرۆکی بەرزو بڵنــد ئەوەندە تێدایە کەهەر لە ساتەکانی یەکەمەوە خوێنەر بەناسکیی ووتەی خۆی بەلای خۆیدا رادەکێشێ.

هیــچ کەسێ نی‌یــە کەبە خوێندنەوەی شیعرەکانی بابەتایەروبەم هەموو چێژ و ناسکیی مانای لەپلەوتاوێکدا لەهۆش خۆی نەچێت و سەرمەستی ئەم بادەی حەقیقەتەنەبێت، رەنگەهەر سادەیی زۆر بێ درەو شەی ووتــەی ئەوبێت کەبەبوونی رەنگی حەقیقەت وەك لەدڵی دەردنــاکی برینــدار دێتە دەرەوەو لەناو دڵداجێ ی خۆی دەکاتەوە. یا سەفــای دەروون و گیــانی تاداری ئەم رەنــدەبــار سووکــەیــە کە ئەم هەموو چێژ وو مەستی‌یە بەمرۆڤ دەبەخشێ.

هەر ئەوچێــژ و هەست و ئارامــە خەیــاڵی‌یــەیــە کە لە باوەشی سروشتــدا لەشــوێنی دوور دەست و ئێــلاخ دوور لەهەراو قەڵەباڵغی شاران و کۆمەڵدا هەستی پێ دەکەین.

شیعــری بابــەتــایــەر خاوەنی ئەوجوانیــەی‌وگوڵی کێــوی‌یــە کە ئاورنگی بەیــانیــان نمــەو ناسکی‌ی ئەوان دەنوێنێ‌و تنۆکی شەونمی بەهاران شادی‌و سەفای ژ یان بەوان دەبەخشێت.

ئەو لەوە عاشقانەیە کە بەدەردی عەشق خۆی راهێناوەو دەربەسی دەرمــانی ئەونی‌یە. بەسۆزی سینەوگری دەروونی خۆی ئەسووتێ‌و ئەم ئاگــری گیــانــە لە دڵی خۆیــدا بە پەنهــانی دەهێڵێتــەوە. بە پەرێشانی‌هاتە جیهانەوەو بە پەرێشانی لەجیهانیش دەچێتە دەرەوە.

مەرا نەسەر نەسامان ئافەریدەند
پەریشانم پەریشان ئافەریدەند
پەرێشان خاتران رەفتند درخاك
مەرا ئەز خاکی ئێشان ئافەریدەند

دەربــارەی شەرحی ژ یــانی بابــەتــایــەر ئەم شاعیــرە بەســۆزە، بەداخــەوەزانینی تەواو بەنــرخی لەپاش بەجێ نەماوە، ئەوەی یادگار نووســان لەم بارەیــەوە نووسیــویــانــە لەمشتێك ئەفسانەو وشەی پوچ بەولاوە هچی‌تر نی‌یەو باشتر ئەوەیە کە لەناو شیعرەکانی خۆیدا بۆی بگەرێین.

لەپێشــەکیی (وحیــد الحق)ی بابــەتایەردا زۆر بەجێ نووسراوە: «چــونکــە بابــەتــایــەر پیــاوێکی بێ پێوەندی‌و رەندێکی بارسوك بووەو خانــومــانی نەبــووە، لەبەر ئەوە مێژ ووی کە پێوەندیی بەخەڵکی بێ خان ومــان و بێ لانــەوهێــلانەوە نی‌یەپشتی خۆی لەباری ناوبردنی ئەوان سووك کردووە. لەبــەر ئەوە لەم رووەوە مێژ وورووی نەکردۆتە بابــەتــایەر، چونکە ئەو لەمەیدانی ووتەبێژ اندانە بە قەسیدەی بەرزو (غــەرا) سروودی ووتــووەو نەگــەشتی غەزەلی ساختــەی هەیــەو نەمەدح و ستایشی پادشایانی کردووەو مێژ ووش روو ناکاتە ئەم جۆرەکەسانە». (١٧)

پێش ئەوەی بێینە سەرباسی براون، دەتوانین بڵێین، ئەوا ئەمیش کەوتــوتــە ناوبــەشێــك لەو ناکۆکیەوە کە براون تێی کەوتبوو. ئەویش ئەوە بوو کە ـ پێــوەنــدی نەبــوونی بابەتایەر لەگەڵ رازاندنەوەی وشەو (موحەسەناتی لەفزی)و هەموو وشەگەرییەکانی شیعری کلاسیکی رۆژهــەلات شاعیــر بەلای خاوەن پێشەکی‌یەوە، لەریزی شاعیرانی گەورە دەهــێــنــێــتــە خوارەوە. لەکــاتێکــدا کە هەرخۆی لەرووی سۆفێتی‌یــەوە باسی تێگــەیشتنی دەروون (یا باطن)ی ئەوو لەزانایی (واتە ـ عارف)ی ئەو دەکات. کەواتە چ لا ی ئەم و چ لای براون ـ ناوەرۆك و بیــری شیعــری بابــەتــایــەر قووڵە، بەلام ساکاری بەلای ئەوانــەوە لەوشــەو دارشتنــدایــە. باشتێکی لێ‌زیــاد بکــەین و بڵێین لەشیعــرەکــانیشیــدایــە، هەر ئەم لێکــدانــەوەو نەکردنەوەیەی گرێی ناکــۆکی لای ئەوان، لێکــدانەوەیەکی تازەو بۆچوونێکی تازە بە ئێمە دەبــەخشێ کە هەمــوو گۆرەپــانی شیعــری کوردی دەگــرێتــەوەو لە بابــەتــایەرەوە دەست پێدەکات تا ئەمرۆ. کە ئەمەش دەبێ بە یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەم باس و لێکۆڵینەوەیەی ژیان و شیعری بابەتایەر.

بابێینــەوە سەر پێشــەکی‌یەکەو نەیەڵێن بیرێکی تریش بێ لێداون بروات، ئەویش ئەوەیــە کەلای نووســەروایــە کەمێــژ وو پێــوەنــدیی بەخــەڵکی بێ خان ومــان و بێ لانــەو هێــلانــەوەنی‌یەوپشتی خۆی لەباری ناوبردنی ئەوان سووك کردووە. بەڵێ ـ ئەومێژ ووەی بۆمیرو سوڵتان تەرخان کراوە، لەباس وحیکایەت گێرانەوە شدا هەر رەنگە باسی کۆشکی شاهــانــەوشاعیــرانی دەربــاربکــات. بەلام ئەو مێــژ ووەی خەڵــك بەخــوێن وخەبــاتی خۆیــان دەینــووسن، ناوی ئەوچەشنە شاعیرانەش دەخاتە پشت گوێ‌وهەر بەدرێژ ی شــاعیرانی خەڵك دەدرەوشێتەوە.

بەڵێ ـ پاش هەزار ساڵێــك، کەم دەربــارەی ژ یــان و ماڵ وحاڵی بابەتایەر دەزانین، بەلام شیعرەکانی ئەو هەر ئەوەنین کە وەك دیوانی شاعیــرانی دەربــار لە لاپــەرەی دەستنــووسی زەردداماونــەوە، بەڵکو

زۆری بەنووسراوی‌و زوربەی لە ناودڵ و مێشك و بیرویادی خەڵكدا ماونەتەوە، رەگ و ریشەیان لای هەموو خاوەن بیران و خاوەن دڵانی كوردو رۆژ هەڵاتـدا چەسپیـوە ئەوەتـا هەموومان، پاش هەزار ساڵ لەگەڵ بابەتایەردا دەهەژێین و دەڵێین:

مو ئان رەندەم كە نامم بی قەلەندەر
نەخان دیرە نەمان دیرەم نە لەنگەر
چو رۆژ ئایە بگەردەم گەردی گیتی
چوشەوئایە بەخشتی وانەهەمسەر (١٨)

نووسەری پێشەكی پاش ئەمە نووسیوویە:

«. . . راستی یادداشت نووســانی لای ئێـمە تارادەیـەك ووشـەی پووچ و بێ سەروبێ‌و بنـەرەت و كەوتـووی وایـان ریـزكـردووە كە تارادەیـەك نزمیی بیـریـان نواندووە، كەمرۆڤ لەراستیدا لە هەموو شیعرو شاعیری بێزار دەبێت و قێزی لێ دەكاتەوە.

با گوێ لەم دوو دێرەی بابە تایەر بگرین كە دەڵێت:

مو آن بحرم كە در ظرف آمدستم
چو نقطة برسرحرف آمدستم
بهر الفی الف قدی برآید
الف قدم كە در الف آمدستم

ئێوە بە خوێندنەوەی ئەم دوودێرە بەناوبانگەی بابەتایەر سۆفیەكی بڵنـد نەزەرو هیمـەت بەرزو عـارفێكی ئازادو شاعیـرێكی بڵنـد فریو دەبینن كەگیـانی پتـەووگـەورەی خۆی وەك زەریایەكی لەبن نەهاتوو لەقاڵبێكی بچووكدا رژاو دەبینێ.

جیهـانی مەتـریـاڵ ـ یا مادیـات و جیهانی دیار (واتە ـ زاهیر) بۆ گەشتی بیـری بڵنـدی ئەو شوێن گەرانی تێـدا نی‌یـەو پەری مەلی ئەنـدێشـەی ئەو كەدەبێ لەجیـهـانـی بەرینی مەلكـووتـدا خەریكی تەماشا كردن بێت، لە قەفەسێكی بچووكی زینداندا دەگەرێ.

ئەم رەنـدە بارسـووكـە، ئەم سۆفیـە ئازادو ئەم عارفـە خاوەن دڵە بەســروشـتی بڵنـدو هۆشی ئازادو بەم هەمــوو هونــەرو زەمینــەو ئامادەیی‌یەوە كە وەك نوقتەیەك بەسەر حەرفێكەوە هاتووە چۆنێ بوێ ئەوان وا ساز دەدات حاڵ و مانـای جیـاوازی ئەوان بەیـان دەكات و بەهــۆیــەوە دەیــەوێ تێگـەیشتنی دەروونی (یـابـاتینی)ی خۆی پیشــان بداو وەك خاوەن دێ نابینێ كە ئەوەی هەستی پێ دەكـات لەنـاودڵیـدا نیـژ راوەو ناڵـەی پر دەردی خۆی لە دەروونـەوە هەڵـدە شێ، بەداخـەوە لە بەردەستی یادگـار نووسانی ئێمە دابووە بەپیرە مێـردێكی پەرپـووتی بەتـاو گیـان تێدا ماو كەبووە بەشتێكی كلۆڵ و ئاوارەو وەك هەژارێـكـی بێ نەوا كەبـۆ دەستـكـەوتـنی زانست و مەعریفەت بچێتە بەردەرگای چەند زانای لەخۆرازی، كە بەوپەری داخەوە ئەم زانا خۆپیشاندەرانە لەرووی گاڵتە پێ كردنەوە بڵێی وەك ئەوەی ویستبێتیان ئەم خۆهەڵواسەرە (واتە ـ طفیلی)یە نەخوێندەوارە لەخـۆیـان لادەن، ئەوەیـە داوای لێـدە كەن كە لەسـەرمای سەختدا سەهـۆڵ بشكێنێ‌و بچێتـە ناو حەوزی مزگەوتەوە. ئەم هەژارە سادە دڵـە، لەرووی ناچــاریـیــەوە ئەو كارەبـەجێ دێنێ، پاش ئەوەی لەسـەهۆڵاوەكە دێتە دەرەوە خۆی بەزانایەكی دانشمەندو شاعیرێكی تواناو ئەدیبێكی تەواو دەبینێتەوە. هەڵبەت ئەم چەشنە بیركردنەوەیەو ئەم چەشنە بیۆگرافی نووسینە بۆشەرحی حاڵی بابەتایەر تەنیانی‌یە، بەڵكو مێژوو نووسانی ئێمە (مەبەستی فارسەكانە ـ ٤ ـ) بۆزۆربەی پیـاوانی گەورەو شاعیـران ئەم چەشنـە ئەفسـانـە كۆنـانە دروست و سازدەكەن و دەبێ بڵێی چونكە راستیان لەبەر دەستدا نەبووە، لەبەر ئەوە بەرامبــەر بەراستی دەست كەوتن بێ دەســەلات وەستــاون و دەستی پارانەوەیان بەرەو ئەفسانە درێژ كردووە.

هیـوا وایـە كە دانشمـەنـدان و زانایانی هونەروزانست پەروەران بەتـەجـروبـە روو بكـەنە رێگەیەكی كاریگەرتر، تا ئەدەب دۆستان بتــوانن بەبیــرێكی كراوەو ئاوەڵـەو باوەرێكی تەواوەوە لە ئەنجـامی كۆشش و كاری ئەوان سوود ببینن و بەهـرەی لێ وەرگـرن و گومرای درۆسازگەران و ئەفسانە بێژانی مێژوو نەبن (١٩)

ئەم پێشەكی‌یەش بۆچوونێكی تری تێگەیشتنی جیهانی بابە تایەر بوو. ئەوەی لە پەراوێــزی ئەو چەنــد دێــری پێشــەكی‌یـەدا دەبێ بووترێت دووشتە:ـ

یەكـەم ـ ئەو چوارینـەی بابـەتـایـەر كە تاقە چوارینە خاوەن پێشەكی بەنموونە هێنابێتی‌یەوە، لای خاوەن پێشەكی بۆبەنموونەی پێناسینی دەروون و رێبازی سۆفیانەی بابەتایەر. كەچی لەشوێنێكی تردا ئێمە لەزمـان مامـۆستـا عەلائەدین سوجادی‌یەوە ـ واتە ـ مێژووی ئەدەبی كوردی‌یـەوە ئەو چوارینـەمـان كرد بە بەڵگـەی ساڵی لەدایك بوونی بابەتایەر ـ كە مامۆستا سوجادیش پشتی بە سەرچاوەیەك بەستوو ئەو چوارینـەی بەوچەشنـەكـرد بە بەڵگـەی ئەوەی بابەتایەر ساڵی ٣٢٦ لەدایـك بووە. بەڵام وەك دیمـان لێـرەدا قووڵیـەكی تری درایەو كرا بەنموونەی سۆفیانەی لەجیهان گەیشتن.

دووەم ـ دیـارە خاوەن پێشـەكی زۆر لەم چەشنە حیكایەتانە توورەیەو تێكـەڵ كردنی راستی‌و ئەفســانــەی بەلاوەدووری‌یــە لەزانست و

لەگێرانەوەی ژیانی ڕاستەقینەی شاعیران. کە هەر لەباری سەرنجی زانستەوە دەبێ تۆزێ هێمن بێتەوە، چونکە لای هەموو گەلان کە ئەو بابەخە ئەفسانەیی یە دەدرێت بەشاعیر، ئەوە خۆی لەخۆیدا بە گەورە زانینی شاعیرە، باوەڕی خەڵکە بەوەی شاعیر کەسێکە توانای لە کەسانی ئاسایی زیاترەو کاری لە وزە بەدەری لەدەست دێت.

بەڵێ ـ بۆیەکێکی وەك بابەتایەر بیری ئەفسانەیی، تێکەڵ بە باوەڕی سۆفیانە بووە، بەڵام شاعیری وامان هەیە پێوەندیی بە سۆفێتی یەوە نی یە، بەڵام خەڵك وای دادەنێن کەزۆر شتی لە وزە بەدەر بزانێ و زۆری لەدەست بێت. ئەمە لای زۆر لەگەلان ـ لای ئێمەش هەر فەقێی تەیرانی سەر بە سۆفیزم وخاوەنی (شێخ سەنعان) نی یە کە خەڵکی وای دادەنێن کە زمانی هەموو باڵندەیەك بزانێت، بەڵکو زانینی زمانی ئاژەڵ و باڵندەو لەگەڵیاندا دووانی دەدەنە پاڵ شاعیرێکی وەکو عەلی بەردەشانیش، کە لە جیهانی سۆفیزم دوورە. وەك ووتمان ئەمە باوەڕی خەڵکە بەشاعیر، ئەوە چ جا کە ئەفسانەو سۆفیزم تێکەڵ بن و مەڵبەندو چەرخیش ـ پێوەندیان بە ئەفسانەوە هەبێت. . . بۆ ئەمڕۆش ئەم چەشنە ئەفسانەو حیکایەتانەکانی وێنەی جوانی ئەدەبیاتی ڕیالیستین و دەبێ بەو چەشنە بۆیان بچین.

ئەو فەسڵەی ڕۆژ هەڵاتناسی ئینگلیز ئەدوارد گرانفیل براون لە مێژووی ئەدەبی ئێراندا بۆ بابەتایەری تەرخان کردووە شتێکی دیارو بەنرخە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم فەسڵە هەمووی کراوە بەکوردی ـ باسی ساڵێك لە مەوپێشیش بێت و [٢٠] وەرگێڕانەکەی باشەو لەلایەن نووسەرێکی ناسراوو لێهاتووەوە وەرگێڕاوە وەرگێڕ چەند پەراوێزی بەنرخیشی بۆ نووسیوەوە بە پێشەکی یەکی بچووکیشەوە پێشکەشی کردووە. لەبەر ئەوە هەموو فەسڵەکە لێرەدا تۆمار ناکەینەوە، بەڵکو لای هەندێ ئیشارەتی پێویست دەوەستین.

وەرگێڕ لەباسی براوندا ئەوەندە دەڵێت کە ئەم وەك هەندێ ڕۆژ ـ هەڵاتناسی ترنی یە. بەڵکو. ئەوەی لەبیر ناچێتەوە کە لە ئاست بابەتایەرا کەمێ بسڵەمێتەوەو کتوپڕ بە (فارس)ی دائەنێ، وەکو زۆری کە، بەڵکو ئەم ئەڵێ: بابەتاهیر ئەم شاعیرەیەکە چوارینەکانی بەلەهجەیێکی تایبەتی ووتووە. . ئەگەرچی بۆجارێکی تر سەری لێ تێك ئەچێتەوە. ئینجا لەبەر نەزانی یا کەمتەرخەمی بێ، تەنانەت ووشەی (لهجە)ش بەکار ناهێنێ [٢١] وەرگێڕ بەرپەچی ئەوانەدەداتەوە کەلوڕ بەکورد نازانن و دەنووسێ:

«بەڵام یەك لە پێویستی یە گرنگەکانی مەرجی نەتەوایەتی کە هەستکردنی هاوبەشی دەروونە ـ تکوین نفسي مشترك ـ ئەم بڕیارەیان لێ پووچ ئەکاتەوە. لەلایەکی تریشەوە ڕوانینێك بەبنکەی (ڕێزەمانی) و جۆری پێك هاتنی ووشەکانی ئەم لهجەیەدا بۆمان دەرئەخا کە بەلایەنی کوردی یەوەدایە نەفارسی. . سێیەم بەڵگەش ئەمەیە کە زەوقی شیعرەکانی بابەتایەر (وەکو لەم ووتارەدا ئەیخوێنینەوە) جیاوازە لەگەڵ شیعری فارسی. . [٢٢]

لێرەشدا هەر ئەوەندە لەبەرگری یەزانستی یەکەی وەرگێڕ زیاد دەکرێ ـ کەوەك لەمەوبەر ووترا ـ ڕای گەل، واتە ـ ئەوەی کە هەڵگرانی دیالێکتەکە خۆیان بەکورد دەزانن و یەکێتی زمان و مێژووو خاکیش ئەو بڕیارەیان لێ پووچ دەکاتەوە.

هەر بەمەبەستی لێدوان و موناقەشە هەندێ لەڕاکانی براون و پەراوێزەکانی وەرگێڕ تۆمار دەکەینەوە.

براون نووسیوی یە:

. . بابەتاهیر کە تەخەلصی (عریان) بووە، چوارینەکانی دووجار چاپ کراوە. یەکەمجار لەگەڵ تەرجەمەیەکی فەرەنسی لەلایەن مامۆستا «کلیمان نۆیار»ەوە لە «گۆڤاری ئاسیایی» ژمارەی نۆڤەمبەرو دیسەمبەری ساڵی ١٨٨٥دا بڵاو کراوەتەوە (کۆمەڵەی هەشتەم، بەرگی ٦)، دووەمیان لەگەڵ تەرجەمەیەکی ئینگلیزی بەپەخشان و لەسەر نووسین وگەڵێ لێدوان لەلایەن میستەر «ئەدوارد هرۆن ئەلین»ەوە لەناو کتێبی Lament oF Babu Tahir واتا (چوارینەکانی بابەتاهیر) کە لە ساڵی ١٩٠٢دا بڵاوکراوەتەوە، لەم کتێبەدا خاتوو «ئەلیزابیث کورنیس بریزتۆن» بە هەڵبەست چوارینەکانی وەرگێڕاوەو لەچاپی داوە. منیش ـ واتەبراون ـ لە بەشی یەکەمی کتێبە کەمدا چەند لاپەڕە یەکم بۆباسی لەهجەکانی فارسی و ئەم شیعرانەی پێیان ووتراون تەرخان کردووە. وە بەتایبەتی باسی شیعرەکانی بابەتاهیرم کردووەو سێ چوارینی بەناوبانگی ئەوم بەهەڵبەست بۆ ئینگلیزی گۆڕیوەو لەگەڵ بنەڕەتە (فارسی)یەکەی نووسیوەتەوە. . . [٢٣]

کورد دەڵێن: . . ئاگردان لە ئاگر گەرمترە. براون لێرەدا ڕاست و ڕەوان ئەم شیعرانەی بابەتایەری کورد بە فارسی دائەنێت. هەرچی شۆڤینی یە فارسەکانن، ئەوا جاروبار تۆزێ پێچ وپەنای تێدەخەن و بەشەرمەوە دەنووسن: ئەشعاری عامیانەی باباتاهیری عوریان، واتە ئەوە جێگیر ئەکەن کە شیعرەکان بەشتێکی جیاواز لە زمانی ئەدەبی فارسی نووسراون، ئیتر ئەوشتە بەزمانی عامی، واتە قسەکردن دادەنێن و ئەوسا دێن ئەوزمانی قسەکردنە لەکوردی

دابیـرن و بیـدەن بە فارسی . هەرچی میستر (براون)ە ئەوا بێ پێچ و پەنـاو، چ شیعرەکان و چ دیالێکتەکە هەردووکیان دەکات بەفارسی و کەوەك ووتمان ـ هەردووکیان لای ئێمە کوردیی تەواون .

ئەمـەلایەکی ئەو قسانە، لایەکی تریش ئەوەیە ـ کە براون باسی دووجـار چاپکـردنی دیـوانی بابـەتـایـەر دەکـات ـ لە ئەورووپـاو بەوەرگێـرانی زمـانی ئەورووپی یـەوە، لەکـاتێکـدا ئەگەر مەبەستمان چاپی جیاجیای دیوانی بابەتایەر بێت ـ بە ئەسڵی زمانەکەی خۆی، ئەوە گەلێك چاپی هەیە ـ هەروەك تەرجومەی عەرەبیش کراوە.

براون لە شوێنێکی تـردا کەدێتـە سەری شیعـرەکانی بابەتایەر بە (دەستکـردی پیـاوی ساکـاری دیهـاتـەکـان دادەنێت . وەرگێـر لەم بارەیـەوە دەنـووسێ : ئەمـە ئەگـەر لەچـاو ئەدەبی فارسی یـەوە بێت شتێکی تـرە . بەڵام لەچـاو ئەدەبی کوردی کەچەشکەیەکی تایبەتی و ڕێچکـەیـەکی تـری گرتـووە، ناگـونجێ . . [٢٤] دەتوانین لەم بارەیە شەوە پشتی وەرگێـر بگـرین و بڵێین : براون دەیـەوێ ئەم لایـەنی کێش و وشـەو خاسیەتی کوردی دیاری‌یەی شیعری بابەتایەر بباتەوە سەر ئەوەی کە (دەستکـردی ساکـاری دێهاتەکانن)، کاك بیماریش دەیەوێ بڵێ ـ ئەمە خاسیەتی شیعری کوردی‌یە، بەڵام بۆوابڵێی و بۆ هەرزێك و ڕەوان نەڵێی ـ کە ئەوەی خەیام شیعری فارسی‌یەو ئەمەی بابـەتـایەر شیعری کوردی‌یەو هەر لەبەر ئەوە لەیەکتر جیاوازن و کاك بیمـار خۆی ووتـەنی شیعـری کوردیش چەشکـەیـەکی تایبـەتی و ڕێچکـەیـەکی تری گرتـووە) و هەر لەسـەرەتاوە لە ئەدەبیاتی فارسی جیـایـە، با زۆر خاسیەتی یەکگرتووی لەگەڵ هەموو ئەدەبیاتی ڕۆژ هەڵاتیشـدا هەبێت . هەرچی ئەوەی کە ئەم چوارینـانـەی بابـەتایەر ناگەنە چوارینەکانی خەیام، ئەوە موناقەشەیەکی درێژتری دەوێت ـ بەڵێ دەگـونجێ ـ بڵێی بایـرۆن یا بودلێـرنـاگـەنـە شکسپیـر یا بەپێچەوانەوە . ڕەنگە بۆ چێژ و لێکدانەوەی هەر شاعیرەو هەر رایەش لایەنگری خۆی هەبێت .

ئەم بەراوردی خەیـام و بابـەتـایـەرەش هەر لە کۆنجی ئەم بۆ چوونـەوە زۆر دەگـونجێ و دەبێ باسی بکـەین . لەئـەدەبیـاتی بەراوردکردندا، دەگونجێ دوو شاعیری، دووزمانی جیاواز، یا دوو گەلی جیـاواز بەراورد بکـرێن، هەروەك دەگونجێ دووشـاعیری یەك زمـان ویـەك نەتـەوە . لەیـەك چەرخـدا یا لەچەرخی جیاوازیش دا بەراوورد بکـرێن . براون بە چەنـد دێـرێـك خەیـام و بابـەتـایەری بەراوردکـردووە . هەڵـەی گەورەی براون لەوەدایە کە بەشاعیری‌یەك زمـان و یەك نەتـەوە بەراوردی کردوون، کەوەك وتمان ئەمە هەڵەیەو زمـانی شیعـرەکانی بابەتایەر لای ئێمە کوردی‌یە فارسی نی‌یە، هەر لەبـەر ئەوەو لەبـەر ڕەچـەڵەك و مەڵبەندیش هەر بە کوردی دەزانین . لەبەر ئەوە دەبوو بەشاعیری دووزمانی جیاو دوو نەتەوەی جیا بەراورد بکـرانـایـە، ئەوسا قسەکانی کاك بیمار وەك بڕیارێکی «مێژوویی و «ئیستاتیکی»ش جێی خۆیان دەگرت و قسەکانی براونیش هەر بەو چەشنـە ڕاست دەبـوونەوە . بەڵام باهەر لەسەر ئەو بڕیارەش چاوێك بە بەراوردەکەی براوندا بگێڕین .

بەڵێ ـ بامـونـاقـەشەی کوردیتی و زمانی کوردی بابەتایەر بخەینە لاوەو بۆچـەنـد تاوێـك لەگـەڵ براون بەچـاوی ئەدەبیـاتی فارسیش تەمـاشـای شیعـرەکـانی بابـەتـایـەر بکـەین . ئەبێ ئەوسـا بڵێین : قسـەکـانی بابـەتـایـەر «دەستکردی پیاوی ساکاری دێهاتەکانن» کە پێچـەوانـە ـ کەشمـان گرت دەبێ هەر بەووتـەی ئەوچوارینـەکـانی خەیـام . . دەستکـردی پیـاوی تێگـەیشتـوو وشـاری بن . هەروەك بەووتەی ئەو «لە لایەن دارشتنی و تەومەعناوە ناگاتە ئەو چوارینانەی کەپیـاوە هونـەروەرەکانی وەکو (عمر خیام نوسیویانە». واتەبەپێی ئەم قسـەیـەبێت ـ ئەو ووتانەی بابەتایەر کە «ساکارودێهاتین» لەوتەو مەعنـاوە ناگـاتـە چوارینەکانی خەیام، کە دەبێ ئەوهونەروەربێت و بابـەتـایـەر نا؟ لێـرەدا شوێنی خەیـام جێی ئینکارولێ کەم کردنەوە نی‌یـە . بەڵام قسـەکـانی بابـەتـایـەر نەسـاکارو نە دێهاتین . بەڵکو قووڵ و بەرهـەمی شارستـانن . ئایاشاعیری شارستانمان کەمن کە بۆنی گوڵـە کێـوی‌و دەنگی خورەی قەڵبـەزو تاڤگـەو ڕەنگی سپی‌و سەوزی چیـاو دەشت سەر تاپـای شیعـرەکانیان بگرێتەوە؟ . ئەمە لە ئەدەبیـاتی هەمـوو جیهاندا هەیە . هەرچی ئەووتەومەعنایا نەیە کەبە «دێهـاتی»و «سـاکـار» دراونـەتـە قەڵـەم، ڕاستە ئەوانە لەشارستانی فارس دوورن، بەڵام زادەی شارستانی کوردەوارین، زادەی هەمەدانن .

• هەرچی قووڵی بیرو فەلسـەفەیە، ئەوە ئەگەر خەیام زۆرتر لەرێی مەیـەوە خۆی بیـاتـەوە سەر مەسـەلـەی ژیـان و مردن و بوون، ئەوا بابەتایەر یەکسەر خۆی بەم مەسەلانەوە بەستووەو هەموو شیعرەکانی سەر بەرێگـەیـەکی بیـرکـردنـەوەی سۆفیـانـەی قووڵەو لەم بەرە بەرە لێکـدانـەوەیـەی شیعرەکانی بابەتایەردا ئەم مەبەستانە دەردەخەین و ئەوسـاش دەپـرسینـەوە : کواساکـاری‌و لادێیـەتی؟ . دیسـانـەوە دڵنیـنەوە . ئەگەر دیمەنی شارستانێتی لەشیعری خەیامدا، ئەوەبێت کە زمـانی شیعـرەکانی ئەوسەر بە ئەدەبیاتی ڕۆژ هەڵات وئەوزمانە تێکـەڵـەیـە کەشیعـری ڕۆژ هەڵاتی پێ نووسـراوەو لە زۆر لایـەنەوە

کاری ئەدەبیاتی عەرەبیی تێدا دیارە، ئەوا چ شیعری بابەتایەرو چ شیعری کوردی ئەم چەرخە زۆرتر دەچێتەوە سەربنچی فۆلکلۆری کوردیو لە رووی کێش و زمان و وێنەوە کاری فۆلکلۆری تێدا دیارە. بەڵێ لەم لایەنەوە رەگەزی لادێ دیارە، بەڵام دیاردەکە خۆیوچەشنی سوود بینینەکە لەو کەرەسە لادێیی یە، دیاردەیەکی شارستانی یەو هەر لەشارستاندا پێك هاتووە. هەرچی سیفەتی هونەرروەر بەخەیام و کەسانی تردانە لەسەر حسابی داماڵینی ئەو سیفەتە لە بابەتایەر ـ بۆئەمەش، دیارە ناڵێم بابەتایەر هونەرمەند ترە، چونکە ئەمەش لێکۆڵینەوەو بەراوردی گەورەترو قووڵتری دەوێت، بەڵام هەر بەپێی چێژ لە شیعر وەرگرتن و بەپێی بەکارهێنانی هەندێك ئامێری ئیستاتیکی ـ رەنگە رەخنە گری ئەوتۆ هەبێ، بابەتایەر بەهونەرمەند تردابنێ.

هەرچی لایەنی بیر و فەلسەفەشە، ئەوە تەواو جێی موناقەشەیەو رەنگە لەهەندێك لادا تەواو پارسەنگی بابەتایەر لەلای ئێمە قورستربێت. بۆلایەنی تری هونەریش ئەوە شتێکی تریش هەیە دەبێ بووترێت. ئەویش ئەوەیە کە چوارین یا (رباعي) لەخۆیدا جۆرێك گۆرین و بەرەوپێش بردنی شیعری رۆژ هەڵاتە، زۆرتری ئەوانەی لەم بابەتەدوواون، بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر عەرووزیشیان نووسیووەو ئەم بابەتە شیعرانەیان ناو ناوە «دوو بەیت»، واتە ـ تەنانەت سەرچاوە عەرەبیەکانیش ئەم بابەتە دەبەنەوە سەر فارسیو زۆرتر. خەیام بەسەرەتای ئەم بابەتەدادەنێن. چوارین ـ بابەتێکی هونەرییەو خاسیەتی خۆی لەرووی جوانیو ناوەرۆك و روخسارەوە هەیە. حەزدەکەین لە دەرفەتێکی تردا بێینەوە سەر ئەو باسە بەدرێژی، بەڵام لێرەداو هەر لەسەر قسەکەی براون دەڵێین: ئایا داهێنانی بابەتێکی ئاوا گرنگ کە تا ئێستاش، چ لە شیعری ئێمە داو چ لە شیعری گەلێك میللەتی تردا ماوەو تەنانەت تازە ناوی.. شیعری پۆستەر، یاپۆستەری شیعری.. لێ دەنرێت. ئایا داهێنانی بابەتێکی ئاوا، شتێکی گەورەی هونەرمەندانە نی یە. ئایا ئەمە کراوەییو دیمەنی شارستانێتیو دەست پێشخەری یەکی هونەرمەندانە بۆبابەتایەر تۆمار ناکات.

دیارە ئەوەش کە بابەتایەر پێش خەیام ژیاوە جێی موناقەشە نی یە.

یەکێکی تر لەچاپەکانی دیوانی بابە تاهیر چاپی رەجەبی یەکە چەند پێشەکی یەکی بچووکی بۆنووسراوە. هەرچەندە ئەم پێشەکی یانە زۆرتر بەلای ئەوحیکایەتە ئەفسانی یەیانەدا دەچێ کە دەربارەی بابە ـ تاهیر دەگێردرێنەوە کە هەندێ جار لەپاڵ ناوەرۆکی قووڵیاندا خۆشیو چێژێکی تایبەتی یان تێدایەو هەندێ بەڵگە بۆ باسی ژیانی بابە تاهیر دەدەن بەدەستەوە لەگیانی رەخنە گریشەوەدوور نین. یەکێك لە پێشەکی یەکانی ئەم چاپە بەفارسی بەناوی (حوسین حماسیان صابر کرمانی) یەوە نووسراوە کە لێرەدا بەشێکی وەردەگێرین. نووسەر دەڵێ:

دلی دارم خریدار محبت
کزوگرم است بازار مجت
لباسی بافتم برقامت دل
زپود محنت وتار مجست

ئێستاش لە داوێنی سەر سەوزی ئەلوەند نەوایی عەشقی بابە تاهیر دێت.

ئێستاش لە دامێنی کێوی ئەلوەند دەنگی پرسۆزو ئاوازو دەنگدانەوەی پر بۆ کوڕووزی ناو دەروونی دڵی دڵسووتاوان دێتە گوێ.

بەڵێ ئەودڵ سووتاوانە، دەنگ بەرز دەکەنەوەو دەزانن هەواڵی دڵ سووتاو هەر دڵ سووتاو دەیزانێ و بەڵام ئەمە نەوای بابە تاهیری عوریانە، سائیبی تەبریزی ووتەنی عوریان و رووت لەپێوەندیی دنیایی وئالۆدەی مادی.

گر دل از علائق کمندەباشی
بمنزل بار خود افکندە باشی
زلیخای جهان کوتاه دست است
اگر پیراهن تن کندە باشی

دەستی ئێمەی تێدا نی یە، کە بابە تاهیر، ئەوگیان سووتاوەی کە نەوای پرشۆرشی لە دڵی ئاشنسانیانی رێی عەشق ومەحبەتدا ئاگرداوەو بەکوورەی کۆمەڵەی دڵداران گڕوگەرمی دەبەخشێ، ئیتر چ رووت وچ پۆشیدەبن، هەرکەسێ دیبێ و لە هەر رۆژێکدا پێی خستبێتە خاکی ژیانەوە، دەبێ ئێمە بۆلای دڵی ئەوو نەوای هەستی پەی رازی ژیان و مەرگ ببەین. هەر ئەوە کە دەڵێ:

من آن بحرم که در ظرف آمدستم
چون نقطه بر حرف آمدستم
بهر ألفی الف قدی بر آید
الف قدم که در الف آمدستم

هەر ئەوزەریای عیرفان و مەعنەویەت وتەواویو مرۆڤیایەتی یە لەقاڵبی تەنگی لەشدا هەیەهاتی کردووەو ووتویەتی:

بقبرستان گذر کردم کم وبیـش
بدیدم قبر دولتمند و درویــش
نەدرویشی بی کفن درخاك رفـتە
نەدولتمند برد، ازیك کفن بیش

بابە تاهیر زۆر بڵند دەڕوانێ، فراوانی بیر لە جیهانی مەعنەویاتدا دەگـەڕێ و لەسنـووری کەللە رەقی ی ووشـك و کوێـرانە پەڕیوەتەوە لەئاسۆی بێ پایانی مەعریفەت و عیرفان نزیك بۆتەوەو ووتویەتی :

اگرمستان مستیم ئەز تو ئیمون
اگر بی‌پاو دستیم ازتو ئیمون
اگر گبریم و ترساوەر مسلمون
بهر ملت که هستم ازتو ئیمون

ساڵـەهـای ساڵـە کە ئاشنای ئاوازی ئەو شاعیرە دڵ سووتاوەین و هەستی پاکی ئەو لەگیان و دڵ کر دەکات و فیغانی دەدا بە گوێدا :

ز دست دیده ودل هر دوفریاد
که هرچه دیده بیند دل کندیاد
بسازم خنجری نیشش زپولاد
زنم بر دیده تا دل گردد ئازاد

چی بکـا تاهیـری عوریـان، بەرگی بە باڵای دڵی دەردمـەنـدی بڕیووەو کەتانی لە خۆشەویستی‌یەو پۆی لە میحنەتە :

توکە نـاخواندئی عیلمی سماوات
توکە نابردەئی رەهـ در خرابات
توکە سودو زیانی خودندانی
بمقصد کی رسی هیهات هیهات

کەواتـە ـ یاران کێن ـ مەقسـەد و مەبـەس لە کوێ‌یـە؟ مەبەست چی‌یــە کە بابــە تاهیـری پەرێشـان خوێنـدنی عیلمی سەمـاوات بەمـەرجی گەیشتن بەو مەبـەستـە دەزانێ ورێ بردن بە خرابات واتە (مەیخانە) بە بێخودی دەزانێ و دەبێ بە جۆری ئەندێشەو گرسەندنی دەروونی بابـە تاهیـر ئاشنا بووبێ، تا ئاگادار یا (واقف)ی ڕاستی ی مەبەست بووبێ.

چوارینـەکـانی ئەم شاعیرە پڕ هەست و ئەم عارفە ئەندێشە بڵندە سۆزو گەرمـی و رازونیــازو خەم و دڵگیـری و یادی خوداو مەرگــەو فیغان و ناڵەی لە نەمانی دنیاو ناپایە داری جیهان ناپەیدایە، ئەوەکە پەند بە هەزارو دەوڵەمەندو وگەورەو پچووك و زاناو نەزان ئەداو ئەناڵێنێت :

دلی دیـرم خـربـدار مـحبت
کز او گرم است بازار محبت
لیباسی بـافته بر قامت دل
زپــود مخـنت وتـار محبت

ناڵــەی بابـە تاهیـرە لە دەست دڵ و ئەم حاڵـەش باشتـرین ڕوو دەردەخات کە بێ ڕەزای خۆی دڵی بەکەسێ داوە ئەگەر تۆحاڵی ئەو دڵـە بزانی، بێ پەروا گرفتـاری ئەودڵـە دەبێت وەك قافلەی دڵداران ڕوو دەکەیتە هەردەی مەڵبەندی دڵدار:

بروی دلبری گرمایلستم
مکن منعم گرفتار دلستم
خدارا ساربان آهسته میران
کەموواماندە ابن قافلستم

داد وفـریـدادی ئەم دڵـە هەموو بیابانی شەیدایی و خۆشەویستی ئاگاداری سەرگەردانی ی خۆی دەکات :

خدایا داد ازین دل داد، ازین دل
کەمویگدم نـگشـتم شـاد ازین دل
چو فردا داد خواهون داد خواهند
بگویم صد هزاران داد ازین دل(٢٥)

دیـارە نووســەری ئەم پێشـەکی‌یـە زۆرتر بایەخی بە سۆزی دڵی عاشق و سۆفی ی بابە تاهیر داوەو هەر بەوەش دەستی پێکردووە، کە بە کوردی دەبێ بڵێی :

ئیستاش لە داوێنی سەر سەوزی ئەڵوەند
نەوای عەشقی بابە تاهیر دێت

نووسەر زام وبرینی بابە تاهیر دەخاتە سەردەست، لای ووشەی (عــوریـان) دەوەستێت وزۆر بە قووڵی لەمـەبـەست ولەولەقـەبـە دەدوێت، هەر لەوێوە بەرەولایەنی (عیرفان و مەعنەویەت وکەمال یا ـ تەواوی ـ و مرۆڤـایـەتیی) بابـە تاهیـر دەچێت و ئەم مەبـەستـانـە هەمووی لێك دەدات.

نووسەر ئەم مەبەستەو ئەم قووڵیی سۆفیزمەی بابە تاهیر بەووردی دەبـەستێت بەهـەستی چینـایـەتی و هەژار پەروەری و دەوڵـەمـەنـد نەویستی بابە تاهیر و زۆربەی سۆفیانەوە :

بگورستان گذر کردم کم وپیش
بـدیدم قبر دولمتندو درویش
نەدرویشی بخاکی بی کفن ماند
نەدولتمند برد ازیك کفن پیش

پاش ئەمە هەر ئەم مەبەستەش دەبەستێتەوە بە دڵی بابە تاهیرەوە، بەخۆشەویستی‌یەوە کە تانوپۆی شیعری ئەو هەر خۆشەویستی‌یەو خۆشەویستی تان وپۆی هەموو شیعرە.

پاش ئەو پێشەکی‌یە هەر لەو چاپەدا ـ چەند لاپەرە لەشێوەی پێشەکی‌یەکی تردا بەناوی (ئەندێشە)وە وبە ناونیشانی (نەقشێ لە بابەتاهیری عوریان) نووسراوە، نووسەر لەوێدا دەڵێ: تاهیر ئەو شاعیرە پەرێشانە یەکە ناڵەی گیان سووتێنەرو نەوای هەژێنەری لەداوێنی ئەلوەندەوە دەگاتە گوێی هەموو جیهان.

گوێندەیەکە کە هەر بەزمانی دڵ وهەستی ووشە دەدوێ وهەر ئەو ئاوازە دڵ ڕاکێشەرانەی ئەوە کەپاش سەدان ساڵ زیاد لە هەموو گۆیندەیەك جێگەی ئەو لەدڵی عارف وعامیدا دەکاتەوە، لەکاتێکدا کە ئەولەوە بەولاوە کە دڵێکی پڕ شۆڕشی ویستووە هیچی تری نەووتووەو ناوەرۆك سازی‌و قافیە پتەوی لە خەیاڵی ئەودا نەبووە.

شیعرەکانی لەکاتی سادەیی‌یەوە ئەوەندە دڵنشین وناڵەیان ئەوەندە بەسۆزە کەیەك ئەندازەکار لەدڵی هەمووان دەکات.

کۆیە ئەو دەنگەگیان سووتێنەرەی نەبیستبێ‌و ئەو کاری تێ نەکردبێ. ئەم عاریفە ناوی لە ئاگری مەحبەتدا بەجۆرێك سووتاوەکە هیچ دڵدارێك بەم چەشنە نەسووتاوەو ئاگرێك کە لە دەروونی‌یەوە بەرەو زمان ئەکشێت، ئاگرێکە نەمروگیان سووتێنەر کە تاجیهان بمێنێ ئەویش دەمێنێ‌و ئەدرەوشێتەوەو ئەسووتێت:

بآهی گنبدی خضرا بسوزم
فلك راجمله سر تاپا بسوزم
بسوزم ارنه کارم رابسازی
چه فرمائی بسازم یابسوزم

ئەوخەمی بەگیان کڕیوەو بۆدڵی لەخەم بەولاوە هیچ بەهایەکی تر نابینێ:

خرم اندل که ازغم بهره‌وربی
باون دل وای کزغم بی خبربی
به‌بازار محبت نقد دادن
کسی دارد درونش سوته تربی

کاتێ کە لە بێ سامانی ناڵەی ئەوسەردەکات وبۆدەردی بێ دەرمانی چارە نابینرێ:

سری دارم کەسامانش نمیبود
غمی دارم که پایانش نمیبود
اگر باور نداری سوی من آی
ببین دردی که درمانش نمیبود

سەرەنجامی ئارامی واقیعی ئەولەنەمان ولەناوچووندا بەرەو دۆست دەبات:

بود درد مودر مونم ازدوست
بودوسل موو هجرونم أزدوست
اگر قصابم ازتن و اگر پوست
جدا هرگر نکرده جونم ازدوست [٢٦]

ئەمە بوو نەقشێکی بابە تاهیری عوریان.

ئەم چەند لاپەرەوباسەش هەرپەرەپێدانی باسەکەی پێشووە، هەر لە کۆی عەشق وسووتان وخۆشەویستی بە سۆفیزم وباسی مان و نەمانی بابە تاهیر دەدوێت، لێرەدا لە چوارینێکیدا ووشەی (دۆست) دووبارە دەبێتەوە کەنیشانەو ئیستیلاحی ناوسۆفیانە. ئەوەی لەم پێشەکی‌یەیان زیاد دەکرێت یا لەپەراوێزدا دەوترێت ئەوەیە کە یەکێك لەچوارینەکان کە کۆتایی‌یەکانی بە ووشەی (بسوزم)ە لە نوسخەیەکی تردا بووە بە (بسوجم)، کە ئەمەیان بوگۆڕین لە (ز)ی فارسی‌یەوە بەرەو (ژ)ی کوردی، بەناو (ج)ی دیالێکتی کوردیی لوڕیدا سەرنج ڕاکێشەرە:

بآهی گنبدی خضرا بسوجم
فلك راجمله سرتاپا بسوجم
بسوجم ارنه کارم را بساجی
چه‌فرمائی بساجی‌یا بسوجم [٢٧]

بەشی سێیەمی ئەم پێشەکی‌یە بریتی‌یە لەچەند حیکایەتێك دەربارەی بابە تاهیر کە لە مێژوو ویاداشتەکاندا تۆمار کراون ـ نووسەرەکە دەڵێ: ڕاستی‌و ئەفسانەیی ئەم حیکایەتانە مەبەست نی‌یەو ئێمە هەر شتێکە دەیگێڕینەوە. دیارەنووسەر ئاگاداری ئەوەیە کە ڕەنگە خەڵکی وەك نووسەری پێشەکی‌یەکەی ترهەبن، لەگێڕانەوەی حیکایەتی ئەفسانەیی دەربارەی کەسی ڕاستەقینەی وەك بابە تاهیر توورەبین، لەبەرئەوە دەڵێ (هەر قسەیەو دەیگێڕینەوە)، بەڵێ واتێمەش (قسەیەو دەیگێڕینەوە)، بەڵام ئێمە ناڵێین (هەر قسەیە)، بەڵکو هەندێك باری سەرنجیشیان دەربارە دەرئەبرین و لێیان ئەکۆڵینەوە.

*** حیکایەتی یەکەم ***

دەڵێن توغرل شای سەلجووقی، کاتێ بۆمەملەکەتان گرتن و دەست بەسەر وولاتاندا گرتن گەیشتە هەمەدان، هاتە خزمەتی بابە تاهیر تا لە هەناسەی قودسیی ئەوپیرە دەروون پاکەو ئەم عارفە بینایە

فەیزێك وەرگرێ ودوعای خێری ئەم ڕۆحانی‌یە دەرگای ڕێی بەختیاریی بۆ بکاتەوە وپەند وئامۆژگاریی لێ وەرگرێ. من هەر ئەوە بەتۆ دەڵێم کە خوای گەورە فەرموویە، کەوا لەگەڵ بەندەکانی خوادا بە عەدل وئینساف بێت. پادشا داوای هیممەتی لە عاشقی عوریانی گیان سووتاوکرد، بابە تاهیر لوولەی ئەومەسینەیەی شکاند کە دەست نوێژی پێ دەششت ولە جێی ئەموستیلە کردیە پەنجەی پادشاوەو دوعای بۆ کردوو وتی برۆ بەهیوای خوا لەجەنگدا سەرکەوتوو دەبیت. وامەشهوورە کە تا ئەوئەموستیلەیە لەدەستی شادا بوو فەتح و سەرکەوتن هاوسەری ئەوبوون و هومای بەختیاری هاونشینی بوو، کە ئوموستیلەکەش شکا، ئەویش شکا. (٢٧)

دەبێ مانای ئەم حیکایەتەچی بی؟

با لەلایەنی باوەڕ وڕاستی وئەفسانەیی ئەم حیکایەتە لادەین، هەر بێینەوە سەر ئەوەی کە لەپێشوودا وتمان:

(هەرچی ئەو حیکایەتەشە دەربارەی توغرول بەگ، ئەوەش ئیحتیمالی ڕاستی وناڕاستیی هەیەو لەمێژ ووتۆماری تەسەوفدا زۆر لەم چەشنە حیکایەتانە دەربارەی سۆفیان دەگێڕرێتەوەو زۆر جار هەر یەك حیکایەتەو ناوی سۆفی یا ناوی پادشای تێدا دەگۆڕیو لەکارێکی بەڵگەیی یاوەسائقی یەوە دەبێتە کارێکی فۆلکلۆریو قابیلی لێ گۆڕین ولێ زیاد کردن).

ئەوسا ئەمەمان ووت ـ هەرگێڕانەوەی ئەم حیکایەتە بەم چەشنەی ئێستای ڕاستیی ئەو قسەیەمان بۆ دەردەخات. چونکە حیکایەتە کە هەروەك هەموو حیکایەتێکی فۆلکلۆری هەر لەم دووسەرچاوەیەدا بە دوو جۆری جیاواز گێڕرایەوە. ئەوەی براون کە کتێبی (راحة الصدور)ەوە وەرگیراوە، وانیشان دەدات کە پادشا بەرێکەوت بابە تاهیری دیوە وئەویش لە (کێوی خزر) هەر تەنیا نەبووەو دوو سۆفیی تری لەگەڵ بوون، کەچی لێرەدا پادشا بەتایبەتی هاتۆتە لای بابە تاهیر.

لەوێدا ـ حیکایەتە کە خوێندەوارانەتر دەگێڕرێتەوەو قسەکانی بابە تاهیر سۆفیانە ترەو بە بەڵگەی ئایەتی قورئان چەسپێنراوەو هەر دووانـدنەکەش لەقسەی (ئەفسانەیی یاداستانیی) نێوان پادشایەك و سۆفییەك دەچێت، هەرچی ئەم گێڕانەوەیەیە ئەوە لەقسەی فۆلکلۆریی خۆماڵی دەچێت.

تێکرا ئەم جیاوازییە بەڵگەی ئەوەیە، کە ئەم حیکایەتانە، لە دیمەنی واقیعی وڕاستییەوە یاهەر لەحیکایەتی ئەفسانەیی سەر بەتەسەوفەوە دێنە ڕیزی فۆلکلۆر وحیکایەتی فۆلکلۆری.

## لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

### * حیکایەتی دووەم *

دەڵێن بابە تاهیر لە ڕۆژانی لاویدا لە زانست بێ بەهرەو نەخوێندەوار بووە، ڕۆژێك بەشەوقەوە ڕووی کردە مزگەوت و مەدرەسەو لەمەجلیسی دەرس ولێکۆڵینەوەی فەقێیاندا دانیشت و لە ماناو گوزارەی (قال وقیل)ی ئەم دەستەیە نەگەیشت، بەیەکی لەفەقێ یانی ووت، ئێوە چیتان کردووە تا لە نهێنیی ئەم زانستانە شارەزا بوون و کەشفی شتی نەزانراوی زانستتان کردووە.

فەقێ ووتی: ئێمە هەموو شەوی سەهۆڵی ئەم حەوزە دەشکێنین ولەم سەرما زۆرەدا خۆمان لەم حەوزەدا دەشۆین. چل جار سەرمان دەبەینە ژێر سەهۆڵەکەوەو دەیهێنینە دەرەوە، کاتێ دێینە دەرەوە ڕازی ئەم زانستانە بۆ ئێمە ئاشکرا دەبێت.

بابە تاهیری سادە دڵ وبە شەوق وچێژ وعەشق وماریفەت بەخودا ئەم قسانەی لاپەسندبوو. کە شەوداهات فەقی‌یەکان خەویان لێ کەوت، هاتە مەدرەسەو سەهۆڵەکەی شکاند وچل جار سەری خستە ژێر ئاو، کەسەری هێنایە دەرێ، نوورێ لە ئاسمانەوە هات وچووە ناودەروونی پاکی بابە تاهیرەوە ودەرگای کەشف و ئیلهامی ئەوئەنجامی ئەم بلیسە خوایی‌یەیە. (٢٨)

ئەمە حیکایەتی دووەم بوو، کە نووسەری پێشەکیی ئەوچاپەی پێشوو (م. درونش)ی پێ توورە بوو بوو، ئەوە بووهەر ئەنجامی توورەیی لەم حیکایەتە ووتی:

«بەداخەوە لەبەر دەستی یادگار نووسانی ئێمەدا بووە (واتە ـ بابەتاهیر) بە پیرەمێردێکی پەڕپووتی بەتاوگیان تێداماو کەبووە بەشتێکی کلۆڵ وئاوارەو وەك هەژارێکی بێ‌نەوا کە بۆ دەستکەوتنی زانستی ومەعریفەت بچێتە بەر دەرگای زانای لەخۆڕازی، کە بەوپەڕی داخەوە ئەم زاناو خۆپیشاندەرانە لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە یا بڵێی وەك ئەوەی ویستبێتان ئەم خۆهەڵواسەرە (واتە ـ طفیلی)یە نەخوێندەوارە لە خۆیان لادەن، ئەوەیە داوای لێدەکەن کە لەسەرمای سەختدا سەهۆڵ بشکێنێ وبچێتە ناو حەوزی مزگەوتەوە. ئەم هەژارە سادە دڵە لەڕووی ناچارییەوە ئەوکارە بەجێ دێنێ، پاش ئەوەی لە سەهۆڵاوەکە دێتە دەرەوە خۆی بەزانایەکی دانشمەندو شاعیرێکی تواناو ئەدیبێکی تەواو دەبینێتەوە.

نووسەر ـ پاش ئەم توورەبوونە ئەم چەشنە حیکایەتە دەداتە پاڵ ئەوەی کە تۆمارکەرانی مێژ ووی ئەدەبیات، شتی بیوگرافیی ڕاستیان لەبەردەستدا نی‌یە لەبەر ئەوە پەنا دەبەنە بەر ئەم چەشنە ئەفسانەو حیکایەتە دروست کراوە پووچانە.

بەلام جارێکی تـر ـ وەلامی نووســەر دەدەینـەوە، کە هەقی ئەم توورەبوون و بۆچوونەی نی یە. چونکە وەك لەکاتی خۆشیدا ووتمان (لای هەموو گەلان کە ئەو بایەخە ئەفسانەیی یە دەدرێت بە شاعیر، ئەوەی خۆی لە خوێـدا بەگــەورەزانینی شاعیـرە، باوەری خەڵکـە بەوەی شاعیر کەسێکە توانای لە کەسانی ئاسایی زیاترەوکاری لەوزە بەدەری لەدەست دێت).

هەروەها وەك ئەوە دووبارە دەکەینەوە. کە بۆ کەسێکی وەك (بابە تاهیـر بیـری ئەفسـانـەیی، تێکـەڵ بە باوەری سۆفیـانە بووە، بەلام شاعیـری وامـان هەیـە پێوەندیی بە سۆفیتی یەوەنی یە، بەلام خەڵك وای دادەنێن کە زۆر شتی لەوزە بەدەر بزانێ وزۆری لەدەست بێت).

*** حیکایەتی سێیەم ***

ئەگێـرنـەوە کە دەروێشێـك بۆدیتنی بابە تاهیری عوریان رێگای کێوی ئەڵوەندی هەمەدانی گرتە بەرو بەخزمەت بابە تاهیر گەیشت، دیی هـەمـوو دەورویشتی بابـە تاهیـر بەفـر گرتـوویەتی بەلام نزیك شوێنی دانشتنی ووشکـە، کە نیـوەرۆهــات دەرویش گرۆس بوو لەگەڵ خوێدا کەوتە بیرکردنەوە، چونکە نزیکی بابە تاهیر خواردنێك نەبوو، بابە تاهیر ئاگاداری بیرکردنەوەو ئەندێشەی ئەو بوو، ووتی:

دەروێش ئێسـتـا کەنیـوەرۆیـە تۆنوێـژی خۆت بکـەو ئیتـاعـەتی فرمـانی خوابـەجێ بگـەینـەو بیـر لەوورگە مەکـەرەوە چونکـە رزق لەرۆژی گەیشتنی خوێدا، زۆر ئەبەخشێ.

بابـە تاهیـر کەوتـە نوێژ کردن ودەروێشیش خەریکی نوێژ کردن بوو، پاش تەواو بوونی نوێــژ بابــە تاهیـر دوعـای کرد، سفـرەو ئاو پەیـدابـوو، ئەو سفـرەیـە جۆرەها خواردنی خۆشی لە سەربوو. بابە تاهیــر ووتـی: بیــســمیــلا، دەروێش دەستی بۆخوانی خواردن درێـژکـرد، خوان لەلای نەیئەنواند، هات بە بیری یاکە بابە تاهیر لە جۆری ئەم ئەندێشەیەی ئاگادار بوو ووتی:

نادەروێش، تۆبەیـادی خوا دەستت بۆئەم خوانـە درێژ نەکرد، بڵێ بیـسمیللاو ئارەزووی خواردن بکـە، بەفـرمـانی بابـە تاهیـری کردو گەڵێك دڵی چووە ئەم خواودنە خۆشانەوە[٢٩]

ئەمیش حیکـایـەتێکی تـر بوو کە لەرووی ئەدەبیاتەوە چەشنێ لە رەگـەزی ئەفسـانـەی تێـدایـەو وەك تر یەکێکی ترە لەو حیکایەتانەی دەربـارەی بابـە تاهیر وسۆفیان دەگێرێتەوە، ئەگەر شوێنیان بکەوین زۆرمان لەم حیکایەتانە دەست دەکەوێت.

بابینـەوە سەرخـاوەن پێشـەکی ـ کە ئەو هەر پاش حیکـایـەتە کە دەڵێ: شەرحی حاڵی گەورەپیـاوان، بەتـایبـەتی عارفان وسۆفیانی گەورە، بەم چەشنـە ئەفسـانـانـە کەبناغەو پایەی زانستی ومەنتیقی و عیـرفـانی یان نی یـە، دەرازێنـرێنـەوە، بەچەشنێك کە وەك حافزی شیرازی ووتوویەتی:

سحر با معجزه پهلو نزند دل خوش دار
سامیری کیست که دست ازید بیضابرد

کەوادەگەیێ:

جادوو وموعجیزە مەخەپاڵ یەك، ئەی دڵی خۆشدار
سامیری کێیە کە دەست بۆیە دی بەیزابەرێ

یاوەك لەشوێنێکی تردا دەنگی بڵند:

فیضی روح القدس از باز مدد فرمایند
دیگران هم بکنند آنچه مسیحی میکرد

یابڵێ:

فەیزی رۆحی قودسی جارێکی تر مەدەد دێنی
خەڵکی کەش، وا ئەکەن، هەروەك مەسیح کردی

مەرجێك هەیە، ئەو مەرجە حافز لەغەزەلێکدا بەیانی دەکات:

گرانگشت سلیمانی نباشد
چەخاسیەت دهد نقشی نگینی

واتە:

گەر ئەموستیلەی سولەیمانی نەبێ
چ بایەخی هەیە، نەقشی نگینی ئەو

دڵ روونـاکان یەقینیان هەیە کە بە ساختەوفێڵی دێوی سولەیمان نەبـوو کە گەورەپیـاوان گەورەبـوون، بەڵکـو بەفـراوانیی ئەندێشەو مەعنـەویـات وروونی دەروون بوو، نەك بەدروستکردنی ئەفسـانەی بێ پایەو بناغەو سەر بەجنۆکەو پەری ومەیموون شۆرکردن[٣٠]

پەراوێز:

(١) لە ساڵی ١٩٨٣دا نزیکەی ساڵێـك لەبەرنامەی هەفتانەی «مێژووی ئەدەبی کوردی»ی رادیۆی کوردیی بەغدادا باسی بابە تایەرم کرد. دووای ئەووتارانە چەند باس و ووتارێکم دی ناوەرۆکی ئەو ریزە ووتارەی تێدا دووبارە کرابوەوە. ئەم ووتارە بریتی‌یە لەرێکخستن و چڕکردن و خەستکردنەوە ولێ زیادکردنی ئەو ووتارانە.

(٢) عەلائەدین سوجادی مێژووی ئەدەبی کوردی. چ٢. بەغدا، ١٩٧١. ل ١٧٠. [لە مەودووا ئەم سەرچاوەیە بە سوجادی ناودەبەین].

(٣) بروانە. گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە ٢ ساڵی ١، بەغدا. کانوونی دووهەمی ١٩٤٠. (محەمەد ئەمین زەکی. ووتاری: زمانی کوردی. ل١١).

(٤) گەلاوێژ. ژمارە ٧. ساڵی ١. حوزەیرانی ١٩٤٠. ل ٥ ـ ٨.

(٥) محمد أمين زكي. مشاهير الكرد وكردستان في الدور الاسلامي، ج١. ت. كريم. بغداد ١٩٤٥. ص ١٣١ ـ ١٣٣.

(٦) رۆژنامەی ژین. ژمارە ٦٠٣. سلیمانی، ١١ تەمووزی ١٩٤٠.

(٧) عەلائەدین سوجادی ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی. بەغدا، ١٩٦٨ ل ١٩٠ ـ ٢٠٨،

(٨) هەر ئەوێ، ل ١٩٤، ١٩٥.

(٩) هەر ئەوێ، ل ١٩٥، ١٩٦.

(١٠) هەر ئەوێ، ل ١٩٦، ١٩٧.

(١١) گەنجینە. بەشێکە لەچوارینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی. دڵزار کردوویە بەسۆرانی. بەغدا، ١٩٦٠. ل ٢٠.

(١٢) هەر ئەوێ. ل ٢٢.

١٣) هەر ئەوێ. لە ٢٢، ٢٣.

(١٤) محمد البدري. رباعيات بابا طاهر الهمداني. بغداد، ١٩٦٩، ص ٥، ٦.

(١٥) لەبەر ئەوە وەرگێرانیان وخستنە بەردەست کوردی‌یان سوودمەندەو دەشچێتە سنووری کاری زانستی‌یەوە.

(١٦) دیوانی بابا طاهر. تاران: ١٣٤٣ (١٩٦٤)

(١٧) هەر ئەوێ.

(١٨) گەنجینە. ل٦١.

(١٩) پ ١٦.

(٢٠) گۆڤاری هیوا. ژمارە ١٣ ساڵی ٤. بەغدا، کانوونی یەکەمی ١٩٦١. ووتاری «عەبدورەزاق محەمەد ـ بابە تاهیری هەمەدانی» ل١٢ ـ ١٦

(٢١) هەر ئەوێ.

(٢٢) هەر ئەوێ.

(٢٣) هەر ئەوێ.

(٢٤) هەر ئەوێ.

(٢٥) دیوانی بابەتایەر. چاپی رەجەبی. تاران. ؟. پێشەکی. (تێبینی: چەندچاپێکی دیوانی بابە تا یەرم لایەکە لەبەر مەبەسی فرۆشتن و بازرگانی ساڵی چاپیان تێدا نەنووسراوە)

(٢٦) هەر هەر ئەوێ.

(٢٧) هەر ئەوێ.

(٢٨) هەر ئەوێ.

(٢٩) هەر ئەوێ.

(٣٠) هەر ئەوێ.

لێكۆڵینەوەی ئەدەبی

# بابا طاهر العريان حول حياته ونتاجه

## (القسم الاول)

الدكتور عز الدين مصطفى رسول
استاذ في كلية الاداب
جامعة صلاح الدين

يتنـاول البحث حيـاة ونتـاج أول شاعـر كردي بارز وقـد قسم البحث لمقتضيـات النشـر الصحفي الى قسمين : يبـدأ البـاحث القسم الاول بجولـة بين المـراجـع مستقصيـا وعـارضـا ومترجما ومعلقا، مع ردود من المنطلق العلمي على آراء بعض المغالين من الكتاب الفرس.

يبـدأ البحث بنقـل الصـورة العلمية التي رسمها العالم الراحل علاء لدين سجادي في تأريخ الادب الكردي للشاعر، ويقول عنها الباحث أنها هيكل نحت بالقلم وتعمق في كنه حقيقة الشاعر وهو أروع تكثيف يقـدم به بابـا طاهـر للقـراء. ثم يبين البـاحث أن الاستهـلال بأقـوال سجادي له سبب أخر، هو كونه أول باحث عن الادب الكـردي كرس عشـرات الصفحـات في كتابه المذكور لبابا طاهـر مستنـدا على نتف من كُتـابات المستشرقين والكرد عنه. ثم ينتقـل البـاحث الى هذه النتف فيبـدأ منـاقشا بما كتبه محمد أمين زكي في «مشـاهيـر الكـرد» وينبـه الى ماكتبـه الشـاعر بيره ميرد في جريدة (ژين) في العام ١٩٤٠ حول الشاعر والترجمة التركية لاشعاره.

وتحت عنوان «بابا طاهر كردي» يناقش الباحث آراء بعض الكتاب من الفرس و(براون) من بين المستشرقين الذين اعتبروا بابا طاهر شاعـرا فارسيـا، ويـدحض اراءهم استنـادا الى الانتسـاب العرقي واللهجـوي عنـد بابـا طاهر الى اللر مما يقره هؤلاء أيضا، ولكنهم يتعامون عن الحقيقة لاعتبارهم اللر من الفرس، اوحتى الكرد من الفـرس، ويضيف البـاحث الى دلائله المختبريه من حيث قواعد اللغـة والفـونتيـك والمفـردات دليـلاً رابعاً عن كردية اللر، هورأي جمهـور اللر أنفسهم، ولايـرى ذلـك عاملا مهما من حيث احترام آراء الشعـوب والنـاس فقـط، بل ولكـون هذا الشعـور عاملا يشد الجمهـور، الى تراث وحـاضـر اللغـة التي ينسبـون انفسهم اليهـا وبوصلة يجذب مستقبل تلك اللغة الى مجرى تطورها ومستقبلها.

ثم يستعـرض البـاحث بعض المقـدمـات المكتـوبة بالفارسية لطبعات ديوان بابا طاهر ويتعرض لها من المنطلق نفسـه، ثم ينقل بعض الحكـايـات عن الشـاعر في تلك المقدمات، التي اعتبرها بعضهم من كرامات الشاعر واعتبرها آخرون خرافات تنسب اليه، ولكن البـاحث ينبـري بين هؤلاء واولئـك برأي آخـر. معتبـراً هذه الحكـايـات ظواهـر فولكلوريـة عن الشعـراء عامـة، لايختص بها المتصوفون منهم وحدهم، بل تروى أمثالها عن شعراء آخرين لم ينتموا الى التصوف، وماذا لك عند الباحث سوى دليل على عظمة الشعراء عند الشعب والتأريخ وسمو منزلتهم عند الناس.

# سیمای داهێنان لە هۆنراوەکانی کامەران دا

«دلشاد علی»
کۆلیژی ئاداب ـ زانکۆی صلاح الدین

## پێشەکی :

زووربـەی ئەو لێکـۆڵینـەوەو نووسینـانـەی کە دەربـارەی (کامەران)ی شاعیر و هۆنراوەکانی بڵاوکراونەتەوە، هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەوری کامـەران لە بـزووتنەوەی نوێخوازی قۆناغەکەیدا دیـاری بکـەن ، ئەمـەش بۆتەهۆی ئەوەی کە گەلێ بیروڕای جیاواز دەربـارەی هۆنـراوەکـانی بەتایبەتی‌و دەربارەی شەقڵی بزووتنەوەی نوێخـوازی ئەو قۆنـاغـە بێنـە ئاراوە . بێ‌گـومـان ئەو باسـانەش بۆ خۆیـان سوودمـەنـدن وکەم وزۆر لە بواری لێکـۆڵینـەوەی ئەدەبـەکەماندا جێگای خۆیان گرتووەو دەشبنە بنەمای لێکۆڵینەوەی تر، بەڵام بەگشتی نەبوونی چەمکێکی دیاری‌کراوی ئەو بزووتنەوە نوێخـوازی‌یـەی کە مەبەست بووە لەلایەك و یەکالآنەکردنەوەیەکی تەواوی تاقیکـردنەوەی هۆنراوەیی لای کامەران لەلایەکی‌ترەوە بۆتە هۆی ئەوەی کە لەگـەلێ ڕووەوە ئەو باس و لێکـۆڵینـەوانـە ئەنجـام بەدەستەوە نەدەن و زۆر لایەنی ئەو تاقیکردنەوەیە هەر بەشاراوەیی بمێنێتەوە .

جا بە نیـازی خەمـڵانـدنی تیـروانینێکی کامـڵ دەربـارەی تاقیکـردنەوەی هۆنراوەیی کامەران و دیاری‌کردنی هەندێ شەقڵ و سیمـای داهێنـان لە بەرهـەمـەکـانیـدا بەو لێکۆڵینەوەو نووسینانەدا چوینـەتـەوەو لەگـەڵیشیـانـدا بۆچـوونی خۆمـان خستـۆتـە ڕوو، بەگشتیش باسـەکـامـان کردووە بەسێ بەشـەوەو لەهـەر بەشێکـدا چۆنیـەتی‌و ڕادەی هەنگـاونـانی کامـەرانمـان لەجیهانی هۆنراوەی کوردی‌دا دیاری‌کردووە .

### هەنگاوی یەکەمی کامەران و دیوانی (دیاری) یەکەی :

پێش بڵاوبـوونـەوەی یەکـەم دیـوانی کامەران لە سـاڵی (١٩٥٧)دا کە دیوانی (دیاری) یە، کامەران خۆی باس لەوپارچە هۆنراوانەی دەکات کە جاروبـار لە هەنـدێ بۆنـەدا لە دایـك بوون، بەتایبەتی ئەو هۆنراوانەی کە دەگـەڕێنـەوە بۆ سـاڵی (١٩٥٤)و پەیـوەندی‌یان بە بڵاوبوونەوەی هۆنراوەی ئاشتی خوازی‌یـەوە هەبـووە، ئەمـە جگـە لەو هۆنـراوانـەی کە ناوبەناو لە گۆڤـاری هیـوادا بڵاوی کردنـەوەتـەوە، پارچـەیـەکیش لەو هۆنـراوانە ئەم چوارینەیەی بووە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٥)و دەڵێ :[١]

بیکەرەوە دەرگای ڕەشی زیندانت
دابڕێژە کۆتی قورسی گرانت
شورە بکێشە لە پەنجەو بازوو
لەناو خوێناوا شوورەکەت ڕۆچوو

ئەم پارچـە هۆنـراوانـەش تابـڵاوکـردنەوەی دیوانی (دیاری) بەتەواوی کامـەرانیـان وەك شاعیـر نەبـەخـۆی و نەبـە خوێنـەرانیش نەنـاساندبوو، هەربۆیە دیوانی (دیاری) یەکەی هەنگاو نانی کامەرانە دەزانین لەجیهانی هۆنراوەی کوردی‌دا .

بەگشتی دیـوانی (دیاری)کە کامـەران خۆی لەپێشـەکی‌یـەکەیدا دەڵێ : «تـازە دەستم داوەتـە هۆنـراوە دانـان لام وایە هەر ساڵێك وچەند مانگێك ئەبێت خۆم پێـوە خەریـك کردووە»[٢] نەك هەر وەك کۆمـەڵـە بەرهـەمێکی هۆنـراوەیی ئەو قۆنـاغـە سەرنجی خوێنـەرانی ڕاکێشـاوە بەڵکـو هیـوای بەرەوپێش چوونێکی بێ سنوویشیان تیادا بەدی کردووە .

(مـارف بەرزنجی) بۆئەوە چووە کە (کـامـەران) : «هەروە خۆی دەڵێ بەڕاستی زۆری دانـاوەو زۆرەکـەش بۆرنی‌یـە ڕەنگینـە. . . لە بابـەتـا شاگـردێکی پێ‌گەیشتووی مامۆستا گۆرانە ، کەمێکیش پرتەوی هەردی لە هەڵبـەستـەکـانیـا دیـارە، بە تایبـەتی لە سۆزی ناسۆری دڵداری لێ تێك چووی بەهۆی خاوەن تەلارووزێرەوە»[٣] .

بەلای (محـمـد صدیق عارف)یشەوە «کامەران یەکێکە لە شاعیرەکانی هەنگـاوی سێ هەمی ماوەی گوێـزانـەوە، هەنگـاوی سێ هەمیش ئەو هەنگـاوەیـە ئێستـا پیـا تێ ئەپـەڕێ، لە مامۆستا گۆرانەوە دەس پێ ئەکا، بەدوای ئەم شۆرشـەی گۆرانـدا چینێـك شاعیـری گەنجی خوێن گەرم لە ئاسۆی هۆنراوەی کوردی‌یەوە سەریان دەرهێنا کە یەکەم زووربەیان کەم و زۆر ئەوشۆرشـەی گۆران کاری تێ کردوون وە دووەم بە بیـروبـاوەڕێکی نوێ‌وە هاتنـە کۆڕەوە، هۆنـراوەکـانیـان لە (ئـایدۆلۆجیەتێکی) تایبەتی‌یەوە

هەڵ ئەقوڵێ بۆ مەبەس و ئامانجێك ئەنووسن»[٤]

هەرلـەم ڕووەوە (د. عیزەدین مستەفا رەسول)یش دەڵێ: «کامەران بە تازەکەرەوە دانانرێ نە لە هێنانەناوەوەی بیروباوەڕی نوێو نە لە روخساری نوێدا، بەڵکـو هەندێ لەو بیروباوەڕە نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی یانە دەردەبـڕێ کە پێش ئەم ولەکـاتی ئەمـدا کۆمـەڵێ شاعیـری تری سەر بە هەمـان بیـرو ـ باوەڕی کامـەران دەریـان بڕی بوو، روخسـارە هونـەری یە تازەکـەش بریتی بوو لەو روخسـارە داهێنـەرەی کە پیـرەمێـردو گۆران ئەنجامیـان دابـوو»[٥] ئەم بۆچوونانە خۆیان ڕوویەڕووی سێ خاڵی گرنگمان دەکەنەوە:

یەکـەم: بنـەمـاو سەرچـاوەی تاقیکـردنـەوەکـانی شاعیرو چۆنیەتی ئەنجامدانی دیوانێکی وەك (دیاری) لە ماوەیەکی کورتدا بێ ئەوەی بێ هێزی بە هۆنراوەکانی یەوە دیار بێ.

دووەم: ڕادەو چۆنیـەتی ئەو پەیـوەنـدی یەی کە لە نێوان هۆزاوەکانی کامـەران و ڕێبـازی نوێی هۆنراوەی ئەو قۆناغەدا هەبووە لە لایەك و پەیـوەنـدی بە بەرهـەمـەکـانی (گـۆران)ی شاعیـرەوە کە رابەرێکی هەرەدیـاری ئەو بزووتنـەوە نوێخـوازی یـە بووە لە لایـەکی ترەوە بەوپێ یـەی هەرسێ نووسـەرەکـەی پێشـوو هێمایان بۆ کردووەو هەر ئەمـەش بۆتـە هۆی ئەوەی کە بیروڕای تروپێچەوانەی ئەو بۆچوونانە لەلای نووسەرانی تر سەرهەڵبدات.

سێیەم: دەنگە تازەکەی کامەران و تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی کامەرانە.

بێگـومـان تا خاڵی یەکەم و دووەمیش بەکاڵانەکرێتەوە بە تەواوی ناتوانرێ تیشکێکی تەواو بخرێتەسەر خاڵی سێیەم و سیمای داهێنان لە هۆنـراوەکـانی دا دیاری بکرێت، لێرەشدا چەمکی داهێنان بەلای ئێمـەوە ڕێبـازکـردنـەوە ناگـەیێنێت بەڵکـو ئەو شەقڵانەی داهێنانە کە زۆرجـارو لە ئەنجـامی مامـەڵـەکـردنێکی نوێ لەگەڵ تاقیکردنەوەو کەرەسەی بنیاتنانی هۆنراوەدا سەرهەڵئەدات.

دەربـارەی خاڵی یەکـەم و دووەم سەرەتـا ئەویـاری سەرنجـە دەخـەینـە ڕوو کە تۆوی لە دایـك بوونی هۆنـراوەکـانی ناو دیـوانی (دیـاری) یەکـەی کامەران جگە تاقیکردنەوەی خودیی شاعیرخۆیو ئاوێتـە کردنی ئەو تاقیکـردنـەوانـە بە تاقیکـردنـەوەی کۆمـەڵانی خەڵکـەوە، هەنـدێ بەرهـەمی ئەدەبی بوونەتە تۆوی تاقیکردنەوەی چەنـد پارچـە هۆنـراوەیـەکی ناو ئەو دیـوانـە. یەکێ لەو پارچـە هۆنراوانەش (پەنجەی تەزیو)ە کە تیایدا دەڵێ:[٦]

لە پاڵ دیوارێکدا، خەمگین
دائەنیشێ (هیوا)ی شیرین
ئەندامی ورد لەشی گەردن
هەموو لەگەڵ یەك ئەلەرزن
دوای هەناسەیەك دەس گێران
لەکونو قوژبنی گیرفان
نەختێ شقارتە دەردێنێ
یەك یەك دایان ئەگیرسێنێ

ئەم هۆنـراوەیـە بەهـەمـوو بیـروونـەو دیمـەنـەکـانیـەوە راستـەوخۆ لە چیـرۆکێکی (هـانـس ئەنـدەرسن)ەوە وەرگیراوە کە بە ناونیشانی (لەشەوی جەژندا)یەو کاتی خۆی لە گۆڤاری گەلاوێژدا کراوە بە کوردیو[٧] باس لە کچـەهـەژارێکی شقارتە فرۆش دەکات کە لە ئێوارەیەکی ساردی زستاندا بەرامبـەر کۆشکێکی رازاوەو ڕونـاك هەڵـدەتـروشکێ و لە سەرمـاندا دەنك دەنك شقارتەکانی دادەگیر سێنێ و خۆی پێ گەرم دەکاتەوە.

هەرلـەم روانگـەیـەوە ئەگـەر بمـانـەوێ ڕادەی پەیوەندی هۆنراوەکانی کامەران لەو هەنگاوە سەرەتایی یەیدا بە بەرهەمەکانی (گۆران)ی شاعیرەوە دەربخەین ئەوا هەر زوو ڕوویەڕووی چەند هێڵێکی دیاری ئەو پەیوەندی یە دەبینەوەو راستەوخۆ چەند پارچە هۆنراوەیەك خۆی دەخاتە بەردەستمان کە لەژێر کاریگەری هۆنراوەکانی (گۆران)دا لە دایك بوون.

لە (بـووکی لادێ)دا کامـەران لایەنێك لە لایەنەکانی چەوساندنەوەی جووتیـارانمـان دەخـاتە بەردەم و سەرەتا بەچەند دێرێك باس لە چۆنیەتی رازانـدنـەوەی کچـە جووتیاری شۆخ و شەنگ دەکات کە بە بووکی بۆ کوڕی جووتیارێکی دەبن، لەپاشدا دێتە سەر باسی ئەو پیلانەی کە ئاغا بۆ کوشتنی کوڕە جووتیار ڕێکی دەخات و کوڕە جووتیاری پێ لەناودەبەن:[٨]

بووك خرایە ڕێ بۆ جووتیار
لەم زنجەوە بۆ ئەو دەوار
هەر دوای دوسێ مانگی تر
بەربوو لەگیانی بەگە ئاگر
پیلان تاڵ تاڵ چنیان بۆی
زۆر ڕێگەو شوێنی دانا خۆی

بەم جۆرە ئەم تابلۆیـە هەر هەمـان تابلۆی هۆنـراوەی (بوکێکی ناکام)ە کەی (گۆران)ەو تەنها جیاوازی یەك کە لە نێوانیاندا بەدی بکرێ لەوە دایە کە لە (بـووکێکی ناکـام)دا هەر لەسەرەتاوە ئاغا کچە جووتیار لەکوڕە شوان داگیـر دەکـات و بەرەو کۆشکی ئاغـا دەخرێتە ڕێ دوای ئەوە ئینجا پیلانی کوشتنی کوڕە شوان ڕێـك دەخـرێت.[٩] لەکـاتێکدا لای (گۆران) جوانی سروشت بێ بزەی ئازیـزو جوانی ئافـرەت لاسـەنگ دەوەستێ و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێ:ـ[١٠]

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکی یە بێ بزەی ئازیز

لای (کـامـەران)و لە هۆنراوەی (جوانی بەهار)ە کەیدا هەمەن بیر بەدی

دەکرێ و لای ئەمیش باش پیشاندانی تابلۆی جوانی سروشت لە بەهاردا بە نزیکەی بیست دێرێك ئینجا دەڵێ :[11]

کیژۆڵەی نازدار ئەم دەشت و چەمە
لارو لەنجەی تۆ بزەی تۆی کەمە
ورشەی کراست کە پێ لەم دەشتە
ئەوساکە ئەڵێم باخی بەهەشتە

لەهۆنراوەی (جارانم)دا (کامەران) ئاور لە رابووردوو دەداتەوەو باس لە ژیانی شێواوو دڵی تەنگ و پەژارەو ناسۆری ئەو رۆژە رابووردووانە دەکات تا دێتە سەر ئەوەی کە پەنجەی خۆشەویستی زامەکانی رابووردووی سارێژ دەکات و سەرچاوەی شادی دەتەقێنێتەوە، خۆشەویستی‌یەکەش لێرەدا خۆشەویستی نیشتمانەو دەڵێ :[12]

جاران دڵم بە مەئیوسی
دێری خەفەتی ئەنووسی
تەرمی زەوقم ست ئەگەرا
کڵپەی پەژارەم ئەگرا
-------------
نەگوڵ بەو رەنگانەوە
نەچڵ بەو چرۆیانەوە
نەمۆسیقای شەماڵ، هاوین
نەهاژەی ئاوی کەف زیوین
نەجریوەی مەلی سەرچڵ
نەغەمزەی کچی رووومەت گوڵ
سارێژیان نەکرد زامی من
بریتی جەرگێکی کون کون
تا پەنجەی تۆ، پەنجەی نەرم
سارێژی کرد زامی گەرم

هەر ئەم تابلۆیە بۆخۆی هەمان تابلۆی (نیاز)ەکەی (گۆران)ە، تەنها جیاوازی‌یەکیش کە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ ئەوەیە کە تەمی مەینەت لابەرەکە لای گۆران جوانی و خۆشەویستی ئافرەتە ئەگینا وێنەکان بەهەردوو دیوانداو لە هەردوو پارچەهۆنراوەکەدا بەتەواوی وەك یەکن، (گۆران) لە (نیاز)ەکەیدا دەڵێ ![13]

سەردەمێك بوو دنیای گیانم تاریك وچۆڵ بوو
تام (بەرۆچکە)ی گەرمە دڵم چەشنی سەهۆڵ بوو
-----------------
سەردەمێك بوو نەتریفەی مانگی هاوینم
نە گزنگی هەتاوی سەر لوتکەی بەفرینم
نە لەرزینی چینی سەر رووی گۆماوی شینم
نە بریقەی دووری چەمی پاش زۆر بارینم

## لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

نە ورشەی گیای مێرگی سەوزی دەم و بەهارم
نەشنەی بای دارستانی چڕی نزارم
چەشنی جاران دای ئەخورپان ناخی دەروونم
ئەیهێنایە سەر هەڵقوڵین سەرچاوەی ڕوونم
-----------------
لەو ڕۆژەوە دیومە سیحری زەردەخەنەی تۆ
دنیای دەروون مەلەکانی هاتوونەتەوە گۆ

جگە لەم هۆنراوانە، هەندێ تابلۆووێنەهونەری‌یەکانی (گۆران) لە هەندێ پارچەهۆنراوەی دوای دیوانی (دیاری) یەکەی کامەرانیشدا بەدی دەکرێ، بۆنموونە ئەوەوێنانەی کە لە هۆنراوەی (بۆگەورەیەکی شیعر دۆست)ی (گۆران)دا دەبینرێ بە تەواوی لە (تۆسقالێك لە دڵم)ی کامەران دا رەنگیان داوەتەوە.

سەرەرای ئەو تێروانینانەو هەر لە سنووری لێدوانماندا دەربارەی خاڵی دووەم، کاتێك ئاور لە لێکۆڵینەوەکەی (کاکەی فەللاح) دەدەینەوە، سەرەتا ئەوەی کە سەرنجمان رادەکێشێ ئەوەیە کە بەلای (کاکەی فەللاح)ەوە : «کامەران لە شیعردا رێبازی بابەتی ریالیزمی شورشگێرانەی ئاودراو بەسۆزو هەستی نەتەوایەتی گرتۆتەبەر»،[14] بێگومان ئەم چەمکەی ریالیزم کە (کاکەی فەللاح) دەست نیشانی دەکات بۆخۆی ئەوە دەگەیێنێت کە هۆنراوەکانی کامەران سەربە رێبازی ریالیزمی سوشیالیزمی نی‌یە، هەربۆیە بەلایەوە رێچکەکەی (کامەران) : «بەرموپێدانی هەمان رێچکەو رێرەوی ئەحمەدی خانی و حاجی قادرو سالم وپیرەمێردو بێ‌کەس و هێمن مهابادی‌یە لە جیهانی شیعری کوردیدا»،[15] لێرەداو وەك دەبینرێ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە شاعیرەدا ناوی (گۆران) ناهێنێت، ئەم تێروانینەش زۆرجارو بێ مەبەست خوێنەری بەرەو دوو هەڵەی گەورە بردووەو تائێستاش لای هەندێ ئەدەب دۆست بەدی دەکرێ، یەکەمیان : دورخستنەوەی (گۆران) رێچکەیە وەك ئەوەی (گۆران) نەهۆنراوەی نەتەوایەتی هەبوویێ و نەدڵسۆزی نەتەوەکەشی بوویێ، دووەمیان : دوورخستنەوەی کامەران و هۆنراوەکانی کامەران لەمەیدانی خەباتی چینایەتی، هەربۆیە بەلای (کاکەی فەللاح)ەوە لای (کامەران) : «ناو بەناو لێرەو لەوێ ناوی هەژارو جووتیارو پاڵە دەبیستین و دەبینین و تەواو ،نەبوون بە ژێر دەست وپێی بیرو باوەرە گشتی‌یەکەوە».[16]

لێرەداو هەروەك (د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ) دەڵێ : «کەسانی هوشیار لە قاوغی یەکگرتووی یەك نەتەوەدا چینە جیاوازەکانی ناو نەتەوە دەبینن»،[17] دەتوانین بە دڵنیایی‌یەوە بڵێین کە (کامەران یش ئەوەندە هوشیار بووە کە نەك هەر چینەجیاوازەکانی ناونەتەوەکەی دەبینی بەڵکو ئەوەندە هەستی بەو جیاوازی‌یە چینایەتی‌یە کردووە کە دەیزانی کامەیان دڵسۆزترن، هەربۆیە لە دیوانی (دیاری) یەکەیدا هۆنراوەکانی (کچەشوان)و (پەنجەی تەزیو)و (بووکی لادێ)و (میوەی نازدار)و

(پەشیمانی)و (هێلانەی ئارام)و (پەنجەی ژیان)و (گۆرانی من)و (رەهێڵە)و (کچەکەی خۆی)و سەرجەمی هۆنراوەکانی دیوانی (گولاڵەسوورە)و زووربەی هەرەزۆری هۆنراوەکانی تری ناودیوانەکانی کامەران ئاوێنەیەکی بێگەردی کێشەوگیروگرفت و خواست و هیواو ئاواتی مرۆڤی چەوساوەن و دەنگی بیری پێشکەوتنخوازانەی کامەرانە کە هیچ کاتێ لایەنە چینایەتی یەکەی کەلانەختووەو وەك لایەنێکی کێشەی میللەتەکەی مامەڵەی لەگەڵدا کردووە: [18]

ئەی خالۆ گیان من رەنجبەرم
بۆیە ئێجگار کورد پەروەرم
باهەر گۆرانی یەکەی جاران
بڵێینەوە بۆ کوردستان
ئەوکەسەی لە مردن ترسا
لە کاروانی خەبات جێما

لە راستی دا ئەدەبی کوردی وەك ئەدەبی هەموو میللەتێکی تری دنیا شەقڵ و سیمای تایبەتی خۆی هەیەو ئەو رێچکە جۆراوجۆرانەی کە لە ئەدەبی میللەتاندا بەدی دەکرێ مەرج نی یە لەلای ئێمەش ئەورێچکانە دروست بووبێت.

(د. عیزەدین مستەفا رەسوول) بەوردی ئەوەی روون کردۆتەوە کە: «کێشەی نەتەوایەتی بنکەی رێبازی ریالیزمی کوردی یەو ئەدیبە کوردەکان وەك یەکەم کێشەی میللەت مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە»و «ئەدیبانی سەر بە رێبازی ریالیزمی سوشیالیزمی لە شێوازی مامەڵە کردن و خستنە رووی کێشە نەتەوایەتی یەکەدا لەگەڵ ریالیستە سوشیالیزمەکانی تردا جیاوازیان هەبووەو لای ئێمە بەستراوەتەوە بە رێبازی شۆرشگێرێتی جیهانی یەوە». [19] هەرلێرەوە دەگەینە ئەو راستی یەی کە لە ئەدەبی کوردی دا ناتوانرێ بەرهەمی ئەدیب و شاعیرانی کوردی ئەو قۆناغە بەسەر چەند رێچکەیەکی رامیاری دا دابەش بکەین چونکە بیروباوەڕی رامیاری ئەدیب و شاعیرانی کورد خۆیان هەرچی یەك بووبێت ئەوا بەرهەمەکانیان هەر لەسەر یەك رێچکە بووە کە رێچکەی ئەدەبێکی نیشتمانی پێشکەوتنخواز بووەو دەنگیشیان دەنگی میللەتەکەیان و دەنگی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازی و شۆرشگێڕێتی بووە.

دوای گەیشتن بەم راستی یانە کە دەگەرێینەوە سەر دیوانی (دیاری)، ئەمدا بە ئاسانی پەردە لەسەر ئەوپارچە هۆنراوانەش هەڵدەدرێتەوە کە بۆخۆیان سیمای داهێنانیان تیا بەدی دەکرێ، هەر ئەم پارچە هۆنراوانەش بوون کە سەرنجی خوێنەران و ئەدەب دۆستانی ئەوکاتەیان راکێشاوەو بە گەرمی یەوە باوەشیان بۆگرتۆتەوە. یەکێ لەو پارچە هۆنراوانەش کە لێرەدا دەیهێنینەوەیاد (یاد)ەکەی ناو دیوانی (دیاری) یە کە تیایدا دەڵێ: [20]

قژی نەرمت وەکو تاڵی خۆرەتاو
لەسەرشان و قۆڵی سپی پەرش وخاو
نەغمەی شیرین، ئاوازی خۆش لە دەنگا
ورشەی سەرنج لەناو چاوێکی مەنگا
---------------
درەختەکەی سەرکانێکەی باخی چەم
پێ ئەکەنێ گەڵای ئەڵێن پڕ بە دەم
لە بیرمانە منداڵ بوون لە ناو باخا
زەردەی دەمتان ئەدا بەپشتی داخا
تۆ بنوارە ئەو کانیە نازدارە
ئێستەش وێنەی هەردووکمانی تیا دیارە
تۆم خۆش ئەوێت بەڵام نابم بەیەخسیر
لە تاوی قژ بۆ دڵم بکەی زنجیر
نەشوانم بە نەشوانت بم بەشمشاڵ
بۆ دڵێکی وشك بکەین پەروباڵ
نەکوڕ نوشت بۆ ئەبەم نەتۆش بۆمن
با لە باخی شادیا دەست لەگەردن
دوو دڵدار بین بەراستی دوو فرشتە
ئەو ژیانە بەوجۆرە بێت بەهەشتە
لەگوڵی یاد لە یادی جوانی رەنگین
پێشکەشت بێت چەپکێك گوڵاڵەی شیرین

بەلای (مارف بەرزنجی) یەوە ئەوهۆنراوەیە «شیعرێکەو ئەڵێی مامۆستا گۆران وتوویەتی وەوێنەیەکی دڵداری تیا دەرخستووە کە بۆئەمرۆ دەس ئەدا کە لەسەربەستی ویەکسانی هەردوولا وسەرکەوتنی هۆش بەسەر عاتیفەدا پێك هاتووە». [21] بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی (مارف بەرزنجی)یەوە ئەم هۆنراوەیەی (کامەران) وەك نموونەیەك لەو هۆنراوانەی کە کەم و کوڕی یان تێدایە لەلایەن (محمد صدیق عارف)ەوە خراوەتە روو، بەلای ئەمەوە هۆنراوەی (یاد) لەو هۆنراوانەی (کامەران)ە کە شاعیر تیایدا هۆگری سروشت بووەو «ئەم هۆگر بوونی سروشتە وەتا ئەم رادەیە دووری دەخاتەوە لە ژیان، لەو رووداوەی تیا ئەژی، ئەبێتە کۆسپ لەدەربڕینی ئەو بیروباوەڕەیا، وەیا پاڵی پێوە ئەنێ بۆ گۆشەگیری لەو بیرو باوەڕەی» [22] بۆ بەڵگەی بۆچوونەکەشی تەنها چەند دێڕێکی کەمی لە هۆنراوەکە بەنموونە هێناوەتەوەو دەپرسێ «بۆ بفرین بۆسەرکانی وناوچەم و درەختەکان؟ ئەی بۆ وێنەیەکی رووداوی ئەوتۆ نەخەینە پێش چاو کە لە زووربەی منالانی کوردەواری رووی دابێ، وەك بڵێین لە بیرتە یارە شیرینەکەم کاتێ منداڵ بووین لە ناو گڵ و خۆڵی کۆڵانەکەماناپێکەوە گەمەمان ئەکرد. . . .». [23] هەر دەربارەی ئەم پارچە هۆنراوەیە (کاکەی فەللاح)یش رای وایە کە «ئەم چەشنە خۆشەویستی یە

که زۆرتـر لە ژێـری‌یەوە نزیکەو کەمتر سۆزو هەستی پێوە دیارە، بابەتێکی نوێ‌یەو شاعیر بە مەرج و ئاگا لەخۆ بوونێکی وریایی‌یەوە دەچێتەپێشەوە». [٢٤]

وەك دەبینـرێ هەرسێ نووسـەرەکـە تەنهـا ڕوویـان لەچـەنـد دێڕێکی هۆنـراوەکـە کردووە کە دیـارە ئەمـەش بە تەواوی ناتـوانێ ڕووی ڕاستی تاقیکـردنـەوەکـەی شاعیـر دەربخـات بۆیـە بەلای ئێمەوە هۆنراوەی (یار) نەهەڵهاتنە لە واقع و نەبە تەنهاش گرنگی دانە بەهۆش بەشێوەیەکی وا کە هەست و سۆزی شاعیر وەك مرۆڤێك شارابێتەوە. خوێندنەوەی هۆنراوەکە وەك بنیـاتێکی یەکگـرتـوو لەلایـەك وئاگـادار بوونمان لە تێڕوانینی شاعیر خۆی کەبەلایەوە هۆنراوە «پێویستە ئەگەرچی هەر لە سروشت و دڵداریش بدوێت گیـانێکی پاکی ئینسـانی و نەتـەوایەتی هەبێت وە ئەم دوو گیانەش لەبـوتـەی دەروونیـا یەك بخات» [٢٥] ئەمانگەیێنێتە ئەو ئەنجامەی کە شاعیر پێش مامـەڵـەکـردنی لەگەڵ تاقیکردنەوەکەیدا ئەو دووگیانەی لە دەروونیدا یەك خستـووە بۆیـە هۆنـراوەکـە لەگـەڵ لەدایك بوونیدا سیمای ئەو لایەنە مرۆڤـایـەتی و نەتەوایەتی‌یەی بۆشێوەو سۆزەکەشی لە ڕادەی تاقیکردنەوەکە خۆی دایـەو ئەنجـامی ڕستگـۆیی شاعیـرەو بەشێکە لە تاقیکردنەوە مرۆڤ پەروەری‌یـەکـەی شاعیـر و نەك هەر هەست و سۆزی تیـا کەمترە بەڵکـو سۆزێکی وای لێ دەتکێ کە لەڕادەی ئەو ڕاستگۆیی‌یەی شاعیردایە. بەم پێ‌یـە بەلای‌ئێمـەوەو لەم هۆنـراوەیەدا تابلۆی سروشت بە درەخت و باخ و چەم و کانی نـازدارو گوڵاڵـەی شیـرینی‌یـەوە بۆخـۆی هەڵگـری گیـانـە نەتـەوایـەتی‌یـەکـەی شاعیـرەو بەبـابـەتـە دڵـداری‌یـەکـەش گیانە مرۆڤ پەروەری‌یەکەی بەرجەستە کردووە.

یەکێ لەو تێبینی‌یـانـەی کە لە لێکۆڵینەوەکەی (محمد صدیق عارف)دا سەرنـج ڕادەکێشێ ئەوەیـە کە نووسـەرەکـەی هەوڵی داوە لە ڕوانگـەی تێـڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی وردەوە ئاوڕ لە هۆنراوەکانی (کامەران) بداتەوەو زیـرەکـانـە بە پێ‌ی بنـەمـایـەکی ڕەخنـەیی کامـڵ بەڕەوشی کـردنـەوەی هۆنـراوەکـان بچێ چونکـە بەلایەوە «بیری هەرباسێك لە تاقی کردنەوەیەك پەیـدا ئەبێ کە ئەو شاعیـرە پیـا تێ ئەپەڕێ وەیا یەکێکی تری دیبێ و بەڵام کارێکی کاریگـەری کردبێتـە سەردڵ و هەستی، ئەوبیرەش ئەبێ بخرێتە بەرگێکـەوە (مـەبـەستم شیـوەی نووسینـە) لەگـەڵیا بگونجێ وپڕ بە پێستی خۆی بێ، چونکە بیرو شێوە (الفکرة والاسلوب) یەك یەکتر تەواو ئەکەن». [٢٦] بەڵام لەگەڵ ئەم تێڕوانینە ڕەخنەیی بەچاکە شدا کە دێتە سەر هۆنـراوەکـان هەنـدێ بۆچـوونی وای لا دروست دەبێ کە ئاکـامی تەنهـا گرنگی دانـە بە چەنـد دێـڕێـك نەك سەرتـاپای هۆنراوەکە. ، هەروەك لەو بۆچـوونـەیـدا بەدی‌دەکـەیـن کەدەربـازەی ناوەرۆکـی هۆنـراووەی (ئـەی‌کچـەشـوان)مو ئەڵێ: «کەچـاوم بەسـەر نووسراوی ئەم هۆنراوەیە کەوت واهـات بە بیـرمـاکـە باسی کیـژۆڵەیەکی بەرگە شڕی سەروپاپەتی جوانکـەلـە ئەخـوێنمـەوە کە شوڵکێکی گرتبێ بە دەستـەوەو لە نزیـك ئاوایی‌یـەوە بە دیارچەن سەر مەڕوبزنەوە دۆش دامابێ، هیواو ئاواتە ساکارە تێکـەڵ بە کەسـاسی و هەنـاسـە ساردی‌یـەکانی خنووکەی هەست و دڵی بدەن، کەچی کە خوێنـدمـەوە نەکـەمـەو نە هیچی تری لەم بابەتەم نەدی بەڵکـو لەگـەڵ ئەوەشـا جەوهەری باسەکە ڕووداوە و لەناو جەرگەی ژیانی کۆمەلایەتیمانەوە هاتۆتە دەرێ، کەچی خۆم لە ئاسمانێکی ڕۆمانسی‌یا دی گوێ بگرن ئەڵێ:

**بە ئاوازی شمشـاڵەکەت**
**بە لەرەی‌لێوە ئاڵەکەت**
**هەستی خۆشم بێنە فرین**
**بۆ ناو گوڵزار**
**چەم و نزار**
**ئاسمانی شین...»** [٢٧]

لێـرەداو ئەگـەر هۆنـراوەی (ئـەی‌کچـەشـوان) وەك بنیاتێکی یەکگرتوو مامـەڵـەبکـرێ‌و سەرنـج لەدێـرەکـانی دوای ئەو دێـرانە بدەین کە (محمد صدیق عارف) بە نمـوونـەی بۆچوونـەکـەی هێنـاویـەتی‌یـەوەو بەلایـەوە کەشێکی ڕۆمانسی دروست دەکەن، ئەوا ئەو تێڕوانینەمان لادروست نابێ کە لای ئەو دروسـت بووە چونکـە دوا کۆپلەی هۆنـراوەکـە بۆخۆی ئەو ڕۆمـانسیـەتـە ناگـەیێنێ کە نووسـەر بۆی‌چـووە، ئەوەتـا (کامەران) لە دوا کۆپلەدا دەڵێ: » [٢٨]

**فرمێسکی ئاڵت بسڕەوە**
**کاتی (تێکۆشانە)و زەردە**
**ئاوی شەونم بخۆرەوە**
**هیوا هەرگیز**
**ئارامی کۆرپەی ژیانە**

هەر ئەم هۆنـراوەیـەی (کـامەران) بۆتە هۆی ئەوەی کە (محمد صدیق عارف) بخـاتـە سەر ئەوڕایـەی کە «کـامـەران نزیکتـرین» شاعیـرمـانـە لەهـۆنـراوەی نوێ‌وە، هۆنـراوەی نوێ بەمانای هۆنراوەی سەربەست (حر) وەیـا بەرەڵـلا (منطلق)» [٢٩] ئەم بۆچـوونـەش بۆخـۆی‌پێویستی بە لێدوان هەیە چونکە بەلای (محمد صدیق عارف)موە «ناتوانرێ قۆناغی کامەران ناوبنرێ نوێ لەبەر ئەوەی شیعری کوردی خوی لە کۆت و زنجیری وەزن ڕزگار نەکردووەو هەر لەسـەر وەزنی یەك پارچـەیی ئەڕواو کامـەران لەچـەنـد پارچـەیـەکیـا ئەو کۆت و زنجیـرەی شکـانـدووە»، [٣٠] بێگـومـان ئەم بۆچوونە پێش هەمووشتێ ئەوە دیـاری دەکـات کە (محمد صدیق عارف) لەو کاتەدا هێڵێك لە هێڵەکانی نوێخـوازی لە هۆنـراوەی کوردیـدا دیـاری دەکات کە پەیوەندی بە ئاوازی هۆنـراوەوە هەیـە، هەر ئەم تێـڕوانینـەش بۆخۆی بووە بنـەمـایەکی دیاری، بزوتنـەوەی (ڕوانگـە) لە سەرەتـای ساڵی ١٩٧٠دا کە خۆی یەکێـك بووە لەڕابـەرانی، ئەمـە لەلایـەك، لەلایەکی ترەوە کە باس بێتە سەر هۆنراوەی سەربـەسـت و ئەو هەوڵانـەی کە لەم بوارەدا دراون، نابـێ ئەوەمـان لە

یادبچێ کە گەلێ پێش کامەران نووسەرانی وەك (جەمال عیرفان)و (پیرەمێرد) مان هەریەکەو بە چەمکێك باس لەهۆنراوەی سەربەست دەکەن و شاعیرانی وەك (بەختیار زێوەر)و (گۆران)و (قەدری‌جان) پشمان چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتوویان لەم ڕووەوە هەبووەو دەکرێ بەسەرەتایەکی چاکی هۆنراوەی سەربەستی کوردی دابنرێن،[٣١] ئەمە جگە لەوەی کە (کامەران) خۆی لەیەك دوو هۆنراوەی ساڵی (١٩٥٤)ی‌دا هەمان ئاواز بەکاردێنێ، سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەبێ ئەوەش بووترێت کە هۆنراوەی سەربەست لەئەدەبی کوردیماندا هەروەك هۆنراوەی سەربەستی عەرەبی خۆی دوور ناخاتەوە لە کێش و قافیە بەڵکو مامەڵەکرنێکی نوێیە لەگەڵ هەردوو بنەما گرنگەکەی ئادازی دەرەوەی هۆنراوەدا کە کێش وقافیەن، (محمد صدیق عارف)یش وریایانە ئەمەی روون کردۆتەوەو دەڵێ: «زووربەی زۆر لەوانەی دوورەپەرێز وەستاون لە هۆنراوەی نوێ وائەزانن مەبەس لە خۆرزگارکردن لەکۆت و زنجیری وەزن و قافیە، واز لێ هێنانیانە بەتەواوی..! بێ گومان ئەمانە بەهەڵەچوون چونکە لە بارەی وەزنەوە هۆنراوەی نوێش هەر لەسەر ئەو (بەحر) انە ئەوترێ کە هۆنراوەی کۆنی لەسەر دا ئەرێژ رێ بەڵام تەنها هێندە هەیە شاعیری نوێ بە ئارەزووی خۆی یاری بەو (بەحر) انە ئەکاو هەڵیان ئەسوڕێنێ، وەك لە هۆنراوەی (کچەشوان)دا کە پارچەیەکە لە هۆنراوەی رزگارکراو لەکۆت و زنجیری وەزن و قافیە لەسەر بەحری (هەزەج) دانراوە»،[٣٢] بەڵام دیارە کە کێشی ئەم هۆنراوەیە پەیوەندی بە (هەزەج)و (بەحر)ە عەرەبی یەکانی عەروزەوەنی یە، بەڵکو کێشەکەی (هەشت برگەیی یەو تیایدا دەستەپێ‌ی جیاوازی ئەو کێشە بەکارهێنراوە کە بریتن لەدەستەپێ‌ی (٤ + ٤) و (٥ + ٣) و (٦ + ٢) و (٣ + ٥).

هەر ئەو تێروانینەی (محمد صدیق عارف) کە بۆ ئەوکاتە تێروانینێکی زیرەکانەیەو پێش بینی یەکی سەرنج ڕاکێشە لە بواری لێکۆڵینەوەی هۆنراوەی کوردیماندا، لە لێکۆڵینەوەکەی (ناکام)دا پشت گیری لێ ناکرێ چونکە بەلای (ناکام)ەوەو وەك خۆی ئەڵێ: «من کامەران ئەناسم ئەگەر نەشم ناسیایە تەنها بەهۆی سەرنجی هەڵبەستەکانیەوە ئەتوانم بڵێم هەر لەبەر ئەوەی دانەری خۆی ئەڵێ شارەزای بەکارهێنانی کوردی پەتی یەو سەرنجی وردی هەیە لە دەربڕینی ماناداو شیعرەکانی گەرم و دڵگیرو هەستاوین و پاشە ڕۆژێکی گەش و ڕوناکی بێ چاوەڕوان ئەکرێ، نابێ شاعیرێکی بەرەڵلا بێ، هیواشی لێ ناکرێ لە دوا ڕۆژدا ببێتە شاعیرێکی بەرەڵلا، چونکە شاعیرێك توانای هەڵبەستی ڕێك و ئاوازەداری ببێ هۆی ناکەوێتە شیعری بەرەڵلا».[٣٣] بێگومان ئێمەلێرەدا کەم و زۆر لەگەڵ ئەم بۆچوونەی (ناکام)دا نین، دیارە (محمد صدیق عارف)یش ئاگاداری ئەوە بووە کە ئەو ئاوازەی لە (ئەی کچەشوان)دایەو بەلایەوە هەنگاونانی شاعیرە بەرەو داهێنان رەنگە لەلایەن نووسەرانی ترەوە پەسەند نەکرێ بۆیە دەڵێ: «ئەوەتا کامەران چەند پارچەیەکی لەم بابەتە بۆوتوین وە تا ڕادەیەکی بەرزیش تیایا سەرکەوتووە، تەنها ماوەتەوە سەرئەوەی کامەران ئازاوچالاك بێ و لەقسەی ئەم و ئەو نەترسێ»[٣٤] بەڵام دیارە قسەی ئەم و ئەو لەلایەك و شێواندنی ئەم تاقیکردنەوە نوێیە لەلایەکی ترەوە بووە هۆی ئەوەی کە (کامەران) لەهۆنراوەی سەربەست دوورکەوێتەوە، چونکە خۆی باس لەمە دەکات و دەڵێ: «بەلای منەوە هۆنراوەی سەربەست مۆسیقاکەی زۆر بەسۆزترە لەهۆنراوەی ترو بەریشی فراوانترە بۆ دەربڕینی هەست، بەڵام داخەکەم نەشارەزایان کەدەستیان دایە ئەم هۆنراوەیە بە جۆرێکی ئەوتۆ شێواندیان کە خوێندەواران بە تەواوی لێ‌ی وەرس و هەراسان بن، وەك مەسەلەیەکی کوردی ئەڵێت (بەراستی سفاتیان ڕەزیل کرد)، لەبەرئەوە بوو کە من وتم لەگەڵ هۆنراوەی سەربەستدا نیم و گەڕامەوە سەر هۆنراوەی کێش دا».[٣٥] دەربارەی ئەم بۆچوونەی کامەران دەبێ دووبارە ئەوەبێنینەوە یاد کە لەهۆنراوەی سەربەستدا هیچ کاتێ ناتوانرێ دەست بەرداری کێش بین وەك کامەران هێمای بۆ دەکات، هەروەها هەر ئەم بۆچوونەی کامەران ئەوە دەردەخات کە هۆیەکی تری وازهێنانەکەی ئەوتێروانینەی بووە دەربارەی هۆنراوەی سەربەست جا زانیبێتی یا نەیزانیبێ کە لەراستی دا ئەمەش دیاردەیەکەو نەك هەر بۆ شاعیرانی ئەوکاتە بەڵکو ێستاش زووربەی شاعیرانمان ئاگاداری چەمکی هۆنراوەی سەربەستی کوردی‌نین و بنەماو بنەرەتە تایبەتی یەکانی نازانن، هەربۆیە هەنگاونانی ۆنراوەی کوردی لەم بواردا گەلێ سستەو لەڕادەی خواستەکانماندا نی یە.

سەرنجێك لە سەرنجەکانی تری (محمد صدیق عارف) ئەوەیە کە لایەوە: «هۆنراوەکانی کامەران بەتایبەتی ئەو هۆنراوانەی کە لە سروشت و هەستی تایبەتی خۆی ئەدوێن، یەکێتی مانایان بە هیچ جۆرێك تیا نابینرێ»،[٣٦] چەمکی یەکێتی ماناش بەوجۆرە دیاری دەکات کە «باس هەیە مل ئەدا بۆ یەکێتی ماناو باس هەیە نەأ»،[٣٧] لە ڕاستی‌دا چۆنیەتی و چەندێتی بابەت کەم و پەیوەندی بە چەمکی یەکێتی هۆنراوەوە نی‌یە چونکە گەلێ جار شاعیر باس لەیەك بابەت دەکات کەچی هۆنراوەکەی بنیاتێکی یەکگرتوو ناگرێتە خۆی، هەروەك جۆن ئاسایی‌یە کە تاقیکردنەوەکەی بەگەلێ بابەت بەرجەستە بکات و بنیاتێکی ئاوێتە یاخود یەکگرتوویان لێ پێك بهێنێ، هەرلەم ڕوانگەیەشەوە دەتوانرێ لەبنیاتی هۆنراوەی کوردی‌دا چوار چەشنە بنیات دیاری بکرێت و ئێمە لەلای خۆمانەوە بەبنیاتی سادەو تێکەڵ و لێکدراوو ئاوێتە ناومان بردووە.[٣٨]

بەوجۆرە (کامەران)ی شاعیر بە یەکەم هەنگاوی لەجیهانی هۆنراوەی کوردی‌دا بەتەواوی شوێن پێ‌ی خۆی کردەوەو بووە یەکێ لە شاعیرە دیارەکانی ئەوقۆناغە، هەر ئەم زەمینە پتەوەی تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی لەلای بووە هۆی ئەوەی کە هەنگاوی تری لە دواوە بێت و بەرەو تاقیکردنەوەی نوێ تری بەرێت.

## هەنگاوی دووەمی کامەران لەبواری داهێناندا :

دوا بەدوای دیـوانـی (دیـاری) و کۆمـەڵێ هۆنـراوەی تری هەمـان تاقیکـردنەوەو شێواز، (کامەران) رووەو تاقیکردنەوەیەکی تر هەنگاوی نا کە بریتی بـوو لە گرنگی دان بەو چەشنـە هۆنـراوانـەی کە کورتن و بەگشتی ژمـارەی دیـرەکـانی لەشـەش دێر (سێ بەیت) تێ پەر ناکات . لەم رووەوە (کـاکـەی فەلـلاح) بە وردی ئەوەی دیاری کردووەکە : «ئەم هەنگاوانانەی کامـەران بە پێچـەوانـەی ئەو بۆچوونـەی بووە کە لە پێشـەکی دیـوانی دیاری‌یەکەیدا سەرنجی خوێنەرانی بۆراکێشابوو، چونکە لەوێدا بە رای کامەران هۆنراوەی تازە دەبێت لەسەر ئسلووبی کوردی رێك بخرێت ـ لە چواریـن وپێنجین دوورکـەوێتـەوە. . بەڵام لەدوایی‌دا کامـەران خۆی سیمـای تازەکـردنەوەی هۆنراوەکانی لەم پارچە بچووکانەدا بەدی‌کردووە، تازەکردنەوەش لەوەدا بووە کە لەپێش ئەمدا ئەم چواینانە کەوتراوە بیرەکەی پەند بووە بەڵام هی ئەو بە شێوەیەکی گشتی باری سیاسی گرت وبوو بوو بە بروسکـەیـەك بۆ تێکـۆشـان»، [٣٩] ئەم بۆچوونـەی (کاکەی فەللاح) بۆ خۆی تێـروانینێکی رەخنـەیی زیـرەکـانەیە بە تایبەتی لەو رووەوە کە دەری خستـووە (کـامـەران) خۆی سیمـای تازەکردنەوەی هۆنراوەکانی لەو پارچە بچـووکـانـەدا بەدی کردووە، چونکـە ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کە (کامەران) بە هۆشمـەندی‌یەوە مامەڵەی لەگەڵ تاقیکردنەوەکانیدا کردووەو بەرەو داهێنان هەنگـاوی ناوە، بێگـومان ئەمەش بۆخۆی پێویستی بەوە دەبێت کە رادەی سەرکەوتنی لەم هەنگاوانانەی‌دا دیاری بکرێ.

دەربـارەی ئەو هۆنراوەکورتانەی (کامەران)ەد.(کامل حسن البصیر) بۆ ئەوە چووە کە کامەران : «بەم رێگایە لەناوشاعیرە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆی کورددا تاك وتەنیـایـە، ئەم دیـاردەیـە لە خۆیەوە نەهاتووە بەڵکو سروشتی بابـەتـە شیعـری‌یـەکـان دروستی کـردون، چونکـە شاعیر بابەتی سیاسی لەدەوری پاشـایـەتی‌دا وەرگـرتـووەو کەس نەیتـوانیـوە بە ئاشکـرا دەم لە سیـاسەتەوە بدات، جا ئایا لەداروبارێکی وادا شاعیر دەتوانێت قەسیدەی درێـژ ی لەوبـابـەتـە بڵێت؟ کێ بوێ بڵاودەکـاتـەوە، چۆن دەچێتـە ناوخـەڵکـەوە؟ کەواتـە وەك دەڵێن پێـویستی دایکی داهێنانە، بۆیە شاعیر پەنای بردۆتە بەر ئەو شێوەی چوارین و پێنجین و بەیتانەوە». [٤٠]

(کـاکـەی فەللاح)یش دەربارەی ئەو بۆچوونەی (کامل حسن البصیر) لەلایـەك و بۆچوونی خۆشی لەلایـەکی تـرەوە دەڵێ : «ئەم رایە ئەگەرچی لەراستی بێ بەش نی‌یـە بەڵام هۆی تریش هەیـەوزۆرە نەهـاتۆتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کە ئەم بابەتە کە لە بابە تایەری هەمەدانی‌یەوە هەیەو کەم و زۆر شاعیـرانی کورد چەرخاوچەرخ و پشتاوپشت وەك رێگایەکی لاسایی کردنـەوە بەرهـەم و تاقی کـردنـەوەیـان هەیـەوگەرمیـان و کوێستـانیـان پێ کـردووە، ئەم بابـەتـە چوارینـانـە زۆرتر بیری راگوزاری‌و چەخماخەی بیـروهـەست و کەم ئەرکی شیعـر و خۆماندوو نەکردن و زوو بەدەستەوەدان دروستیان دەکات». [٤١]

پێش هەمووشتێ دەبێ ئەو راستی‌یە بخەینە روو کە ناونانی سەرجەمی ئەو هۆنراوە کورتـانەی کامەران بەچوارین وپێنجین راست نی‌یە، چونکە ئەگەر چاوێك بەچاپی دووەمی (گوڵاڵە سووە) کەیدا بگێرین کە زووربەی هەرە زۆری ئەو هۆنـراوە کورتـانەی کامەرانیان تیادا کۆکراوەتەوە دەبینین لە (٧) پارچـەی (دوو) دێـری‌و (٤٠) پارچـەی (چـوار) دێـری‌و (٢) پارچـە (پێنـج) دێـری‌و (٤١) پارچـەی (شەش) دێری‌و لە تەنها پارچەیەکی (دە) دێـری پێـك هاتووە، کەواتە ژمارەی ئەوپارچانەی کە لە (شەش) دێر پێك هاتـوون لە (چـوار) دێـری‌یـەکەش زیاترە بۆیە ناکرێ نەبە چوارین ونەبە پێنجین ناویـان بەرین . هەرچی دەربـارەی سەرهـەڵـدانی ئەم چەشنـە هۆنـراوانـەشـە لای کامەران، ئەوا بەلای ئێمەوە هیچ کاتێ ئەنجامی کەم دەرفـەتی بڵاوکردنەوە نەبووە چونکە نەك هەر دیوانە چاپکراوەکانی تری ئەو سەردەمـەو هەمـوو ئەو هۆنـراوە درێـژ انـەی کە لەسـەر لاپـەرەی رۆژنـامەو گۆڤـارەکان بڵاوکراونەتەوە بەڵکو دیوانی (دیاری)یەکەی کامەران خۆی کە تەنهـا شەش پارچـە هۆنـراوەی کورتی تێـدایـە ئەوە دەسـەلمێنن کە کەم دەرفـەتی بڵاوکـردنـەوە لەو سەردەمـەدا پەیـوەنـدی بە رووکـردنـە ئەم تاقیکـردنـەوەیەو برەوپێدانی ئەم چەشنە هۆنراوە نەبووە لای کامەران . هەر دەربـارەی ئەم باسـە دەبێ ئەوەش روون بکـەینـەوە کە تاقیکـردنـەوەی شاعیـران لە ئەدەبی کوردیـدا بێ یاخـود لە ئەدەبی میللەتـانی تردا بێت لەلایەك و تێروانینە رەخنەیی‌یە جۆر بەجۆرەکانی جهانیش لەلایەکی ترەوە کەم وزۆر ئەوەیان نەگەیاندووە کە لەدایك بوونی ئەم پارچە کورتانە لە چاو هۆنـراوەی درێـژدا ئەوەنـدە ئاسـان بێت کە خۆمـانـدوو نەکـردن وزوو بەدەستـەوەدان بگـەیێنن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ناوبانگی ئەو شاعیرانەی کە بەم چەشنە بنیاتەی هۆنراوەوە ناسراون لە ناوبانگی ئەو شاعیرانە کەمتر نی‌یـە کە بەهـۆنـراوەی درێـژ ناسـراون، ئەمـە جگە لەوەی کە هیچ کاتێ کورتی‌و درێـژ ی هۆنـراوە لەو روانگـەیەوە تێ ی ناروانرێ چونکە جاری وا هەیـە تەنهـا بەپێـك دەتـوانێ تاقیکردنەوەیەکی وا بەربڵاو دەربرێ کە لە پارچـە هۆنـراوەیەکی درێژدا بەدی نەکرێ. هەر لێرەوە کە ئاور لەو هۆنراوە کورتـانـەی کامـەران دەدرێتـەوە دەبێ لە روانگـەی ئەو چەمکەوە لەگەڵدا بکـەین کە رەگـەزەکـانی لەدایـك بوونیـان رەگەزی جیا جیاو لەیەك دابراو نین و تاقیکـردنـەوەکـانی شاعیر خۆی بابەتو سۆزو ئەندێشەو وێنەو ئاوازی هۆنـراوەیی لە بنیـاتێکی هونـەری گونجـاودا پێـك دەهێنێ جا بۆیـە سۆزو ئەنـدێشـەو وێنـە هونـەری‌یـەکـانیش بۆخۆیـان لەرادەی ئەو بابەتانەدان کە تاقیکـردنـەوەکـانی پێ بەرجـەستـە دەکـرێ‌و لاوازی یەکێکیـان سیمـای تاقیکـردنـەوەکـە دەشێوێنێ بەم پێ‌یە بەلای ئێمەوە هەوێنی سەرهەڵدان و بیـرەوپێـدانی ئەم پارچـە کورتـانـە لای کامـەران گرێدانی دوو بەهـرەی کامـەران خۆی بوو پێکـەوە کە بریتی بوون لە بەهـرەی دوانـدەری‌و دەنگە دڵێرەکەی‌و بەهرەی شاعیرێتی‌و توانای پێك هێنانی وێنەی هونەری گونجاو

بۆ ئەو سۆزە هەڵچووەی کە بابەتە شۆرشگێرییەکەی خەملاندووەو ئاوازی هۆنراوەکەی سازداوەو لە بنیاتێکی کاریگەردا دایرشتووە: (٤٢)

زۆرجار ژیانم تاریك دا ئەهات
ئاگر بەرئەبوو لە باخی ئاوات
پێم لە ناو خوێنا، زنجیری ئاسن
پیا ئەرشت تەزووی بەتینی مردن
سام هەر نەیتوانی پێ بەرپێ بنێ
بەکێوی ورەی دڵما هەڵزنێ

## دوا هەنگاوی کامەران و بێ دەنگی یەکەی:

لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠) داو دوا بە دوای بڵاوبوونەوەی بانگەوازی (روانگە)و دەنگی نوێخوازی لە ئەدەبی کوردی دا بەگشتی و لە هۆنراوەی کوردیدا بەتایبەتی، راستەوخۆ روو لە کامەران کراو ئەو پرسیارەی لێ کرا کە: «ئەوترێت کامەران لە پلەیەکی نزیکی ئەدەبی سەردەمی تازەماندا لە هەرە شاعیرە تازەکەرەوەکانمان بوو کەچی بەبێ گۆرینێکی ئەوتۆ ئێستاش هەر لەسەر ئەو رێبازو شێوەو ناوەرۆکەی ئەو وەختە ئەروات»، (٤٣) ئەم پرسیارەو ئەو تێروانینە دەربارەی کا مەران لە دوای بڵاوبوونەوەی دوا دیوانی کە (زەبری هۆنراوە)ی ساڵی (١٩٧١)ە نەك هەروەك خۆی مایەوە بەڵکو روخسارێکی توندتریشی گرتە خۆی و هێمای وشك بوونەوەی بۆ کرا. (٤٤) هەرچی کامەران خۆشی بوو ئەوە لە پرسیارەکە نەدەگەیشت و دەیپرسی: «ئاخۆ مەبەست لە گۆرین و تازەکردنەوە چی یە؟». (٤٥) لە راستیدا (کامەران) ناهەقی نەبووە کە لەو پرسیارە نەگەیشتووە چونکە نەك هەر ئەو کاتە ئێستاش بە تەواوی کە باس لە نوێخوازی و تازەکردنەوە دەکرێ بە تەواوی چەمکەکەی دیاری ناکرێ و بنەماو بنەرەتی یەکانی دیاری ناکرێ.

هەرچۆنێ بێ ئەو پرسیارەو ئەو تێروانینەش بۆ خۆی دیاردەیەکی زۆر ئاسایی بووە، ئەگەرچی هەندێ جارو هەندێ نووسەر وای نەئەبینی، (٤٦) چونکە ئەگەر بەو شێوەیە لە کامەران و شاعیرانی قۆناغەکەی نەروانرایە ئەوا ئەو بزووتنەوە تازەگەرییەی کە مەبەست بوو هیچ مانایەکی نەدەبەخشی بەو پێیەی ئەگەر لەو کاتەدا هەنگاوی نوێ تر لای (کامەران) بەدی بکرایە ئەوا بزووتنەوە نوێخوازییەکە بۆی نەدەکرا باس لە رێچکە شکاندن بکات، خۆنەش دەکرا لە تێروانینەکەیاندا مەبەستیان ئەوە بوو بێت کە هەنگاوەکەی ئەمان هەنگاوێ پێش ئەوەش کەوتووە کە لە کامەرانیان داوا دەکرد.

لێرەدا بەلای ئێمەوە، ئەوەی کە لە کامەران داوا دەکرا زۆر بەئاشکراو روونی لە (زەبری هۆنراوە) کەیدا بەدی دەکرێ و ئەم دیوانەی کامەران نەك هەر هێمای وەستان و بەرەو دوا بوونەوەی ناکات بەڵکو زوور بەی هۆنراوەکانی ناو ئەم دیوانە بوونەتە بنکەی ئەو تەقینەوە نوێیەی کە داوای لێ دەکرا، لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە باس کردن لە وشك بوونەوەی کامەران وەك پێش بینی یەك بۆ دەنگی یەکەی دوایی وەرناگیرێ چونکە بێ دەنگی یەکەی دوایی ـ هەروەك روونی دەکەینەوە لە ئەنجامی بێدەسەڵاتی و کز بوونی سەرچاوەی تاقیکردنەوەکانی یەوە نەبووە.

بۆ بەڵگەی بەدی کردنی داواکاری بزوتنەوە نوێخوازییەکە لە هۆنراوەکانی (زەبری هۆنراوە) کەیدا سەرەتا ئاور لە تێروانینی کۆمەڵەی (روانگە) دەدەینەوە بەوپێیەی ئەو تێروانینە بووە بنەمای ئەو بیرە نوێخوازییەی کە لەو سەردەمەدا لە ئارادا بووە. کۆمەڵەی (روانگەی) وەك خۆیان دەیانووت: «ئێمە گۆشکراوو تاڵ بووی ئەو بەسەر هاتانەین [واتە ساڵانی پێش بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە] بۆیە ئێستا هەرچی بنووسین دوورو نزیك بەچاك و خراپی بە ستایش کردن و بێزاری دەربرین بەرهەمی خۆخواردنەوەیەکی قووڵمانە لە ئاستیاندا، واتە ئێمە دڵسۆزترین زبان و دەنگی ئەم سەردەمەی خۆمانین نەوەی پێش ئێمەش (کە هێشتا لە ژیاندان) لەو سنوورەدا ئەبزوێن بەڵام ئێمە لە بوتەی ئەدەبیاتدا ئەو کارەسات و بەسەرهاتانە بەهەزارو یەك باردا ئەمرێنین و ئەژێنینەوە، لە کاتێکدا نەوەی پێش ئێمە ناتوانن لە سنووری رستێك دروشمی پیرۆزی رابووردوو بچن بەودیوودا». (٤٧) جا ئەگەر لێرەوە ئاور لە (زەبری هۆنراوە)کەی بدەینەوە، بەئاشکرا هەست بەوە دەکەین کەئەمیش لە روانگەیەکی گەلێ نوێوە دەروانێتە ئەو بەسەرهات و کارەساتانەی کە خۆی لەناویدا دەژیاو بەهەزارو یەك بارداو بەتێروانینێکی تازەترەوە دەیانمرێنێ و دەیانژێنێتەوە، هەر بۆیە دەڵێ:- (٤٨)

وا شیعرم داگیرسانەوە
ئاسنی سامم توانەوە
دوا قەڵای وەنەوزم روخان
خوێنی ئۆقرەو ماتیم رژان
هاتوەمەوە بەرەو مەڵبەن
بەرەو شاری دەروون بوگەن

-------------

ئەبێ هەزاران پێشێل کەم
تا ئەگەمەوە دڵەکەم
ئەو دڵەی وەك دڵان نی یە
ترسنۆك و نیان نی یە

-------------

دڵە گەشەکەی جارانە
دڵی پاکی تێکۆشانە

بەم جۆرە ئاوردانەوەمان لە گەلێ پارچەی ناو (زەبری هۆنراوە)کەی و مامەڵە کردنمان لەگەڵیاندا وەك پارچەیەکی یەکگرتوو نەك تەنها

هەڵبـژاردنی یەك دوو دێـر لێرەولەوێ، ڕاستەوخۆ دەمانگەیێنێتە ئەو ڕاستییەی کە ئەم هەنگاوەی کامەران بۆخۆی هەنگاوێکی نوێ بووەو کەم وزۆر سیمای پاشگەز بوونەوەی تیادا بەدی ناکرێ، تەنانەت هۆنراوەی (بۆ ئاگاداری) یەکەشی بەلای ئێمەوە بەڵگەی بەرەوپێش چوون و تەقینەوەیەکی نوێی تاقیکردنەوەکانی بووە نەك بەرەودوا بوونەوەی، چونکە کە دەڵێ :[٤٩]

**بەڵێن بێ ئەی کچ، بەڵێن بێ ئەی گوڵ**

**ئەی دەشت و دەرو چیای کوردستان**

**من جارێکی تر نەبەدەم نە دڵ**

**بۆ ئێوە نەڵێم هۆنراوەی جوان جوان**

**تەنها هۆنراوە ئەڵێم بۆ هەژار**

**هەر لەگەڵ ئێوەم ئەی هەژارینە**

**تەنها هۆنراوە ئەڵێم بۆ هەژار**

**هەژار هەوێنی شیعری خوێنینە**

لێرەدا (کوردستان) نەبۆتە نیشانەی خاك بەڵکو وەك جوانی سروشت باس دەکرێ و لە کۆپلەی یەکەمی هۆنراوەکەشدا بە ڕووتی ئەمەمان بۆ دەردەکەوێ کاتێ دەڵێ :

**هۆنراوەکانم هەر بۆ ئافرەت بوون**

**بۆ خونچەی گوڵ و بۆ جوانی سروشت**

**خوێنیان ئەمژی لە بەهرەی دەروون**

**ڕستی زێرین و جوانیان دا ئەرشت**

ئەمە جگە لەوەی هەمووومان دەزانین کە هۆنراوەکانی پێشووی هەربۆ ئافرەت و گوڵ وجوانی سروشت نەبووەوزوووربەیان هەربۆئەوهەژارانە بووە کە لێرەدا دەیەوێ ڕوویان تێ بکات، دیارە ئەم شێوە تێڕوانینەی بەو مەبەستە بووە کە لە هۆنراوەکانی پێشووی ڕازی نەبووە، ئەمەش بۆخۆی ئەوە دەگەیێنێت کە دەیەوێ بەدڵسۆزییەوە تەعبیر لەوبارە ئاڵۆزانە بکات کە تاقیکردنەوەکانی ژیانی ڕووبەڕووی دەکردنەوەو لە سنووری بیرگواستنەوە بچێتە دەرەوەو داهێنەرانە مامەڵە لەگەڵ تاقیکردنەوە نوێیەکانیدا بکات، بۆیە لێرەدا دەتوانین بڵێین کە مەبەستی لە هەنگاوێکی نوێ بووە نەك پاشگەز بوونەوە.

لە باسێکدا کە دەربارەی (کامەران)و هۆنراوەکانی بێت ئەوا باسی بێدەنگییەکەی دوای دیوانی (زەبری هۆنراوە) ڕاستەوخۆ دێتە ناوەوەو دەبێ ئاوڕی لێ بدرێتەوەو پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە هەڵبدرێتەوە کە بێدەنگییەکەی ئاکامی وشك بوونەوەی سەرچاوەی هۆنراوەکانی نەبووە، چونکە هۆنراوەکانی بەگشتی و (زەبری هۆنراوە)کەی بەتایبەتی بۆخۆیان سیمای ...میکیەتی هۆنراوەی شۆڕشگێڕێتیان تیادا دەبینرێ، ئەو سیمایەی کە شۆڕشگێڕێتی بەلایەوە کارێکی بەردەوام و هەمیشە نوێیەو هیچ کاتێ ئەو بەرگەی نەپۆشیوە کە وەك کارێکی میسالی دەرکی پێ بکات. (کامەران) خۆی لە هەمووکەس باشتر ئەوەی دەزانی کە تەنها دیارییەك بۆ مرۆڤی خەباتکەر هەر ئەوچەپکە گوڵەیە کە یا دەدرێتە دەستی یاخود دەخرێتە سەر مەزاری بۆیە بەلایەوە گرنگ نەبووە کە تەنانەت چەپکە گوڵەکەشی بدرێتە دەست بەڵام کە کار بگاتە ئەوەی هەندێ هەڵوێست ئەوە بگەیێنێ و هێمای ئەوە بکات کە پێی بووترێت تۆکێیت و تۆچیت؟ ئەمەیان وەك مرۆڤ زامێك دەکاتە دڵەوە کە تا ئێوارە بڵێ :[٥٠]

**لە چیاکان لە لووتکەی بەرزوو نودا**

**لە ئاگری بە نێڵە نێڵی برِوا**

**لە کۆتێ پێ کەلەپچەی دەست بپرسن**

**من چیم و کێم ئەوان چاکم ئەناسن**

زامی وا سارێژ نابێت و نەئەبوایە هێمای پرسیارێکی وا بخرایەتە بەردەم (کامەران) تا ئەویش تازە بەتازە خۆیمان پێ بناسێنێ، هەر ئەمەش بوو وەك مرۆڤێك دڵی گەرد بگرێ و بگاتە ئەو قەناعەتەی کە بەو هەمووو تێکۆشان و قوربانیدان و بەرهەمانەی کە لاوانی پێ گۆش دەکرا نەزانرێ تازە بگەرێتەوەو تەنها بەبەرهەمی هۆنراوەیی خۆیمان پێ بناسێنێ؟.

تاقیکردنەوەی هۆنراوەیی (کامەران) لەرادەیەکدا بوو کە هیچ نەبێ بتوانێ وەك کارسازێکیش بێت مامەڵە لەگەڵ هۆنراوەدا بکات و بەرهەمی هۆنراوەیی بخاتە بەردەست خوێنەر، جا هیچ کاتێ پێی ناخۆش نەبووە داوای هۆنراوەی لێ بکرێ چونکە وەك خۆی دەیووت : «ئەگەر کامەران نەبوومایە کەس داوای هۆنراوەی لێ نەئەکردم»[٥١] بەڵام ئەگەر داوا کردنەکە تەنها لە ڕوانگەی ئەو بۆچوونەوە بوو بێت کە گوایە وشك بۆتەوە تەنها وەك شاعیر تەماشابکرێ و هێمای ئەوەبێت کە بێ هۆنراوە، (کامەران) نەتێکۆشەرو دڵسۆزەکەی جارانەو نە شاعیریشە، ئەمەیان دووبارە دڵ ڕەنجاندنی تیادا بووەو هەروەك ئەو پرسیارە بووە کە ناچاری کرد وەڵامی بداتەوە، وەك ئاگاداریشین گەلێ جار لەم تێڕوانینەی دواییەوە داوای هۆنراوەی لێ دەکرا بۆیە یەکێ لە هۆنراوەکانی دوایی بۆخۆی وەڵام دانەوەیەکی ئەو داواکاریانە بووەو دەڵێ :[٥٢]

**ئەگەرچی دڵی سەردەمی لاویم**

**بڵێسی بەرزی نیشتمانم بوو**

**بازووی بەهێزوو جەستەی خوێناویم**

**نیشانەی زەبری تێکۆشانم بوو**

**بەڵام پیریەکەم سوتێنەرترە**

**چونکە نەك هەر دڵ بوونم ئاگرە**

### ئەنجام :

---

کاتێ (کامەران) بە دیوانی (دیاری)یەکەی و چەند پارچە هۆنراوەیەکی پێشتریەوە هاتە ناو جیهانی هۆنراوەوە، هۆنراوەی کوردی ڕێرەوێکی گشتی و سیمایەکی تایبەتی خۆی هەبووە، (کامەران) خۆشی ئاگاداری ئەوە بووە،

هەروەك خۆی دەڵێ: «ئێمـەش لە کاتێکـدا دەستمـان داوەتـە هۆنراوە کە دەرگـای ریـالیـزمیـەت خرابـووە سەرپشت»،[٤٣] هەربۆیە دیاری کردنی شەقڵ و سیمای داهێنان لە هۆنراوەکانی‌دا دەبێ لە چوارچێوەی ئەو ڕێرەوە گشتی وسیمـا تایبـەتی یەی هۆنراوەی کوردی ئەو قۆناغەوە ئەنجام بدرێ، کاتێکیش لەم روانگــەیـەوە ئاوڕمـان لە هۆنـراوەکـانی دایـەوە بە ئاسـانی ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە یەکەم هەنگاوی کامەران بە دیوانی (دیاری)یەکەی هەنگـاوێکی وا پتـەو بوو کە راستـەوخۆ لەسـەر زەمینەی هۆنراوەی کوردی جێگـای خۆی کردەوەو بووە هۆی ئەوەی کە هەنگـاوی تری بەدوادابێت و تاقیکردنەوەکەی ئاراستەی بنیاتێکی تری هۆنراوەبکات و بەهۆی ئەمیشەوە ئەوەندەی تر جێگاوشوێنی خۆی لەمەیدانی هۆنراوەی کوردی ئەو قۆناغەدا بکاتەوەو تا سەرەتای حەفتاکانیش هەربە (شاعیری هەڵکەوتووی کورد)[٤٤] بناسرێ. هەرچی (زەبری هۆنراوە) کەشی‌یەتی کەدوا دیوانیەتی ئەوا بەلای ئێمــەوە بووە بنکــەی هەنگـاوێکی نوێی کامـەران و ئەگـەر بێ دەنگی یـەکـەی دوایی نەبوایە ئەوا تاقیکردنەوەیەکی تازەتری پێ ئەنجام ئەدا چونکـە ئەوەی لا ئاشکـرابووە: «ریالیزمی نوێ پێویستە هێز بدات بە دەمـاری رەنجبـەران بۆ تێ‌کـۆشـان و کۆڵ نەدان نەك ئائومێـدی برژێنێتە دڵیانەوە»و «یاخی بوون ئەبێ سوودی ئەوچینە چەوساوانەی تێدا بێت نەك یاخی بوون هەر بۆ یاخی بوون بێت».[٤٥]

## پەراوێزەکان:

١ ـ کۆرێکی (نیسـانی ساڵی ١٩٨٣)وە وەرگیـراوە کە لەشاری هەولێر بۆ کامەران گیرابوو بە ناوی (من وهۆنراوە).

٢ ـ دیاری، کامەران، چاپخانەی مەعارف، بەغدا ١٩٥٧: ١٣

٣ ـ کامـەران و دیـاری‌یـەکـەی، مەعـروف بەرزنجی، گۆڤاری شەفەق ژمارە (١)ی ١٥ك٢، ٩٥٨: ٢٠

٤ ـ کامـەران و هۆنـراوەی نوێ (لێکـۆڵینـەوە)، محمـد صديق عارف، چاپخـانـەی مەعـارف، بەغـدا، ١٩٥٨: ٢١. (محمد صديق عارف) کاك (حسين عارف)ی چیرۆك نووسە.

٥ ـ الـواقعيـة في الادب الكردي، د. عزالدين مصطفى رسول، صيدا، ١٩٦٦: ١١١

٦ ـ دیاری: ٢٠

٧ ـ کچە شقارتە فرۆشەکە، هانس ئەندەرسون، گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٤)ی ساڵی (٤): ٣١ کاتی خۆی (پـەخشـان صابر) کە قوتابی کۆلیجی ئاداب بوو سەرنجی بۆ راکێشام.

٨ ـ دیاری: ٢٣

٩ ـ دیـوانی گۆران، ئامـادەکـردنی محمـدی مەلا کەریم، چاپخـانـەی کۆری زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠: ٥٧

١٠ ـ دیوانی گۆران: ٩

١١ ـ دیاری: ٦٢

١٢ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٦٦

١٣ ـ دیوانی گۆران: ٤٢

١٤ ـ کاروانی شیعـری نوێی کوردی، کاکـەی فەلـلاح، بەرگی یەکەم. چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨: ٢٣٦

١٥ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢٣٩

١٦ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢٤٥

١٧ ـ بەختیـار زێـوەر (ژیـان و بەرهـەمی). دوکتـۆر عیـزەدین مستـەفـا رەسوول، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات. ژمارە (٢٢)ی ساڵی ١٩٧٨: ٤٩

١٨ ـ دیـوانی کامـەران موکـری. ئامـادەکـردنی عەبدوڵلا عەزیز خالد، چاپخانەی رۆشنبیری‌و لاوان، هەولێر ١٩٨٨: ٢٦٧

١٩ ـ الواقعية في الادب الكردي: ٢١٣

٢٠ ـ دیاری: ٣١

٢١ ـ کامـەران و دیـاری‌یەکەی. گۆڤاری شەفەق ژمارە (یەك)ی ١٥ك٢ ١٩٥٨: ٢٠.

٢٢ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٩

٢٣ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٤٩

٢٤ ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٢

٢٥ ـ دیاری: ١٣

٢٦ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٥

٢٧ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٤٥

٢٨ ـ دیاری: ١٩

٢٩ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٣

٣٠ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢٢

٣١ ـ بنیـاتی هەڵبـەست لە هۆنـراوەی کوردی‌دا، دلشـاد علي محمـد، نامەی ماجستێر: ١٦٦ ـ ١٧٠

٣٢ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٥٤

٣٣ ـ هۆنـراوەی نوێ، لێ‌کـۆڵینەوەیەکی ویژەیی، ناکام، چاپخانەی کامەران، سلیمانی، ١٩٥٩: ٣٤

٣٤ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٤٤

٣٥ ـ لەگـەڵ کامــەران دا، رۆژنـامـەی هاوکـاری ژمارە (١٦)ی شەممـەی ٢/٥/١٩٧٠: ٤، ٧

٣٦ ـ کامەران و هۆنراوەی نوێ: ٥٦

٣٧ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٥٧

٣٨ ـ بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردی‌دا (نامەی ماجستێر): ٥٢ ـ ٨٨

٣٩ ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٧

٤٠ ـ لە کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)یەوە: ٢٤٧

٤١ ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی: ٢٤٧ ـ ٢٤٨

٤٢ ـ دیوانی کامەران موکری: ٢٧٢

٤٣ ـ لەگەڵ کامەران دا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤

٤٤ ـ زەبری هونراوەو کارەساتی وشک بوونەوە، سامی شۆرش، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٤)ی (٤)ی کانوونی یەکەم ١٩٧١.

٤٥ ـ لەگەڵ کامەران دا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤

٤٦ ـ زەبری هونراوەو کارەساتی چرنوك گرتن، زمناکۆ، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٦)ی (١٨)ی کانوونی‌یەکەم ١٩٧١.

٤٧ ـ کورێك بۆ ڕوانگە خوازەکان، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٦)ی (٢)ی شوباتی ١٩٧١.

٤٨ ـ دیوانی کامەران موکری: ٢٩٨

٤٩ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٣٢٥

٥٠ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٢٨٠

٥١ ـ لە کۆڕێکی (نیسانی ساڵی ١٩٨٣)وە وەرگیراوە کە لە هەولێر بۆ کامەران گیرابوو.

٥٢ ـ لەکۆڕێکی (مارتی ساڵی ١٩٧٩)وە وەرگیراوە کە لە سلیمانی بۆ کامەران گیرابوو.

٥٣ ـ لەگەڵ کامەران دا، ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٦): ٤

٥٤ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٤

٥٥ ـ سەرچاوەی پێشوو: ٤

# ملامح الابداع في قصائد كامران


دلشاد علي محمد

كلية الأداب ـ جامعة صلاح الدين



يتناول البحث المراحل الابداعية عند الشاعر كامران موكري ولتحقيق هذا الهدف قسم الباحث دراسته الى ثلاثة فصول، فقد تناول في الفصل الاول التجربة الشعرية الاولى للشاعر مبتدءاً بديوانه الأول وآراء من سبقوه من الدارسين لشعر كامران في تلك المرحلة. وفي الفصل الثاني تطرق الباحث لتلك القصائد القصيرة التي إشتهرت خطأً بالرباعيات والخماسيات مستعرضاً الاراء التي طرحت حولها، ولقد إعتبر الباحث هذه القصائد القصيرة من نتاجات المرحلة الابداعية الثانية للشاعر. أما في الفصل الثالث فقد تناول الباحث الديوان الأخير للشاعر وخلافاً لآراء من سبقوه إعتبر الباحث هذا الديوان مرحلة جديدة من مراحل التجربة الشعرية لكامران وكذلك تناول الباحث ضمن هذا الفصل الصمت الشعري عند كامران والآراء التي ظهرت حول مسبباته. وفي نهاية البحث قدم الباحث خلاصة إستنتاجاته حول الموضوع.

زانست

# ئامێرو پەرەسەندنی لە کۆنەوە تا ئەمرۆ

نافع کاکە قولانی

هەزاران ساڵ لەمەوبەر مرۆڤی کۆن بەتەنیا هێزی ماسولکەی بەکاردەهێنا بۆ بەدەست هێنانی پێداویستی ژیانی و گوزەرانی کردنی. دوایی وردە وردە بە تێپەربوونی کات کاروباری خۆی چاکتر کردووەو هۆیەکانی چاککردنی ژیانی داهێناوە بە دۆزینەوەی پێویستییەکانی ژیانەوە بەرو دۆخی واشی بەسەردا هاتووە کە بیر بکاتەوەو هەوڵی پەرەپێدانی ئامرازەکانی کارکردنی خۆی بدات و لەگەڵ کارو پیشەی خۆی بیانگونجێنێ، ئیدی مرۆڤ وای لێ هاتووە نوێڵ بەکاربهێنێ بۆ زۆربەی کارەکانی ژیانەی، لەوانەش بۆ ڕاووشکاریش. جا لەگەڵ پێشکەوتنی رادەی بیری مرۆڤ وردە وردە ئامرازەکانیشی لەگەڵ پەرەی سەندووە، لەکاتی گۆڕانکاری پەلە بە پەلەی ژیانی سەر وەختی، دووای چاخی ڕاووشکار چاخی کشتوکاڵ و نیشتەجێ بوون دەستی پێ کردو لەو سەردەمەش دا مرۆڤ پتر پێویستی بە ئامرازو ئامێرو کەلو پەلی چەشنی نوێڵ و پەرەپێدرانی پتر بوو چونکە ئەو ئامرازو پێویستیانەی لە سەردەمی کشتوکاڵ دا پێویست بوو ئاڵوزترو ووردتر بوون لەو ئامێردانەی لە سەردەمی چاخی ڕاووشکاردا پێویستی بوون هەر وەکو ئەوەی لە سەردەمی پیشەسازیدا ئامرازی پێویست وردترو ئاڵوزتر بوون لەهی سەردەمی کشتوکاڵ دا لەسەردەمی پیشەسازیش دا ئەو پەرەسەندنە بەجۆرێك تەقی یەوە. نەوەبوو هەر لە زووەوە لە شارستانی یەتە کۆنەکاندا مرۆڤ بۆ بیناسازیو ئاوەدان کردنەوە نوێڵ و جۆرەکانی بەکار هێناوە، ئەگەرنا شاکاری ئەوتۆ پاشماوەیان ماوە کە بەبێ جۆرەکانی نوێڵ و ئامێردەکان و کەلوپەلی وردەکاری درووست کردنیان ستەمە. بەگوێرەی وێنە کێشراوەکانی سەر دیواری ئەشکەوتەکان دەردەکەوێت مرۆڤ هەر لە ژووەوە ڕەورەوە یان پێچکەی داهێناوەو گەلێ سوودی لێ وەرگرتووە بە شێوەیەکی سەرەتایی بۆ گواستنەوەی شتی گرانی وەکو دارو بەردی گەورەو گلۆر کردنەوەیان لە سەر پێچکە دارینەو بەردینەکان. ئیدی لە رابووردووی دوورو درێژی مرۆڤایەتیدا مرۆڤ بۆ هات و چۆی لە پیادە ڕۆیشتن بەولاوە هیچ ڕێگەو هۆیەکی تری نەبووە لە کاتی گەڕانی بەدووای خۆراك و شوێنەوارێکی گونجاوترداو بەدووای گوزەرانێکی باشتر، ئەوە هەردەم کەلوپەلی پێویستی بەدەستی خۆی هەڵگرتووەو کوچبەری هەردەم بە سەر شان و لەکۆڵ دا بووە دووایی سەبارەت بە ئەزموونەیی و تێڕووانینەکانی خۆیی و پێشکەوتنی هۆش و بیری توانیویەتی گیانەوەرەکانی دەوروبەری خۆی کەوی بکات و بۆ سوودی خۆی رایان بهێنێ نەك تەنها بۆ خۆراك راویان بکات، بۆ یەکەم جار گاجووتی بەکار هێناوە بۆ بارکردن ئەوەش هەر لەبەر ئەوە بووە چونکە گاجووتی بۆخۆراك ڕاو کردووەو لەگەڵ ئەوەدا بیری لێ کردۆتەوە سوودێکی تریشی لێ وەربگرێت بەر لە خواردنی ئەنجا دووایی گیانەوەرانی تری وەکو کەرو بارگیرو فیل و پاشان ئەسپ و ئەو وڵاغە بەرزانەیان بۆ بارکردن و سوود وەرگرتن بەکارهێناوە، ئیدی دووای بەکارهێنانی گیانەوەران و دۆزینەوەی پێچکە ئەنجا بیری لە گالیسکەو پەیتوون کردۆتەوە کەوا تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم گالیسکەو پەیتوون هەر هۆیەکی سەرەکی هات و چۆ بووە.

بەڵام دەربارەی داهێنانی پێچکە نازانین بۆ یەکەم جار کەی بەکارهاتووەو کێ یەکەم جار درووستی کردووەو لە کوێ بووە، ئەوەندە هەیە وێنەی سەر دیواری ئەشکەوتەکان وایپشان دەدات کە گالیسکە بەر لە (٣٠٠٠) ساڵ پ.ز بەکارهاتووە بەڵام ئەوەش وادەبێت کە پێچکە بەر لە گالیسکە داهاتبێت بە ماوەیەکی زۆر، بەگوێرەی ئەو وێنانە وا دەردەکەوێت کەوا کۆنترین پێچکەیەك درووست کراوە لە سەر شێوەی نوولەك و خنوکە بووەو لە قەدی دارو درەخت و بەرد دروست کراوە. بەشێوەیەکی واش بە کارهاتووە کە بتوانن شتی لەسەر گلۆر بکەنەوە. بێ گومانیش هەر یەکە لە شارستانی یەتی دۆڵی نیل و ڕافیدەین و شارستانی یەتی گریك بۆ یەکەم جار گالیسکەی بچووکیان بەکار هێناوە بەو شێوەیەی لە پاشماوە دێرینەکان دەردەکەوێت، بەڵام هەر چۆن بێت ماوەیەکی زۆر لە مێژە گالیسکە لە وڵاتەکانی ئاسیای بچووك بەکارهاتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە (٤٠٠٠) ساڵ پ.ز.

تەکنۆلۆژی ئەمرۆ وشەیەکی گریکی یەو زانستی کارمەندەیەو لە بریتی ئەو پەرەسەندنەی ئامێرو ئامێردانە بەکار دێت بەپێی زانستیو زانیاری ئەورو

# زانست

کەوا بێ گومان ئەوەش قەرزاری بچووکترینی داهێنانە کۆنەکانە کە لە سەردەمی زوودا مرۆڤ دایهێناون و بەکاری هێناون و پەرەی پێداون و لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیشدا دەستی بەخۆدا گرت و لەو ڕۆژگارەش زۆر بە خێرایی پەرەی سەندووە لە هەر بوارێکی دا. ئەو دەتوانین بڵێین هەموو ئەو داهێنراوانەی ئێستا ئەنجام دراون وئەنجام دەدرێن زادەی بیرە کۆنەکانن و ئەو پەرەسەندنە بەشێوەیەکی ورد بەداهێنان و دۆزراوە کۆنەکانەکی مرۆڤایەتی یەوە بەستراونەتەوە کەوا داهێنانە کۆنەکان بنکەیەکی سەرەکی یان پێك هێناوە لە هویەکانی پەرەسەندنی زانستی و تەکنۆلۆژی هاوچەرخ دا کەوا ئەو ئامێرانەی ئەوڕۆ دەیان بینین وەچەی ئەو ئامێرە سەرەتایی یانەن کە مرۆڤی کۆن دروستی کردبوون چونکە هەر ئامێرێك لە کۆمەڵە ئامێردەیەکی سەرەتایی پێك دێت بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو ئێرەش دا وەك پێویستی یەك پێناسێکی ئامراز و ئامێردەکەین:-

ئامراز (آلە):

———— ئامراز بەشێوەیەکی سادە بریتی یە لە هویەکی بەکار هێنان بۆ بەرەنگاربوونی هەر بەرهەڵستی یەك لە هەر جێگایەك بێت و هێزێك کاری تێ بکات لە شوێنێکی دوورتربێت. وەکو چەکوش ئامرازێکەو بەسادەیی بەکار دەهێنرێت بۆ داکوتان و دەرکێشان و هاو چەشنە لەگەڵ یەکێ لە سێ چەشنەکەی نوێل.

ئامێر (ماکنة):

———— لە چەند ئامرازێك پێکهاتووەو ئاڵۆزترە بە هەمووی یانەوە کارێکی سەرەکی ئەنجام دەدەن، بۆ نموونە ئەو هۆیەی گۆشتی پێ قیمە دەکەن پێی دەوترێت ئامێر و لە دوو بەش پێك دێت و هەریەکە لە بەشەکانیش ئامرازێکە کەوا بەشی یەکەم ئەو بەشەیە بەهۆی دەست دەجووڵێنرێت و نوێلێکەو لە چەشنەکانی نوێڵە چونکە باسکی هێزو چەقی ڕاگیربوون و بەرگری هەیە هەروەها بەشی دووەمی کە تەوەرەکەیەتی ئەویش ئامرازەو لە چەشنەکانی نوێل دایەو پاڵ بەگۆشتەکە دەدات و ئەو دوو ئامرازەوە ئامێرێکیان پێکهێناوە، بەهۆی ئامێرو ئامێردەوە سەبارەت بەسێ چەشنەکەی نوێل قازانج لە هێز یان لە خێرایی دەکرێت کەوا هێزو خێرایی پێچەوانەی یەکتر هاو ڕێژە دەبن و کاتێ قازانج لە یەکێکیان بکرێت ئەوە دەبێت زیان لەوەکەی تریان بکرێت واتە ئەگەر هێزمان بوو ئەوە خێرایی کەم دەبێت و بەپێچەوانەشەوە. ئیدی مرۆڤ هەر لەکۆندا توانیویەتی بە بەکار هێنانی ئامرازو چەشنی نوێڵەکانەوە سوود لە هێز وەربگرێت بۆ وەدی هێنانی ئامانجەکانی و پەرەسەندنی وورد ووردە بەو ئەنجامەی ئەمڕۆی گەیاندووە، ئەو نووسینەش لێکۆڵینەوەیەکی وردی داهێنانەکانە لە بواری ئەندازەی میکانیکی دا لە سەردەمی کۆندا تاکو سەردەمی ئێستامان کە چاخی زانست و تەکنۆلۆژی و شەری ئەستێرانە کەوا لەو باسەدا کارو ماندووبوون و هەوڵدانی زاناو پسپۆران و خاوەنی داهێنەرەکان بەکورتی نوێ دەخەینە بەر چاو ئەگەر ئەوەی زۆر پسپۆرو شارەزا بێ گومان هەبوونەو ناویان لە ئارادا نەماوەو ئەوەی کە ئاوێشیان نیست ئەو بووەوە دیارە ئەو من بیرەوە بە خوێنەری کوردی زۆ دەکەیەم سەبارەت بەفراوان بوونی ڕۆشنبیری و زانستیان کەوا ئەو زانیاریانە دەربارەی تەکنۆلۆژیەو میکانیکی ئامێر بزانن کە ئەوەش باسێکی گشتی قۆناغەکان و هۆیەکان و بوارەکانی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئامێرە کەو لەوانەیە لای زۆر کەسان ڕوون نەبێت کەوا چۆن ئامێری نیست بەخۆد بڵێین ترومبێلێك یا هەر بابەتێکی تر چۆن بەو جۆرو شێوەیەی دەیبینی هاتوتە بەرهەم ئەوانەشە زۆریش و هەست بکەن ئەوە تەنها هۆش و بیری ماسوولکەی تاکە کەسێك دروستی کردبێت. لە گەڵ ئەوەی هەر ئامێرێکی ترومبێل بێ یا شەمەندەفەر یا پاپۆر یا فڕۆکە ئەوە بەرەنجامی بیرو هۆش و زانیاری و ماندووبوون و هەوڵ و کۆششی ژمارەیەکی یەکجار زۆر داهێنەران و پسپۆرو ئاش وەستاو کرێکارانە. هەروەها لە زۆربەکەی ئەو بابەتەیەوە خوێنەرانی پسپۆرایەتی میکانیکی و تەکنیکی یەکان پێیان خۆش بێت هەندێك لە مێژووی زانستی و تەکنۆلۆژیی ئامێر بزانن ئەوانەیە حەز بکەن بزانن چۆن ئامێر بۆ یەکەم جار داهاتووە، ئایا بە ڕێکەوت بووە یان بە خەون بووەو چۆن ئەو شێوەو ئەو پارچانەی بە ڕێك وپێکی بە شێوەیەکی بیردۆزی و کرداری وا وەرگرتووە کە هەر یەکە فرمانی خۆی بە چوستی یەکی تەواو بەجێ دەگەیێنیت و بەچەند قۆناغ دا تێپەڕیووەو چۆن هەر پسپۆرو ئاش وەستاو کرێکارێك بەشێکی نوێی سەبارەت بە پێویستی و چوست کردنی بۆ داهێناوەو چۆن بەرو دوخ وای بۆ گونجاندووە بیر لە داهێنانی هەر یەکێك لە بەشەکانی کراوەتەوە هەموو ئەوانە ئاستی زانیاری خوێنەرو ڕادەی ڕوشنبیری فراوانتر دەکات و پتر خوێنەری میکانیکی دەباتە ناو بابەتەکەیەوەو پتریش بە سەر پسپۆراتی یەکەی زاڵی دەکات، ئەنجامی ئەوەش سەرکەوتووتر دەبێت لە کرەکەیدا و هەن دەدرێت و باوەری بەخۆی دەبێت کە هەر کەسێك بە پێی توانایی خۆی بۆی هەیە بتوانێت خشتێ لە دیوارێکی گەورە پتر بکات بەتایبەتی ئەوڕو چەرخی زانستی ئەلەکترۆنی و پیشەسازی یە وڵاتەکەشمان لەو بارەیەوە خەریکەو کارگاو کارخانەو فابریقەو پیشەسازی هەمەچەشنەی هەیەو ئەوانەش شارەزاو پسپۆری وریایان گەرەکە. نووسینەکەشم دەربارەی وردی لە مێژووی داهێنان و دروست کردندا لە هێزوی ئەلیگزەندەرانی یەوە (١٣٠) پ.ز دەست پێ ‌دەکات کە یەکەمین کەسە یەکەمین ئامێری خو بزوێنی داهێناوە کەوا بۆ ئارەزووو هەوەس وەکو بووکە شووشەیەك بۆ کات ڕابواردن و جوانی بەکار هاتووە، ماوەیەکی یەکجار زۆری پێ چووە ئەنجا وەکو ئامێر سوودی لێ وەرگیراوەو بەکارهاتووە ئیدی پاشان ئامێر بەخێرایی پەرەی سەندووەو جوولەی خولدار هاتە کایەوەو مرۆڤ توانی بەهۆی خلۆکەوە سوود لە هێزی باو تاڵای ئاگەو

٥

زووبـــرەکـان وەربگرێت و جوونەی خوڵداریان ێ وەدەست بهێنێ و بە دری بهیبیت بو تش و راکیشانی ئاوی کانگکان و هەمینجنی ئاوی ژێر زەوی ئیدی ئەوەش پتر پەرەی سەنـدووەو مرۆڤ تا دەهـات هۆشـمەندو رتـیارتر دەبووەوەو هەوڵی دەدا سوودی زورتر بە زور شت وەربگرێت ت وای لێهات بتوانێت زۆر کارگاو کارخانەی بچکۆڵانە دروست بکات.

ئەو سەش دەستکاریو ئەردەستیو خیرایی پترو سەرمایەیەکی زور تری گەرەك دەبوو بۆیە لەو رۆژانەدا پتر بیر دەکراوە لە بریتی هێزی ماسـولکە هویەکی تر بخریتە کارو تێچوونیشی کەمتر بێت تا لە سەرەتای سەدەی هەژدەهـەم و خەریك بوونی شۆرشی پیشـەسـازی نەشـوونـماکردن لە ئەورووپـد گەی کرگـو کارخـانـە و دەزگ پەیدابوون و دوای ئەوەش کـانگـکـان پتر دەدۆزرانەوەو کارگاو کارخانەسازیش تا دەهات برەویان دەسەند، مروڤ پتر خەریکی کر دەبوو بە کانگاو کرخانەو کارگکان د بەتـایـبـەتی لە کارگـاو کارخانەکانی ئاسن و کانگاکانی کەرەسە خاوی خەمووزی بەردو کەرەسە خاوی ئاسن دا، بەوەش پێویستی دەستی کارو هێزی جوڵێنەرو سەر چاوەی وزە تا دەهات پتر دەبوو لەو لاشەوە ناخۆشی و قورسی و شەکەتی و مەترسی ناو کانگکان هەندەی تر ئەو کرانەیان گرانتر دەکرد وەهەردەم ئاوی ژێر زەوی تەنگی بە کارکەران هەڵ دەچنی کەوا لە ناو قووڵایی و قورتـیی کانگـکـنـدا ئەو ئاوە پەنگـوەی دەداوەو بەری ئیشکردنی دەگرتن و کارەکانیان زۆر قورس و ئەستەم دەبوو بۆیە ماندوو بوونێکی فرەی گەرەك دەبوو جا ئەوەش گەر، هەروا بە هێزی ماسـولکەی مرۆڤ و گیانـەوەران بوایە ئەوە کارەکـەیان ئەنجـام نەدەدرا یان بەهـۆی بەکـارهێنـانی هێزی بـاو هووروژمی ئاو بۆ هەمو جێگایەك نەدەگونجـو مەیســەر نەدەبـوو، سەبـارەت بە هەمـوو ئەوانە کاری کارگاو کارخانەو کانگـکـان وەك دەویسـترا جێ بەجێ نەدەبـوو بۆیە کاروەستاو پسپۆرو شارەزایان کەوتنە خۆو بیرکردنەوە کە چارەسەری ئەو گرفتانە بکەن بە هۆی داهێنانەکانیان، بەڵێ لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەم دا هەندێك ئامێری چنین و پەستان و لێدان کە بەهێزی ماسولکە دەکەوتنە گەر دەهاتنە پەیدا، وێنەی ژمارە (١) ئامرازێك پیشان دەدات کە بۆ سوڕانی ئامێری چنین و بەرداش بەکاردەهات، ئیدی بەرە بەرە بیر لە داهێنانی هۆیەکانی دەست بەسەر داگرتنی ئەو جۆرە کارانە دەکرایەوە بەدۆزینەوەی چەند ئامێرێکی سادە بەنیازی کەم کردنەوەی ئیشی ماسولکە، ئەو دۆزینەوانەش لەلایەن کرێکـارو پسـپۆران و کار وەسـتـایان و ئەنـدازیارانی کارخـانەو کانگاو سازگـاکـانـەوە دەهـاتـنـە ئارا. کەوا ئەنجامی دۆزینەوەی ئەو ئامرازانەو ئیش پێ کردنیان و پەرە پێ دانیان ئامێری هەڵمی هێنایە کایەوە کە بە ئامێری دەرە سووتـەکی External Combustion engine ناوی دەبـرێت، پەرە پێدانی ئەو ئامـێری هەڵمی یەش ئامـێری بەنزین و گازو تورببینی هەڵمی و مژەری هێنایە ئەنجام.



زور جار جیمس وات ١٧٣٦ ـ ١٨١٩ز بە داهێنەری ئامێری هەڵمی دادەنـرێت و دەشگـێڕنـەوە کە جێمس منداڵ بووە لە سکۆتلاند و لای ئاگردان دانیشتووەو سەرنجی داوەتە کوڵانی کتلێیە ئاوەك و تێبینی هەڵمی ئاوەکـەی دەکـرد کە پاڵ دانی دەرخـۆنەکەی دەکردو دەیجوڵاند، دەڵێن جاریك جێمس وات بە نیازی تاقی کردنەوە خەریکی بەهەڵم کردنی کتلێیە ئاوەك دەبێت و لەلـەکەی سەر زەنشتی دەکات کەوا کاتی خۆی بەفیرۆ دەدات لە جیاتی خەریك بوونی بە وانـەکـانی، ئەوەبـــوو ئەنجـامی هەوڵ دانی جێمس وات کە گەیشتە ئەوەی بێتە یەکێك لە بەناوبانگترین داهێنـــەرو پەرەپێدەری ئامـــێری هەڵمی لە جیهـان دا. جێمس هەر لە منـــاڵیەوە زیرەك بووەو کارکـــردنـیشی لە سازگـــای باوکیدا بواری بۆ رەخسـانـدووە. ئەو چیرۆکـە وابـووە بەڵام راستی‌یەکەی هێزی هەڵم بە ١٨٠٠ ساڵ پێش بوونـی جێمس وات زانـراوە. لە ساڵی ١٣٠ پ.ز ئامـــێرێکـــی بچـــووك لە لایەن هیرۆی ئەلـیگـــزەنـــدەرانـی‌یەوە Hero دروســـت کراوە کە ئەو کابـــرایە شارەزایەکـــی زۆری هەبـــووەو لە ئەسکـەندەریەدا دەژیاو ئامێرەکەشی بووکە شووشـەیەکی سەیر بووەو لە توێیك پێکهاتبوو لە سەر کوچکەی تایبەتی بەهۆی هێزی هەڵمەوە بەدەوری خۆیدا دەخوولاوە ئەوەش لە ئەنجامی هێزی کاردانەوەی دەرچوونی هەڵمی ئاو توێیەکە دەبوو لە دوو دەرچەوەو پێی دەگوترا ئامێرە هەڵم Steam engine (وێنەی ژمارە (٢) ) ماوەی نزیکەی ٢٠٠٠ دوو هەزار ساڵ ئامێرەکەی هێرۆ وەکـو خۆی ماوە ئەنجا لە سەدەی حەڤدەهەم پەرەی پێدرا، زۆر جارانیش ئەو هێزە هەڵمی‌یە یان ئەو ئامێرە هەڵمی‌یانە بە ئامێرە ئاگر Fire en-gine دەنـاسران کەوا هەر لەزووەوە شارستـانی‌یەتی گەلان هەوڵی بەکار

# زانست

هێنانی ئاگرین داوه بو وەدەست هێنانی وزە ئەوە بوو لە وڵاتی چین دا ٤٠٠٠ پ ز، لە میسردا ٢٠٠٠ پ ز بە کارهاتووە دووای ئەوانەش لە ئیمپراتورییەتی رومانیدا بەکار هاتووە بەڵام بەکار هێنانەکەیان بە سادەترین شێوە بووە لە بواری بەهەڵم کردنداو بۆ شەرکردنیش بەکاریان هێناوە (مەنجەنیق)، یان بەکار هێنانی هێزی هەمی بو ئاگرکوژاندنەوە بەهۆی ئامێرە ئاگرەوە کە لە ئاسن و دار دروست کرابوو توانای بەرزکردنەوەی ئاوی هەبووە بە هێزێك کەوا بو ئاگر کوژاندنەوە دەست بدات و توانای بەرز کردنەوەی ئاوی هەبووە بۆ ماوەی (٩٠) پێ بەرزو بەرز کردنەوەی (٤٠) تەن ئاو بە کاتژمێریك دا و کەوا بزوەك و بەستێنەری هەبووە.



FIGURE I (Hero)

پەرەپێدانی ئامێری هەڵمی سەبارەت بە بەکار هێنانی بەنیازی کارکردن و ئابووری وانەبوو تا گەیشتە سەدەی حەڤدەهەم، ئەوەبوو زاناکان خەریك بوون ئەوەی بە بیریانە بتوانن لە کاردا بەجێ بگەیەنن و تاقی بکەنەوە، پەیوەندی نێوان گەرمی و هەوا لە بیری زاناو فەیلەسووفەکاندا پەنگی دابۆوە کەوا چۆن ئاگر بکرێتە هێزەك بۆ هەموو شتێك و بتوانن دەست بەسەر ئەو وزەیەدا بگرن. یەکێ لەو زانایانە ئۆتۆ ڤۆن گیورکە ١٦٠٢ - ١٦٨٦ز سەرۆکی شارەوانی ماگدبرگ و ئەفسەری تفاقی شاهانە کەوا گیورك سامان و کاتی خۆی زۆر لە پێناوی تاقی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانیاریدا بەخت دەکرد و لە ئەنجام دا توانی فشار Vacuum ی دروست بکات لە قاپێك داو ئەنجامی ئەوەش پەمپی ئاوی دروست بوو کەوا گەورەترین و سەیرترین تاقی کردنەوەشی کرد لەبەردەم ئیمپراتۆر فەردیناندی سێیەم و پیاوانیدا کەو (١٦) ئەسپی بەکار هێنا بو جیا کردنەوەی دوو نیوەی گویەکی لە هەوا بەتاڵ کراو، کە لە هەر لایەك (٨) ئەسپ نیوەگۆیەکیان پێچەوانەوەی ئەوەی تر رادەکێشا. ئەوە لە ساڵی ١٦٥٠ز لە شاری ماگدبرگی ئەڵمانیدا. کەو تۆپەکە فشارکراو بوو لە هەموو لاکانیدا هەوای دەرەوە هووروژمی دەکردە سەر تۆپەکەو بچێتە ژوورەوەو رێگەی چوونە ژوورەوەی هەوش نەبوو بۆیەکجار تۆپە پێکەوە نووساو بوون و بە هێزی راکێشانی (١٦) ئەسپ لێك نەبوونەوە. ساڵی ١٦٥٤ز بەکار هێنانی تەکنیکی کرد کەوا هەوای دەرەوە پەستێنەری ئەو لوولەك بجووڵێنێ و پەمپە ئاوییەکەی بەکاردەهات بۆ باغچەکان و هەڵێنجانی ئاوی بیرو کانەکان و کانگاکان. بەوەوە دۆزینەوەی فشاری هەوایی هاتە پەیدا، ئەگەرچی پێش دۆزینەوەی فشاری هەوایی پەستێنەری ئاوی هەر هەبوو کەوا زانا دی کۆس de caus ١٥٧١ - ١٦٢٦ز ترومپایەکی دروست کردبوو بریتی بوو لە قاپێك و بۆرییەکی درێژ بە بنکی بیرەکە دەگەیشت و بە گەرم کردنی قاپەکە ئاوەکەی ناوێی دەبووە هەڵم و دەر دەچوو بەداخستنی دەرچەکەو سەرکردنەوەی فشارێك دروست دەبووو پاڵەپەستۆی ناو قاپەکە لە پاڵەپەستۆی دەرەوەی کەمتر دەبوو لێرەدا پاڵەپەستۆی دەرەوەی پەنەپەستۆی دەخاتە سەر ئاوی بیرەکەو فشاری قاپەکەی پردەکردەوە. دووای ئەوە دینیس پاپن ١٦٤٧ - ١٧١٤ز بەیارمەتی زانا بۆیل Robert Boyle ١٦٢٧ - دامەزرێنەری سەرۆکی کۆمەڵەی شاهانە لە زانکۆی ئەکسفورد دا لە لەندەن قەپێکی دروست کردو پاڵە پەستۆیەکی زۆری هەبوو و کرا بە مەنجەڵی هەڵم پەست ساڵی ١٦٧٥ز وپێی دەگوترا هێلك هەرسکەر، دروست کردنی ئەو مەنجەڵە بووە خاڵی سەرەتایی داهێنانی ئامێرەکان هەڵم.

سەبارەت بەکارەکانی گیورك و دینیس پاپن و بۆیل ترومپی ئاوی و هەموو هێزێکی فشاری هاتە ئاکام، گرنگترین کاری دینیس پاپن ئەوەبوو لوولەك و پەستێنەری بەکار هێنا ئەوەش گەورەترین خاڵە لە پەرە پێدانی زانستی و تەکنۆلۆژی ئامێردا، هەر لەو سەردەمەش دا دینیس پاپن بەلەمێکی دروست کرد بە ئامێرە هەڵمییەکەی کاری دەکردو پێچەوانەی شەپۆلی و رێرەوی ئاویش دەڕۆیشت، کاتێ پاسەوانان ئەو کردەوە سەیرەیان دیت وئەو بەلەمەیان لا ناهەموار بوو بۆیە لێیان شکاند. تاقی کردنەوەکانی پاپن papin وای لە سەرۆکی پروستاتییەکانی ئەڵمانیا کرد کورسی مامۆستایەتی زانکۆی (ماگدبوگ)ی پێ بداتێ. هەر لەو کاتەش دا کابرایەکی فەرەنسی ئەبا هۆت فیل هەوڵی دا دەست بەسەر وزەی باروت Gun powder دابگرێت بە تەقاندنەوەی لە ناو لوولەکێکدا پەستێنەر پاڵ بدات ساڵی ١٦٧٨ز دووای ئەوە دوو بارە ساڵی ١٦٨٠ز زانایان هیوگنزو پاپن دوو فەرەنسی بوون لەو بابەتەوە ئامێرێکیان داهێنا بەڵام دەست بەسەر داگرتن و دابین کردنی بڕی وزەو گرانی و زەحمەتی لوولەك پرکردن



به سووتــەمــەنی باروت لە نێوان لێدانــەکــانی دا Strokes ڕێگــەی لە پەرەپێدان و پێشکەوتنی ئەو جۆرە ئامێرەدا گرت.

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا ساڵی ١٦٩٨ز تۆماس ساڤەری ١٦٥٠ - ١٧١٥ ئەنـدازیاری شاهـانـەو سەرکـردەی دەریـوانی ئینگلیزی تێبینی چوونە خوارەوەی قەپاغی ئەو شووشەیەی دەکرد کە هەڵمی ئاوە گەرمەکەی ناوی خەست دەبووە بە سارد کردنەوە، ساڤەری هۆی ئەوەی نەزانی بەڵام لە ئەنجامی چەند تاقی کردنەوەیەکدا گەیشتە داهێنانی ئامێرێکی سادە کە پێکهاتبوو لە هۆیەکی جوولاندنی پارچە کانزایەك بەرەو پێش و پاش کاتی گوزەر کردنی هەڵمی ئاو لە دەروازەیەکـەوە بۆ ناو تەنگـەبـەرێك و توانی ئامـرازێکی پێ دروست بکـات بۆ مەبەستی هەڵێنجانی ئاوی بیرو ئاوە زیادەی ناو کانگاکان کەوا بە هەڵمی ئاو ئیشی دەکرد بێ وەی لوولەك و پەستێنـەری هەبێت، ترومپایەکەی ساڤەری بریتی بوو لە مەنجەڵێك و سێ دەرچـەی تیادا بوو لە دەرچـەیەکـدا هەڵمی ئاو دەچـووە ژوورەوەو بۆریەکیش بۆ بنکی بیرو کانگـاکاندا درێژ دەبووە، دەرچەکەی تریشی ئاوی ناو قاپەکەی لێ دەهاتە دەرەوە، کاتێ مەنجەڵەکە پڕ دەبوو لە هەڵمی ئاو ئەنجا مەنجەڵەکە بەهۆی ساردکردنەوە هەڵمی ناوی خەست دەبووە کە هەموو قەبارەی مەنجەڵەکەی داگرتبوو ئیدی بە خەست بوونەوەی هەڵمەکە فشارێکی لە ناو مەنجەڵەکەدا دروست دەبووو پاڵەپەستۆی دەرەوە هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشایی یەی دەدا ئەویش لە ڕێگەی بۆری بنکی بیرەکەدا ئەو هوورووژمی ناو مەنجەڵەکەی دەکرد سەبارەت بە پاڵەپەستۆی دەرەوە مەنجەڵەکە پڕ ئاو دەبوو ئەنجا لە دەرچەکەی‌دا بەتاڵ دەکراو بە بەردەوام بوونی ئەو کارەوە ئەو پەستێنەرە ئیشی دەکردو ئاوی رادەکێشا وێنە (٦)، ئەو ئامـێرەی ساڤـەری Savery چونکە بەهۆی پاڵەپەستۆی دەرەوە کاری دەکرد بۆیە پێی دەگوتر ئامێری هەوایی. ئەو ئامێرە ماوەیەکی زۆر لە کاردا بوو تاڵـەسـاڵی ١٧١٢ز ئامـێرێکی تر لەو بابـەتەوە لەلایەن ئەندازیاری ئینگلیزی تۆماس نیوکۆمەن Thomas Newcomen لە دارتموت دروست کرا کە هەر لە نزیك جۆرەکـەی ساڤەری بوو بۆ دەرهێنان و هەڵێنجانی ئاو بەکار دەهات کەوا لوولەك و پەستێنەری هەبوو هەروەك لە ترومپادا بەکار دەهات. نیوکۆمەن هەروەکو ساڤەری خەستکردنەوەی هەڵمی ئاوی بەکار دەهێنا بۆ سەرچاوەی جوڵان بەڵام لێرەدا تەنها بۆ دروستکردنی فشاری ناو لوولـەکـەکـە بوو، بەشی یەکـەی ئامێری نیکۆمەن ئەوەدابوو لە دەرچەو لوولـەکی تایبـەتی‌دا هەڵم دەچـووە ژوورەوەو دەهاتە دەرەوە ئەو کارەش هەردەم بەوە دەبوو یەك لە دەرچەکان بکرێتەوەو ئەوی تریان دابخرێت و بە پێچـەوانـەش بە پڕ هەڵم کردن و خەسـت بوونـەوەی هەڵمەکەو دەست بەسەر داگرتنی هەردوو دەرچەکانی بە کردنەوەو داخستنی زەمبەرەکان پەستێنـەرەکـە دەجـوولاو دەکـەوتـە ئیش (وێنـە (٧) ) بەهـۆی چەنـد ڕێکخستنەوە جۆرە ئەرەی دەکەوتـە ترومپای ئەوو بەکاری دەهێنـا.

کردنەوەو گرتنەوەو دەست بەسەرداگرتنی دەرچەو زەمبەرەی هەڵم و ئاوەکە وا گەرەك دەبوو بە دەست بکرێت کەوا هێزێکی زۆریشی گەرەك نەبوو بۆیە ئەو کارە بە منـداڵانیش ئەنجـام دەدراو زۆر جاران منداڵ بەکرێ دەگیران بەنرخێکی هەرزانتر یەك لەو کرێکارانە منداڵێك ناوی هامفەری پۆتەر Humphrey Potter بوو ئیشی ئەوەبوو لەسەرەخۆ زەمبەرەکان لە دووای یەکـتر بکاتەوەو دا بخات بە بەردەوامی هەر چۆنێك بێت ئەوە کارێکی گرانـە، بۆیە ئەو منداڵە بیری لە هۆیەك دەکردەوە ئەو کارەی سەرشانی ئەختێك ئاسانتر بێت. هامفەری وای لە ئامێرەکە کرد هەر خۆی زەمانەکانی Valves یان زەمبەرەکان بکاتەوەو بگرێتەوە ئەویش بە گەیاندن و پەستانی ڕەسـەکـان بەهۆی چەند گوریس و تویەوە لەگەڵ بەشە جوولاوەکانی ئامێرەکەدا کەوا کارەکەی بەئاسایی بەجێ بگەیەنێت و بە چوستی یەکی زۆریش کاربکـات، ئیدی ئەو منـداڵــە بووە یەکێك لە پەرەپێدەرە بەنـاوبـانگـەکـانی ئامێری هەڵم، ئەو هەڵمەی لە ئامێری نیکۆمەن بەکار دەهات بۆ پاڵنانی پەستێنەرەکە نەبوو بەڵکو تەنها بۆ دروست کردنی فشار بوو و بۆشایی هەوایی دروست بێت و پاڵەپەستۆی دەرەوە هوورووژمی ناو لوولەکە بکات و ئەو ئامێرەش ئامێری هەوایی زۆر سەرکەوتوو بوون و ماوەی نیو سەدە لە کاردا بووو بەرە بەرەش پەرەیان پێ دەدرا و لە کانگـکـان و کارخانەو پیشەسازی‌یەکاندا ئیشیان دەکرد تا دەشهات بە بواری شێوەو تەکنیك و چوستی‌دا پتر پەرەیان پێ دەدراو سوودیان پتردەبوو و تا دەهـات ژمـارەیان پتر دەبـوو لە زۆربـەی کانگەو کارخانەکان لە پیشەسازیی ئاسن و پۆڵاو کانگاکانیان داو کانگای خەڵووزی بەردا، بۆ یەکەم جاریش ئامێری هەڵمی لە لایەن پۆلزنۆڤ polzunov لە ساڵی ١٧٥٨ز لە ڕووسیا بەکار دەهات و سوودی لێ وەردەگیرا بۆ پیشەی چەکووشی زۆر گەورەو گران کە کێشیان تەنێك دەبوو کە لە هەندێك پیشەسازیدا بەکار دەهات. بەو جۆرە ئامێری نیکۆمەن بە سەرکەوتوویی لە کاردا بوو لەگەڵ هەندێ کەم و کوڕی هونەریدا کە ئەوانیش چارەسەریان دەکرا لە لایەن

کارگەرو پسپوران و ئاش وەستانەوە، تا ئەو دەمەش لە ئامێری نیکۆمەن دا هێزی هەڵم تەنها بۆ دروست بوونی فشار بەکار دەهات کە ئامێری هەوایی یان پی دەگوترا وات هاتنی جیمس وات کەوا ئەو کابرایە هەر لە مندالی یەوە لەسازگای ئاوکیدا ئیشی دەکرد لە سکۆتلاند لەشاری گلاسکو کەوا کوریکی زیرەك و لی هاتوو بوو سالی ١٧٥٧ لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا لە زانکۆی گلاسکۆدا دووای خوێندنی لەوێ کاری دەکرد، ئەوە بوو سالی ١٧٦٣ چاککردنی نموونەیەکی ئامێری هەڵمی پی درا ئەویش مۆدیلەکی ئامێری نیکۆمەن بوو کە لە بوواری وانەگوتنەوەدا بەکاری دەهێنا. کارکردنی پەمپەکەی ئامێری نیکۆمەن وزەیەکی سووتەمەنی زۆری گەرەك دەبوو بۆ کارکردنی لێرەدا جیمس وات سەرنجی دایێ و تێبینی یەکانی خۆی لە کارکردنی تەکنیکی ئامێری هەوایی یان ئامێری هەڵمژین دا Suction engine بەکارهێنا ئەوە بوو ساڵی ١٧٦٩ز خەستکەرەوەی Condenser بۆ ئامێرەکە دروست کرد چونکە گەرمی یەکی زۆری گەرەك دەبوو بۆ بە هەڵم کردنی ئاو ئەنجا دووبارە گەرەك دەبوو لوولەکە سارد بکرێتەوە ئەوەش بە ئاوی دەرەوە دەکرا سەبارەت دروست بوونی فشار بۆ خەستکردنەوەی هەڵمەکەو دوویی گەرم کردنەوەی بۆ بەردەوام بوونی ئەو کارە ئەوە سووتەمەنی زۆری لە دەست دەچوو لەگەڵ کاتێکی زۆریش سەبارەت بە ساردکردن و خەستکردنەوەی لوولەکەکەوە، بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە جیمس وات خەستکەرەوەی بەکار هێنا بەوەوە

لوولەکە هەر بەگەرمی دەمێنێتەوە خەستکەرەوەش هەر سارد دەبوو بەوەوە سووتەمەنی وەکو جاری پێشوو زۆر نەدەویست و کاتێکی کەمتریشی گەرەك دەبوو و سەرچاوەی وزە power زۆرتر دەستی بەسەر داگیرا کە لە ئەنجامی جیاوازی پلەی گەرمی نێوان یەکەم دووەم و سارد کردنەوەو گەرم کردنەوەدا لە دەست دەچوو، ئەوەش خێرایی یەکی پترو کاتێکی کەمترو چوستی یەکی پتری دەبەخشی ئەوەش لە ساڵی ١٧٠٩ز بوو کە بە ساڵی گۆرانکاری و پەرەپێدانی ئامێری هەڵمی دادەنرێت. هەر لەو ماوەیەش دا جیمس وات گەلێ پەرەپێدانی تری بە بەشەکانی ئامێرە و وی لە زمانە دەرچەکانی chocke کرد ئەوەدەرچەو inlet chocke ئاو دەرە دەرچە outlet chocke ئەو جۆرە بە جۆرە نوێیانە ئامێرەکە خێرا زیاتر کاری و توانای خوێن بکرێنەوە و بخرێنەوە لە کاتی دیاری کراودا کەو کاتی خۆی هەمەری پێوەر بە چەند گۆرینی و ترییەت پێکی هێنا بوو. هەر وەها لە هەمان ساڵدا ١٧٦٩ز جیمس وات توانی لەو ئامێرانەی تا ئەو کاتە لەرە جوولەیان up and down motion هەبوو یان جوولەی هات و چۆ بگۆرێتە جوولەی بازنەیی circular motion بەوەی کە بلند بوونەوەو نزم بوونەوەی نوێلی پەستێنەر بکاتە جوولەی بەخول Rotary motion ئەویش بە هۆی بەکار هێنانی خلۆکەوە یان فلایویل Fly wheL یاخود گرگرە یان بە هۆی گێری

تایبەتی یەوە کە پی یان دەگوترێ گێری خورو هەسارەکان.

لەگەڵ ئەوەی لەرە جوولە دەگۆرێتە جوولەی بەخول دەشتوانێ خێرایی پتر یان کەمتر بکات و بەوەوە هێز زۆرو کەم دەکرێت ئیدی بۆ گۆرینی جوولەو هێز ئەو سیستەمە بەکاردەهات تا ساڵی ١٨٠٢ جیمس پیکارد James pickard توانی جوولە بۆ فلایویل بەشێوەیەکی تر بگۆرێت ئەویش بە بەکار هێنانی کرەنك شەفت کە خێرایی یەکی زۆریش بەدات هەروەها جیمس وات توانی شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی تر بۆ دابین کردنی سووتانی هێندی سووتەمەنی لەکاتی گۆرانی خێرایی بهێنێتە پەیدا کە بە شێوەی وات بەناوی خۆیەوە دەناسرێت دووای کارەکانی ئەو دوو جیمسە پیکاردو وات دەرگایەکی فراوان بوو بەکارهێنانی ئامێرە زۆربەی بوارەکاندا کرایەوە چونکە بەر لەوەی خولدار پەیدا بێت ئامێری هەڵمی هەر لە بواری لەرە جوولەدا کاری دەکردو ئەدەخیوایە کارکردنی لە بواری جوولەی خولدا زۆر تەنها لە کارەکانی فشارو پەستان و کوتان و راکێشان دا بەکاردەهات ئیدی بە بەکارهێنانی گێری خورو هەسارەکان و کرەنك شەفت توانرا لە بواری پیشەسازی رستن و چنین و هەموو ئەو پیشەسازییانەو کارخانانەی جوولەی خولدار یان بۆ دەگونجا بەکاردەهات. دەربارەی بەکارهێنانی ئامێری هەڵم لە بواری هات و چۆدا تا ساڵی ١٧٦٩ز نەبوو ئەوە بوو لەو ساڵەدا کە جوولەی خولدار لەجوولەی لەرە پەیدا بوو بە هۆی گێرو کرەنکەوە ئیدی توانرا ئامێری هەڵمی بەکار بێنن بۆ مەبەستی گواستنەوە لە ئامێری خۆرەودا (ماکێن) کەوا نیکۆلاس جۆزیف کوگنوت Nicolas J Cognut هەر لەو ساڵەدا ١٧٦٩ز بەکاری هێنا کەوا ئەو کابرایە ئەندازیارو ئەفسەری سوپای فەرەنسی بوو.

لە راستی یەکەیدا پێش ئامێرە خۆرەوەکەی کوگنوت بیرۆکەی داهێنانی ئەو ئامێرانە هەر هەبوو لەو سەردەمە کۆنەکانی گریکدا ئەو هیرۆس لە ئەلیادە ئاوی ئەو جۆرە ئامێرەی هێناوە (عارەبانەی خۆش رەو). بەڵام لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستی دا هونەرمەندی مەزن لیۆناردۆ داڤینشی Leonardo De Vinci ١٤٥٢ ـ ١٥١٩ز بیرۆکەی ئەو ئامێرە خێرایانەی وێنە کێشاوە ئەو بە هێزی ئاوو بەفر دەسوڕانەوە ئەو هەروەها چەند ئامێری فڕین و ئامێری جەنگی سکێچ و وێنە کێشاوە کە بووینە سەرچاوەیەکی زانستی ئامێر لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەندازەی میکانیکی دا هەروەها ڤۆلتەر Volter باسی دەکات کەو لەساڵی ١٤٧٢ز پەیتوونەکی کردووە بەهێزی هەوا دەروێشت هەروەها لەساڵی ١٧٦٠ جینۆڤ Ginova پەیتوونەکی کردبوو بەهۆی هەواوە بە پەروانە دەروێشت و بەر لەوەش ساڵی ١٦٨٠ز ... پەیتوونی خێرای دروست کردبوو بەهێزی قورمیش کاری دەکرد، ئیدی هەر لە زۆروەی ... پەیتوونانە بەهۆی قورمیش و هێزی بە پەروانە کارێن دەکرد بە هیچ

## زانست

بوریکـد، سەرکـەوتوو نەبوون بەلام بیرۆکەکەیان لە داهێنانی پەیتوونی خۆرەوو ئامێردا بە سەرەتـای داهێـنـانی ئامێر دادەنرێت و ئەو بیرۆکانە پەرەیان پێدرا ئامێرو ماکینی ئێستا زادەی ئەوانن .

ماکینەکەی نیکۆلاس جۆزیف کوگنوت .

سالی ١٧٦٩ بەیەکـەمین پەیتوونی بێ ولاغ دادەنرێت و خۆرەویش بێت و سێ پێچکەی هەبوو خێراییشی نزیکەی (٣) میل/کاتژمێر بووو تەنهـا (١٥) خولەك بەردەوام دەبوو، قەبارەیەکی پتەوی لە ئاسن و دار هەبوو و (٤) کەسی هەڵدەگرت و باری (٥ ,٤) تەنی هەڵدەگرت، کەوا (سووکانی) نەبوو مەنجەڵێکی خڕی گەورەی لەپێش دا بووو بەتایبەتی بۆ پەیتوونی تۆپ و گولله تۆپ دروست کرابوو، نموونەی ئەوە لەمۆزەخانەی پاریس دا پارێزراوە ئەگەرچی ئەو ئامێرەی جۆزیف کۆگنوت سەرکەوتوو نەبـوو بەلام سەلمـانـدی کە هێزی هەڵمی بواری بەکـارهێنـانی هەیە بۆ گواستنەوەو لێخورین، ئەو سالەش ١٧٦٩ز بە سالێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی ماکین و ماکین سازیدا. ئیدی کۆگنوت بەوە نەوەستاو سالی ١٧٧١ز ماکینێکی تری دروست کرد بۆ هاژوشتن و زۆر لەوەی پێشووی سەرکـەوتووتر بوو نموونەی ئەوەش لە پێشانگای هونەرە لە پاریس دا .

سـالـانی ١٧٦٠ ـ ١٧٧٠ز بە خالی گۆرانکـاری مێژووی زانیاریو تەکنیکی دەنـاسرێت لە مەیدانی دەست پێکردن و بنچینەدانانی بەکار هێنانی هێزی هەلم دا چونکە تا ئەو سەردەمە ئەو ئامێرانەی هەبوون هەر کارخانەیەك و هەر ئەندازیارێك لە هەر شوێنێ بەرە بەرە گۆرانکارییان بە سەردا دەهێناو لە ماوەی کارکردنیان دا بیری نوێیان لەلا گەلاڵە دەبوو سەبـارەت بە باشـترکـردن و پەرەپێدانی چاکـتری ئامێر. سالی ١٧٨٤ز جێمس وات ئامـێرەکـەی پەرەپێداو وای لێکـرد لە جیاتی ئەوەی لە دەرچەیەك دا هەلم بچێتە ژوورەوەو تەنها بە ئاراستەیەك پەستێنەدەکە پال بدات و وای کرد لە دوولادا هەلم پەستێنەر پال بداتن و جوولە وزەی لە دوو لاوە بدات و خێرایی ئامـێرەکـەی پتر بێت و چوستییەکی زۆرتـریشی هەبێت ئەوەش دووای سالی ١٧٨٢ز بوو کە جێمس ئەو فیکرەی دانابوو بەلام سالی ١٧٨٤ز بە یارمـەتی بولتون ئەو پەرەپێدانەیان کردو ئامێری جووتە کرداری هەلمیان هێنایەکایەوە

هەر لەو سالەش دا ١٧٨٤ . لیبۆن ماکینی گازی داهێنا کە دوایی باس لەو جۆرە ئامێرە دەکەین . دووای پەرە پێدرانی ئامێری هەلمیو داهێنانی ئامێری جووتـەن کە چوستییەکی زۆری هەبوو لە سالی ١٧٨٥ ولیام مردوك بە تاقی کردنەوە ئامێرێکی راکێشانی پەیتوونی داهێنا لە سەر هێلی ئاسـنـین دەرۆیشت، ئەگـەر چی رۆیشتن لەسـەر هێلی ئاسن بیرۆکـەیەکـی نوێ نەبـوو کەوا کاتـی خۆی لە جیاتـی ئاسن داریان بەکاردەهێناو یەکەمین کەس بۆمنت دای هێنابوو سالی ١٦٣٠ هەر ئەویش پێچکـە ناوچالی بۆ دروست کردبوو تا لە سەر دارەکان نەخلیسکێت کە

کاتی خۆشی یۆنان و رۆمانەکان گالیسکەی چوار پێچکەیی لەو بابەتەیان بەکاردەهێنا لە بواری گواستنەوەی سوپاییدا لە سەودەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمـان دا، ولاغیان بەکـارهێنـا، بەکـارهێنـانی پێچکـەی ناو چال بۆ گالیسکەی ولاغ لەبەر هۆیەك داهێنرا کەوا گالیسکە گرانەکان لە بیابان و خاکی نەرم دا لە نەرمایی و عاردو قوم دەچەقین بۆیە گەرەك بوو رۆیشتن لە سەر دار دابهێنرێ و لە ئەورووپاش سالی ١٦٢٠ بەدەرکەوت و دووای سالانی ١٧٥٠ لە شەقامەکانی شاری لەندەن دەبینرا، دووای پێشکەوتنی سازگای ئاسن و ئاسن سازی ئیدی لە جیاتی ڕێگەی دار ڕێگەی ئاسن دەرکـەوت، ئەوەبـوو سالی ١٧٦٧ ئەنـدازیاری ئینگلیزی رێنـۆلـدز لە کۆلـبرۆکـدال ڕێگەی ئاستینی بەکارهێنا لە جیاتی ڕێگەی دارین دا بۆ رۆیشتنی گالیسکەی ولاغ راکێش، تاکو گالیسـکەکان لە خۆل و بەردو قوم و قورتی کانگـاو کارخـانـەکـان و ڕێگـە ناهەمووارەکان گیر نەبن و نەسـەنگـرێنـەوەو ولاغـەکـان زۆر مانـدوونەبن . سەرکەوتووترین هێلی ئاسنینی ولاغ دار ڕێگـەی ئاسنینی نێوان کانکـای خەلووزی ویلام لە نزیك شاری نیوکاسـل بۆ رووباری تاین بوو، تا کەل وپەل رەوانەی شاری لەندەن بکرێت بەهۆی بەلەمەوە، ئیدی دووای ئەوە بیر لەو هۆیە کرایەوە بۆ هات وچـۆی ڕێگەی شارەکان کەوا جۆن ماك ئادەم تۆماس تەلفۆرد توانیان ئەو رژێمـە بەکار بهێنن و وەستانی گالیسـکەو پەیتوون لە زیخ و قومی بیابـان و کەندو کۆسپەو قۆرت قۆرتی ڕێگا رزگار بکەن هەروەها هێلی ئاسنینی ولاغدار لە هەرێمی سوری داکرا لە سەردەمی ناپلیۆن و شەری فەرەنسـاو ئینگلیزدا کەوا کەلوپەل و تفاقی نێوان پۆرت سماوت و لەندەنی پێ دەگوێزرایەوە دەکەوتە بەر پەلاماری فەرەنسا کەنالی مانشی ئینگلیزی، بۆیە بیر لە گۆرینی ئەو ڕێگـەیە کرایەوەو ڕێگـەیەکی تری ناهەموار هەبوو بۆ هاتوچۆ ئەویش پێویستی بە هێلی ئاسن هەبوو. ئەو ڕێگا ئاسانەش وەکوو

ڕێگـەی نێوان کانگـاو کارخـانـەکـان تەنهـا بۆ گواستنەوەی کەل وپەلی پێویست و کەرەسە خاوی خەلووزو ئاسن و گەچ و لم و . . . هتد . بەلام هێشتا بۆ گەشت و گوزارو مرۆڤ بەکار نەهێنرا بووو لە پەیتوونەکیش پتر دووای یەکتر دەخران و ولاغ رایدەکێشان .

دووای داهـاتنی ئامـێری هەلمی ئەو پەیتوون و گالیسـکانە لە کانگاو کارخـانـەکـانـدا لە جیاتی ئەوەی ولاغ رایان بکێشێت و لەسـەر هێلی ئاسنین دا بروات واکرا ئامێری هەلمی ئەوکارە بکات بەجۆرێك کە ئامێرەکە لە جێگایەکدا جێگیر بکرێت و سەبارەت بە سوورانەوەی پێچکەکەی وەکو گرگـرە (بـەکـرە) بتوانێ گوریس و زنجیر لوول بدات و هەلی بوێنجیو پەیتوونەکان رابکێشێت. دووای داهێنانەکەی ولیام مردوك سالی ١٧٨٥ کەوا پێچکـەی ناو چال بوو ریچارد ترافیسیك کە ئەندازیاری کانگای

تووتیا (زینك) بوو له نزیك شاری پەنزانس. ساڵی ١٧٩٠ خەریکی چاککردنی ئامێری هەڵمی وەستاو بوو بۆ ڕاکێشانی پەیتوون بەهۆی گرگرەوە، لێرەدا ترافیسیك بیری لەوە کردەوە بۆ ئامێرەکە وەستاو بێت و له زەوییەوە جێگیر بێت؟ بۆ ئامێرەکە خۆشی لەگەڵ پەیتوونەکە یان گالیسکەکە نەبێت و بەیەکەوە له جووڵەدا نەبن له سەر ڕێگەکەیدا و وەك بڵێی ئامێرەکە وڵاغێك بێت و لەپێش گالیسکەکەوە بڕوات و ڕای بکێشێت ئیدی دووای ئەوە ترافیسیك ماکێنە هەڵمی یەکەی لۆکۆمۆتیڤ Locomotive ی داهێنا ساڵی ١٨٠٠ ـ ١٨٠١ز کە خێرایی یەکەی دە (١٠) میل/ کاتژمێر بوو دوو پێچکەی گەورەی له دوواوە هەبوو تیرەی هەریەکەیان (٨)پێ بووو پێچکەیەکی بچووکیشی له پێشەوەدا هەبووو سووکانەکی وەکو هی بایسکلی پێوە بوو بۆ ئاڕاستەکردن. ترافیسیك بەو ترومبێلەی له گوندەکەی خۆی پێ دەسووڕایەوە له کۆرن واڵ له ئینگلتەرەدا کەوا خەڵکی سەری سوڕما بوو کەوا چۆن ئەو پەیتوونە بێ وڵاغ دەڕوات و هێزێکی زۆری هەیەو دەنگ و گرمەو هارە هاریشی دێت هەروەها لۆکۆمۆتیڤەکەی ساڵی ١٨٠٣ دروستی کردبوو له شێوەی شەمەندەفەر بوو سەرکەوتنەکی زۆری وەدەست هێنا له کانگاکانی خەڵووزی بەردا ئیدی ماکێنی ترافیسیك له کاردا بوو لەکانگای پەنیدارن Peny Darren له هەرێمی وێڵز و ساڵی ١٨٠٤ ماکێنێکی تریشی دروستکرد کە له کانگای خەڵووزی تینساید دائیشی دەکرد. دووای ئەو ماوەیەی ماکێنی ترافیسیك یاخود بڵێین شەمەندەفەرەکەی ترافیسیك بەکار دەهات بۆ عەنتیکەیی و ڕابواردن و خەڵك سواری دەبوون بەکرێ له مەیدانێکی دوور لەشاری لەندەندا.

هەر لەبواری ماکێنی هەڵمیدا ساڵی ١٨٠٢ له ئەمەریکادا ئۆلیڤەر ئیڤانس Oliver Evans بەلەمێکی هەڵمی داهێنا بۆ پاك کردنەوەی کەنارو لێوارەکانی دەریا بەکار دەهات کە ئەوەش بەیەکەمین ماکێنی وشکاوەکی (برمائي) دادەنرێت. هەر لەساڵی ١٨٠٤دا ئارتەر وۆڵف و Arther Woolf ڕالف ئالێن Ralph Aler بیرۆکەی داهێنانی ئامێری هەڵمی هووروژمی بەرزیان داهێنا بۆ هات وچۆ کە ئەو ئامێرە چوستی یەکی یەکجار زۆری هەبێت و لەسەر شێوەی ماکێنی جووتەنی دابوو لەو کاتەش دا. ڕیچارد ترافیسیك شەمەندەفەرەکی سەرکەوتووی دروست کردبوو و دووای ئەوەش ساڵی ١٨٠٧ ڕۆبەرت فلتن Robert Foltin یەکەمین پاپۆڕی هەڵمی سەرکەوتووی له مەیدانی بازرگانیدا دروست کرد. ئیدی لەوەو بەدوواوە سازگاو کارخانەو کارگای ماکین و ترومبێل دروست کردن بەرە بەرە دەهاتنە پەیداو پەرەپێدانی ئەو پیشەیە گەشەی دەکردو تا دەهات تەکنیکی ماکین و ترومبێل سازی له برەو دابووو هەر کارخانەو سازگاو داهێنەرێك لەو پیشە سازییەدا هەوڵی پترکردنی ئامرازو گونجاندنی ماکین و گۆرانکاری بۆ سەرکەوتوویی ماکێنەیەکەیان پتر گرنگی پێ دەدا. تا له دەستیان دەهات لێخوڕین و کارکردنی ماکێنیان ئاسانتر دەکرد سەبارەت بەوەی له مەیدانی بازرگانی و تەکنیکیدا سەرکەوتووتر بێت و هاڤرکێ ی ئەو پیشەسازییە له نێوان خاوەن سازگاو کارخانەکان و داهێنەرەکان دەهاتە بەر چاو، لەو کاتەش دا گێری دداندار هاتە پەیداو کەوا کاتی خۆی. ئەو جۆرە خلۆکەو گێرانە نەبوون و چەرخی خلۆکەکان زۆر لەسەر یەکتر دەخلیسکان و یان قایشەکانیان لەسەر خلیسك دەبرد ئیدی بە داهاتنی ئەو چەرخ و خلۆکە ددانداراانە چوستی ئامێر زۆر پتر بووو بەوەش توانرا دەست بە سەر هێزو خێرایی دابگیرێت، نموونەی ئەو جۆرە گێرانە لەلایەن بلەنکینسۆپ Blenkinsop لەساڵی ١٨١١ داهێنرا کەوا لەبواری ئامێرو ترومبێل سازیدا سەرکەوتنەکی یەکجار زۆری وەدەست هێنا.

دووای ئەوە لێکۆڵینەوەی بواری تەکنیکی و بازرگانی ئامێر کەوتە برەو ئەوە بوو له ساڵی ١٨١٣ ولیام هادلەی William Hadley شەمەندەفەری پۆفینگ بیلی Puffing Billy دروست کرد لەسەر هێڵی ئاسنینی وڵاغداری کانگای خەڵووزی ویلام Wylam Colliey له نزیك نیوکاسل بۆ ڕووباری تاین ئەو کابرایە ولیام هادلەی کرێکارێکی ئەو کارگایە بوو بە یارمەتی سەرۆکی ئەندازیاران و سەرۆکی سازگای کارخانە بلاك سمیث شەمەندەفەری پۆفینگ بیلی داهێنا کەوا بۆڕە بۆڕو گرمە گرم و دووکەڵێکی زۆری هەبوو بۆیە پێیان دەووت مووشەکە دووکەڵ (پۆفینگ بیلی). ئەگەرچی ئەو شەمەندەفەرە نارێك و بە هارە هارو گرمە گەرم بوو بەڵام

بەهێزو پتەو بوو لە کارکردنیدا، ئەگەرچی خێرایی‌یەکی وا زۆریشی نەبوو ماوەی پەنجا (٥٠) ساڵ لە کانگاو کارخانەکاندا کارکرد لە سەرەتا چوار (٤) پێچکەی هەبووو دووایی کرا بە (٨) هەشت پێچکەو پاشان ناردرایە مۆزەخانەی داهێنان لە لەندەن.

ساڵی ١٨٦٢، لەو سەردەمەش دا زۆر تەگەرە کەوتە بەردەم ئەو پیشە سازی‌یە چونکە ئەو ئامێرانە دەنگی ناسازو ترسناك و دووکەڵێکی زۆرو دیمەنێکی قورسیان هەبوو و خەڵك زۆریان لێ دەترسان و بەتایبەتی منداڵ زەندەقیان لێ چوو بوون. وڵاغ و ماڵات و گیانلەبەرانی کێڵگە لە بەریان هەڵ دەهاتن و دەرەوینەوە تەنانەت وڵاغی پەیتوونەکانی گواستنەوەی سوارە رادەپەرین و پەیتوونەکەیان وەردەگێراو خەڵك زیانی گیانی‌یان دەداو بریندار دەبوون، زۆر جاریش ئەو ئامێرانە بەسەر خەڵك دەکەوتن و پانیانی دەکردنەوە. بۆیە ئەو ئامێرانە وەکو دەعبایەك سەیر دەکران کەوا هێشتا خەڵك شارەزایان نەبوون بۆیە ئەوە وای کرد سنوورێك بۆ ئەو پیشەسازی‌یە دابنرێت و چەند یاسایەك بۆ ترومبێل سازان و شووفێرەکان دابنرێت و باج و سەرانەیان خرایە سەرو لە رێگا گشتی‌یەکانیش دەبوو باج بدەن. سەرەرای ئەوەش خاوەن پەیتوون و گالیسکە وڵاغدارەکان هەردەم لەبەردەم ئەو پیشەسازی‌یەدا تەگەرەیان دەنا چونکە بە زۆر بوونی ئەو ئامێرانە رەواجی پەیتون و گالیسکەی وڵاغدارو ئیشەیەکەیان کەمتر دەبۆوە، لە کاتی لێخورینی ئەو ترومبێل و شەمەندەفەرانە پێویست دەبوو سوارێت لە بەرایی شەمەندەفەرەکان دا بروات و ئاگاداری خەڵکی بکاتەوە بە شەوانیش پێویست دەبوو رووناکی‌یەك لە بەرایی دا هەڵ بگرێت تا خەڵك بزانن نیشانەی نزیك بوونەوەی ترومبێل یان شەمەندەفەرە. ماوەیەك دووای ئەوە یاسای [illegible] سوار لە سەر [illegible] پێش ئەو ئامێرانە لایەکی سوور هەڵبگرێت و سوارێك بەدەستی‌یەوە بێت و لەپێش ماکینەکەدا بروات زۆر جاریش لە پیشەوەی ترومبێلان و شەمەندەفەران دا شێوەی سەری وڵاغیان پێوە دەبەست تاکوو وەکوو پەیتوون و گالیسکەی وڵاغداریان بێت. ئیدی دووای لۆکۆمۆتیفی ترڤیسیك ساڵی ١٨٠٤و دووای داهێنانی [illegible] لە لەندەری بەنکینسۆپ ساڵی ١٨١١و دووای [illegible] ١٨١٣ [illegible] یەکەمین شەمەندەفەری سەرکەوتووی دروستکرد بەناوی [illegible] ساڵی ١٨١٤ ئەویش جۆرج ستیڤنسۆن بوو George stephenson [illegible]

[illegible]

لە کانگای خەڵووزی بەرد و لەو ماوەیەدا ئەندازیاران و هونەر کاران خەریکی چاککردن و پەرەپێدانی ئامێر دەبوون ئەوەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ جۆرج ستیڤنسۆن و تەواو لەو مەیدانەدا خۆی دروست بکات، لە ساڵی ١٨١٤ز یەکەمین شەمەندەفەری بلەچەری دروست کردو بۆ ساڵی ئایندە سەرکەوتنی زیاتر وەدەست هێناو لە ساڵی ١٨١٩ز دا هێڵی ئاسنینی نێوان کانگاو کارخانەی راکێشاو لە ساڵی ١٨٢١دا دانرا بە سەرۆکی ئەندازیارانی هێڵی ئاسنینی نێوان ستۆکتۆن و دارلینگتۆن دوایی شەمەندەفەرەکەی (لۆکۆمۆشن) خۆی لەسەر کاری دەکرد، هەروەها لە ساڵی ١٨٢٣ لەگەڵ ئامۆزایەکی‌دا تۆماس ریچارد سۆن و ئەدواردپیز ئیشیان لە شەمەندەفەری (لۆکۆمۆنتیف) دەکردو دروستیان کرد لە نزیك نیوکاستل، پاش ئەوە ساڵی ١٨٢٥ هەر لە هێڵی نێوان ستۆکتۆن و دارلینگتۆن دا شەمەندەفەرەکەی دروستکراو کە یەکەمین شەمەندەفەری سەرکەوتوو بوو نەفەری هەڵ دەگرت و زۆر چالاکانە کاری دەکردو دوای لە ساڵی ١٨٣٠دا تەواوی کرد پێش تەواوبوونی ئەو هێڵە لەگەڵ کورەکەی خۆی رۆبەرت ستیفنسۆن شەمەندەفەرێکی تری دروست کرد رۆکێت Rocket کە لە هەموو بوارێك دا زۆر سەرکەوتوو بوو لە نێوان لیڤەرپول و مانچستەردا ساڵی ١٨٣٠ لە راین هیل دا Rainhill لە سەر هێڵی تازە راکێشراوی لیڤەرپول و مانجستێردا رۆکێتەکەی یەکەم بوو لە هاڤرکێی شەمەندەفەروانەکان دا کەوا خۆی شەمەندەفەرەکەی دەهاژواو خەڵاتی (٥٠٠) جونەیهی لە سەرۆکی رێگاکان وەرگرت و خێرایی یەکەی (٢٩) میل/ کاتژمێر بوو.

دوای ساڵانی ١٨٣٠ رێگای هات و چۆ زۆر بووو ماکینی ئەفسەر هەڵگر پتر پەیدابوو و ترومبێل سازی پێش دەکەوت لە کۆتایی ساڵی ١٨٣٠دا رۆکێت زۆر پەرەی پێدرا لوولەکەکانی بە ئاسویی لەتەك یەکتر ریزکران و لە ناو سندوقی تایبەتی‌یەوە جێگەی بۆ کرایەوەو بۆیلەری لوولەکی بۆ دروستکرا و پێچکەکانی زیادکراو بووە (٦) پیچکە ویی ی دەکوترا شەمەندەفەری پلانێت کەوا بنچینەی شەمەندەفەری ئێستایەو داهێنانی رۆبەرت و جۆرج ستیفنسۆن بوو. هەروەها لە ساڵانی ١٨٣٣ ـ ١٨٣٨دا رۆبەرت هێڵی ئاسنینی نێوان برمینگهام و لەندەنی راکێشا، ئیدی ئەو پیشەسازی‌یە بەردەوام بوو تا لە ساڵی ١٨٤٨ دا گەشت و گوزار بە شەمەندەفەر دەکرا، ئەگەرچی زۆریش رەحەت نەبوو تا ئەو کاتەش گەشتکردن بە شەمەندەفەران لای هەندێ خەڵك پەسند نەبوو بەتایبەتی چینی ناوەندی‌و خەڵك لە توندی خێرایی دەترسان کەوا ٣٠ میل/ کاتژمێر بوو دووایی ئەو خێرایی‌یە زیادی کردو پەیتوونی زوریش لە دووی دەخران و خەڵکێکی زۆری سوار دەکردو هەموو جۆرە خەڵك و لە هەموو چینەکان تێکەڵاو دەبوون بۆیە زۆر کەس کەشتی بە پەیتوونی وڵاغیان [illegible]

یەسندتر بوو، بەڵام ئەو بیرە بەرە بەرەو نەمان دەچووو خەڵك تادەهات پتر بە شەمەندەفەر گەشتیان دەکردو ترسیان لێ ی نەدەماو خەریك دەبوو بە ئاسایی سەیری بکرێت بە تایبەتی دووای گەشتەکەی شاژنە ڤیکتۆریا لە ١٣ ـ ی حوزەیرانــی ـ ١٨٤٢دا کەوا ڕۆژێکـی گرنگــە لە مێژووی شەمـەنـدەفـەرو هێڵی ئاسنین دا کەوا لە سەعات ١٢/٥ی نیوڕۆی ئەو مێژووەدا خاوەن شکۆ ڤیکتۆریا گەیشتە ئێستگەی ستبوو لە بادینگتۆن، ئەو فارگـۆنـەی خاوەن شکـۆی تێدابـوو بەتایبەتی بۆ ئەو گەشتەی وی ئامادەکـرابـوو و بەو بۆنـەیەوە ڕازانـدرابۆوە شەمەندەفەرەکەش لەلایەن بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی‌یەوە دەهاژووراو ئەندازیاری بنکـەی لێخـوڕینیش بوو کە ئای کەی برۆنـەل ناوی بوو. بەگەیشتنی شەمـەنـدەفـەری شاهـانـە بۆ ئەو شارە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان لە پێشـوازی‌دا بوون، شاژنـە ڤیکتۆریا ڕەزامەندی خۆی لە گەشتەکەی‌دا ڕاگەیاند کەواهەموو کەرەستەو پێویستی‌یەکی بۆ تەیار کرابوو، ئیدی لەو ڕۆژەوە گەشت کردن بە شەمەندەفەر پایەیەکی بەرزتری وەرگرت و برەوی سەندو ماکینی هەڵمی کە ئامێری دەرە سووتەکی‌یە هەر بە سەر کەوتوویی لە کاردابـوو لە ڕێگـای هات و چۆکان و کانگاو کارگاو کارخانەکاندا.

بۆیەش پێ‌یان دەووتـرێ ئامێری دەرە سووتەکی چونکە ئاگردانی یاخۆد بڵێین ژووری سووتانی لە دەرەوەی (بۆیلەرەکانەوە) بوو، هەر بەو شێوەیە هێزی هەڵمێ هەموو کاروبارێکی میکانیکی لە ئەستۆدا بوو تا پەیدا بوونی ئامێری ناوەسووتەکی سەبارەت بە دۆزینەوەی نەوت و سووتەمەنی شل تا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم دا بیری نەوتی بە شێوەیەکی تەکنیکی بۆ مەبەستی بازرگانی لێدرا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەتایبەتی دووای دۆزینەوەی نەوت لە تیتۆسڤیلە کە گوندێکی بچووکی پەنسلڤانیایە لە ساڵی ١٨٦٩ کەوا کۆلۆنیل دراك لە قووڵایی (٧٠)پێ‌دا گەیشتە نەوتی خاو، ئەگەرچی بۆ یەکەم جار نەوت بۆ ڕووناك کردنەوەی بەکار هاتووە لە دوورگەی (سانت) لە دەریای سپی ناوەڕاست دا ساڵانی (٤٠٠) پێش زایینی کەوا بۆرمایی‌یەکان بیری نەوتی‌یان لێ دەدذا، بەڵام لێدانی بیری نەوت بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٦٤٠ز لە ئیتالیادا لێدراوەو نەوتیان بۆ ڕووناك کردنـەوەی شەقـامـەکـان بەکار هێناوە، ئەنجا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا ئەو پیشـەسازی‌یە دەستی پێ‌کردو پێش کەوت و لە ئەنجامی پاڵافتن و کیمیکە سازیدا پەیدابوون، وەکوو نەوتی سپی (کیرۆسین) ـ بەنزین ـ گازوایل و ڕۆن ئیدی ئیرەوە دەرفەت پەیدا بوو بۆ بەکارهێنانی سووتـەمـەنی شل لە بواری ئامـێرکـاری‌و میکانیك و ناوە سووتەکی‌دا داهێنانی ماکینی ناوە سووتەکی نەوکاتەدا نوێ نەبوو چونکە هەر لە زوو بۆ یەکەم جار بەهۆی بارووتەوە ناوەسووتەکی تاقی کرابۆوە بۆ وەدەست هێنانی وزە لە ئەنجامی تەقینەوەی باروت دا وەکوو لە تەقینەوەی گوللەی تۆپ و تڤـەنگ دا هەیە کەوا لە بەرایی‌دا باسمان کرد ئەگەرچی دووای بارووتـیش چەنـد تاقـی کردنـەوەیەکـی تر لەســەر چەنـد گازە هایدرۆجینی‌یەکـان کرا کە تەقینـەوەیان هەبـوو. بەڵام ئەوانـە هیچیان سەرکەوتوو نەبوون بەڵام بیری ناوەسووتەکی‌یان داهێناو داهێنـانی ئامـێری ناوە سووتـەکی خاترانەیەکی زۆری سامۆیل براونی لەسەرە کەوا بنچینەی ئەو جۆرە ئامێرانەی دروست کرد ساڵی ١٨٢٦ز، ئەگـەرچی ساڵی ١٧٩٩ لە فەرەنســادا لیبون باسی ئامێری هووروژمی دەکات بەڵام هیچ گرنگی‌یەکی پێ‌نەدا لە بواری کرداری‌و تەکنیك دا.

سامۆیل براون تانکی‌یەکی گەورەی لە شێوەی لوولەکدا بەکار هێناو گازی سووتاوی هووروژمی ناوێ دەکردو هەوای ناو لوولەکەکە دەکشا بەو گەرمی‌یەو لە دەرچەیەکەوە دەردەرچوو دووای داخستنی دەرچەکەو سارد بوونــەوەی هەوای ناو لوولــەکـەکـە فشـارێکی تێدا دروست دەبـوو و پاڵەپەستۆی هەوایی هەوڵی پرکردنەوەی ئەو بۆشایی‌یەی دەداو پاڵەپەستۆی پەستێنەرەکەی دەکردە ناو لوولەکەکەوەو دەیجووڵاند ئەو ئامێرەی سامۆیل براون سووتـەمـەنی بەنـزین دووای تێکـەڵ بوونی لەگەڵ هەوادا بەکار دەهات کە ئەوەش یەکەمین ئامێری بەنزینی بوو ئەو ئامێرانەی لەو جۆرە بوون ئامێری ساڵی ١٧٩٤ لە کاردا بوو و سووتەمەنی بەهۆی ڕەحەتی‌یەوە لە دەرچـەیەکی دەست بەســەرداگـەر تێ‌دەکراو هەواش بەهۆی پەمپی دەستی‌یەوە ێدەدرایە ناو ژووری سووتان لە دەورەی ژووری سوتانیش ئاگردانێك هەبوو و دەبووە هۆی ئاگرگرتنی تێکەڵاوی هەواو بەنزین لەناو لوولەکەکەدا دەرچوونی هوروژم و ساردبوونەوە وپەیدابوونی فشاری ناو لوولەك و پەستێنەر پاڵ دان بەهۆی پاڵەپەستۆی هەوایی‌یەوەو بە دووبارە بوونەوەی ئەوە بەردەوام دەبوو و، لە بەر ئەوەی کارکردنی ئەو ئامێرە بەهۆی دروست بوونی فشــارو پاڵ دانی پەستێنــەر لەلایەن پــەپــەستری هەوایی‌یەوە، بۆیە پێی دەڵێن ئامێری فشاری پەستێنەر وبەهۆی نوێنەی جووڵەی پەستێنەر دەگەیشتە ترومپای ئاوی‌و کارکردنی بە شێوەیەکی ڕێك دووای سامـۆیل براون ساڵی ١٨٣٨ بارنێت Barnett پەستانی تێکەڵاوی سووتەمەنی و هەوای بۆ ناو ژووری سووتان هوروژم کردن بەهۆی پەمپەوە داهێنا. ساڵی ١٨٥٤ دوو زانای‌تر فلێکس ماتیوسی و پەدەر ئەوجینە لە ئیگنتـەڕەد ڕێگەیەکی تری ئامێری فشاری هەوایی پەیدا کرد کە هەر لەنـاو لوولـەك دا سووتـان ڕوودەدات و پەستێنـەر بجـوولێنی‌و بکـرێتە جووڵەیەکی بەخۆی بەهۆی گێڕی ڕاك و پینیۆن وەکو ئامێری بەنیني Benini لە ئیتالیا کە لە گەڵ بەرزبوونەوەی پەستێنەر [illegible] دەبۆوەو خلۆکەیەکی ددانەری دەخولاندەوە و جووڵەی خولەری [illegible] دەبوو. بەڵام [illegible] پەستێنەر [illegible] بنکی لوولەکەوە، بۆیە گەرەك دەبوو دوو لوولەك و پەستێنەر هەبێت [illegible] لە کارکردن دا پێچەوانەی بری یەکتر بن و یەکتر [illegible] کرەکە بەردەوام بێت هەروەکوو ئامێری لانجن و ئۆتۆ [illegible]

دووای ئەو ئامێرە ناوە سووتەکی یانەی تا ئێستا هەبوون ساڵی ١٨٦٠ کابرایەکی فەرەنسی لینوار Linoir ئامێرەکی هەڵی جووتەنی کاری Double asting بەناوە سووتەکی و سووتەمەنی شل پەرەپێداو زمانەیەکی جووڵاو Slide Valve یش دەسری بەسەر دەرچەکان دادەخست و تێکەڵاوی سووتەمەنی و هەوای هووروژم کەر دەکرایە ژووری سووتان و بە چوار باردا دەرۆیشت و بە چوار لێدەر دەناسرێت ئەگەرچی ئەو ئامێرە چوستی یەکی وای نەبوو لەگەڵ ئەوەش ژمارەیەکی زۆری لێ دروست کرا لە ئینگلتەرەو فەرەنسەداو بە ئامێری لینوار دەناسرا دووای ئەوە بە ساڵێك ساڵی ١٨٦١ لە ئەڵمانیادا گوستاف سمیث Gustav Schmidt بیرۆکەیەکی نوێی لەو ئامێرەدا (لینوار) بەکارهێنا کەوا گازو هەوا هوروژم بکاتە ژووری سووتان پێش لێدانی سووتان Combustion Strocke بەوەوە ئەو ئامێرە لە بەکاربردنی سووتەمەنی دا ئابووری تر بووو شمیث هەوڵی دەدا تێکرایی بواری لێدانی ئامێرەکەی پتر بێت و چوستی یەکەی لە گواستنەوەی وزەدا زیاتر بێت و ئیدی بواری نوێ بۆ داهێنانی شێوەی تری ئامێری سووتانی ناوەکی پەیدابوو و ساڵەك دوای لینوار ساڵی ١٨٦٢ ئەندازیاری فەرەنسی ئەلفۆنز بۆو دی رۆشا Alphonse Beau de Rocha یەکەمین بنچینەی ئامێری دیزلی داهێنا کەوا چوار لێدانی بازنەیی هەبوو Four strocke cycle و لە کارکردنییش دا بۆ سووتانی سووتەمەنی زۆر ئابووری بوو، لەوەش زیاتر بۆودی رۆشا هەوڵی دەدا ئامێرەکەی بەکەمترین سووتەمەنی زۆرترین وزە بدات سەبارەت بەوەی رووی گەرم بووی قەبارەی ژووری سووتان بچووك بکاتەوە و تەنگیشی بکات بەوەش سوودی پتر دەبوو چونکە تا تەنگتر بێت پاڵەپەستۆی پتر دەبێت، ئیدی بە کەم کردنەوەی رووی گەرم بوون و تەنگترکردنی قەبارەکەوە چوستیی ئامێری پتر بوو هەر لەو رۆژانەش دا وردە وردە پیشەسازی ئەو ئامێر و شەمەندەفەرانە پەیدا دەبوون و رەواجیان لای خەڵکیش پتر دەبووو لە ساڵی ١٨٦٥دا خەڵك لە پێشانگاکانی پاریس دا لە ئۆتۆموبیل لۆتەز دا چاویان بە دیتنی ئامێر دەکرایەوە، هەر لەو ساڵەش دا بوو یاسای بەیداخی سوور دەرچوو بۆ خاوەن ئامێرەکان بە هەڵکردنی ئاڵایەکی رەنگ سوور لەپێش ئامێردا بە دوورایی (٦٠) یاردە سوارەك پێویست بوو هەڵبکرداییەو بە رەوتی ولاغ لە بەرانی دا دەرۆیی، بە شەویش لە جیاتی ئاڵای سوور رووناکی یان هەڵدەگرت، خێرایی ئامێریش لە ناو شارو ئاوەدانی دا (٢)میل / کاتژمێرو لە چۆڵەوانی دا (٤) میل / کاتژمێر خێراتر نەدەبوو، هەر لەو رۆژانەدا شەمەندەفەرسازی زیاتر دەکرانەوەو کرێکارانیش پتر لە کارخانەکان دا کریان دەکردو ژمارەی پیشەسازان و سازگایان و پسپۆرو ئەندازیاران پتر دەبووو خەڵك پتر روویان لە شارو شوێنی کارخانەو کانگاکان دەکردو هەریەکە لەلایەکدا پەرەپێدانی ئامێرو هویە تەکنیکی یەکانیان پتر دەکرد سەبارەت بە سانایی هاژووشتن و حەسانەوەیان و مەترسییان کەمتر دەکردنەوەو هۆیەکانی دابین کردن و دەست بەسەرداگرتنیان پتر دەکرد.

لەساڵی ١٨٧١ دا لانچن کارخانەیەکی ئامێرسازیی گازی لە دوێتس لەئەلمانیادا دامەزراند کەوا گۆتلب دایملەر Gottlibe بەرێوەبەری کارخانەکە بووو ئامێری بەرهەم دەهێنا.

ساڵی ١٨٧٣ ئامێری برایتۆن لەلایەن برایتۆنی فەرەنسی یەوە دروست کرا، ئەو کابرایە ئامێرەکی ناوە سووتەکی پەرەپێ دا کە بریتی بوو لە یەك لوولەك و لەلایەکی دا بە دەرچەیەکەوە هەوا پەمپ دەکرایە ژووری سووتان و لە دەرچەیەکی تردا سووتەمەنی تێ دەکرا، سەبارەت بە پاڵەپەستۆ پلەی گەرمیی ژووری سووتان بەرزدەبۆوە لە کاتی کرژبوونی قەبارەدا ئیدی لە کاتێ سووتەمەنی دەکرایە ئەو شوێنە پلەگەرمی یە بەرزە ئاگری دەگرت لەدووای پەرەپێدرانی ئامێری ناوە سووتەکی و بەکارهێنانی لە بواری هاتووچۆدا تادەهات سەرکەوتوتر دەبوو ئەوەبوو بە دوو ساڵ دووای ئامێری برایتۆن ساڵی ١٨٧٥ مارکۆس ئامێرێکی چوار لێدەری تری دروست کرد کەوا لەوانی تر سەرکەوتووتر بوو و ئامێرێکی پێ دروست کرد بەڵام ئەو ئامێرە لە بەر گرمە گەرم و غەڵبە غەڵبی یەکجار تووندی بەکارنەدەهات. ئیدی لێرە بەدوواوە پیشەسازی ئامێر سازی پەرەی سەندو وەك چاو لێ کەری زۆر کەس دەستی دەدایە ئەو پیشەسازی یە بەتایبەتی ئەندازیاران و پسپۆرانی کارخانەکانی تر تەواو خۆیان خەریك دەکرد لە سازگاکان و کارگاو کارخانەکان دا بۆ ئەنجام دانی ئامێر یان ترومبێل و زۆربیش دەبوو لەو پیشەیەدا سەرنەدەکەوتن، ئیدی دووا بەدووای مارکۆس ساڵی ١٨٧٦ ئەندازیارێکی ئەڵمانی نیکۆس ئۆگەست ئۆتۆ Nilolas August Otto هەر لە سەر بنچینەکەی بۆودی رۆشا ئامێرێکی چوار لێدەری دروست کرد کە گازوایلی بەهۆی کاربرێتۆر بەهەڵم دەکردو تێکەڵی هەوا دەبوو کەوا لە لێدانی یەکەمی دا یان لێدانی تێچوون تێکەڵاوەکە لە ناوە دەرچەدا Inleat Calve دەچووە ژووری سووتان و لە لێدانی دووەم دا لێدانی پەستان هەردوو دەرچەکان دادەخران و تێکەڵاوەکە پەنگی دەداوەو پلەی گەرمی بەرز دەبۆوەو قەبارەکەی زۆر بچووك دەبووەوە و ئامادە دەبوو بۆ گردان و تەقینەوە. ئەنجا لە لێدانی سێ یەمی دا لێدانی وزەیە کەوا بە هۆی تریشقەی کارەبایی Spark Plug تێکەڵاوەکە کرداری ئاگردان و Ignition سووتان و Combustion کشانی Expansion ی بەسەر دادەهات و پاشماوەی سووتاوەکە قەبارەکەی یەکجار زۆرەو پەنگی دەداتەوەو لێرەدا لێدانی وزە تەواو دەبوو بەپاڵ دانی پەستێنەرو ئەنجا لێدانی چوارەم لێدانی دەرچوون Exhaust Strocke کۆتایی دەهات و گازو دووکەڵ دەردەچوو بە کردنەوەی دەرە دەرچەوە Exhaust Valve. بەوەوە لوولەکەکە بەتاڵ دەبووەوەو ئەو کارە بەردەوام دەبوو، جووڵانی پەستێنەر لە لێدانی یەکەم و دووەم و چوارەم دا سەبارەت خولانەوەی بەردەوامی فلای ویلە ئیدی لەهەر لێدانێك دا پەستێنەر تا دوواترین پنتی نزم بوونەوەی ژێر دادەچوو کە پێی دەگوترێ

قوزتـــه مرده خالْ هەروەهـــا بلْنـد بوونـەوەی بۆ بەرزتـرین بنت ژوور هەن دەچوو کە ئەویـش پێی دەگوترێت لووتکە مردەخالْ بۆ بەردەوام بوونی ئەو کاوە بێجگە لە لێدانی سێ‌یەمی کە لێدانی وزەیە خولانەوەی کرنك ئەفت سەبارەت بە زەبری خولانەوەی فلای ویل دەبوو وکرنکیش لەرە جوولەی دەگۆڕێتە جوولەی بەخول

بەپێش کەوتنی ئامێرو شێوەی تەکنیکی و چاوێکەری و هاڤرکێ‌ی ئەو پیشـەسـازی‌یە خەریك بوو، تا ئەوکـاتـە چەنـد ناوێك لەو مەیدانـەدا پەیدابوون لەکارخانەو سازگاکانیان دا ئامێریان هێنایە بەرهەم وەکو:ـ نیوار ـ ئۆتۆ ـ مارکۆس



دایملەر هەر لەو رۆژ انـەش دا ترومبێلی کارەبـایی خەریکی داهێنان بووو یەکەمین تاقی‌کردنەوەی ئەوە ڤێرنێر سیمەنس کردی کەبریتی بوو لە شەمەندەفەریکی کارەبایی بچووك لەسەر هێلی ئاسنین دەرۆیی لە سالْی ١٨٧٩دا و لە پیشـــانـگـــایەکـــی بەریتـــانـیادا ماوە ئەنـجـــامـی ئەو تاقی‌کردنەوەیەش پەیدابوونی شەمەندەفەری کارەبایی و تراموای کارەبایی دروست کردو سالْێك دوواتــر لە ١٨٨٠ یەکـەمـین ترومبێلی کارەبـایی لەشاری پاریس دەرکەوت.

لەسالْی ١٨٨٥ دایملەر ترومبێلێکی بە ئامێرەکەی هاژووا کە خێرایی Mph17 بوو دەنگێکی گەورەو گرمە گرمی هەبوو، ئەو ئامێرەی دایملەر هەر پایسـکـی ئاسیی بوو ئامێرەکەی بۆ تێ‌یەخستبوو و پتر پەرەی پێدا بوو، پێویستە ئەوەش بلْێین ئەو کاتی پایسکل ئەسپەدارینەیان پێ دەووت کە بۆ یەکەم جار لە سەرەتای سەدەی نوزدەهەم دا هاتە پەیدا بەشێوەیەکی سادە تەنها دوو پێچکەو (سووکانی) هەبوو و هیچ ئامرازێکی جووڵێنەری نەبوو تەنها بە هەنگاونان و خشاندنی پێی سوار لە خاکدا دەرویشت و بەئەمەنی پێ‌ی دەووتـرا (دراسـین) کەوا کابـرایەکی ئەلْمانی بارۆن ڤۆن پرایس دروستی کرد بوو پێ‌ی دەگـوتـرا هوبی هورس ئارەزووە ئەسپ، سالْی ١٨٦١ دووکەسی فەرەنسی پیێر ئەرەنەست میچاو دەستیان بە دروست کردن و بەرهـەم هێنـانی ئەسپـا ئاسنینـە لە جێـتی ئەسپـە دارینە کردو پەیدانیان بۆ دروست کرد لە پێچکـەی پێشـەوەی‌دا کەوا هەندێ ئەسپە ئاسنینە پێچکەی پێشـەوەی گەورەتر دەکرا لە هی دوواوە، کە ئەیەك سالْدا ١٤٢ ئەسپە ئاسنینەیان (پایسکل) بەرهەم هێنا، لە سالْی ١٨٧٦ یەکەمین پایسـکـلی بە زنجـیر دروستکـرا لە ئینگلتـەرە، ئیدی پیشـەسـازیی پایسـکـل سازی دەستی بە پەرەپێدان و زۆر بوون کرد تاوای لێهات بە هۆی گێرو خلوکـەوە خێرایی و هێزی دەگـۆردرا دووای ئەو ماوانـە بوو دایملەر سالْی ١٨٨٥ ئامـێرە ناوە سووتـەکی‌یەکەی خۆی لە پایسکل دا بەکـار هێنـا لە جیاتی ئەوەی پەیدانی لێ بدرێت. هەر ئەو سالەش دا گۆتلیب دایملەر لە ئۆتـومـوبێل لۆتـەزی پیشـانگای پاریس دا خەلاتی داهێنـانی ئامـێری ناوە سووتـەکی وەرگـرت. هەرلەو سالەش دا سالْی ١٨٨٥ لە ئینگلتەرە ئەتکینسۆن ئامێرێکی تری لێدەری داهێنا کەوا تەنها دوولێدەر stroks بوو لە لێدانی یەکەمی‌دا لێدانەکی کورت بوو و هەردوو کرداری تێچوون و Intake پەستانی Compression بەیەك لێدان تەواو دەکردو لێدانی دووەمی درێژ ئەوەش کردارەکانی ئاگردان و سووتان و Combus-tion کشان Expantion لەگەڵ لێدانی دەرچوون Exhaust strocke دەگرێتەوە سالْی ١٨٨٦ ئەنـدازیاری ئەلْمـانی کارل بەنز خەلاتی داهێنانی ئامێری گازی وەرگـرت کەوا کارخـانەیەکی ترومبێل سـازی دروست کردو سالْی ١٨٨٧ یەکـەم ترومبێلی لێفـرۆشـت و سالْی دوواتر ١٨٨٨ کارخانەکەی گەورەتر کرد دووای سالْەکی تر لە ١٨٨٩ بەنز توانی بە ترومبێلەکەی نێوان شاران ببڕێت و دووای ئەو سـالەش لە ١٨٩٠ گوتلیب دایملەر کارخانەی دایمـلەری کردە کۆمپـانیای ترومبێلی دایملەر و کۆمپـانیای دایملەر لە کوڤەنتری دامەزرا.



لەسـالْی ١٨٩١ لیڤـاسـۆر ترومبێلەکی دروست کردو پەرەپێدراو ئەندازیاران دیمۆن و بیجو بەشداریان تێدا کرد ئەو ترومبێل سازانەش بەردەوام بوون لە بەرهـەم هێنـان و لە هەمـان سالیش لە ئەمەریکـا کابـرایەکی ناو لامبێرت ترومبێلەکی گازویی دروست کرد، دووای ئەو ماوانەش پسپۆرانو ئەندازیاران هەندەی تر خەریکی ئەو پیشەیە دەبوون لە ئەمەریکاو ئەلْمانیاو فەرەنساو ئینگلتەرەدا و گەشەو پەرەپێدانی ترومبێل

بەردەوام بوو سالی ١٨٩٣ ئامێری دیزل لە بواری ناوە سووتەکی دا لەلایەن زاناو ئەندازیاری ئەڵمانی رودۆلف دیزل داهێنرا، ئەو کابرایە سالی ١٨٥٨ لە شاری پاریس Paris لەدایك بووە لە باوانێکی ئەڵمانی لە سالی ١٨٧٠دا لە زانکۆی میونیخ دابوو و لێکۆڵینەوە و کارەکانی سادی کارنۆت ١٧٩٦ لەلایەنی‌یەوە گرنگی‌یەکی زۆری پێ دەدراو پەیوەندی پاڵەپەستۆو قەبارەو گەرمی سەرنجی دیزلی بۆ لێکۆڵینەوە راکێشا ئیدی دیزل سالی ١٨٩٣ پەرتوکێکی دەربارەی ئامێری گەرمی بلاوکردەوەو هەر لەو ساڵەش دا ئامێرەکەی داهێنا کە بە هاررراوەی رەژوو ئیشی دەکردو دووای سالێکی‌تر لە ١٨٩٤ لە شاری ئۆجسبرگی ئەڵمانیا ئامێرەکەی دەنگی دایەوەو هەر خەریکی پەرەپێدانی بوو. هەر لەسالی ١٨٩٣ چارلس دوریا ترومبێلێکی دروست کرد بە بەنزین دەکەوت گەر لە شەقامەکانی شاری‌سپرنگگ فیلد لە ویلایەتی ماساشوتس دەیهاژوا خەڵك زۆریان لا سەیر بوو پێ کەنینیان پێ‌ی دەهات لە غەلەڵبە غەڵب و گرمە گرمی بێزار دەبوون و دەترسان هەر لەوکاتەش دا کۆمپانیای دانلوپ دەستی بە بەرهەم هێنانی پێچکە هەوایی (تایە) کردو هەر هەمان سالی ٩٣.. ێیری فۆرد دەستی بە ترومبێل سازی کردو کارخانەی ترومبێل سازی دترۆیتی دروست کردو ئیدی شاری دترۆیت بووە بنکەی ترومبێل سازی‌و چەند کارخانەیەکی تێ‌دا دامەزراو لەو ماوەدا کارخانەی ئۆلدزموبێل پاشان کارخانەی فۆرد هەر لەوێ دامەزرێنرا، هەر لەسالی ١٨٩٣دا لە فەرەنسا ناوی هەر داهێنەرو ترومبێلەکەیان تۆمار دەکردو ژمارەی تایبەتی‌یان بۆ دادەناو هەر ترومبێلە ژمارەی تایبەتی خۆی لە جێگایەکی بلند لەسەر دەنووسرا.

سەرچاوەکان

١ ـ العلم في التأريخ المجلد الثاني
جـ ـ د ـ برنال ترجمة شكري ابراهيم سعد
٢ ـ تأريخ العلم والتكنولوجيا الجزء الثاني
جـ ـ فوريس أ. جـ ـ ديكستر هوز
ترجمة: اسامة امين القوي
٣ ـ الثرموديناميك
د. سامي مظلوم د. أمجد عبدالرزاق د. عبداللطيف ابراهيم
٤ ـ ميكانيكا السيارات
وليام هـ ـ كراوس ترجمة: احمد عباس

5 Combustion Engine Processes
L - C - Lichty
6 - Heat Engins
S.H. Moorfield and H.H. Winstanley
7 - Power and progress
G.C. Thornley
8 - Changing Horizons
G.C. Thornley
9 - Inventors and Scientists
John Ray
10 - The language of mechanical engineering in english
Engene - J - Hall
11 - The story of Railways
Richard Bowood
12 - use scientific English
crescent English course
13 - Science No - 54 - Vol - 5
14 - Knowledge :-

زانست

No. 45. V. 4
No. 48. V. 4
No. 75. V. 7
No. 81. V. 7
No. 94. V. 8
No. 113. V. 10
No. 130. V. 11

15 - New English EncycLopedia VoL -II - No. 18

ملخص البحث :

# تطور الآلة من العصور القديمة الى اليوم

نافع كاكه قولاني

قبـل آلاف السنين كان الانسـان القـديم يعتمد على استخدام عضـلاتـه للحصول على قوته ومعيشته ، وشيئاً فشيئاً وبمرور الزمن حسن أوضـاعـه وابتكـر وسـائـل تحسين أعمـالـه وفكـر في تطوير الأدوات التي يستخدمها بحيث تنسجم وطبيعة اعماله التي تنوعت نوعـاً ما . فأخـذت الآلات تنمـو وتتطـور مع تقـدم مستـوى تفكيـر الانسـان ، وتطـور حيـاتـه الاجتماعية ولاسيما حين إنتقل من مهنة الصيـد الى الـزراعـة وحين استـوطن في مجمعـات سكنيـة والتي أصبحت فيمـا بعـد تعـرف بالقـرى والمـدن والحواضر، إحتاجت حياته الجديدة الى استخدام آلات اكثر تصوراً وتعقيداً .

اما في العصر الصناعي فقد شهدت آلالة تطوراً انفجارياً هائلاً فقـد حاول العلمـاء والخبـراء تطوير اختراعاتهم وخاصة في القرن الثـامن عشر حيث تدرجت المكائن والمحركات بانواعها البخارية والنـاريـة في سلم التقـدم بسـرعـة واحتلت مكانة بارزة في حياتنا اليـوميـة . حيث أختـرعت السيـارات والقطـارات والطـائـرات والمولدات الكهربائية .

وفي هذا البحث عرض تاريخي لتطور الآلة والماكنة منذ القدم وتعـريف بمبتكرات اشهر المخترعين والعلماء، وهو موضوع مفيد في منظـور الثقافة العامة تنشر تشجيعاً لكتابة البحوث المماثلة في ميدان العلم والتكنولوجيا .

# BoiLer Water

محمد قادر محي الدين
ئەندازیار ـ سلێمانی

# ئاوی کوڵێنەر

کوڵێنەر [1] ئەو ئامێرە هەرە گرنگە مەزنەیە، کە لەزوربەی زۆری پیشەسازی یەکانی ئیمرۆدا (وەك پیشەسازی یە کیمیایی یەکان، نەوت، خواردەمەنی، هێنانە بەرهەمی هێزی کارەبا . . . هتد) دەورێکی سەرەکی و تایبەتی هەیە، ورادەی بەرهەم هێنان لەو پیشەسازییانەدا راستەوخۆ بەستراوە بە کاری ئەم ئامێرەوە. لەبەرئەمە پێویستە هەمیشە کوڵێنەر کوك وتەیارولەباربێت وزۆر بەوردی و کارامەیی پارێزگاری و چاودێری بکرێت وزیرەکانە دەست نیشان و چارەسەری ئەو گرفتانەش بکرێت کە لە کاتی هێنانە بەرهەمی هەڵم دا دووچاری دەبن و کاردەکەنە سەر رەوتی ئیش کردن و هێنانە خوارەوەی توانست وتوانای.

دیارترین وگرنگترین گرفت کە دووچاری کوڵێنەر دەبێت لە بەکارهێنانی ئاوی ناسازەوەیە. هەروەها ئەو ئاوەی بۆخواردنەوەش بەکاردێت بۆ کوڵێنەرو بۆری یەکانی ئێجگار زیان بەخشە، چ لەرووی ئەوەوە کە ژەنگ دروست دەکات و کانزادەکانی لاواز دەکات، وەچ لە رووی ئەوەوە کە بۆری یەکانی دەگرێت وتوێکلێك لە قسل (نوورە) بەدیوی ناوەوەیان دا دروست دەکات. بێ گومان سەرچاوەی ئەو ئاوەی لە کوڵێنەردا بەکاردێت ئاوی رووبارەکان وئاوی ژێر زەوی یەکە کەموزۆر ئاوی بارانیان تێ کەڵ دەبێت. لە کاتێکدا باران دەبارێت دڵۆپی ئەم بارانە لە کاتی هاتنە خوارەوەی دا ئۆکسجین ونەیترۆجین ودووەم ئۆکسیدی کاربۆن وخۆڵ وخلتەی تری ناو هەوا دەمژێت وبەشێوەیێکی ئەوتۆی لێ دێت کە توانای تواندنەوەی کاترادو خوی یەکانی ناو زەوی ببێت. جاری ئەوتۆهەیە ئەم پیسی یە زیاتر دەبێت بەهۆی ئەو ترشەڵوکی یەوە کە لە مادده ئۆرگانیکی یەکانەوە سەرهەڵ دەدات، بەتایبەتی لەکاتێك دا ئەم ئاوە تێ کەڵ بەئاوەڕوی کارگەکان دەبێت کەپڕە لە پاشماوە پیسەکانی پیشەسازی. بەگشتی ئەو خلتانەی لەناو ئاودایە دەکرێن بە دووبەشی سەرەکی یەوە :ـ

أ ـ ئەو خلتانەی لە ناو ئاوەکەدا تواوەیە.

ب ـ ئەو خلتانەی لە ناو ئاوەکەدا هەڵواسراون.

ئەو خلتانەی لەناو ئاوەکەدا تواوەیە بریتین لە :ـ

١ ـ بیکاربۆناتی کالسیۆم، ومەگنسیۆم، وسۆدیۆم $Ca(HCo_3)_2$ , $Mg(HCo_3)_2$ , $NaHCo_3$

٢ ـ گۆگرداتی کالسیۆم، ومەگنسیۆم، وسۆدیۆم $CaSo_4$ , $MgSo_4$ , $Na_2So_4$

٣ ـ نتراتی کالسیۆم ومەگنسیۆم $Ca\,c(No_3)_2$, $Mg(No_3)_2$

٤ ـ کلۆریدی کالسیۆم، ومەگنسیۆم، وسۆدیۆم $CacL_2$ , $MgcL_2$ , $NacL$

٥ ـ ئۆکسیدی ئاسن و وسلیکەیت

٦ ـ گازە تواوەکان وەکو ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن.

٧ ـ پسماوەی پیشەسازی یەکان.

وەئەو خڵتانەی لە ئاوەکەدا هەڵواسراون بریتین لە :-

١ - قوڕ
٢ - لم
٣ - ماددە ئۆرگانیکی یەکان .
٤ - پاشماوەی پیشەسازی یەکان .

بوونی ئەم خڵتانەی سەرەوە لەئاوەکەدا ئەم گیروگرفتانەی خوارەوە لەکوڵێنەردا دروست دەکەن :

١ - کەم کردنەوەی توانای گۆڕینەوەی گەرمایی (للتبادل الحراري) بەهۆی دروست بوونی توێکڵێك لە خڵتە نیشتووەکان لەسەر رووکاری ناوەوەی بۆری یەکان . بڕوانە وێنەی - ١ - . لەبەر ئەوەی ئەم توێکڵە گەیەنەر (موصل)ێکی باش نی یە، ئەوا بەرگرێکی فرەگەورە لە ئاستی تێپەڕبوون و پەڕینەوەی گەرمایی دا دروست دەکات .
٢ - دڕاندن و تەقینی بۆری یەکان بەهۆی کەم بوونەوەی مژینی گەرمایی یەوە، کە بەهۆی کانزادەکەوە دەگوێزرێتەوە .
٣ - ژەنگ هەڵ هێنان وکلۆر بوونی ئەو کانزادەی کوڵێنەری لێ دروست بووە .
٤ - دروست بوونی کەفەڵوکە «foaming» وپەڕینەوەی گەردی ئاو لەگەڵ هەڵمەکەدا، وباش ئیش نەکردنی کوڵێنەر .
٥ - بەرزبوونەوەی نرخی پاککردنەوەی کوڵێنەر، لەگەڵ چاککردن وگۆڕینی پارچەکانی بەزۆری .
٦ - زیانی ئابۆری لەو ئامرازانەش دەکەوێت کە لەسەر ئەو هەڵمە پیسە کاردەکەن .
٧ - نزم بوونەوەی توانستی کوڵێنەر، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا زیانێکی ئابوری یە .

گرنگترین ئەو خڵتانەی لەناو ئاوی سروشتی دایەو لەکوڵێنەردا دەبنەهۆی دروست بوونی توێکڵی نیشتوو (الرواسب القشریە) بریتین لە خوێیەکانی کالسیۆم ومەگنسیۆم، کە ناودەبرێن بە ناسازی سەرەکی . ئەمەش دەبێت بە دووبەشەوە : ناسازی هەمیشەیی، وناسازی کاتی . ناسازی کاتی بەهۆی خوێیەکای بیکاربۆناتی کالسیۆم ومەگنسیۆمەوە ڕوودەدات . لە ئەنجامی کوڵاندن دا ماددەکانی کاربۆناتی کالسیۆم ومەگنسیۆمەکە دەنیشن لەگەڵ دەرچوونی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دا .










ئەمانەش توێکڵێك لە قسڵ لەسەر ڕووبەرە گەرمەکان دروست دەکەن . بەڵام ناسازی هەمیشەیی لە گۆگرداتی کالسیۆم و گۆگرداتی مەگنسیۆمەوە دروست دەبێت . لەکاتێك دا خەستی یان لەسەرووپلەی تێری یەوە زیاتر بێت، ئەوا دەنیشن . هەرچ کاتێك پلەی گەرمای بەرز ببێتەوە رادەی تواندنەوەی ئەم خوێیانە کەم دەبێتەوە . لەبەر ئەمە ئەمانیش چینێك لەسەر ڕووبەرە گەرمەکان دروست دەکەن . جگە لە خوێیەکانی ناسازی، جاری ئەوتۆهەیە خوێی سلیکۆنی تواوە لە ئاوەکەدایە کەئەمیش توێکڵێك دروست دەکات، وەئەم توێکڵەش باش نی یە، چونکە توانای پەڕینەوەی گەرمایی زۆر زۆر کەمە . هەرچ کاتێك ئەستووری ئەم توێکڵانە زیاتر ببێت پلەی گەرمای کانزادەکان بەرزتردەبێتەوە هەتاوەکو دەگەنە رادەیێکی ئەوتۆ کانزرادەکە نەرم دەبێتەوەو بەرگەی گەرمایی یەکە ناگرێت ودرز پەیدا دەکەن ولەژێر زەبری پەستانی کوڵێنەردا دەقڵیشێن ودەم دەکەنەوە . بۆ نموونە لەوێنەی - ٢ - دا چۆنی یەتی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای کانزادی کوڵێنەر لەژێر زەبری چینێکی کەم «٧٩٤و.» ملم خڵتە نیشتووەکان لەسەر ڕووی کانزادەکەی بە ئاوەکەوە نووساوە نیشان دەدات . وەهەرچەندە ئەستووری ئەم توێکڵە زیاتر بێت لە گەڵیدا پلەی گەرمای ڕووی کانزادەکە بەرزدەبێتەوە، وە لەکاتێك دا پلەی گەرمای ئاسنەکە لە سنووری جێ فشاری جیری «المطاوعە المرنە» دەردەچێت قڵیش بوون وتەقین دەست پێدەکات، ئەمەش لەسەر کوڵێنەر بەزیانێکی گەورە دەگەڕێتەوە . خشتەی - ١ - توانای گەیاندنی گەرمایی هەریەك لەونیشتەمەنیانە ڕوون دەکاتەوە، وەئەوەی شیانی باسە توانای گەیاندن بە (یەکەی گەرمایی بەریتانی[٢] - ئنج /پێ٢ - کاژێر - پلەی گەرمایی فەهرنهایت) دەپێورێت .

| جۆری نیشتەمەنی | توانای گەیاندن |
|---|---|
| کاربۆناتی کالسیۆم | ٦ - ١٨ |
| گۆگرداتی کالسیۆم | ١٢ - ٢٤ |
| نیشتەمەنی سلیکانی ئاڵۆز | ١,٥ - ٥ |
| تێکرایی نیشتەمەنی کوڵێنەر | ١٥,٦ |

خشتەی - ١ -

بێ گومان تەقینی بۆری یەکانی کوڵێنەر بەزیانێکی گەورەوگران دەگەڕێتەوە . جابۆئەوەی بەرگری لەم دەرکەوتە ناهەموارانەبکەین و بەربەستی دروست بوونی ئەم توێکڵانە بکەین پێویستە ئەوئاوەی دەڕوات بۆکوڵێنەر بەباشی بپاڵێورێت وپاك بکرێتەوە، وەهۆ سەرەکی یەکانی چارەسەرکردنی ئاو بریتی یە لە :-

١ - لابردنی ماددە هەڵواسراوەکان و تواوەکان .
٢ - نەهێشتنی گازەکان .

ئەم پاکردنەوەیەش بە دوو ڕێگا دەگرێت، یان دەتوانین بڵێین لە دوو

قۆناغی سەرەکی دا تەواو دەبێت :

١ ـ پاکردنەوە لە دەرەوە

٢ ـ پاکردنەوە لە ناوەوە

مەبەستمان لە پاکژکردنەوەی دەرەوە، رزگاربوونە لەو خڵتانەی لەناو ئاوەکەدایە بەرلەوەی بڕواتە ناو کوڵێنەرەوە. بەڵام تێکردنی ماددەی کیمیایی راستەوخۆ بۆ ناو کوڵێنەر، بەمەبەستی بەرگری کردن لە توێکڵ دروست کردن، ناودەبرێت بە پاکردنەوە لە ناوەوە.

شێوازی یەکەمیان (واتە پاکردنەوە لەدەرەوە) لە دوو قۆناغ دا ئەنجام دەدرێت. قۆناغی یەکەم نەهێشتنی ناسازی کاتییە، وقۆناغی دووەمیان رزگاربوونە لە ناسازی هەمیشەیی. کورتەی ئەم قۆناغانە بەم جۆرەیە :ـ ئاوەکە بەرلەوەی بڕواتە ناو کوڵێنەرەوە دەکرێتە ناو تانکی یان حەوزی گەورە گەورەوە و ماددەی ئەلومیناتی سودیۆم ـ NaALo2 ـ یان گۆگرداتی ئەلەمنیۆم (زاخ) ـ AL2 (So4)3 ـ ی تێدەکرێت. ئەم ماددانە لەناو ئاوەکەدا بەم جۆرەی خوارەوە شیتەڵ دەبن :










• ئەو هەیدرۆکسیدی ئەلەمنیۆمەی دروست دەبێت، وەك توێژێکی جەلاتینییەو ماددە هەڵواسراوەکانی ناو ئاوەکەی پێوە دەنووسێت، وکێشەکەی قورس دەبێت و لەبنی تانکییەکەدا دەنیشێت. پاشان دەردەکرێتەوەدەرەوە. ئەوەی ئاشکرایە ئەنجامی شیتەڵ بوونی زاخەکە لەناو ئاوەکەدا دۆخێکی ترشەڵۆکی دروست دەکات، بۆ نموونە توانانی هەیدرۆجینی (PH) ی[٣] ئاوەکە لە نێوان (٨, ٥ ـ ٨, ٦)دا دەبێت. ئەمەش کارێکی خراپ دەکاتە سەر ئەو تانکی و ئامرازانەی ئەو ئاوەی تێدا بەکاردێت. لەبەر ئەمە نابێت هەرتەنیا زاخ بەکاربهێنرێت، بەڵکو پێویستە ماددەیێکی وەك قسڵاو [Ca (oH)2] بەکار بهێنرێت، تاوەکو بتوانێت کاریگەری ئەو ترشەڵۆکییە لابەرێت. خۆ ئەگەر تەماشایێکی ئەم هاوکێشانەی خوارەوە بکەین، ئەوا بەئاشکرا ئاتاجی بەکارهێنانی ئەو ماددە تفتییەمان بۆ دەردەکەوێت.



















لەم هاوکێشانەی سەرەوەدا بەزەقی گرنگی بەکارهێنانی Ca(oH)2 بۆ نەهێشتنی کاریگەری ئەوبارە ترشەڵۆکی یە دیارە، ئەمە جگەلەوەی کە رۆڵی هەرەسەرەکی گیراوەی قسلاوەکە ئەوەیە کە خوێی یەکانی بیکاربۆنات و گۆگردات و کلۆریدەکانی ناوئاوەکە دەنیشێنێت، هەروەك لەم هاوکێشانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت













ئەو تانکی یەی ئەم کردارانەی سەرەوەی تێدا روودەدات، ناودەبرێت بە تانکی نیشتن. ناوە ناوە دەرچەی ژێر ئەم تانکی یە دەکرێتەوە بۆ دەرکردنەدەرەوەی ئەو ماددە نیشتووانە، پاشان ئاوەکەی ناوی بە ئاوپاڵێودا دەبرێت بۆ پاکردنەوەی لەو ماددە هەڵواسراوانەی کەتێدایەتی، بەتایبەتی گەردی وردی قسڵ. لێرەدا ناسازی کاتیی کۆتایی دێت. پاشان قۆناغی دووەم دەست پێدەکات، کە بریتی یە لە لابردنی ناسازی هەمیشەیی. لەم قۆناغەدا ئاوەکە بە تانکی یێکی تردا دەبرێت. ئەم تانکی یە ماددەیێکی تایبەتی تێدایە ناودەبرێت بەزێولایت «ZeoLite» ئەم زێولایتە ئۆرگانیك نی یە، بەڵکو بریتی یە لە کۆمەڵێك ماددە، یان بەشێوەیێکی خۆرسکی یە، یان لە سودیۆم ئەلەمنیۆم سلیکەیتی ئاویی دروست دەکرێت «Na2o. AL2o3. Sio3» و ناودەبرێت بە زێولایتی سودیۆم «Na2Z». ئایۆنێکی ئاسانی تێدایە بەزوویی جێگاگۆرکێ دەکات، وەکو ئایۆنی سودیۆم یان پۆتاسیۆم. لەکاتێك دا ئاوەکە بەسەر ئەم زیولایتەدا تێ پەڕدەبێت یەکسەر جێگای کالسیۆم و مەگنسیۆمەکەی ناو ئاوەکە بەسودیۆم دەگیرێت. لەئەنجام دا خوێی کاربۆناتی سودیۆم بە تواوەیی دروست دەبێت، کە بەهیچ جۆرێك بە شێوەی توێکڵ لەناو کوڵێنەرد نانیشێت و بەدیوارەکانی یەوە نانووسێت.




لە کاتێك دا زیولایتەکە پڕ دەبێت لە ئایۆنەکانی کالسیۆم و مەگنسیۆم ئیتر ناتوانێت بە ئەرکی خۆی هەڵبستێت. لەبەر ئەمە پێویستە ئەم ئایۆنانە دەربکرێتە دەرەوەو سەر لەنوێ ژیان بۆزیولایتەکە بگەڕێنرێتەوە. گەڕانەوەی ژیان بۆزیولایتەکە ناودەبرێت بەکرداری ژیانەوە «Regeneration». ئەم کردارە بەهۆی خوێی کلۆریدی سودیۆمەوە دەکرێت. لێرەدا ئەم خوێیاوە دەکرێت بەسەر زیولایتەکەدا، جارێکی تر

ئایۆنی سودیۆم دەگەڕێتەوە جێگای خۆی .







ئەگەرچی ئەم ڕێگـایـە پارەی کەمی تێـدەچێت و هەرزانـەو لە ئیش کردن دا ئاسانە ، بەڵام خەوشی لەوەدایە ناتوانێت بەتەواوەتی ڕێژەی ماددە ڕەقە تواوەکان بن بڕ بکات وتفتی کەم بکاتەوە . شێوازێکی تر هەیە دەتـوانێت بمـان گەیـەنێتـە ئەم مەبـەستـەو ئەنجـامێکی باشتـرمان بدات بەدەستـەوە ، ئەویش بەکـارهێنـانی ئایۆن گۆڕینەوەکانی هـەیـدرۆجـین «H2O» ە . بریتی‌یـە لە گۆڕینـەوەی ئایـۆنـەکـانی کالسیۆم ومەگنسیـۆم بە ئایۆنی هەیدرۆجین لەجیاتی ئایۆنی سودیۆم ، ولەئەنجام دا گیراوەی دووەم ئۆکسیـدی کاربـۆن لە ئاوەکـەدا دەردەچێت . یەکگـرتنی زیـولایتی هەیـدرۆجین لەگـەڵ Ca (HCo3)2 ، و Mg (HCo3)2 ، و 2Na (Hco3) دا ، ئەم ئەنجامانەی خوارەوە دەردەچێت :

Na2 Z, Mg Z, Ca Z لەگـەڵ 2Co2, 2H2o ، وە لەکـاتێـک دا H2 Z ەرگـوگـردیـدی کالسیـۆم یان مەگنسیـۆم یان سودیـۆم دەگـەوێـت لـە ئـاکـام دا Ca Z یان Mg Z یان Na2Z دەردەچێت لەگـەڵ ترشی گوگـردیك «H2 So4» دا . وە ئەگەر هاتوو بەر کلۆردی کالسیـۆم ، یان مەگنسیۆم ، یان سودیـۆم کەوت ، ئەوا لەئـەنجام دا CaZ , MgZ یان Na2Z لەگەڵ 2HcL دا دەردەچێت . بۆ نموونە تەنیا ئەم هاوکێشانەیان دەنووسین :










پاشـان ئاوەکـە بە ئامـرازێك دا تێ‌پەردەکرێت بۆ دەرکردنی گازەکان و ڕزگـاربـوون لە دووەم ئۆکـسیدی کاربۆن . بەهۆی داخەسوداوە «NaoH» دەەست بەسـەر تفتی ئاوەکـەدا دەگیـرێت و توانی هەیـدرۆجینی (PH) بەرزدەکرێتەوە بۆ ٨,٥ .

ئایـۆن گۆڕینـەوەی هەیـدرۆجین بەهـۆی یەکێـك لە ترشـەڵوکەکانەوە ژ یـانی بۆدەگـەڕێنرێتەوە ، وەئەو ترشـەڵوکی‌یەی بەزۆری بەکاردێت ترشی گۆکردیکە کە لەئەنجام دا H2Z و CaSo4 و Mg So4 لەگەڵ Nas So4 دا دەردەچێت :




دەتـوانـرێت بەم شێـوازە تارادەیێکی فرە زۆر بڕی ماددە ڕەقە تواوەکان وتفتی نزم بکرێتەوە .

چەنـد توانستی ڕێگـای یەکـەم (پـاکـردنەوەی ئاو لە دەرەوەی کوڵێنەر) بەرزبێت ، هێشتـا ڕێـژەیێکی دیـاریکـراو لە خلتەی ئەوخوێیانەی دەبنە هۆی نیشتن وتـوێکـڵ دروست کردن لە ئاوەکەدا دەمێنێت ، وەئەگەر هاتوو پاك نەکـرایـەوە ئەوا دەنیشن وتوێکڵ دروست دەبێت . جا بۆ ئەوەی کوڵێنەر لەم گرفتـە قوتـار بێت ، ئەوا پێـویستـە پەنـا ببـرێتە بەر ڕێگای دووەم ، واتە پاکـردنـەوە لە ناو کوڵێنەردا . لێرەدا ماددەی کیمیایی دەکرێتە ناو ئاوەکەوە . ئەم ماددە کیمیاییانە هەوڵ دەدەن خلتەکانی ناو کوڵێنەر بەشێوەیێکی ئەوتۆ لێ بکـەن کە بەهیـچ جۆرێك بەدیوارەکانی‌یەوە نەنووسێت . لێرەدا یەکێك لە خوێ‌یـەکـانی فۆسفاتی تواوە (سێ‌یەم فۆسفاتی سودیۆم ـ Na3 Po4) بە خەستی‌یێکی لەبار دەکرێتە ناو ئاوەکەوە . ئەم چارەسەرکردنە کیمیایی‌یە بە «چـارەسـەرکـردنی فۆسفـات» ناودەبـرێت . فۆسفـاتـەکـە لەگـەڵ ئەو خوێ‌یـانـەدا یەك دەگـرێت کە لەڕێگـای یەکەم دا پاك نەکراونەتەوەو لەناو ئاوەکـەدا ماونـەتـەوەو دەبنـە هۆی ناسـازی و پەرپـونـەتەوە بۆ ناو کوڵێنەر . فۆسفـاتـەکـە کارێکی ئەوتـۆ دەکـات ، ئەوماددە ڕەقـانە بەجۆرێکی ئەوتۆ لێ بکات بە دیوارەکانی ناوەوەی کوڵێنەرەوە نەنووسێن .

فۆسفـات لەنـاو کوڵێنـەردا لەگەڵ هەر هەمووکالسیۆمە ڕەقەکان دا یەك دەگـرێت ، ئەم یەك گرتنـە کالسیـۆمـە ڕەقـەکان دەگۆڕێت بە لیلاوێك لە سێ‌یـەم فۆسفـاتی کالسیـۆم . ئەوەی گرنگـە پێـویستـە تفتی لەناو ئاوەکەدا بەشێـوەیێکی ئەوتـۆبێت تاوەکو لەگەڵ مەگنسێومە ڕەقەکانیش دا یەکگرتن ڕووبـدات . بەگشتی لە کاتێـك دا فۆسفات دەکرێتە ئاوی کوڵێنەرەوە ئەم یەکگرتنانەی خوارەوە ڕوودەدات



















هەروەکـو توێژێك لەمەوبەر ئاماژەمان بۆکرد ، لەناو ئاودا گازاتی تواوە هەیـە ، وەك گازی ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیـدی کاربـۆن . بێ گـومـان ئۆکسجین یەکـەم هۆی سەرەکی‌یە بۆدروست کردنی ژەنگ و داخوران و کلۆر بوون لەنـاو کوڵێنـەردا ، هەروەهـا گازی دووەم ئۆکسیـدی کاربۆنیش یارمـەتی دەرێـکی گەورەیـە بۆهاوبـەشی کـردن لە کرداری ژەنـگ دروست کردن دا . ئەوەی شایانی باسە زۆرجار ئاوی کوڵێنەر بیکاربۆناتی تێـدایـە ، لە کاتێـك دا ئەم بیکـاربـۆنلتە لەژێر پەستـان دا گەرم دەکرێت ، گازی دووەم ئۆکسیـدی کاربـۆن دەردەکـات . ئەم گازە لەگـەڵ ئاودا یەك دەگـرێت و ترشـەڵوکێکی لاواز دروست دەکـات ، کە ناودەبـرێت بەترشی کاربـۆنیـك (H2 Co3) . ئەم ترشـەڵوکی‌یـە بەشێنەیی و لەسەرخۆ لەگـەڵ ئاسن و کانـزادەکـانی تردا یەك دەگـرێت و بیکـاربـۆنات دروست دەبێت ، ئەم بیکـاربـۆنـاتـە بەگـەرمای زیاتر شیتەڵ دەبێت و گازی دووەم

ئۆكسیدی كاربۆن دەردەكات، وە ئەم گازە جارێكی تر لەگەڵ ئاوەكەدا یەك دەگرێتـەوەو ترشی كاربـۆنیـك دروست دەبێتـەوە. بەم چەشنـە ئەم سور (cycle) ە دووبارە دەبێتەوە.



$Fe + 2H_2Co_3 \rightarrow Fe(HCo_3)_2 + H_2$



$Fe(HCo_3)_2 + 2HOH +$ گەرمایی $\rightarrow Fe(oH)_2 + 2H_2o + 2Co_2$

بۆ ئەوەی بەربـەستی ژەنـگ بكـەین، ئەوا پێـویستـە ئاوەكـە لەم دوو گازەش پاك بكـرێتـەوە. باشتـرین رێگـا بۆ بەربـەست كردنی ژەنـگ لە ئامـرازەكـانی كوڵێنـەردا، ئەوەیـە كە پارێـزگاری تفتی ئاوەكەی بكرێت. پێـویستـە (PH) ی ئاوەكـە لە نێـوان (٥ ، ٨ ـ ٩) دا بێت. ئەمەش كەمترین پلەی تفتی‌یـە كە گازی دووەم ئۆكسیـدی كاربـۆنی تێدا نامێنێت. لەلایێكی ترەوە بە دوو رێگا رێژەی ئۆكسجین لە ناو ئاوەكەدا كەم دەكرێتەوە:

١ ـ بەهۆی رێگایێكی میكانیكی‌یەوە (لەدەرەوەی كوڵێنەر).

٢ ـ بەهۆی رێگایێكی كیمیایی‌یەوە لەناو كوڵێنەردا).

رێگا میكانیكی‌یەكە بریتی‌یە لە دەركردنی ئۆكسجینەكە پێش ئەوەی برواتە ناو كوڵێنـەرەوە. ئۆكسجین لە ئاوەكەدا گازێكی تواوەیە، بە هیچ جۆرێكی كیمیایی لەگەڵ ئاوەكەدا یەك ناگرێت. هەرچ كاتێك پلەی گەرمایی ئاوەكە بەرزبكرێتەوە رێژەكەی كەم دەبێتەوە و بەئاسانی لە ئاوەكە جیادەكرێتەوە، بەتایبەتی لە كاتێك دا پلەی گەرمـایی ئاوەكـە دەگاتە پلەی كەرمایی كولاندن. بۆ ئەم مەبەستە ئامرازێك دروست كراوە ناودەبرێت بە گازدەركێش (Dearator) بروانە وێنەی ـ ٣ ـ ئاوەكە لە سەر تانكی‌یـەكـەوە دەرژێتـە ناو گازدەركێشـەكـەوە. لەنـاو ئەم تانكی‌یـەدا چەند پلێتیكی بەرامبـەر بەیـەك قایمكـراون. ئیشی ئەم پلێتـانـە ئەوەیـە ئاوەكـە پەرتـوبـلاوەكـەنـەوە. لەژێـر تانكی‌یەكەدا بۆرێكی هەڵم دەرواتە ژوورەوە. ئەم هەڵمە بەناو ئاوەكەدا دەروات وگەرمی دەكات بۆ زیاتر لە پلەی گەرمی كولاندن. لەم پلەیـەدا گازەتـوواوەكـانی ناو ئاوەكـە دەردەپـەرن، وبـە بۆرێك دا كە بەسەر تانكی‌یـەكـەوە نوسـاوە دەرۆنە دەرەوەی گازدەركێشەكە. بەم شێوازە میكانیكی‌یە دەوتـرێت (Dearation). بەهـۆی ئەم رێگـایـەوە بە تەواوەتی ئاوەكـە لە ئۆكسـجین رزگـاری نابێت، بەڵكـو رێـژەی ئۆكسـجینـە كە نزم دەبێتـەوە بۆ نزیكـەی ٣و. سم³/لتر. پێـویستـە ئەم برەش بن بربكـرێت، چونكـە هەروەكـو وتمان بوونی ئوكسجین لەنـاو ئاوەكـەدا دەركـەوتێكی پر مەتـرسی‌یـە و زیـان بەكـوڵێنـەرو پاشكـۆكـانی دەگـەیـەنێت. جا بەهۆی بەكارهێنانی ماددەی كیمیـایی‌یـەوە، كە دەكـرێتە ناو كوڵێنەرەوە ئاوەكە لە پاشماوەی ئۆكسجینی تواوە پاك دەكـرێتـەوە. ئەو ماددانـەی بەزۆری بۆ ئەم مەبـەستە بەكاردێن بریتین لە گۆگـردیتی سـودیـۆم (Na2 So3)، یـان هایدرەزاین (N2 H4). خوێ‌ی گۆگـردیتی سودیـۆم لەگـەڵ ئۆكسـجینـەكەدا یەك دەگرێت ولەئەنجام دا خوێ‌ی گۆگردیداتی سودیۆم دروست دەبێت وكاریگەری ئوكسجینەكە ناهێڵێت.



$Na_2So_3 + 1/2\, O_2 \quad Na_2So_4$

بەڵام هایـدرەزاین لەگـەڵ ئوكسـجینـەكـەدا یەك دەگـرێت لەئـەنجـام دا نەیترۆجین و ئاو دروست دەبین.



$N_2H_4 + O_2 \rightarrow N_2 + H_2o$

جگـە لە فۆسفات و گۆگردیتی سودیۆم دەتوانرێت ئەم ماددانەی تریش بۆ شێوازی پاكردنەوەی ناوەوە بەكاربهێنرێن

١ ـ كاربۆناتی سودیۆم - Na2 Co3 - Soda ash

٢ ـ هەیدرۆكسیدی سودیۆم - NaoH - Caustic Soda

كاربـۆنـاتی سودیۆم خوێ‌یێكی تفتە، كاریگەری ئەوخوێ وگازانە ناهێڵێت كە دەبنـە هۆی ژەنـگ دروسـت كردن، وتفتی ئاوی كوڵێنـەر بەرزدەكـاتـەوە. لە كاتێـك دا دەكـرێتـە ناوئاوی كوڵێنـەرەوە لەگـەڵ ئەوخلتـانـەدا «Ca So4» یەك دەگرێت كە دەبنەهۆی دروست كردنی توێكڵ، ولەئەنجام دا كاربۆناتی كالسیۆم دروست دەبێت و لەگەڵ ئاودا فرێ دەدرێتە دەرەوە.



$Na_2Co_3 + CaSo_4 \rightarrow CaCo_3 + Na_2So_4$

هەروەهـا ئەم كاربـۆنـاتی سۆدیـۆمـە لە ناوئاوی كوڵێنـەردا بەهـۆی گەرمـایی‌یـەوە دەگـۆڕێت بۆ هەیـدرۆكسیـدی سودیـۆم ودووەم ئۆكسیدی كاربـۆن. ئەم هەیـدرۆكسیـدی سۆدیـۆمـە لەگـەڵ (Mg So4) دا، كە لەنـاو ئاوەكـەدا هەیـە ودەبێتە هۆی دروست بوونی توێكڵ یەك دەگرێت، ولەئەنجام دا هەیدرۆكسیدی مەگنسیـۆم و گۆگرداتی سودیۆم دروست دەبن.



$Na_2Co_3 + H_2o +$ گەرمایی $2NaoH + Co_2$



$2NaoH + MgSo_4 \rightarrow Mg(oH)_2 + Na_2So_4$

كاربۆناتی سودیۆم چەند خەوشێكی هەیە، كە بریتین لە:ـ

١ ـ لە ئاوی كوڵێنـەردا و لە پلەیـێـكـی بەرزی پەستـان وگەرمـایی‌دا هەیـدرۆكسیـدی سودیـۆم دروست دەبێت. ئەمـە كاردەكـاتـە سەر بری كاربـۆنـاتی سودیـۆمـەكـە. چونكە برێكی تەواوەتی ئەوتۆ نامێنێت لەگەڵ كالسیۆمە رەقەكان دا یەك بگرێت.

٢ ـ لە كاتێـك دا دووەم ئۆكسیـدی كاربـۆن دروست دەبێت لەگـەڵ هەڵمـەكـەدا رێگـادەگرێتەبەر، هەرچ كاتێك هەڵمەكە بووەوە بەئاو، ئەوا دووەم ئۆكسیـدی كاربـۆنـەكـە دەتـوێتـەوەو ترشی كاربـۆنیك دێتەكایەوە. ئەمەش هۆیێكە بۆ دروست بوونی ژەنگ.

٣ ـ ئەو كاربـۆنـاتی كالسیـۆمـەی دروست دەبێت توێكڵێكی تەنك لەسـەر رووبـەرەكـان دروست دەكـات. لەبەر ئەوەی هەیدرۆكسیدی سودیۆمیش تفتە، ئەمیش كاریگەری خوێ ترشەڵۆكی‌یەكان و ئەوگازانە ناهێڵێت كە دەبنـەهـۆی ژەنـگ دروست كردن، وتفتی ئاوی كوڵێنەر بەرزدەكـاتەوە، هەروەها ئەورەوقی‌یە لەناودەبات كە بەهۆی مەگنسیۆمەوە دروست دەبێت. چونكـە لەكـاتێـك دا لەگـەڵ (Mg So4) دا یەك دەگـرێت هەیدرۆكسیدی مەگنسیۆم دروست دەبێت:

شان بەشـانی شێـوازی چارەسەركردنی ئاولەناوكوڵێنەردا، رێگایێكی تر هەیـە بۆ رزگـاربـوون لەوخوێ‌یـانـەی كە لەنـاو كوڵێنـەردا بەزۆری

کۆدەبنەوە. ئەم ڕێگایەش ناودەبرێت بە دەرکردنی ناوە ناوە. بێ گومان ئەو ئاوەی دەڕوات بۆ کوڵێنەر ڕێژەیێکی لە خوێ تواوەکان تێدایە، کە خەستی یەکەی بەهۆی کوڵاندنەوە بەبەردەوامی لە بەرزبوونەوەدایە.

خۆ ئەگەر هاتوو ڕێژەی ئەو خوێیانە زۆر بەرز بوو و دەرنەکرایە دەرەوە کەفەڵوکە دروست دەبێت. بوونی کەفەڵوکە هۆیێکە بۆ پەرینەوەی گەردی ئاو لەگەڵ هەڵمەکەدا بۆ ئەو ئامێر و ئامرازانەی ئەو هەڵمەی تێدا بەکاردێت وەك: پەرەکە «Turbine» و گۆڕەری گەرمایی «Heat Exchanger»، لەئەنجام دا ئەو خوێیانە لەسەر ڕووی ئەو ئامێر و ئامرازانە کۆدەبنەوەو دەبێت بەزیان بۆیان. جابۆ ئەوەی بەرگری لەم دەرکەوتە بکرێت پێویستە ناوەناوە بڕێك لە ئاوی ناو کوڵێنەر فڕێ بدرێتە دەرەوە، تاوەکو پارێزگاری لە ڕێژەیێکی دیاریکراو لەو خوێیانە بکرێت کە لەناو ئاوی کوڵێنەردان. بڕی ئەو ئاوەی فڕێدەدرێتەدەرەوە بۆمەبەستی پاکردنەوەی کوڵێنەر بەندە بەڕێژەی ئەو خوێیانەوە کە لەناو ئاوەکەدایە. وەدەتوانرێت بەهۆی ئەم یاسایەی خوارەوەوە کەمترین بڕی ئەو ئاوە بدۆزرێتەوە کە دەردەکرێتە دەرەوە.

$$د = \frac{خ}{ب - خ} \times ١٠٠٪$$

د = بڕی ئەو ئاوەی دەردەکرێتەدەرەوە.

خ = بڕی خوێی ناو ئاو کەدەڕوات بۆناو کوڵێنەر بەپێوانەی بەشێك لە ملیۆنێك بەش دا.

ب ـ بڕی خوێی ڕێگادراو لە ناو ئاوی کوڵێنەردا بەپێوانەی «ب. ل. م ـ PPM»[١]

بڕی ئەو ئاوەی فڕێدەدرێتە دەرەوە بەندە بە :ـ

١ ـ بڕی ئەو ئاوەی کە کوڵێنەر دەتوانێت بیگرێتە خۆی.

٢ ـ جۆری ئەو ئاوەی کە دەڕوات بۆ کوڵێنەر.

٣ ـ بڕی ئەو ئاوەی کە لە کوڵێنەردا دەبێت بە هەڵم.

٤ ـ بەرزترین ڕادەی ڕێگادراوی ئەو خوێیانەی کە لە ناو ئاوی کوڵێنەردایە.

ئەمەش بەندە بە وزەو پەستای کوڵێنەرەوە. بڕوانە خشتەی ـ ٢. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەرکردنی ناوە ناوە بەربەستی بەرزبوونەوەی ڕادەی خەستی خوێی تواوەکان دەکات، لەچەشنی کاتدا بڕی ئەو مادە ڕەقانەش کەم دەکاتەوە کە لەبنی کوڵێنەردا گردەبێتەوە.

| پەستانی کوڵێنەر «پا/ئنج»[٤] | کۆی ڕەقی «ب. ل. م» | کۆی تفتی «ب. ل. م» |
|---|---|---|
| سفر ـ ٣٠٠ | ٣٥٠٠ | ٧٠٠ |
| ٣٠١ ـ ٤٥٠ | ٣٠٠٠ | ٦٠٠ |
| ٤٥١ ـ ٦٠٠ | ٢٥٠٠ | ٥٠٠ |
| ٦٠١ ـ ٧٥٠ | ٢٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٧٥١ ـ ٩٠٠ | ١٥٠٠ | ٣٠٠ |

| سایکا Sio2 «ب. ل. م» | ڕەقەمەنی Hardness «ب. ل. م» | فۆسفات Po4 «ب. ل. م» |
|---|---|---|
| ١٢٥ | سفر | ٢٠ ـ ٥٠ |
| ٩٠ | سفر | ٢٠ ـ ٥٠ |
| ٥٠ | سفر | ٢٠ ـ ٥٠ |
| ٣٥ | سفر | ٢٠ ـ ٥٠ |
| ٢٠ | سفر | ٢٠ ـ ٥٠ |

خشتەی ـ ٢ ـ

پەراوێزەکان

١ ـ دەربارەی کوڵێنەر، بڕوانە گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٩ نیسان/ ١٩٨٤ لاپەرە ٨٦

٢ ـ یەکەی گەرمایی بەریتانی ـ ی. گ. ب ـ B.t.u، بریتییە لەبڕی گەرمایی پێویست بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمای یەك پاوەند ئاوی پاك یەك پلەی فەهرنهایتی لە ژوورێك دا کە پلەی گەرمایی نەگۆڕێت.

٣ ـ توانای هەیدرۆجینی ـ PH ـ پێوانەیێکە بەکاردێت بۆنیشاندانی ڕادەی ترشەڵۆکی یان تفتی لە گیراوەیێك دا. ئەگەر مادەیێك (PH) ەکەی یەکسان بوو بە (٧)، ئەو مادەدیە هاوسەنگە. واتە نەتفتەو نەترشە. بۆنموونە ئاوی سازگلری پاك (PH) ەکەی حەوتە، وەهەرچ کاتێك (PH) لە ٧ زیاتر بوو (٧ تا ١٤) مانای وایە گیراوەکە گیراوەیێکی تفتی یە هەروەها لەژێر ژمارە ـ ٧ ـ وە [٧ تا سفر] نیشانەیە بۆگیراوەیێکی ترشی. کەواتە (PH) پێو لە نێوان سفرو چواردەدا دابەش بووە.

٤ ـ ب . ل . م ـ P.P.M

بەشێك لە ملیونێك دا ـ Part permillion، بلاوترین ڕێگا بۆ دەربرین لە یەکـەی خەستی یان چڕیی شیتـەڵ کردنی کیمیـایی لە ئاودا بریتیـە لە بەشێك لە ملیونێك بەش دا. یەك «ب . ل . م» مانای یەك کێش «وزن» لە ماددەیێـك تـواوەتـەوە لە یەك ملیـون لە چەشنی کێش لە ئاو. بۆنمـوونـە یەك گرام لە یەك ملیـۆن گرام لە ئاو. بەڵام یەك پاوەنـد لە ماددەیێـك لەناو یەك ملیـۆن گاڵـۆن ئاو، یەکسـان نی یـە بە «ب . ل . م» چونکـە یەکەکانی پاوەندو گاڵۆنەکە چۆن یەك نین.


## سەرچاوەکان

1 - PracticaL Boiler water treatment

LEO . I . PINCUS

2 - Steam, its generation and use

'Babcock and wilcox

38 - edition - 1972

3 - Power plant theory and design

PHILP J. POTTER

2- edition

٤ ـ تصفية المياه للأغراض الصناعية ـ وزارة الصناعة والمعادن نبيل عبدالأحد ججاتوي ـ حزيران ـ ١٩٧٨

٥ ـ سلامة ظروف عمل المراجل البخارية

المؤسسة العامة للصناعات الغذائية ـ عبدالرحيم سعيد غزال شباط ـ ١٩٨٢


# ماء المرجل

محمد قادر محي الدين

تعتبر المراجل البخارية من المعدات المهمة جداً، حيث تلعب دوراً رئيسياً في كثير من الصناعات الحيوية كالصناعات الكيمياوية، النفط، المـواد الغـذائيـة، محطـات توليـد الطـاقـة الكهـربائية. . . الخ . وإن مؤشـرات الأنتـاج في هذه الصنـاعـات تعتمـد إعتمـاداً كليـاً على عمل وكفاءة المراجل، لذلك من الضروري الأهتمام الجدي والعناية الفائقة بالمراجل في هذه المعامل.

إن أهم المشـاكل التي تواجه المرجل هي إستعمال ماء العسر، الذي يحتـوي على كميـات غيـر مرغـوب فيهـا من الأمـلاح الذائبة للكالسيوم والمغنسيـوم والتي تتـواجـد بشكـل بيكاربونات وكلوريدات وكبريتات. وبـالأضـافـة الى العســره فأن المياه قد تحتوي على شـوائب ومواد عالقة أخـرى والغـازات المذابة مثل الأوكسجين وثاني اوكسيد الكاربون. إن هذه الشوائب في ظروف المرجل من إرتفاع درجة الحرارة والضغط تتركز وتترسب ملاصقة للسطح الداخلي لأنابيب التسخين، وتبعاً لتكوين مثل هذه الـرواسب تتكـون طبقـة شبـه عازلـة للحرارة يكون من شأنها جعل إنتقـال الحـرارة من خارج الأنـابيب الى الماء داخلها أقل بكثير عن ذي قبـل، كمـا أنـه يتسبب في جعـل الحـرارة تتـركز في منطقة واحدة على الأنـابيب ممـا يسبب إنفجـار الأنـابيب وتـوقف المرجل عن العمل. إن حصـول التـرسبات القشـية في المراجل يمكن منعه بمعالجة المياه التي تغـذي المـرجـل، وبشكـل عام فأن معـالجـة الميـاه عبـارة عن تحويل الشـوائب المـوجـوده في المـاء الى مواد لاتكـون رواسـب قشـرية داخل المـرجـل مع التخلص نهـائيـاً من أيـة آثـار للأوكسجين وثـاني أوكسيـد الكـاربـون، ويمكن أن يتم ذلـك بطـريقتين: المعـالجـة الخـارجيـة، والعالجة الداخلية نعني بالمعالجة الخارجية التخلص من الشوائب قبل دخـولـه الى المـرجـل، وتتم بأضـافـة محلول الشب والجيـر المطفأ مع إستعمـال المـرشحات والمبادلات الآيونية. أما المعالجة الداخلية فهي

عبارة عن إضافة كميات مناسبة من المواد الكيمياوية مثل فوسفات ثلاثي الصـوديـوم وكبـريتيت الصـوديـوم والهـايـدرزاين الى الماء، وذلك بغية تحـويـل الشـوائب المـوجـودة في الماء الى مواد لاتكون رواسب داخل المرجل مع منع حدوث التآكل في الجانب المائي للمرجل.

# هونەری خۆشنووسی و خۆشنووسانی کورد

ئامادەکردنی
ئەحمەد سەعید ئەحمەد

پاش سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام و هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز نووسین زیاتر گەشەی کردو پەرەی ستاند، لەقورئاندا چەندان ئایەت هەن کە داوا لە موسڵمانان دەکەن فێری نووسین و خوێندنەوە بن، لەوانە یەکەمین ئایەتێك کە بۆ پێغەمبەر (د.خ) هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ «بسم الله الرحمن الرحيم اقرأ وربك الأكرم الذي علم بالقلم علم الأنسان ما لم يعلم.... صدق الله العظيم». هەروەها ئایەتی «نٓ وَالقَلَم وَمَا يَسطرُون» ئەمە جگە لە زۆر فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) کە باس لە گرنگیی نووسین و خوێندنەوە دەکەن لەوانە «اطلبوا العلم ولو بالصين»

پاش ئەوەی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەر (د خ)و خەلیفەکانی دوای خۆیدا پەلی هاویشت و زۆر وڵاتی تازە خرە سەر ئەم دەولەتە، نووسیی عەرەبیش بەنێو خەڵکی ئەو وڵاتانەدا بڵاوبووەوە، لەبەر ئەوەی نووسینی عەرەبی نووسینی قورئانی پیرۆزە زۆر نەتەوەی تریش بەکاریان دەهێنا، لەوانە فارس، کورد، ئەفغان، تورك، هیند، مەلایو... لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، لە نووسینی عەرەبیدا چەند شێوەیەکی تایبەت بۆ نووسین بەکارهاتن کە بە هونەری خۆشنووسی ـ فن الخط ـ دەناسرێن، لەوشێوانەیش خەتی کوفی، ثلث، نسخ، فارسی، دیوانی، دیوانی جەلی، ئیجازە... و جۆری تریش.

یەکەمین کەسێك کە یاسای ئەم هونەرەی دانا «ابن مقلە» بوو ناوبراو بنەما سەرەتاکانی خەتی ـ ثلث» و «نسخ»ی دارشت بەدوای ئەمیشدا «ابن البواب» هات و، زۆر شتی تازەی خستە سەر داهێنانەکەی پێش خۆی. بەدوای ئەمیشدا «یاقوت المستعصمي» سەر لەبەر کارەکەی تەواوکردو بەپێی یاسای نوختە پێوانەی هەموو پیتەکانی لەشێوە جیاوازەکانی ئەم هونەرەدا دانا.

لە مێژ ووی ئەم هونەرەدا زۆر خۆشنووسی کارامە هەڵکەوتوون کە شوێن دەستیان لەبواری ئەم هونەرەدا دیارەو، بەرێزەوە ناویان دەهێنرێت، لەوانە: حافز عوسمان، مستەفا ڕاقم، عەزیز ڕوفاعی، حامید ئامیدی، هاشم موحەممەد، حوسنی، بەدوی‌و دەیان و سەدان هونەرمەندیتر.

سەبارەت بەگەلی کوردیش هەروەك لە پێشەکی ئەم باسەدا ئاماژەمان بۆکرد، یەکێك بوو لەونەتەوانەی کە ئایینی ئیسلامی وەرگرت. گەیشتنی ئەم ئایینە کارێکی گەورەی کردە سەر هەموو لایەنەکانی ژیانی کوردەواری، لەڕووی ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بە نەخش و نیگارو نووسینەوەی قورئانی پیرۆز. هونەری خۆشنووسی وەکوو گۆشەیەك لەهونەروشارستانەتیی ئیسلامی بەکورد گەیشت و، لەلایەن هونەرمەندانی دەست ڕەنگینی کوردەوە گەشەی پێدرا.

زۆر جار بخوێنی کورد پرسیار دەکات: بۆچی ئێمەیش وەکوو نەتەوەکانی دراوسێمان «عەرەب و فارس» خاوەنی داهێنان یاخود خاوەنی ڕێباز و یاساو ڕێچکەیەکی تایبەتی خۆشنووسی نین؟ من وەکوو خۆشنووسێکی کورد بەپێی زانیاری‌و بۆچوونی خۆم دەڵێم دوو هۆی سەرەکی هەن کەبوونەتە ڕێگر لەم بوارەدا یەکەمیان: نەبوونی ڕێنووسێکی دروست و لەباری کوردی، چونکە هەروەك دەزانین ئەو پیتانەی ئێمە بەکاریان دەهێنین لەعەرەبی‌یەوە وەرگیراون، بەدەستکارییەکی کەمەوە توانیویانە تارادەیەك جێگەی

خۆیـان لەوکەم وکوری‌یـانـەی کە لەزمـانـەکەدا هەن «بربکەنەوە» دووەمیشیان: باری تایبەتی میللەتی کوردو نەبوونی هەل و دەرفەتی باش وتێـرو تەسـەل تا بتـوانێ خاوەنی داهێنـان وشێـوەی نوێی

نووسین بێ کەتایبەت بێ بەخوی. لەگەڵ ئەمانەیشدا لەنێو کورددا زۆر خۆشنـووسی ناودار هەڵکـەوتـوون کە شوێن دەستیـان دیـارە لەبواری ئەم هونەرەدا. ئێمە لێرەوەو لە مەودای ئەم باسەماندا هەوڵ دەدەین تیشـك بخـەینـە سەرژیـان و بەرهـەمی هێنـدێك لەو هونـەرمـەنـدە پایـە بەرزانـە کە نەتـەوەکـەمان حەقیەتی شانازی بەو ڕۆڵانـەیـەوە بکـات کە شوێنی خۆیـان لەم هونـەرەدا کردووەتـەوەو خزمەتی مرۆڤایەتی‌یان پێ کردووە.

## حامیدئامەدی
## «١٨٩١ - ١٩٨٢»



ناوی تەواوی «مـووسـاعـەزمی» یەوباوکی قەساب بووو، ناوی «ذو الفقار»ە لە ساڵی ١٨٩١دا لەشاری دێرینی دیاربەکر «ئامەد» لە کوردستانی تورکیا لەدایك بووە. باپیری حامید خۆشنووس بووەو، ناوی «ئادەم ئامەدی»یە.

لە منداڵیدا خرایە حوجرە لە مزگەوتی گەورەی دیار بەکر تالەوێدا فێـری خوێنـدنـەوەی قورئـانی پیرۆزو نووسین بێ هەر لە حوجرەوە هۆگـرییـەکی باشی هەبـوولەگـەڵ وانـەکانی وێنەوخۆشنووسی کە مامۆستـایـەك بەنێـوی «مصطفى عاكف»ەوە دەیگوتنەوە پاش ئەمە چووەتـە قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی لە دیاربەکرو لەوێدا لەسەر دەستی مامۆستا «واحید ئەفەندی» فێری خەتی ڕوقعە بوو، هەروەها لای مامـۆستـا «ئـەحمەد حیلمی بەگ» فێری خەتی ثلث بوو. هەر ئەم دوو مامـۆستـایـەوە فێـری خەتی زمـانی لاتینیی و ڕۆمـانی وگۆتی (غوطی Gothic) بوو، چەند مامۆستایەکی شارەزای تر یارمەتییان داوە بۆ فێربوونی خۆشنووسی، لەوانە «عبدالسلام أفندي وسعيد أفندي»

پاش ئەوەی قوتـابخـانەی ڕوشدییەی تەواوکرد، چووە ئامادەیی دیـار بەکـر لەوێ فێـری خەتی «ثلث جلي» بوو لای مامـۆستـایـەك بەنێـوی «عبـدالسـلام أفندي» و بەبەردەوامی لاسایی نووسینەکانی هەردوو خۆشنـووسی ناودار «حـافـز عوسمان»[1] و «مصطفى»[2] راقم ی دەکـردەوە. ساڵی ١٩٠٦ خوێندنی ئامادەیی تەواوکردو چووە ئەستـەمـووڵ و لەکـۆلێجی ماف «الحقـوق» وەرگیـرا، بەڵام پاش ساڵێـك وازی هێنـاو چووە قوتـابخـانـەی «الصنـايـع النفيسـة» کە ئەکـادیمی هونـەرە جوانـەکـانـە لەبـەر ئەوەی باوکی حامید کۆچی دوایی‌کـرد، ئەویش نەیتـوانی درێژە بەخوێندنەکەی بدات و وازی لێ هێنـا. لەم کاتـەدا وەزارەتی مەعـاریف ڕایگـەیـاند پێویستی بە مامـۆستـای خەت هەیـە بۆ قوتـابخـانـەکـان، حامیـدخێـرا خۆیی ناساندو، لە تاقی کردنەوەدا پلەی بەرزی بەدەست هێنا. بەڵام لەبەر کەم تەمـەنیی - کە ئەوکـاتـە ١٨ ساڵان بوو- دانـەمـەزرا. لەهەمان کاتـدا بەڕێـوەبـەری یەکێـك لە قوتـابخـانەکان، کەناوی «گوڵشەن مەعـاریف» بوو لەشـاری حەسـەکـە، زۆر حەزی لە دەستخـەتی حامید دەکردو زۆریی پەسند دەکرد، بۆیە بڕیاریدا دایبمەزرێنێ.

پاش تێپـەڕبـوونی ساڵێـك، لەم قوتـابخـانـەیەوە بۆ چاپخانەی «الرسـومـات» گوێـزرایـەوەو، لەوێش ساڵێـك مایـەوەو ئەمجـا بۆ چاپخـانـەی کاروبـاری جەنگیی عوسمـانی گوێـزرایـەوە تابچێتـە شوێنی خۆشنووسی کۆچ کردوو «محمد نظيف»[3]

ماوەی حەوت ساڵ لەم چاپخانەیە مایەوە.

حامیـد لەم ماوەیـەدا بیری کردەوە کە نووسینگەیەك بکاتەوە هەتا لەکـاتی بێ ئیشیـدا ئیشی خۆشنـووسی تێـدا بکـات. ئەوە بوو

ئەگەرەکی «جاغـال ئوغلوو» نووسینگـەیەکی کردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی یاسای تورکی ڕێگە بە فەرمانبەری میری نادات جگە لە کارە ڕەسمییـەکـەی کارێکی تر بکـات بۆ ئەوەی ئیشـەکەی ئاشکرا نەبێ نووسینگـەکـەی ناونا «خطاط حامد ـ یازی اوی». پاشتر کارەکەی لای میری ئاشکـرابـوو و درابـەدادگـاو، ناچار بوو وازلە ئیشەکەی بهێنێ، جا لەبـەر ئەوەی ناوبـانگێکی زۆری بەنێـوی «حـامیـد»ەوە پەیـدا کردبـوو بڕیـاریدا بەڕەسـمی نێـوی خۆی بگـۆڕێ لە «مـووسـاعـەزمی» یەوە بۆ «حـامیـد ئامـەدی». پاشان گواستیەوە بۆ نووسینگـەیـەکی تازە لەشـەقـامی «باب عالي» و لەوێدامایەوە تاکوو کۆچی دوایی کرد

- پاشماوەی نووسینەکانی -

حامیـد ژمـارەیـەکی زۆر کاری هونـەریی خۆشنـووسی لەپـاش بەجێ ماون کە ئەمانە گوڵبژێرێکن لە شاکارەکانی :-

+ دوو جار قورئـانی پیـرۆزی بەخـەتی نـسـخ نووسیـوەتەوەکە لە دوو پلەی جوانیدایە.

+ نووسینیءزۆر لە مزگـەوتـەکانی نووسیوە، لەوانە مزگەوتی «قوجە تەپە» لە ئەنقەرە، هەروەها مزگەوتی «موضە»

لە ئەستەمووڵ کە سورەتی «الفتح»ی تێدا نووسیوە. لە مزگەوتی «قارتال» دا لە ئەستەمووڵ سورەتی «النبأ»ی بەخەتی «ثلث» نووسیوە.




«وجاهد وا في الله حق جهاده»
نووسینی حامید بەخەتی «ثلث»

+ بەخەتی توورە(١) «طغراء» ناوی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و مەلیـك فەیسـەڵی سعودیەو ڕەزا شای ئێرانی نووسیون کەلە نووسینە جوانەکانی حامیدن و پاداشتی گەورەو بەنرخی لەسەر وەرگرتوون.

بەڵام ئەو پارچـە نووسینـە کە خۆی زۆر بەدڵی بێ و لای جوان بێ، بریتی‌یە لە «سـورەتی الفـاتحە» کە بە خەتی ثلث نووسیویەو لاسـایی خۆشنـووسی بەنێـوبـانگ «مصطفى راقم»ی کردووەتەوەو ماوەی شەش مانگ خەریکی نووسینی بووە.

حامیـد ژمـارەیەکی زۆر قوتابیی هەبوون کە وانەی خۆشنووسی بێ دەگـوتن و ئیجـازەنـامـەی خۆشنـووسیی داونـەتێ، لەوانـە :- لەتـورکیـا : حەلیم، حەسـەن چەلەبی، خەسرەو صوباشی.... لەوڵاتـە عەرەبییەکان : هاشم محمد ـ البغدادي، یوسف ذوالنون، سماع الحلبي.

لە یابانیش خاتوو میناکۆ. لەکوردستانیش خۆشنووس نجاة أنور لە هەولێر لەلای حامید ئیجازەی خۆشنووسیی وەرگرتووە.

حامیـد لە ساڵانی کۆتـاییی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی بووو، لە نەخـۆشخـانـەی حەیـدەر پاشا لە ئەستەمووڵ چارەسەر دەکرا، تاڵە ڕۆژی ١٨/٥/١٩٨٢دا لەتـەمەنی ٩١ ساڵیدا کۆچی دوایی کردو تەرمـەکـەی برایـە مزگـەوتی شیشلی، ئەو مزگـەوتـەی کە خۆی نووسینـەکـانی نووسیبـوون و زۆری شانـازی پێـوە دەکردن. لەوێوە بەرەو گۆڕستـانی «قـەرەجە ئەحمەد» بەڕێ کراو، لەتەنیشت گۆڕی «حمدالله أفندي» کەبە «شیخ الخطاطين» ناسراوە بەخاك سپێردرا. گەلێـك ناودارو نووسـەری تورکیـاو زۆر لەقـوتابیە خۆشنووسەکانی بەشداریی ناشتنی تەرمی حامیدیان کرد.

بۆ ڕێـزلێنـان لەو خزمـەتـە گەورەیەی کە حامیدی خۆشنووس لە سەدەی بیستـەم دا پێشکـەشی ئەم هونـەرەی کردووە، ڕێکخـراوی کۆنگـرەی ئیـسلامی ساڵی ١٩٨٦ پێشبرکێ(٢) یەکی بەنێوی حامید ئامیـدی‌یـەوە سازداو، ژمـارەیـەکی زۆر لە خۆشنـووسـانی وڵاتانی ئیـسلامی بەشـدارییـان تێـدا کرد. لە عێراق مامۆستای هەڵکەوتوو جاسم نەجەفی پلەی سێ‌یەمی لەو پێشبرکێیەدا بەدەست هێنا لەگەڵ چوار مەدالیـاو بڕوانـامـەی ڕێـزلێنـان و، کرایـە ئەندامی بەردەوامی لیژنەی پەسندکردنیءبەرهەمەکان.



(محمد علي صابر)ی خوشنووس لەگەل (مصطفی آبو طبرە)ی خوشنووسی قوتابیی خویدا

## حاجی موحەممەد عەلیی «صابیر»
## ١٨٦٣ - ١٩٤١

خوالی خوش بوو سابیر لە دەوروبەری سالی ١٨٦٣ی زاییدا لەگەرەکی حەیدەرخانەی بەغدا لەخێزانیکی کورددا لە دایك بووە.[٢] لەمندالیدا لە چاپخانەی «دار السلام» کە هی میری بوو، کاری دەکرد. بەهوی ئیشەکەیەوە لەچاپخانە توانیی بە تەواوی خەتی «النسخ المطبعي» فیربیی و، شارەزاییەکی باشی تیدا پەیدابکات. هەر لە چاپخانەکەدا پیوەندیی بە خوشنووسی ناوداری تورك عوسمان یاوەرەوەکردو، لەسەر دەستی ئەو دەستی کرد بەنووسین و مەشق کردن و، بەشیوەیەکی تایبەت خەتی «ثلث»ی لی وەرگرت.[١]

سابیر ماوەی ژیانی بە مەلتی بەسەربردووەو، ئەوەی زانراوە لەبارەیەوە ئەوەیە کە پیاویکی دوورە پەریز بووەو، حەزی بە تەنیی کردووەو بەدەگمەن تیکەلی خەلکی دەکرد،پیشەی ئەمیەکی دیاری کراوی لەگەل چەند کەسیکدا هەبوو کە هەوری بوون و لەنووسینگەکەیدا کەلەکیتکی

(رئیس الکتاب)ی نیزیك مۆزەخانەی عیراقی کوندا بوو، هات وچویان دەکرد. لەوانە: ناجی السوسانی، محمد صالح الخطاط، الحاج اسماعیل الشیخلي. لەوقوتابیانەیش کە لەلای سابیری خوشنووس وانەی خوشنووسی وەرگرتوە: هاشم محمد الخطاط، جلال الترکي، اسماعیل الفرضي، مصطفی بو طبرە، محسن الخطاط، عبدالقادر المفتي، عزت الشوفي

سالی ١٨٢١ چووبو حەج. لەسالی ١٩٢٧ دا بو جاری دووەم چووبو حەج و، دوای گەرانەوەی چووبو میسر، لە قاهیرە چاوی بە خوشنووسی گەورە «عبدالعزیز الرفاعي»[٣] کەوت و، ماوەی سی مانگیك لای ئەو دەینووسی. پاش ئەو ئیجازەنامەی خوشنووسیی لی وەرگرت. پاشان لە قاهیرەوە چووبو ئەستەموول و خوشنووسی بەناوبانگی کورد (حامید ئامەدی)ی بینی.

سالی ١٩٢٨ گواستیەوە بو نووسینگەیەکی تازە بەرابەر بەریوەبەریتی پولیسی سەراو، لەنهومی سەرەوەیدا ژووریکی تەرخان کرد بو نووسینگەو شوینی ژیانیتی.

لەو ماوەیەدا کە حاجی سابیر لە بەغدا ژیاوە، جگە لە خوالی خوش بوو (مەلا عەلی فەزلی)[٤] کەسیك نەبوو لە بواری خوشنووسیدا شانی لەشانی بدات.

- پاشماوەی نووسینەکانی -

خوالی خوش بوو سابیر ژمارەیەکی زور لە نووسینی خوشنووسی بەنرخی لەپاش بەجی ماون کە تاوەکوو روژی ئەمرویش دیوارو نیوەوەی مزگەوتەکانیان رازاندووەتەوە. ئەمانە بەشیکن لەو نووسینانە:

- دیریك لەسەر دەرگا بچکولەکەی مزگەوتی حەیدەرخانە لە شەقامی رەشید[٥] لەسالی ١٣٣٢ی کوچیدا نووسیویە.
- چەند دیریك لە مزگەوتی «عثمان ابن السعید العسکري» لە بازاری مەیدان.
- دیریك بە دەرگای مزگەوتی «الشیخ عمر السهروردي» و دەرگای مزگەوتی «سید سلطان علي» و دەرگای مزگەوتی «الخفافین»ەوە.

## موحەممەد تاهیر کوردی
## ١٩٠٣ - ١٩٨٠

ناوی تەواوی موحەممەد تاهیر کوری عەبدولقادر کوری مەحموود کوردییە. لەساڵی ١٩٠٣ی زایین دا لەشاری مەککە لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی «الفلاح» لە مەککە تەواوکردوە ساڵی ١٩٢٢ باوکی دەیبا بۆ قاهیرەو دەچێتە مزگەوتی «الأزهر» بۆ تەواوکردنی خوێندن.

لەگەڵ خوێندنی لە ئەزهەردا، پێوەندی بە قوتابخانەی «تحسين الخطوط العربية»وە دەکات کەیەکەم ساڵی کردنەوەی بوو لە میسردا. لەو قوتابخانەیە لە مامۆستا «محمد أفندي ابراهيم»ەوە فێری خەتی ثلث و جەلی ثلث و رووقعە بوو. هەروەها خەتی ثلث و نسخ و فارسی و دیوانیی لە مامۆستای بە ناوبانگ «عەبدولعەزیز روفاعی» وەرگرت، لەگەڵ فێربوونی هونەری نەخش و نیگاردا «فن الزخرفة والتذهيب».

ساڵی ١٩٢٥ لەو قوتابخانەیە «دبلوم»ی پێ بە خشرا. دوای ئەوە گەڕایەوە. لە مەککە کرا بە پسپۆری مەحکەمەی شەرعی بۆ تێروانینی ئەو نووسین و ئیمزا ساختانەی دەهاتە بەردەم مەحکەمە. ساڵی ١٩٣٠ کرابە مامۆستای خەت لە قوتابخانەی الفلاح و چوار ساڵ تێیدا مایەوە. لەو ماوەیەدا توانیی نامیلکەیەکی خەتی ڕوقعە لە ٧ بەشدا دابنێ و، چاپ کرا.

ساڵی ١٩٣٤ دەستی کرد بە دانانی کتێبێك لەبارەی خەتی عەرەبی و ژیانامەی ئەو خۆشنووسانەوە کە لەکۆنەوە خزمەتی ئەم هونەرەیان کردووە. بۆ ئەم مەبەستە چووبۆ قاهیرەو سێ ساڵێك لەوێ مایەوە. ساڵی ١٩٣٩ کتێبەکەی بەناوی «تأريخ الخط العربي وآدابه» چاپ کردو، گەڕایەوە بۆمەککە. هەر لەو ڕۆژانەدا سیپارەیەکی بۆ فێرکردنی خەتی نسخ و ثلث داناو، چاپی کرد. هەروەها نامیلکەیەکی (خەتی نسخ)ی لە دوو بەشدا نووسی و، وەزارەتی مەعاریفی سعوودی چاپی کردو، بڕیاری خوێندنی لە قوتابخانەکاندا دا. ئەم خۆشنووسە لەنووسینی وردا دەستێکی یەکجار باڵای هەبوو، لەوانە سورەتی «الاخلاص»ی لەسەر دەنکە گەنمێك نووسیوە.[11] هەروەها لەسەر کرۆکی دەنکی ئورزی لوبنانی سورەتی «قل اعوذ برب الناس»ی نووسیوە لەسەر هێلکەیەك سورەتی «یاسین»ی نووسیوە.

نموونەی نووسینێکی .لەم شێوە بە خەتی دیوانی جەلی کە مەلا علی بە صابر ناسراو ساڵی ١٣٥٦ز نووسیویەتی و تاکە هەڵبەستێکە:

**ما في زمانك من ترجو مودته**

**ولا صديق اذا جار الزمان وفا**

+ دێڕێك لە بەشی سەرەوەی دەرگای مزگەوتی «اصفية»ی نێزیك پردی «الشهداء» هەروەها نووسینێك بەخەتی «ثلث» لەسەر میحرابەکەی «أشرف العبادة الأخلاص»

+ لە جوانترین نووسینەکانی دێڕێك بەدەوری گۆڕی «ئیمام ئەبی حەنیفە» - خوالێی ڕازی بێ - کە بریتییە لە دێڕێك بە خەتی - ثلث - لەگەڵ ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگاری مەزن. لەساڵی ١٣٤٧ی کۆچیدا نووسیویە.

+ ساڵی ١٩٣١ی زایینی بە دووپارچە نووسین بەشداریی پێشانگەی بەغدای کردووە کە لە «باخچەی پێشانگە» کرایەوە. یەکەمیان «آية الكرسي» بوو بەخەتی ثلث نووسیبووی، دووەمیان «العدل أساس الملك». ئەم دووپارچەیە «مەلیك فەیسەڵی یەکەم» هەڵیگرتن بۆ خۆی.

خوالێ خۆش بوو سابیر ڕۆژێك دەچێتە گەرماوی «پاشا» لەوێ قاچی هەڵدەخلیسکێ و دەکەوێ بەو ئازارەوە دەمێنێتەوە تالەساڵی ١٩٤١دا کۆچی دوایی دەکات و، لەگۆڕستانی «باب المعظم» نێژرا.

خوالێ خۆش بوو سابیر ٧٨ ساڵ ژیاوە. لەو ماوەیەدا خزمەتێکی باشی پێشکەش بەهونەری خۆشنووسی کردو ژمارەیەکی زۆر خۆشنووسی دی لاو لەلای پێگەیشتن و فێری نهێنییەکانی ئەم هونەرە بوون. لەکاتی خۆیدا دادگاکانیش پشتیان بەو دەبەست بۆ دۆزینەوەی نووسینی ساختەو گومان لێکراو.

ساڵی ١٩٣٤ لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز بووەوە کە نزیکەی ٤ ساڵێك خەریکی نووسینی بوو و ساڵی ١٩٥٠ چاپ کرا. [١٢]

لە ساڵی ١٩٤٦ دا سەری لەهەولێر داوە و لەماڵی «عبدالغفور چلبی» کە خاڵی بوو، ماوەتەوە. کە لە هەولێر بووە، چاوی بەخواڵی خۆش بوو گیوی موکریانی و محەممەد رەشاد موفتی کەوتوون. [١٣]

خواڵێ خۆش بوو محەممەد تاهیر کوردی لەگەڵ ئەوەدا کە خۆشنووسێکی کارامە و بەتوانا بوو، هەروەها لە شیعردانانەدا دەستێکی باڵای هەبووو لەم بوارە یشدا بەرهەمی زۆری هەن. ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کردو، لە مەککە بەخاك سپێردرا.

زۆر بەرهەمی چاپکراوو دەستنووسی لەپاش خۆی بەجێ هێشتوون. لە ساڵی ١٩٧٣دا حوکومەتی سعوودی بڕیاریدا هەموو بەرهەمەکانی چاپ بکات، بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەك بۆ هەڵسەنگاندنیان پێك هێنرا، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرهەمەکان زۆر بوون چاپ نەکران و لەجیاتی ئەوە پاداشتێکی نەقدی یان دایە، هەرچەندە بەم ئەنجامە زۆر دڵگران بوو و هەستی بەکەمی دەکرد. [١٤]

خواڵێ خۆش بوو ٥ کوڕ و ٥ کچی هەن هەروەها برایەکی بەنێوی مەککی کوردی یەوە هەیە. گەلێك خۆشنووس لای موحەممەد تاهیر کوردی ئیجازەنامەی خۆشنووسی یان وەرگرتووە، لەوانە یوسف ذولنون، وەلید ئەعزەمی، یەحیا سەلوم عەباسی، محەممەد ساڵح شێخ عەلی موصڵی و زۆری تر جگە لەوەی زۆری تر فێری خۆشنووسی بوون لەلای.

## مەجدی «ملك الكلام»
## ١٨٤٩ - ١٩٢٥

ناوی عەبدولمەجید کوڕی میرزا عەبدولکەریمە. [١٥] لە ساڵی ١٨٤٩ی زاییندا لەشاری سەقز لەکوردستانی ئێران لە دایك بووە. میرزا عەبدولکەریمی باوکی یەکێك بوو لە پیاوە ناودارەکانی شاری سەقز و لەڕووی ئایینی و کۆمەڵایەتی یەوە دەستەڵاتێکی گەورەی هەبوو. لەگەڵ ئەوەدا باوکی یەکێك بوو لە ـ خۆشنووسە هەرە ناودارەکانی ئێران. مەجدی سەرەتای خوێندنی لە حوجرەوە دەستی پێکرد. پاشان لەلای باوکی فێری خۆشنووسی بوو. پاش ساڵێك بەتەواوی خەتی فارسیی بەهەرسێ بەشەکەیەوە «تعليق، نستعليق، شكسته» فێربوو، بەجۆرێك خەتی ئەم و باوکی جیانەدەکرانەوە.

ساڵی ١٨٧٧ی زایین بەبیا نووی چوون بۆحەجەوە شاری سەقزی بەجێ هێشت و، ڕووی کردە شاری سنە. ساڵی ١٨٧٩ لە سنە ژنی هێناو، لەساڵی ١٨٨٦دا لەگەڵ خێزانەکەیدا چوون بۆ حەج. لەڕێگەی حەج، چاوی بەشاعیری ناودار «مفتی زەهاوی» کەوت. پاش گەڕانەوە لەحەج ڕووی کردە تاران و لە قوتابخانەی «دار الفنون» کرا بە مامۆستای خەتی فارسی. لەئیشەکەیدا مایەوە، تاکوو ساڵی ١٩٢٥ی زایین کۆچی دوایی کرد.

مەجدی هەروەکو چۆن خۆشنووسێکی دەست ڕەنگین بوو، لەگەڵیدا شاعیرێکی بە توانایش بوو. ئەم دوو هونەرە ناوبانگێکی باشیان بۆپەیدا کردبوو. مەلیکی ئینگلستان خەتی مەجدیی زۆر بەلاوە پەسندبوو. ئەم ناوبانگە زۆرەی وای کرد لە شای ئەوکاتەی ئێران «ناصرالدين» لە کۆنگرەیەکی ئەدەبیدا نازناوی «ملك الكلام» یان لە پاداشتی ئەو ناوبانگە ئەدەبی و هونەری یەی کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا هەیبوو، پێ بەخشێ.

مامۆستای خواڵێ خۆش بوو عەلادین سەجادی لە کتێبە بەنرخەکەیدا «مێژووی ئەدەبی کوردی» بەدرێژی باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەم خۆشنووسە شاعیرەی کردووە. هەروەها دوو پارچەی لە شیعرەکانی کە بە کوردین بڵاوکردووەتەوە

## مەلا ئەمین
## ١٨٦٤ - ١٩٧٤

«ناوی تەواوی محەممەد ئەمین کوڕی محەممەد مستەفا کوڕی مەولوودە. لە دەوروبەری ساڵانی ١٨٦٤ - ١٨٦٩ لە کۆیە لەدایك بووە» [١٦] لە منداڵیدا خرایە حوجرە بۆ فێر بوونی نووسین و خوێندنەوە. هەر لەحوجرە ناسیاویی لەگەڵ مەلا عەبدولرەحمان ناوێك، کە خەڵکی کوردستانی ئەودیو بوو، پەیدا کرد لە خەتی فارسیدا شارەزایی یەکی باشی هەبوو.

باوکی مەلا ئەمین خەریکی دروست کردنی خەنجەر و شیر و تیژکردنەوەی چەقۆو شتی لەم بابەتە بوو. مەلا ئەمین یش لەباوکیەوە فێری هەڵکەندن لەسەر شتی ڕەق بوو. لە ڕۆژەکانی سەفەربەردا هەرچەندە ئەم قوتابی یەکی ئایینی بوو، بەڵام گیرا بە سەربازو، ڕەوانەی بەرەی شەڕکرا لە بەسرەو، لە سەربازگە کرا بە مامۆستای ئایینی و پاشتریش گێردرایەوە بۆعەمارە. لەو ماوەیەدا بە بەردەوامی خەریکی مۆرهەڵکەندن بوو. ساڵی ١٩١٦ هات بۆ بەغداو،

لەسەر شۆستەی شەقامی موستەنسریە نیزیك مەحكەمەی شەرعی فەرشێكی بچكۆلانەی ڕاخستبوو، لەوێدا خەریكی مۆرهەڵكەندن بوو. ماوەیەك لەم شوێنە مایەوە پاشان گواستیەوە بۆ بازاڕی «المصبغة» ولەوێ نووسینگەیەكی بچكۆلانەی كردەوە، تاوەكوو كۆچی دوایی كرد هەر لەوێ كاری دەكرد.

مەلا ئەمین زۆر گرنگیی دەدا بەخەتی فارسی «تەعلیق»وتێیدا پێش كەوت، بەبەردەوامی لاسایی نووسینی خۆشنووسە گەورەكانی فارسی دەكردەوە، لەوانەیش «عماد حسنی، زرین خط» هەروەها نووسینەكانی خۆشنووسی تورك «یمني»ی پەسند دەكردو، لاسایی دەكردنەوەو، لە زۆر تابلۆیشدا ناوی «محمد أمين يمني»ی لێ‌دەنووسی و بەم ناوبانگە لە نێو خەڵكدا ناسرا.

«ساڵی ١٩٣٥ی زایینی چوو بۆ سوریاو، چاوی بە خۆشنووسی ناودار «ممدوح» كەوت. لەوەوە فێری خەتی كوفی بوو، پاشان چوو بۆ لوبنان و، چاوی بە خۆشنووسی بەناوبانگ «نسيب مكارم» كەوت، لە میشەوە فێری چۆنیەتی هەڵكەندنی مۆر لەسەر لاستیك بوو. خواڵێ خۆش بوو مەلا ئەمین یەكەمین كەسێكە كە پیشەسازیی مۆرهەڵكەندنی لەسەر لاستیكی هێنایە عێراقەوە.»[١٧]

ماوەی ساڵێك بە خۆشنووس لە «مديرية المساحة العامة» دامەزرا. دوای ئەوە وازی هێناو، لە نووسینگەكەی ئیشی دەكرد. لەكاتی خوێدا چونكە تەنها خۆشنووس بوو لە بەغدادا دادگاكان پشتیان بەو دەبەست بۆ تێروانینی نووسینی ساختەو گومان لێكراو.

مەلا ئەمین لە ساڵانی كۆتایی ژیانیدا چاوی كزبوو بوو، بەڵام هەر دەچوە نووسینگەكەی تا لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٧٤ی زایینیدا كۆچی دوایی كردوو، لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەكەیان بردەوە بۆ كۆیەو، لەوێ بەخاك سپێردرا.

خواڵێ خۆش بوو مەلا ئەمین ژمارەیەك نووسینی لە پاش بەجێ ماوە كە هێندیك لەوانە بەخوێنەران دەناسێنین. نووسینی ناونیشانی ڕۆژنامەی «الوقائع العراقية» بەخەتی كوفی، هەروەها ناونیشانی ڕۆژنامەكانی «اليقين» الارشاد، تنوير ألافكار» بەخەتی ثلث. لەبواری ڕۆژنامەگەریی كوردیدا ناونیشانی گۆڤاری گەلاوێژ ودیوانی سالم وشیعرو ئەدەبیاتی كوردی‌وزۆری تریشی بەخەتی فارسی نووسیون.

ژمارەیەك لە تابلۆ هونەرییەكانی مەلا ئەمین لەكتێبی «بدائع الخط العربي»و «مصور الخط العربي»دا بڵاوكراونەتەوە.

## رۆشنبیری گشتی

### شێخ لەتیفی دانساز
### ١٨٨٦ - ١٩٤٨

ناوی شێخ عەبدوللەتیف كوڕی شێخ عەبدولكەریم كوڕی شێخ عەبدولقادری موهاجیرە، لەساڵی ١٨٨٦ - ١٨٨٧دا لە شاری سلێمانی لەدایك بووە. «لەحەوت ساڵیدا باوكی كۆچی دوایی دەكات و، مامێكی بەناوی شێخ نەسیمەوە دەیباتە لای خۆی و، پەروەردەكردنی دەگرێتە ئەستۆ. شێخ نەسیم كە مامۆستا بوو لای مەحموود پاشای جاف، فێری خوێندنەوەی قورئان و نووسینی دەكات. پاشان بۆ خوێندن دەچێتە كەركووك، لای مەلا مەحموودی مەزناوی ئالانی درێژە بە خوێندن دەدات و،[١٨] دەگەڕێتەوە سلێمانی و، لەو مزگەوتەی كەباوكی لێ‌بوو دەیخوێند، تاكوو ئیجازەنامەی مەلایەتی وەردەگرێت. پاش ئەمە دەچێت بۆ شاری سنەو، لەوێ (لەقوتابخانەیەكی ئەوێ) دەكرێتە مامۆستای خەتی فارسی پاش ماوەیەكی كەم دەگەڕێتەوە بۆ سلیمانی و، ئەوەندە پێ ناچێ



چەند نموونەیەكی خەتی شێخ لەتیفی دانساز

شەڕی یەكەمی جیهانی بەرپا دەبێ، حوكوومەتی عوسمانی فەرمانی ڕەش بگیر دەردەكات. ئەمیش ناچێتە سەربازی‌و لە سلێمانی خۆدەشارێتەوەو بەمۆرهەڵكەندن و دروست كردنی چەقۆی بچووكەوە خەریك دەبێ‌و، بەدەرامەتی ئەوەوە دەژی.

هەر لەم كاتەدا قاڵبێكی دروست كرد بۆدروست كردنی لیرەی عوسمانی‌و، تا ئێستایش ئەوقاڵبە لای كوڕەكانی ماوە. لە مارتی ١٩٣٢دا،[١٩] كاتێك فڕۆكەكانی ئینگلیز شاری سلێمانی‌یان

## روشنبیری گشتی

بۆردومـــان کرد، روربـــەی خەڵکی شار لە شار هەڵاتن و چوونـــە گونـــدەکـانی دەورو پشت. شیـخ لەتیف یش چوو بۆ بیـارەو، لای شێخەکانی بیارە مایەوەو، ڕێزێکی زۆری لێ دەگیرا.

هەر لەبیـارە، لەدانسـازێکـەوە کەهـاتبـوو تاقمی ددان بۆ شیـخ عەلادینی بیـارە بکـات، فێـری دانسـازی بووو، کردیـە پیشـەی سەرەکیی خۆیو، نازناوی شیخ لەتیفی دانسـازی بەسەردا بردرا.

شیـــخ لەتیف لە زۆر هونـــەردا دەست ڕەنگین وشارەزابـوو. لە بواری خۆشنـــووسیـدا دەستێکی یەکجار باڵای هەبـوو، لەخـەتی فارسی «تەعلیق»دا ئەو نووسینانەی کەئێستایش ماون لەدواپلەی جوانیدان.

هەروەهـــا لە چاکـــردنـــەوەی سەعـــاتـدا یەکجار کارامـە بوو. سەعـــاتێکی لە تەختـــە دروست کرد بووبەبـــاشی ئیشی دەکـــرد هەروەهـــا مقـەستێکی تایبـەتی دروست کرد بووبۆبرینی پارچـەی سەعـات ولەسـەری نووسیبـوو «صنـع عبـداللطیف ـ کردستان».

مێجـەرسۆنی حاکمی سیاسی ئینگلیز زووززوو سەری لەدوکانەکەی دەداو، ئامـادەیی خۆیی پێشـان دا کەلەسەر حسێبی دەوڵەت بینێرن بۆلەندەن بۆ ئەوەی فێری شتی باشتر بیێ، بەڵام خۆی ڕازی نەبوو.

هەروەهـا لە چەخمـاخ سازیـدا یەکجار بەدەستەلات بوو، پێنج تفـەنگی دروست کرد بوو، یەکێکیـان لە شێـوەی قامچیـدا بووکە پێشکـەشی مەلیـــك فەیســـەلی یەکـەمی کردبـوو، لە پاشمـاوەی ئەوفـرۆکـەیـە دروستی کردبوو کەلەکاتی شۆڕشی شیخ مەحموودی نەمردا لە سلێمانی کەوتبوە خوارەوە.[20]

ئەمـەولـەبـواری دارتـاشیو ئاسنگـەریو میکـانیك و نوژداریی میللیـــدا دەستێکی باڵای هەبـــوە. هەروەهـــا لە ڕێکخستنی باخ و ناشتنی دار و گوڵـدا بەنـاوبـانـگ بوو، باخـەکـەی شیـخ لەتیف کە دەکـەوێتـە لای گەرەکی خەبـاتی ئێستاو بەتەنیشت خانوەکەیەوە بوو یەکجار خۆش و دڵفرێن و بەناوبانگ بوو.

هونـەرمـەندی گەورەمان شیخ لەتیف لە ڕێکەوتی ١٨ی مایسی ١٩٤٨دا فەرمانی یەزدان بەجێ دەهێنێو کۆچی دوایی دەکات و لە گردیء سەیـوان بەخـاك سپێـردرا لەدوای خۆی چەند کوری لەپاش بەجێ ماون، لەوانە شیخ عبداللهی دانساز ئێستا لەشەقامی کاوە بە (دانســازییەوە) خەریکە، دکتۆر سەعید ئەمیش دوکتۆری ددانە لە سلیمـانیو، شارەزایی لە خۆشنـووسیـدا هەیـە، هەروەهـا شیـخ عوسمان ئەمیش شارەزایی یەکی باشی لە خۆشنووسیدا هەیە لەگەڵ شیخ بابە عەلیو شیخ فاررووق.

### ئەحمەد قەرە حەسـری
### ١٤٦٨ ـ ١٥٥٥

«مـــەلا شەمسی بیـــرقـەرە حەســر کەنـــســراوبـوو بە ئەحمەد قەرەحـــەســـری ساڵـی ١٤٦٨ی زایـیـن «٨٧٣ی کۆچی» شـاری قەرەحەسار لەدایك بووە. لەسەردەمی خۆشنووسی ناودار «حمدالله الأماسي» دا ژیاوەو، دەڵێن ئەو ئیجازەنامەی خۆشنووسیی داوەتێ» هەروەهـا بۆ فێـربوونی خۆشنووسی سوودی لە خۆشنووس «أسدالله الكـرمـاني» وەرگرتووەکە لە فێرکردنی خەتدا لەسەر ڕێرەوی «یاقوت المستعصمي» دەڕۆیشت.[21] ئەم بلیمـەتـە لەو شێـوە جیاوازانەی خۆشنـــووسی، کە لای چەنـد مامـۆستایەك فێربووبوو، شێوازێکی تایبـەتی بۆخۆ هەڵبـژارد کە جیـاوازیی هەبـوو لەگـەڵ ئەو شێوازەی «شیـخ حمـدالله» بەکاری دەهێنا. لەوانەی لای مەلا ئەحمەد فێری خۆشنـــووسی بوون: دەروێش محـــەمـــەد چەلـــەبی، ئیبـــراهیم حەسەن، محیّ دین خەلیفە، فەرهاد پاشـو سلیمان حیجازی.

«مـەلا ئەحمـەد لەژیـانیـدا فەرمـانـڕەوایی چوار سوڵتانی بینیوە کەئـەمـانـەن: سوڵتـان بایـەزیـد، سوڵتـان فاتـح، سوڵتـان یاووز سەلیم خان و سوڵتان سـلێمانی قانونی»

لە تەمـــەنـی ٩٠ ساڵـیو لەســـاڵی ١٥٥٥ی زایین دا «٩٦٣ی کۆچـی» کۆچـی دوایی کردو کێلی گۆڕەکـــەی خۆیشی پێش مردن بەدەستی خۆی نووسیبوو، تەنیا ساڵی مردنەکەیی نەنووسیبوو.

لە پاشماوەی نووسـینەکانی:

نووسینی مزگـەوتی «سلێمانی» لەئەستەموول کە ماوەیەك بەر لە مردنی نووسیویە. هەروەها قورئانی پیرۆزی بەخەتی نسخ نووسیـوەو[22] بۆ زیاتر جوانکردنی ئایەتەکان خەتی «المحقق»یشی تێـدا بەکـارهێناوە. هەر بۆخۆیشی نەخشی کردوون و، پێشکەشی سوڵتـــان سلێـمـــانـی قانـــوونـیـی کردووە. هەروەهـــا سورەتـی «الاخلاص»ی لەگەڵ بسمیلا بەخەتی «کوفی مربع» نووسیوە کە لە دوا پلەی جوانیدایە.

### «حاجی سەلیم جزیری»
### ١٨٩٧ ـ ١٩٤٧

ناوی حاجـــی سەلـــیـم کوری حاجـی ئەحـمـــەد کوری مەلا محەممەدی دۆستی یە.[23] ساڵی ١٨٩٧ی زایین لە جزیرەی بۆتان لەدایـك بووە. لە منداڵیدا خرایە بەرخوێندن، لای مەلا ئیسماعیل ساڵـح فێـری خوێنـدنـەوەو نووسین بوو. هەر لەم سەردەمەدا فێری

مۆرهەڵکەندن بوو. لەگەڵ ئەمەدا یارمەتیی باوکی دەدا کە بە کەبابچێتی یەوە خەریك بوو.

لە هەرەتی لاویدا بووکە چووبۆزاخۆ لەوێ لای «یوسف» ناوێك فێری زێرنگەری بوو. لەوێوە سەری لەموصل داو، بەباشی لە زێرنگەریدا شارەزایی پەیدا کردوە، ساڵی ١٩٢٠ گەڕایەوە بۆ جزیرەو، دووکانێکی زێرنگەریی کردەوە. ماوەیەك بەردەوام بوو لەکارەکەیدا، پاشان لەگەڵ کەسوکاری چوون بۆشام و، دوو ساڵێك لەوێ مانەوەو، دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ جزیرە.

لە بواری خۆشنووسیدا حاجی سەلیم زۆر کارامەوەدەست ڕەنگین بوو. لەوکەسانەی کە حاجی سەلیم لێیانەوە فێری

## عەبدولرەحمانی فندکی
## ١٩٣١ - ١٩٨٦

خۆشنووسی بووە مەلابرایمی بەرخو، مەلا محەممەد بەشیر، حسەین ئەفەندی وحاجی عەلیی جانگیر.

لەو کەسانەیش کە لە حاجی سەلیمەوە فێری خۆشنووسی بوون مەلا عومەری ئەروهی و خۆشنووسی ناودار عەبدولرەحمان فندکی.

لەپاشماوەی نووسینەکانی :

چەند جارێك دیوانی شاعیری ناوداری کورد مەلای جزیری بەخەتی فارسی نووسیووە کە دانەیەکیان لای حاجی عەبدولرەحمانی جزیریی کوڕیەتی. هەروەها مەولوودنامەی «ابن حجر العربي»ی بەخەتی نسخ نووسیوە.

حاجی سەلیم ساڵی ١٩٤٧ لەتەمەنی ٥٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردو لەجزیرە بەخاك سپێردرا.

ناوی تەواوی عەبدولرەحمان کوڕی [illegible] عەلی ئەرزەنی فندکییە، ساڵی ١٩٣١ لەجزیرە لەدایك بووە، لەمنداڵییەوە لای باوکی فێری نووسین وخوێندنەوە بوو، هەر لای ئەویش تەواوی کردو، ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرت. هەر لەسەرەتای خوێندنەوە ئارەزووی خۆشنووسی هەبوو، بە[illegible] کردنی حەزەکەشی پێوەندیی کرد بە خۆشنووسی ناودار حاجی سەلیم جزیری یەوەو لەوەوە فێری خۆشنووسی بووە، زۆریش مەشقی دەکرد. تاکو دەستەکەی جوان بوو، بووە یەکێك لە خۆشنووسە ناودارەکانی ناوچەکەی.

ئەم زاتە هەر بەئیجازەی مەلایەتی یەوە نەوەستا بەڵکو لە تاقی کردنەوەی قوتابیانی بەشداری کردو، بڕوانامەی سەرەتایی و ناوەندی وئامادەیی وەرگرت. ویستی بچێت بۆخوێندنی زانکۆ، بەڵام (لەبەر بارێکی تایبەتی خۆی) نەیتوانی بەردەوام بێ، کرا بە موفتیی یەکێك لەقەزاکان و، دوایش گوێزرایەوە بۆ شاری جزیرە.

خواڵێخۆش بووعەبدولرەحمانی فندکی لەش ولارێکی وەرزشیی بەهێزی هەبوو. لە زۆرانبازیدا شارەزا بوو. بەدگمەن کەسێك هەبوو کەبتوانێ لەم بوارەدا شان بدات لەشانی.

خواڵێخۆش بوو لەدەورووبەری ساڵی ١٩٨٦دا (دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی دڵ بوو) کۆچی دوایی کرد، لە جزیرە بەخاك سپێردرا.[٢٤]

فندك :- باووباپیریان لە ناوچەی «ئەرزن»ەوە هاتوون کە دەکەوێتە بەشی سەرووی ویلایەتی سێرت «سعرت»ەوە لە کوردستانی تورکیا. لەبەر ئەمەیەکە بە ئەرزن ناودەبرێت.

لەم فندکیانە ژمارەیەکی زۆر زاناو ناودار هەڵکەوتوون، لەوانە: شیخ حەسەنی فندکی کە لەزانا بەناوبانگەکانی بۆتانەو ساڵی ١٩٣٠ - ١٩٣١ کۆچی دوایی کردووە.

کوڕەکەیشی مەلا ئەحمەد، کە لە سەرەتای شەستەکاندا کۆچی دوایی کردووە، لەزانا ناودارەکانی فندکەو، کتێبێکی لەبارەی «فقه»وە هەیە. سەید عەلیی باوکی مەلا عەبدولرەحمان زاناو شاعیر بووە، لای شیخ حەسەنی فندکی و مەلاحسێنی گچك ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و، مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف دانەیێك دیوانەکەیی هەیە کە محەممەدی کوڕی نووسیویەتی. سەید عەلی ساڵی ١٩٦٨ی زایین کۆچی دوایی کردووەو، شیعرەکانی لەناو خەڵکیدا زۆر بڵاون.

## مەلا ئەحمەد ئەولیائی
## ١٨٦٠ - ١٩٦٥

«مەلا ئەحمەد ساڵی ١٨٦٠ی زایین لەگوندی «بەردەر» کە دەکەوێتە خۆراوای شاری باژگیران لە نیزیك سنووری ئێران - ڕووسیا لەدایك بووە. لەمنداڵیدا خراوەتە حوجرەو فێری خوێندن و نووسین بووەو، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو، ئەوجا دەستی کردووە بە دەرس دانەوەو سەدان کەس لەلای ئەو پێگەیشتوون.[٢٥]

مەلا ئەحمەد خەڵکی ئەم گوندەبوو، پیاوێکی زاناو خۆشنووسێکی بێوێنە بوو. هەمیشە جل و بەرگی کوردیی لەبەر دەکردو، وەکو زۆربەی پیرەمێردانی لای خۆمان پەستەکی لەشان دەکرد.

مەلا ئەحمەد کاری کشتوکاڵ وئاژەڵداریی دەکردو، بەرەنجی شانی خۆی دەژ یاو، تاکو کۆچی.دوایی کرد بەردەوام بوو لەکاری کشتوکاڵیداو، لەشێکی ساخ وپتەوی هەبوو. خواڵێخۆش بوو

قورئـانی بەتـەواوی ئەبـەربـووو، لەناوچەی خۆراساندا کەم کەس هەبوو لە تەفسیرو لێکدانەوەی قورئانی پیرۆزدا بتوانێ شان لە شانی بدات. زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی «مەولانای رۆمی»ی لەبەر بوو، بە دەنگێکی خۆش لە ئاهەنگە ئایینیەکاندا دەیگوتن.

مەلا ئەحمەد چەنـد جارێـك قورئـانی پیـرۆزی بەخەتی نسخ نووسیـووەو، لەنـاوچـەی سەرسنـووردا بلاون و، بە دەست خەلکەوەن یادگارێکی جوان و بێ وێنەن.

ماوەیەك بەرلەمردنی و لە چاوپێ کەوتنێکی رۆژنامە نووسی دا لە بارەی خۆشنـووسی یـەوە گوتـوویـە: «بـەدیتنی خەتی خۆش هیچ خەمێکم نامێنێ». لەبارەی جوانترین نووسینەکانیەوەیش گوتوویە: «ئەوانەن کە قورئانی پیرۆزم پێ نووسیوە».

مەلا ئەحمەد زۆر هۆگـری خوێنـدنـەوە بووو، رۆژانە کتێبێکی دەخـوێنـدەوەو، شارەزایی باشی لەزمانی عەرەبی وفارسیدا هەبووە سالـی ۱۹٦٥ لە تەمـەنـی ۱۰٥ سالێـدا کۆچی دوایی کردو، لە گوندەکەی خۆی بەخاك سپێردرا.

## سەید موحسین
## ۱۹۲۱ - ۱۹۷۷

سەید موحسین سەید سەمین سالی ۱۹۲۱ لە دووزخورماتوو لە خێزانێکی جوتیاری هەژاردا لەدایك بووە. لەشەش سالیدا خراوەتە قوتـابخـانـەو، لەبەر کەم دەرامەتی خێزانەکەی و مردنی باوکی هەر پلەی سەرەتایی بۆتەواو کراوە. دوای ئەمە خەریکی ئیش وکار بوو لە کێلگـەکـەیـانـدا لە شوێنی باوکی. لە ناوەراستی سی یـەکـانـدا گوزەرانـیـان تۆزێ باش بوو، درێـژەی بە خوێـنـدن دا لە «دار المعلمین الـریفي» وسـالـی ۱۹٤۰ تەواوی کردو کرا بە مامـۆستا لە قەلادزەو، پاشـان گوێـزرایـەوە بۆبنگردو هەلبجەوسەرچنار. پاشان لەشاری سلێمانی جێگیر کرا.

سالـی ۱۹٦۷ گوێـزرایـەوە بۆبەرێـوەبـەرێتیـی چالاکیی قوتـابخانەکان و، لەوێ کرا بە سەرپەرشتیاری بەشی خۆشنووسی و نەخش ونیگار. تاکو سالی ۱۹۷۰ کە خانەنشین کرا لەوێ مایەوەو چەندین خولی خۆشنووسی کە چالاکیی قوتابخانەکان دەیکردنەوە، لەلایـەن مامۆستا «سەید موحسین»ەوە بەرێوە دەبراو، دەیان قوتابیی زرنـگ لەلای فێـری خۆشنـووسی بوون. دوای ئەوەی خانـەنشین کرا، لەشـەقامی چوارباخ نووسینگەیەکی خۆشنووسی کردەوە، کە برێتی بوو لەدوکـانێکی بچـووك هەموو جۆرە کارێکی خۆشنووسی تێدا دەکرد.

هەرگیز ئەوەدەمانەم لەیاد ناچن کە ئەوکاتە مندال بووم و، رۆژانە چەند دەچوومە بەردەمی دوکانەکەی و، لەنێزیکەوە سەیری دەست و پەنجـەی سیحـراویی مامـۆستـام دەکـرد، کاتێـك تابلۆیـەك یاخود هەرشتێکی تری دەنـووسی و، درێـژەم بەم وەستانەم دەداو، ئەویش لەژێـرەوە بەلایەکی چاو سەیری دەکرد نەوەکوو وەك هێندێك مندال دەست بەرم بۆئیشـەکـانی. کە ئەمـەم دەبینی شەرمم دەکـردو، تۆزێـك ئەونـاوەم بەجێ دەهێشت، پاش کەمێـك دەگەرامەوە تاکوو ئارەزووی خۆم بەو نووسینە جوانانە تێربکەم و، لە مێشکمدا وێنەی بکێشم تاکوو لە مالەوە بە لاساییانەوە خەریك بم.



خۆشنووس سەید موحسین



آیة الكرسي
بەخەتی ثلث نووسیویە



تابلۆیەك بەخەتی دیوانی

مامۆستای بەناوبانگ سەید موحسین لە ڕێکەوتی ١٩ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ دڵی لەلێدان کەوت و، چووە خانەی نەمرانەوەو، لەگردی سەیوان لەنیزیك نزرگەی (شێخ مارفی نۆ دێ)ەوە بەخاك سپێردرا.

سەید موحسین یەکێکە لەو خۆشنووسە ناودارانەی کە هەر لەمنداڵیەوە بەم هونەرە ئاشنابوو بووو، بەبلیمەتی خۆی توانی ببێتە یەکێك لە ناودارەکانی هونەری خۆشنووسی. لەگەڵ ئەوەی لەبواری خۆشنووسیدا کارامەو لێهاتوو بوو، لە بواری لێکۆڵینەوەی مێژ ووی ئەم هونەرەیشدا دەستێکی باڵای هەبوو. چەند باس و لێکۆڵینەوەی هەبوو کاتی خۆی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی زانکۆکە لە سلێمانی بوو چەند کۆڕێکی بۆ ڕێك خست و هێندێکیانی لێ پێشکەش بەجەماوەر کرد.

خواڵێ خۆش بوو سەید موحسین ژمارەیەك تابلۆی هونەری لەپاش بەجێ ماون کەلەدواپلەی جوانیدان، لەوانە «آیة الکرسي» کە بەخەتی ثلث نووسیویە لە شێوەی بازنەداو، لاسایی خۆشنووسی لوبنانی «أدیب نشابە»ی کردووەتەوە. هەروەها لەسەر ئاوێنەو شووشەکە قوماشی تێ گیراوە زۆر ئایەت و حەدیسی نووسیون.

لەخەتی ڕوقعەدا کەخاوەنی داهێنانێکی تازەبوو تێیداو، جوانکارییەکی تازەی خستبوە سەر ئەم خەتە، زۆر نووسینی لەپاش بەجێ ماوە لەوانە «مصلحة المبایعات الحکومیة»، «اعدادیة السلیمانیة للبنات» هەروەها «شرکة المخازن العراقیة - اورروزدي باك» بەخەتی کوفی و ڕوقعە نووسیویە ئەمانەو دەیان تابلۆی جوانیتر کە بریتین لە ئایەت وحەدیس وگوتەی ناوداران وپەندو هۆنراوە کە بە جوانترین شێوە نووسیونی.(٢٦)

## پەراوێز سەرچاوەکان

١ - حافظ عثمان ساڵی ١٦٤٢ی لەدایك بووە ساڵی ١٦٩٨ کۆچی دوایی کردووە.

٢ - مصطفی راقم، برای خۆشنووسی ناودار اسماعیل زهدی‌یە.

٣ - محمد نظیف ساڵی ١٨٤٦ی زایین لەدایك بووە ساڵی ١٩١٣ کۆچی دوایی کردووە.

٤ - طوغرا یان «توررە» نیشانەیەکی تایبەت بوو. چەند خەلیفەو سوڵتانێك بۆ ناوی خۆیانیان بەکاردەهێنا.

دەڵێن کاتێك نێوانی «تەیمور لەنگ»ی سوڵتانی مەغۆلی و سوڵتان بایەزیدی عوسمانی لە ساڵی ٧٩٢ دا تێك دەچێ، تەیمور لەنگ نامەیەکی هەڕەشە بۆ سوڵتان بایەزید دەنێرێ و، بەدەستی خوێناویی خۆی ئیمزای دەکات و، دوایی کارەکە بەوە تەواو دەبێ کە هێرش دەباتە سەر دەوڵەتی عوسمانی و داگیری دەکات و سوڵتانیش بەدیل دەگرێ.

ئەو نامەیەی تەیمور لەنگ کە پەنجەکانی دەستی تێدا دیار بوون، بووە بنەرەتێك بۆ ئەم خەتی طوغرایە.

٥ - ئەم پێشبرکێیە ساڵی ١٩٨٦ لە ئەستەموول بۆ ڕێزلێنان لە حامید ئامەدی کە دوا خۆشنووسی بەتوانای چەرخی بیستەم بووو بەناوی ئەویشەوە لەلایەن ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییەوە سازدراو، ٣٥٢ خۆشنووس لە ٣٢ دەوڵەت بەشدارییان تێداکرد.

٦ - تراجم خطاطي بغداد المعاصرین. ولید الاعظمي بیروت ١٩٧٧.

٧ - هەمان سەرچاوە.

٨ - خۆشنووسی ناودار عەزیز روفاعی ساڵی ١٨٧٢ی زایین لە تورکیا لە دایك بووە، شارەزاییی تەواوی لە دوازدە جۆری خەتدا هەبووە. دوای ئەوەی قورئانێکی بۆ مەلیك فوئادی یەکەم نووسی، ڕێزی زۆری لێ نراو لەسەر داوای مەلیك فوئاد قوتابخانەی پەرەپێدانی خەتی عەرەبی «مدرسة تحسین الخطوط العربیة» لە قاهیرە کرایەوەو ئەوی کرا بە مامۆستا ساڵی ١٩٣٤ لەتەمەنی ٥٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٩ - مەلا عەلی فەزڵی ساڵی ١٨٩٧ لەدایك بووە و ساڵی ١٩٤٨ کۆچی کردووە.

١٠ - نووسینی سەردەرگای ئەم مزگەوتە حاجی سابیر لەساڵی ١٣٣٢ی کۆچیدا نووسیوویەتی. بەڵام لەساڵی ١٩٧٠ی زاییندا سەرلەنوێ تازە کرایەوە و خۆشنووسی ناودار سەلاح شێرزاد نووسییەوە.

١١ - ڕۆژنامەی العراق ژمارە ٢٩٣٦ی ڕۆژی ٢٨/٩/١٩٨٥

١٢ - هەمان سەرچاوە.

١٣ ـ گۆڤاری کاروان ژماره ٤٥ .

١٤ ـ رۆژنامەی العراق ژماره ١٥٣٦ی رۆژی ٢/٣/١٩٨١ .

١٥ ـ ژیانی ئەم شاعیره خۆشنووسه بەدرێژی لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی»ی مامۆستای خوالێ خۆش بوو «عەلادین سەجادی»دا بلاوکراوەتەوەو من لەم بارەوە سوودم لێ وەرگرتووە .

١٦ ـ تراجم خطاطي بغدادالمعاصرين . وليد الاعظمي .

١٧ ـ هەمان سەرچاوە .

١٨ ـ ئەم زانیاریانەم لە مامۆستای مێژوونووس عەبدولرەقیب یووسف وەرگرتوون .

١٩ ـ هاوکاری ژماره ٢٢٤ی رۆژی ٢٨ . ٦ . ١٩٧٤ .

٢٠ ـ ئەم زانیاریەیشم هەر لە مامۆستا عەبدولرەقیب یووسف وەرگرتووە .

٢١ ـ مصور الخط العربي . ناجي زين الدين المصرف . بغداد ١٩٦٨

٢٢ ـ هەمان سەرچاوە .

٢٣ ـ درێژەی ژیانی ئەم خۆشنووسەم لە مامۆستا عەبدولرەقیب وەرگرتووە .

٢٤ ـ هەمان سەرچاوە .

٢٥ ـ رۆژنامەی العراق ژماره ٣٥٦٥ی رۆژی ١٣/١٠/١٩٨٧

٢٦ ـ رۆژنامەی العراق ژماره ٣١٣٤ی رۆژی ١٠/٥/١٩٨٦ .

# خطاطون كرد أسدوا خدمات جليلة للخط العربي

أحمد سعيد

إهتم العرب منذ بزوغ فجر الاسلام بالخطّ العربي وتمكنوا من ايجاد انواع مختلفة من الخط كـ(الثلث) النّسخ ، الديوان ، ديوان الجلي وغيرها . . . ) وتفننوا في حفر آيات قرآنية كريمة على جدران الجوامع والمساجد وعلى القبب والمنائر .

كما برز اشهر الخطاطين كل من (الحافظ عثمان وحامد الآمدي وهاشم الخطاط) بكتابة المصحف الشريف بخط بديع يليق بمنزلة آيات الذكر الحكيم .

أما الكرد فمنذ اعتناقهم الدين الاسلامي الحنيف ظهر بينهم خطاطون عظام أسدوا خدمات جليلة للخط العربي منهم (حامد الآمدي ١٨٩١ ـ ١٩٨٢)و (حاج سليم الجزري ١٨٩٧ ـ ١٩٤٧) و (عبدالرحمان فندكي ١٩٣١ ـ ١٩٨٧) و (ملا أحمد اوليائي ١٨٦٠ ـ ١٩٦٥) و (السيد محسن ١٩٢١ ـ ١٩٧٧) و (الشيخ لطيف داناز ١٨٦٦ ـ ١٩٤٨)و (الملا أحمد القرحصاري ١٤٦٨ ـ ١٥٥٥)و (محمد طاهر الكردي ١٩٠٣ ـ ١٩٨٠) و (مجدي ١٨٤٩ ـ ١٩٢٥)و (الملا أمين ١٨٦٢ ـ ١٩٧٤) وغيرهم كثيرون .

وسنعرف للقارىء الكريم في هذا العدد على نخبة من اولئك الخطاطين وما قاموا من أعمال فنية باهرة وماقدموا من كتب حول فن الخط وتطويره .

# ناوی تایبەتی مرۆڤ لە زمانی کوردی و چەند زمانێکی تردا

د. محمد فاروق عمر
کۆلیجی ئەدەبیات/ زانکۆی صلاح الدین

بەرامبەر بە ناوی تایبەتی مرۆڤ [١] لە زانستی زمانـدا زاراوەی (ئـەنترۆپـۆنیم) بەکار دەهێنرێت، ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا لە دوو وشەیی یۆنانی (ئـەنترۆ ـ مرۆڤ، ئۆنۆما ـ ناو) پێك هاتووە. ناوی تایبەتی مرۆڤ و ناوی باوك و بنەماڵە (فامیلیا) و لەقەب و تەخەلوس و ناوی ناسك و نازداری و بچوككردنەوە لقێك لە زانستی زمانـدا پێك دەهێنن كە پێی دەوترێت (ئـەنترۆپۆنیمیك) ئەمیش دەبێت بە بەشێك لەبەشە سەرەكیەكانی (ئەنۆماستیك). زانستی ئەنۆماستیك جگە لە ناوی تایبەتی مرۆڤ، ئەم بەشانەش دەگرێتەوە: تۆپۆنیمیك (ناوی گیۆگرافی)، ئێتنۆنۆمیك (ناوی خێڵ و میللەت)، كۆسمانۆمیك (ناوی گەردوون و بەشەكانی)، زوونۆمیك (ناوی حەیوانات). [٢]

بایەخ پێدان و شوێنی ناووەك بەشێك لە بەشە سەرەكیەكانی ئاخاوتن چ لەڕوویی مۆرفۆلۆژییەوە، چ لەڕوویی واتالۆژییەوە پێویستی بە چەند لێكۆڵینەوەیەكی زانستی هەیە كە بە نیسبەت ناوی مرۆڤەوە لە زمانی كوردیدا ئەوجۆرە لێكۆڵینەوانە بەوچەشنەیی پێشتر وتمان روناكیان نەدیوە.

ئاشكرایە ناو لە بەشەكانی ئاخاوتندا چەند جۆرێك دەگرێتەوە، بەڵام ناوی مرۆڤ جێی تایبەتی هەیە، ئەو هێز و چالاكی و دینامیكیەیی كە تیایدایە لە ناوەكانی تردا بەوچەشنە بەدی ناكرێت، ئەم چست و چالاكیەیی ناوی مرۆڤ بەستراوە پێویستی مرۆڤ بەناو. ناو هەرلەدروست بوونی كۆمەڵی سەرەتاییەوە، یەكێك بووە لە پێویستیە هەرە گرنگەكانی مرۆڤ، هەرچەندە لەو كاتەوەكە مرۆڤ دەستی بە قسەكردن كردووە ئەمیش هاتۆتەكایەوە، بەڵام ئەوسا ئەو چەمكی ناوی ئێستایەیی نەبووە، بەڵكوو جیاوازیەكی كەمی لەگەڵ لەقەبدا هەبووە، ئەمەش دیارە لەبەر ئەوە بووە كە مرۆڤ جارێ وشەیی ئامادەكراوی نەبووە كە ناوی پێ لێ بنێ دەبوایە دروستی بكردایە بە جۆرێك كە منداڵ دەبوو ناویان بە چەمكی ئێستا لێ نەدەنا، یا ناویان نەدەدایە، ئەوەیی كە لێیان دەنا بریتی بوو لە جۆرە لەقەبێك، یاجۆرە ناو و نیشانێك. [٤] ئەم چەشنە ناو نانە كۆنە تا ئێستاش هەندێ جار لەژیانی مرۆڤدا دووبارە دەبێتەوە، بۆ نموونە: جارێك فرۆكەیەكی (ئیل ـ ١٨) بەئاسمانەوە دەبێت، ژنێك كە دەیەویست لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر بچێت لە فرۆكەكەدا ژان

دەیگــرێت، لە ئەنجامــدا بە یارمــەتی ئافــرەتــە کارکەرەکــانی ناو فرۆکەکە ژنە کچێکی دەبێت، هەر دەست بەجێ لەفرۆکەکەدا ناوی دەنێن (ئیلا)[٥] [فۆنیمی (آ) نیشانەیی جێنەیی تاکە لەزمانی روسیدا].

هەمــوو رۆژێـك لە جیهــانــدا هەزاران منــاڵ لەدایـك دەبێت، گشتیـان پێـویستیـان بەنـاو هەیـە، ئەومنـاڵانە لە کۆمەڵی جیاوازدا لەدایـك دەبن، دیـارە هەمـوو کۆمەڵێکیش چ لەکۆن و چ لە ئێستادا خاوەنی مێـژووو بیروباوەڕوداب و نەرێتی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام بە هۆی نزیکی نیشتـەجێ بوونی کۆمـەڵێـك لەگەڵ کۆمەڵانی تری دەوروپشتیو تێکەڵاویی پەیدا کردن لەنێوانیاندا کارێکی وا دەکات کە زۆرجـار یەك چەشن بیـروباوەڕ، یا بیرکردنەوە، یاداب و نەرێت لەناو هەموویاندا بڵاو بێت، ئەو بیروباوەڕو بیرکردنەوانەیان ئەگەر بە تەواویش وەك یەك نەبـێت، بەڵام زۆر نزیــك دەبێت و لە ناوانــانی منالانی ئەو کۆمەڵانەدا رەنگ دەدەنەوە، هەر لەبەر ئەمەیە کە زانستی ئەنتـرۆپـۆنیمیـك بە سەرچـاوەیـەکی گران بەهـا بۆگەلی زانستی‌تر دادەنـرێـت؛ بەنـیـسـبـەت مێـژ ووەوە ناوی مرۆڤ یارمـــەتی رون کردنەوەو دەرخستنی ژیانی پێشوویی مرۆڤ دەدات، تەنانەت میللەتی واهــەیــە تا ئێستـا جگـە لە ناوکـە لە دەکـۆمێنتی رەسمیو نەخشدا ماوە هیچی تر دەربارەی نەزانراوە.[٦]

دیســانـەوە ئەنترۆپۆنیمیك و هەروەها تێکرایی ئەنۆماستیك لەبەر ئەوخاسێتـانـەی کە تیـایـدایە پەیوەندیەکی پتەووبەتین و نەپچراوی لەگـەڵ ئەتنـوگـرافیو جۆری قانـون و یاسـاو نیزام وباری دەروونی وزانستی جوانی (ئیستێتیك)دا هەیە. ئەنترۆپۆنیمیك بێ ئەوکۆمەڵە زانستـانـە نرخێکی ئەوتـۆیی نییە، هەر وەك چۆن تەپۆنیمیکیش بێ گیۆگرافی نرخی نییە، هەر بەو چەشنەش ئەنۆماستیکیش بێ مێژ وو بێ بەهایە.[٧]

بەراورد کردنی زمــانی کوردی لەگــەڵ چەنــد زمــانێکی تـردا لەرێگـەی کەرەســەیی ناوی مرۆڤەوە دەبێت بەهۆیی دەست خستنە سەرو رونکـردنـەوەیی زۆر لایـەنی مێـژ وویی و بیـروبـاوەڕو داب و نەرێستیو کۆمەڵایەتی هەمە چەشنەی کوردو میللەتانی دەوروپشتی کەئـەمـەش ئامـانجێکی تری ئەم باسـەمـانـە. کاتێ سەرنجی ئەو کارانـەیی کە تاکـو ئێستـا بە زمـانی کوردی دەربارەیی ناوی تایبەتی مرۆڤ نووسـراون دەدەین، دەبینین کە زووربـەیـان بریتین لە چەنـد نامیلکەیەك، تەنیا ناویان بەکۆمەڵ تیادا ریز کراوە.[٨]

بێجگـە لەو نامیلکـانـە مامـۆستـا مەحمـود زامـدار لەسێ وتاردا بەگشتی لەنـاوو ناوەنـتـۆرەو نازنـاو لەزمـانی کوردیـدا دوودو چەند زانیــاریـــەکی پر بە پێـزوپڕ سوودی دەربـارەیـان تۆمـار کردووە.

د. جـەمال رەشید لە وتارێکدا دوایی ئەوەی پشت بە دوو دەکۆمێنتی کۆن کە لە ناوچـەی هەورامـانـدا دۆزراونـەتەوە دەبەستێت. (٩) ناوی لەو دوو دەکۆمێنتە دەرهێناوەو بە ناوی کوردی کۆنیان لە قەڵەم دەدات.[١٠]

بەزمـانی عەرەبی لە کتێبێکـدا کە دەربارەی ناوی تایبەتییە باسی ناوی کوردیو چەنــد داب و نەرێـتـێــك کە لە ناونانی کوردیــدا دەوریان هەیە کراو.[١١]

د. عیـزەدین مستـەفـا رەسـوڵ لە وتـارێکدا بە کورتی دەربارەی قۆنـاغـە مێـژ ووییـەکـانی ناوی مرۆڤ دواوەو چەند خاسێتێکی ئەو ناوانـەیی خستـۆتە رووکە لەبنجدا لەزمانی عەرەبییەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردیو زۆر زمانی تریشەوە.[١٢]

جۆرو چەشن ورێبـازو کەرەسـەیی لێکۆڵینەوەکەیی ئێمە دوورەو جودایــە لە جۆروچەشن ورێبـازو کەرەســەیی تێکـرایی ئەوباس و نامیلکـانەیی کە تاکو ئێستا دەربارەیی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا کراون. ناوی تایبـەتی مرۆڤ لە روویی لێکیکـۆلـۆژ یوواتا لۆژ یو مۆرفـۆلۆژ ییەوە، بەگشتی خستنە روویی تێکرایی ئەو هۆکارانەیی لە ناونـانی مرۆڤـدا دەور دەگێـرن، بۆیەکـەم جارە بەزمانی کوردیولە دیراساتی کوردیدا ئەم لێکۆڵینەوە زانستیە بەراورد کارییە باوەشی بۆ گرتبێتەوە.

جۆرو چەشن ورێبـازو کەرەســەیی لێکۆڵینەوەکەیی ئێمە دوورەو جودایــە لە جۆروچەشن ورێبـازو کەرەســەیی تێکـرایی ئەوباس و نامیلکـانەیی کە تاکو ئێستا دەربارەیی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا کراون. ناوی تایبـەتی مرۆڤ لە روویی لێکیکـۆلـۆژ یوواتا لۆژ یو مۆرفـۆلۆژ ییەوە، بەگشتی خستنە روویی تێکرایی ئەو هۆکارانەیی لە ناونـانی مرۆڤـدا دەور دەگێـرن، بۆیەکـەم جارە بەزمانی کوردیولە دیراساتی کوردیدا ئەم لێکۆڵینەوە زانستیە بەراورد کارییە باوەشی بۆ گرتبێتەوە.

لێکۆڵینەوەکەمان ئەم بە شانە دەگرێتە خۆی:

١) کورتەیەك دەربارەی مێژ ووی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا.

٢) ئەرك و واتایی ناوی تایبەتی مرۆڤی

٣) ئەو هۆکـــارانـــەی کە لەزمـــانی کوردیو کۆمـەڵێـك زمـانی تردا لەناونانی مرۆڤدا دەور دەگێرن.

٤) ئەنجام

## کورتەیەك دەربارەی مێژوویی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا.

دەتوانین ناوی مرۆڤ لە ڕوویی مێژووەوە بەم جۆرە دابەش بکەین:

١) سەردەمی پێش بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز.
٢) سەردەمی سەرەتاو پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلام.
٣) لەدوایی جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا ئەمرۆ.

لە قۆناغی یەکەمدا، واتە پێش بڵاوبوونەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز میللەتی کوردیش وەك هەمــوو میللەتێکی تــر هەر لەزوووەوە ناوی تایبــەتی لە کەســانی خۆیی ناوە. ناو دەتــوانین بڵێین مەرجێکی پێویستی ژیانی ساکار ترین مرۆڤی کۆنیش بوە، چونکە ئەندام لە هەمووکات و کۆمەڵێکـدا دەبێت ناوی تایبەتی خۆیی هەبێت تاکو لەئەندامانی تر جودا بکرێتەوە.

لەبــەر ئەوەی بەزمــانی کوردی سەرچــاوەیی نووســراومـان بۆ نەمـاوەتـەوە کە مێژ وویی بڵاوبوونەوەیی پێش ئاینی ئیسلامی پیرۆز بێت، ناتـوانین لەسـەردەمی پێش ئیـسـلامـدا دەست بخـەینـە سەر جۆروچەشنی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا، چونکە دەست نیشان کردنی ناوی مرۆڤ بەتایبەتی بۆ میللەتێك کە پاشماوەیی نووسراوی بۆنەمـابێتــەوە مێــژ ووبــەکی کۆنی هەبێت بە ئەرکێکی گران دادەنرێت و پێـویستی بە چەندەها لێکۆڵینەوەی قووڵ وورد هەیە، ئەمیش وەختێــك دەکــرێت کە ژمــارەیــەك نووســراوی گومـان لێنــەکراوی ساغ کراوە لەلایـەن چەنـد کەسێـك کە لە مەیـدانی شیکــردنــەوەیی ناواختنی نووســراودا شارەزاو پسپۆربن لەبـەر دەستـدابێت، جا تا ئێستـاهەسـەلەی جۆروچەشنی ناوی مرۆڤ لە سەردەمی پێش ئیـسـلامـدا تەمێکی تەواوی بە سەرەوەیەوزۆر لێڵە.

ئێمـە ئەگـەر کوت ومت نەتـوانین ناوی مرۆڤ پێش ئیســلام بخەینە ڕوو، هەڵبـەتـە پێمان دەکرێت بەمەزندە لە ڕێگەی پەنا بردنە بەر ئەو هۆکـارە جیـاوازانـەی کە لەزمـانی کوردیو چەنـد زمـانێکی تـردا لە ناونـانی مرۆڤـدا دەوردەگێرن، یا لە سنورێکی دیاریکراویشدا بێت دەست بخەینە سەر ئەو واتایانەی کە ناوی مرۆڤ جاران بەخشویانە.

ئەم تەمم ومژیــەیی کە بەســەر ناوی مرۆڤ لەزمـانی کوردی پێش ئیسلامدا هەیە بەسەر ناوی مرۆڤ لە زمانی تری هەر هی ئەو سەردەمەشـەوەیـە. غەفـوروۆڤ بەرامبـەر بە ناوی مرۆڤ لە زمـانی تاجیکی سەردەمی پێش ئیسلامدا دەڵێت:

ئەنتــرۆپــۆنمیکی تاجیکی لە ژێــرکـاری هۆکـاری رامیـاری و رۆشنبیــری و مێــژ وویی و کۆمــەڵایـەتی ئالـۆزدا پەیـدابـووە، ئەو نووســراوانــەی کە هی سەردەمی پێش موســوڵمــانـەتی بن، جا ژمـارەیـەیـان هەر چەندێك بێت، بیرێکی تەواومان دەربارەی ناوی مرۆڤ نادا تێ، ئاشکـرایـە کە پیـاوە بەنـاوبـانگەکان بێجگە لە ناوە تایبـەتێکـانیـان لە قەبیشیـان لە خۆیـان دەنـا، ئەو لەقـەبانە چەندە هاجۆری هەبـووە، سەیـر ئەوەیە کە لەهەندێ ناوچە شاخاوێکانی تاجیکستـان هەمـووی ماوەیـەك دەبێت عادەتی شاردنـەوەیی ناوی ئەسڵی منالّ تا تەمەنی بلوق بوونی بەلەقەبێك نەماوە.

ئەنجـا دێتـە سەر باسی سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامی پیـرۆزو دەربـارەیی ناوی مرۆڤی ئەم قۆنـاغـە دەڵێت: کاتێك ئاینی ئیسلامی پیرۆز بڵاو بۆوە، خەڵکی هاتنە سەر دینە نوێکەو دەستیان کرد بە بەکــار هێــنــانـی وشەی عەرەبـی بۆناوی مرۆڤ، ئەوناوە عەرەبیــانـە بریتی بوون لە ناوی عەرەبی کۆنی پێش ئیـسـلامـەتی و ناوی عەرەبی ئیســلامی وەك: قتیبــە، اسـد، سهـل، ابـراهیم، یعقــوب، الیـاس، محمـد، احمـد، محمـود، ئەوناوانـەیـان بە یارمەتی وشەی (ابن، بن) دەنووسان بە ناوی باوکەوە، وەك: احمد بن اســد. پاشــان غەفــورڤ دەڵێت: دوایی ئەوەی کە کۆمــەڵی دەربــەگـایـەتی پەرەیی سەنـد ناوی مرۆڤ بەرە بەرە چووە قاڵبێکی گرانتـرەوە. گەورە پیـاوانی چینەکانی سەروولەقەب وکونیەشیان لە خۆیـان دەنـا، هەڵگـرتنی ئەولەقـەب وکونیـەیـە بە پێی فەرمـان و مەرسـومێکی تایبەتی بووکە لەلایەن دەسەڵاتدارێتیەوە دەردە چوو. کونیە دەخرایە دوایی ناوە تایبەتێکەوەو زۆر جاریش لەباتی ناوە تایبەتێکـە لە ژیـانی ڕۆژانەدا بەکار دەهێنرا. جگە لە کونیە گەورە پیاواد دەستیـان بە بەرکارهێنـان و هەڵگـرتنی لەقـەبیش کرد، لەقـەب لە سەرەتــاوە لە شێــوەی ناونیـشــانێکی رەسمیــدا بوو، لە ڕوویی پێـك هاتنیـانەوە جۆری جیاواز جیاوازیان هەبوو، بەڵام لە ئاسیایی ناوەراست زیـاتـر ئەو لەقـەبـانـە لەبرەودا بوون کە بە وشـەیی (دین) کۆتاییان دەهات. وەك: نورالدین، صلاح الدین، فخرالدین... هتـد تا ئەوکاتـەیی کە (نـاونیشان) وەك نیشانەیی چەشنی وەزیفەو ئەرك سنـووری بەکـار هێنانی فراوان نەبووبوو لەقەب دەچووە پێش هەمـوو ناوێکـەوە، بۆ نموونە جامی شاعیر تێکرایی ناوەکەیی بریتی بوو لە (مـولانـا نورالـدین عبـدالرحمن ابن احمد جامی). وشـەیی (مــولانــا) وەك نیــشــانــەیــەك وا بوو کە دەنــرا بە ناوی زانــا

موسـولْمانەکانەوە . وشەیی (جامی) بریتیە لە ناوی شوێنی لە دایك بوونی، واتـە نسبـەیـە، بەرە بەرە وشـەیی (مـولانـا) گۆڕاو بوو بە (مـەلا) . وشـەی (مـەلا) تەنیـا لەگـەڵ ناوی پیـاوە ئاینێکاندا بەکار دەهێنـرا، لەگـەڵ ئەمـەدا وشـە یا لەقـەبی (مـەلا) بوو بەهـۆی جو داکردنەوەی خوێندەوار لە نەخوێندەوار کاتێك کە دەخرایە پێش ناو. (١٤) ئەمـانـە بەکـورتی بیـرو بۆچوون ورای غەفـوروۆف بوون دەربارەیی مێژوویی ناوی مرۆڤ لەزمانی تاجیکیدا تا سەرەتایی ئەم سەدەیە .

سەرنـج دانێکی وردو قوڵ لەوبیـروڕایـانـەیی غەفـوروۆف کە بەرامبـەر ناوی مرۆڤـە لە زمـانی تاجیکی سەردەمی پێش ئیسـلام و پاش بڵاوبـونـەوەیی ئاینی ئیسلامی پیـرۆزو تا ئەمرۆ ئاشکراشەکە تاجیکیکـان میللەتێکی ڕۆژهـەڵاتی وموسلْمانن، وامان لێ دەکات کە ئێمەش بە شێوەیەکی گشتی هەر بەوچاوە سەیری ناوی مرۆڤ لە زمـانی کوردی سەردەمی پێش ئیسـلام و تا سەرەتـایی ئەم سەدەیـە بکەین، چونکە ئەو میللەتانەی لە ناوچەی گیۆگرافی نزیك بەیەکدا دەژین دەکـەونـە ژێـر کاریگـەری یەکتـرییەوە، بەڵام ئەمە ئەوەش ناگـەیـەنێت کە هەر زمـانێـك لەمێـژ وودا بە قۆناغی تایبەتی خۆیدا تێ نـاپەڕێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو زمانێك با نزیکی لەگەڵ زمـانی تردا هەبێت، بەڵام لەسـەر بە خۆیی خۆی ناکـەوێت، جا نەبوونی سەرچاوەیی تەواو ساغ کراوەو گومان لێ نەکراوی سەردەمی پێش ئیسـلام و تا چەنـد سەدەیەکیش پێش ئێستا بەزمانی کوردی، هۆی هەرە سەرەکی لێڵی و ڕوون نەبوونەوەیی تەواوی ناوی مرۆڤی ئەو سەردەمەیە، هەر چەندە تاکو ئێستا کۆمەڵێك ناو بەتایبەتی ناوی ئافرەت لەزمانەکەماندا ماونەتەوە بەدووری نازانین هی پێش ئیسلام بن وەك : گوڵـە، مەنیـج، وەنـەوش، ئاسکـە، بەهێ، پیـرۆت، شێرکۆ، بایز، پرتەو، شیرین، خونچە، خورشید. دەربارەیی ناوی مرۆڤ لەقـۆنـاغی دووەمـدا کە سەردەمی بڵاوبـوونـەوەیی ئاینی ئیسـلامـە لە ناوکورددا د. عیزەدین مستەفا دەڵێت : باوەڕ بە ئیسلام کۆمەڵی ناوی زۆری هێنایە ناو کوردەوە کە لە عەرەبییەوە وەرگیراون، جا هەنـدێکیـان ئەو ناوە عەرەبیـانـەن کە سەحـابـە لەگـەڵ فەتحی ئیسـلامیـدا هێناویانن، بەڵام ئەوانەی کە لە ناو عەرەبدا ناوی پێش ئیسلام بوون لایی کورد کە من، ئەوەی باو بووە ئەو ناوانەن کە پێـوەنـدییان بە باوەڕی ئیسلامییەوە هەیە فەرموودەیی پێغەمبەر (د.خ) کە «خیر الاسماء ما عبد وحمد»، واتە باشترین ناو ئەوانەن کە مەعنـای بەنـدەیی خوا ئەبەخشن وباسی حەمدو سەنای خوایان تێدایە . هەروەها دەڵێت : ئەگەر ناوەکانی پەروەردگار، واتە ـ اسماء الله الحسنی ـ ٩٩ ناوبن ئەوا زۆرکـەمیـان لە ناوکورددا بۆناو بەکار هێنـراون و هەنـد یکیشیـان دەگمـەنن ـ وەك : عبـدالمـوجـود، عبـدالمصـور، عبدالمهیمن . . . هتد لە مەشدا واتاو ئەرکی ناوی مرۆڤ و ئەوهۆکـارە جیـاواز جیـاوازانـەی کە لە ناونـانی مرۆڤـدا وەردەگیرێن بە بابەتێکی گرنگی زانستی زمان دەژمێرێن کە تاکو ئێستا بەزمانی کوردی و لە کورددا وەك لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کە تێکرایی ئەو لایەنانەی سەرەوە بە بەراورد کردنیان لەگەڵ کۆمەڵێك زمانی تردا بگرێتە خۆیی نەکراوە، (٣) لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی کە لەم بابەتە بکۆڵمەوە نەك تەنیا بەکەرەسەو لەسەر بناغەی زمانی کوردنی، بەڵکو بە بەراورد کردنی زمانی کوردی لەم ڕووەوە لەگەڵ کۆمەڵێك زمانی تر بەتایبەتی زمانی ڕۆژهەڵاتیکان . دەرخستن و نیشان دانی لایەنی لەیـەك چوون و جیـاوازی ناوی تایبـەتی مرۆڤ لەو زمـانـانـەدا کە کراون بە کەرەسـەی بەراورد کارێکـە خۆی لە خۆیـدا بەکارێکی پڕ بەهـایی دەزانین، ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەکی ترەوە گرنگی و کورد دەسکـاریـەکی خۆیی هەر کردووە، یەکـەم زۆر لەونـاوانـە بەبێ (عـەبـد)ە کەبـوون بەنـاو وەك : قادر، مەجید، حەمید، عزیز. . . هتد، دووەم وشەی (عەبد) لەگەڵ ئەلف و لامی تەعریفی ناوەکەی دوایی ناوێکی تاك و تەنیایی لێ دروست کراوە کە (عبدول)ە. (١٥)

ئاشکـرایـە ناوی عەرەبی چۆتـە ناو ژمارەیەکی زۆر لەزمانەکانی جیهـان بەتـایبـەتی زمـانـە ڕۆژهـەڵاتیکـان لەم ڕووەوە ت . خ . کوسیمـۆڤـا دەربـارەی ئەو ناوە عەرەبیـانـەی کە هاتوونەتە ناو زمانی باشکیـری‌یـە وە کە زمـانێکی ڕۆژهـەڵاتییـە دەڵێت : ناوە کۆنەکانی میللەتی باشکیـر وەك هەمـوو میللەتێکی تری ڕۆژهـەڵات لەگـەڵ پەیدا بوون و بڵاوبوونەوەیی ئیسلامەتیدا گۆڕان و کران بەعەرەبی، بەڵام بە دوو قۆناغ، لە قۆناغی یەکەمدا ئەو ناوانە باو بوون و کەوتنە گەڕ کە واتـایـەکی ئاینی تەواویـان دەبـەخشی وەك : ناوی پێغـەمەر (د.خ) و پیـاوە گەورە ئاینیکـانی تر، ئەنجـا ئەو ناوانـەی کە لە ناوی جەژنـەکـانـەوە وەرگیرابوون، ئەوجۆرە ناوانە لای هەموو میللەتانی ڕۆژهـەڵات هەیـە. لە قۆناغی دووەمدا دەستکرا بە بەکارهێنانی ئەو ناوە عەرەبیـانـەش کە واتای ئاینیان نە دەبەخشی، بەڵکوو واتاکانیان بریتی بوون لە پاڵەوانێتی و زانیاری. (١٦)

لە زمانی کوردیشدا کە دەڕوانینە واتای ناوە بەئەسڵ عەرەبێکان، دەبینین دوو جۆرن، یەکـەم ـ ئەو ناوانـەن کە ڕاستـەوخـۆ واتاکانیان دەچنە قاڵبی بیرو باوەڕی ئاینییەوە، دووەم ـ ئەوانەی کە واتای (جگە

لە ئاینی) دەبەخشن.

یەکێك لەو ڕاستییانەی کە لە زماندا هەیە ئەوەیە کە ئەووشانەی بوون بە ناوی مرۆڤ لە ڕووی ئەسڵیانەوە، یا ئەوەیە کە لەبنجدا موڵکی ئەو زمانە خۆیەتی، یا لەزمانەکانی ترەوە خواستوونی، چونکە ئاشکرایە لە ئەنجامی پێویستی ژیان و لەبەر زۆر هۆیی مێژوویی وکۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئاینی هەموو زمانێك بەگشتی وشەی لە زمانەکانی ترەوە خواستووە، جا ناوی تایبەتیش زۆر جار دەچێتە ناو چوارچێوەی ئەووشە خوازراوانەوە، تەنانەت زمان هەیە کە تێکرایی ناوە تایبەتیەکانی مرۆڤی لە زمانی ترەوە خواستووە، بۆ نموونە لەزمانی فەرەنسیدا ناوی تایبەتی نییە کە لە بنجدا وشەی فەرەنسی بن، بەڵکوو کاسۆلیکەکان لەڕۆماوە هێناویانە، لەزمانی ڕوسیشدا هیچ ناوێك نییە کە لە بنەڕەتدا وشەی زمانی ڕوسی بن، چونکە کڵێسە قەدەغەیی کرد کە ناوی تایبەتی لەزمانی ڕوسی کۆنەوە وەربگیرێت بۆ ئەمە چووە ناوی لە زمانی بیزە نتیەوە وەرگرتووە.[17]

لە قۆناغی سێیەمدا کە لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە دەست پێ دەکات تا ئەمڕۆ، جوڵانەوەیەکی نوێ لە ناونانی مرۆڤ لەزمانی کوردیو چەندین زمانی تریشدا ڕوویی دا، هۆی سەرەکیو بنەڕەتی ئەو جوڵانەوەیە بەو بیروباوەڕە نوێیانەوە بەستراوە کە لە ئەنجامی جەنگی جیهانی یەکەم لە میللەتانی گێتیدا پەیدا بوو. لەم پلەیەدا لەپاڵ بەکار هێنانی ناوە بە ئەسڵ عەرەبیەکان دەستکرا بە زیندوو کردنەوەی ناوە کوردییە کۆنەکان ووەرگرتن و پەراندنەوەی کۆمەڵێك ناو لە گشتییەوە بۆ تایبەتی مرۆڤ و دروست کردنی ناوی نوێ.

## ئەرك و واتای ناوی تایبەتی مرۆڤ

بەر لەوەی بێینە سەر باسی ئەرك وواتای ناوی تایبەتی مرۆڤ ئەگەرچی بەکورتیش بێت بە پێویستی دەزانم هەندێ جیاوازیو پەیوەندی نێوان ناوی گشتیو ناوی تایبەتی، بەڵام بەگشتی ناوی تایبەتی مرۆڤ بخەینە ڕوو. مەبەست لەناوی گشتی ئەووشەیەیە کە بووە بەناوی گیانلەبەرو بێ گیانی لەیەك چوولە هەمووڕوویەکەوە وەك: مرۆڤ، ڕووبار، شێر، دار، سێو... هتد.

پێویستە ئەوە بزانین کە ئەگەر هەموو گیانلەبەرو بێ گیانێك خاوەنی ناوی گشتی بن، مەرج نییە ناوی تایبەتیان هەبێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر زانیمان کە گیانلەبەرێك، یا بێ گیانێك ناوی تایبەتیان هەیە دەبێت بزانین کە پێش ئەوەی ناوە تایبەتێکەیان هەبێت ناوی گشتییان هەیە، بەم شێوەیە ناوی تایبەتی دووەم ناوە کە لە گیانلەبەرو بێ گیان دەنرێت کەواتە بە نیسبەت هەموو گیانلەبەرو بێ گیانێکەوە ناوە گشتێکەی پلەی یەکەمە، ناوە تایبەتێکەشی پلەی دووەمە، هەر ئەم پلە دووەمیەی ناوی تایبەتی وای لەزۆر زمانەوان کردووە کە نەیخەنە ناو فەرهەنگی زمانەوە[18]

ناوی تایبەتی مرۆڤ خۆی لە چوارچێوەی تاقە زمانێکدا ناگرێت، بەڵکو بە پێچەوانەی ناوی گشتییەوە زۆر بەهەڵپەو چست و چالاکە بۆ ئەوەی بپەڕێتەوە بۆ ناو زمانی تر، بەڵام گەڕانەوەی ناوی تایبەتیش بۆ گشتی دیسانەوە لە زماندا ڕوو دەدات، بۆ نموونە، ئەم ناوانە: (ڤۆڵت، وات، گاز، کووخ، بەلهاریز) تایبەتی بوون کەچی ئێستا لەزۆر زمانی جیهاندا وەك زاراوەی زانستیو ناوی گشتی بەکار دەهێنرێن.

خەڵکی کاتێك بەتەواوی لە ناوی تایبەتی تێ دەگات کە بیەسترێتەوە بەو کەس وشت ومەکانەی کە بەهۆی ئەمەوە ناو نراون، بەڵام بۆ تێگەیشتنی ناوی گشتی پێویستی بەو بەستنەوەیە نییە.

ناوی تایبەتی کۆمەڵە وشەیەکە لە مەیدان و بواری تایبەتیو ئەرکی تایبەتیش دەبینێت، زۆر زیاتر لە ناوی گشتی پشت بە هۆکارەکانی دەرەوەی زمان دەبەستێت، لەبەر ئەوە تەنیا لەژێر باروکاری یاساکانی زماندا نییە، بەڵکوو لەژێر کاریگەری یاسا کۆمەڵایەتیو مێژوویەکانیشدایە جیاوازیەکی تری ناوی گشتی لە ناوی تایبەتی لەوەدایە کە فۆنیمە پێکهێنەرەکانی ناوی گشتی تەواو چەسپاوترن لە فۆنیمەپێکهێنەرەکانی ناوی تایبەتی هەر لەبەر ئەم چەسپاوییە تەواوە گۆڕینی فۆنیمی ناوی گشتی، یا دەستکاری کردنی کارێکی وا ئاسان نییە جا ئەگەر هاتوو دەستکاریش کرا بە پێی پەیڕەوێکی توندوتیژەو لە سنورێکی دیاریکراودانە، فۆنیمە پێکهێنەرەکانی ناوی گشتی ئەگەر بەو جۆرە چەسپاو نەبوونایە بەگەڕان پەیوەندی ناوی گشتی بەچەمکەوە ڕێك دەکەوت، بەپێچەوانەوە ناوی تایبەتی ئەو پەیوەندییە بەتینەی لەگەڵ چەمکدا نییە، لەبەر ئەوە دەشێ لەڕووی فۆنەتیك و مۆرفۆلۆژیو هەتاوەکو لێکیسکۆلۆژیشەوە گۆڕانیان بەسەردا بێت.[19]

ئەرکی ناوی تایبەتی مرۆڤ بەگشتی دەشێ لەم چەند خاڵەدا کۆ بکرێتەوە:

١ ـ جوداکردنەوەی کەسێك لە کەسێکی تر لەکۆمەڵدا بە ئەرکی سەرەکی و هەرە گرنگی ناوی تایبەتی دادەنرێت، بێ ئەم ئەرکە بوونی ئەنترۆپۆنیمیك هیچ واتایەکی نییە.

٢ ـ پەنجە ڕاکێشان بۆ جێ و شوێنی هەموو کەسێك لە کۆمەڵدا

٣ ـ ئەم ئەرکە بەستراوە بە باوەڕ بەهێزی سەروو تواناو هێزی مرۆڤ و دڵ ڕاگرتنی

٤ ـ وا ئەرك پەیوەندی بە هەندێ شتی وەك داب و نەریت و، شتومەکی باوو زەوقی تاقەکەسییەوە هەیە. [٢٠]

ناوی گشتی کە دەپەڕێتەوە بۆ ناوی تایبەتی (جگە لەو ناوانەی کە واتایی ئاینی دەبەخشن) تا ماوەیەك لە چەند کە سێکدا، یا لە ناو خزم و ناسیاودا، یا لە ناو چەند خێزانێکدا پارێزگاری واتا ئەسڵێکەی دەکات، بەڵام بەرەبەرە واتا بنچێکەی ون دەکات و وا دوور دەکەوێتەوە لێی کە دەتوانین بەگشتی بڵێین پەیوەندی پێوە نامێنێت بەجۆرێك ئەگەر لە سەرەتاشەوە حساب بۆ واتا ئەسڵێکە کرا بێت دوایی ئەوەی کە دەبێت بەناوی مرۆڤ ئەو نرخ و بایەخەی نامێنێت، بۆ نموونە کاتێك منداڵێك ناو دەنرێت، دیارە لەسەرەتاوە هۆکارێك، یا چەند هۆکارێك دەوریان لە هەڵبژاردنی ناوەکەدا گێراوە، بەڵام بەتێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر ئەو ناوانەدا وای لێ دێت کە بیر بۆ هۆکارەکانیش نەچێت بەتایبەتی لای ئەو کەسانەی کە ئاگایان لە هۆکارەکان نەبووە.

## ئەو هۆکارانەی کە لە ناونانی مرۆڤ لەزمانی کوردی و کۆمەڵێك زمانی تردا دەور دەگێڕن

لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ بەگشتی لەزوربەی زۆری زمانەکانی گێتیدا ناونانی مرۆڤ و هەڵبژاردنی ناوێك لە ناوەکانی تردا وپەسەندکردنی هەندێك و بە دڵ نەبوونی هەندێکیان بەستراوە بەبوونی هۆکاری هەمەچەشنەوە، ئەم هۆکارانەش لە ئەنجامی باوەڕی باوی ناو کۆمەڵ و گۆڕانی سروشتی و مێژوویی و ئابوری و ڕامیاری هاتوونەتە کایەوە.

لە یەك چوونی پەیڕەو یاسای کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕامیاری و جۆری بیرکردنەوەو بڵاوبوونەوەی باوەڕ، یا ئاینێکی تایبەتی لە سەردەمی دیاریکراوداو نزیکی شوێنی نیشتەجێبوونی میللەتێك لەگەڵ چەند میللەتێکی تردا، دەبن بەهۆی ئەوەی کە ئەو هۆکارانەی لای ئەو میللەتانە لەناونانی مرۆڤدا دەوردەگێڕن هاوبەش بن، یا زۆر لەیەکەوە نزیك بن، ئەگەرچی لە هەمووبارو زروفێکدا زمانی هەر میللەتێك بگرێت خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی کە مەرج و نیشانەی سەربەخۆییەتی. جا ناوی مرۆڤیش لە هەر زمانێکدا بێت، وەك هەموو وشەیەکی تر یاسا فۆنەتیکی و مۆرفۆلۆژیکانی ئەو زمانە ئەمانیش دەگرێتەوە.

زمانی کوردیش وەك هەموو زمانێکی ڕۆژهەڵاتی تر گومانی تێدا نییە کەلە ڕووی ئەو هۆکارە نازمانییانەی لە ناونانی مرۆڤدا لەکاردان لەگەڵ کۆمەڵێك زمانی تر بەتایبەتی زمانە دراوسێکانی لەیەك دەچن، یا زۆر نزیکن لەیەکەوە، بۆیە وامان بەچاك زانی هۆکارە نازمانێکانی کە لە ناونانی کوردییدا دەوریان هەبووە، یا هەیە لەڕێگەی بەراورد کارییەوە لەگەڵ هەمان بابەت لە کۆمەڵێك زمانی ڕۆژهەڵاتی تردا نیشان بدەین و بەگشتی بەم خاڵانەی خوارەوە بیان خەینە ڕوو:

١) لە زۆرکۆنەوە خەڵکی ئەو هێزو قودرەت و گیانلەبەرانەی کە پیرۆزبوون لایان، یا سەرچاوەی مەترسی بوون بۆیان، سڵیان لە ناوبردنی ڕاستەقینەیان کردۆتەوەو وایان بەباش زانیوە کە بە وشەی تر ناویان بەرن، بەمە باوەڕیان وابووەووایە کە ڕێزیان لێ دەگرن و دڵیان ڕادەگرن، یا لە کینەو پەلاماروڕق هەڵسانو ئێش وئازار پێ گەیاندنیان بۆسەرخەڵکی بەدوور دەبن، واتە ئەگەر ناوە ڕاستەقینەکانی ئەو هێزو قودرەتانە بەرن لە هەموو حاڵەتێکدا باشیان بۆ نابێت و تووشی خراپە دەبن. [٢١]

ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ناونانی مرۆڤ و هەندێ گیانلەبەرو بێ گیانیش بەجۆرە ناوێك کە واتاکانیان سەرسوڕێنەرو بەتەواوی دوورو بن و لەگەڵ واتا باوەکانی تێکڕای ناوەکانی تردا نەگونجێن لەزۆر زماندا پەیرەوی کراوە، ئاشکراشە بۆمەبەستی خۆپاراستن لە هێزی خراپەو گیانلەبەری درندەو زیان بەخشە، جا ناوی بەم چەشنە کە بە وشەیەك، یا هەندێ جار کە بەرستەیەك، یا دەستەواژە نراوە، لەئەنجامی باوەڕ بەسیحری وشە هاتۆتەکایەوە. باوەڕ بەهێزو تواناو جادووگەری وشە مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیەو لەزۆر کۆمەڵدا تا ئەمڕۆش ماوەو کاری خۆی لەزماندا هەر دەکات. بۆ نموونە: لە سەدەکانی ناوەڕاست لە وڵاتی مەجەر ناوی وایان لە منداڵەکانیان دەنا کە بەڵکو بە هۆی ئەو ناوانەوە لەدەست هێزی شەڕو خراپەکار و لە مەترسی و زەفەر پێ بردنی ڕزگاریان بێت و نەمرن. وەك ناوی: بچوکی مردوو، زیندوونییە، پیسی، چڵك. [٢٢] جا لەبەر ئەوەی واتای ئەو ناوانە شت ومەکی بێ نرخ و نزمی بێ کەڵك و بێ سود دەگەیەنێت، بە باوەڕی ئەوان هێزی شەڕو خراپە دەستیان لێ

هەڵدەگرێت و هەڵ ناکوێتە سەریان، چونکە شتی بێ بەهاوسووك کەس پێویستی پێ نییە.

واتـای ئەسڵی وشـەی (ورچ) لەزۆر زمـانی ئەوروپـاییـدا نمـوونـەیـەکی ترە لە باوەڕ بەسیحری وشە لای ئەومیللەتانە، ناوی ئەسـڵی ورچ لەلاتـینیـدا (ursus) ە کەوشـەی (ours) ی فەرەنسی دەچێتەوە سەر کەئەمیش واتاکەی هەر ورچە، بەڵام لەهەندێ زمانی ئەوروپـای تردا بەرامبـەر بە (ورچ) بۆئەوەیی زەفـەریان پێ نەبات و زیانیان پێ نەبەخشێت وخۆشی بوێن وخۆیان لەمەترسی ئەورزگار بکەن بە وشەی تر ناویان ناوە؛ لەزمانی ئنگلیزیدا وشەی (loear) کە ناوی ورچـە، لە بنـەڕەتـدا واتـایی (قـاوەیی) بەخشیـوە، لەزمـانـە سلاڤیکاندا ناوی ورچیان بە (هەنگوین خۆر) ناوە.

مارو گورگ و ڕێـوی و بەرازو بزنـیش هەنـدێـکـی ترن لەو گیـانلەبـەرانـەی کەسڵ لەناوبردنی راستەقینەیان کراوە، یا بە جۆرە وشەیەك ناونراون کە دیارە زۆر جار لەبەر ترسە کە بەڵکو ئیتر بەهۆی ئەو وشانەوە وازیان لێ بێنن، گیانلەبەرێکی درندەیی وەك (بزن مژ) بە عەرەبی (ابن عرس) و بەکـوکـەی (بنات عرس) ی پێ دەڵێن ولە دێهاتەکانی میسر بە (المخفیه)، یا بە (أم احمد) ناوی دەبرێت لە زۆر زمـانی تردا ئەم گیـانلەبـەرە لەبـەر درندەیەتی بەوشەیی جوانی و ناسـك و نازداری ناونـراوە. وەك! بەفـەرەنسی! جوانی بچـوك، ئەڵمانی: گیانلەبەری بچوکی جوان، ئیتالی و پورتوگالی: خاتونی بچوك، ئیسپانی: لەقلەق، دانیمارکی: جوان.[23]

لەزمـانـی کوردیشـدا سڵ کردنـەوە لە بەکـارهێنـانی ناوی راستـەقینـەی هەنـدێ نەخۆشی وڕووداوتا ئێستا بەدی دەکرێت: بۆ نموونە: زۆر جار نەخۆشی شێرپەنجە بە (دوابراو) کە ناو دەبرێت، نەخـۆشی سورێـژە (مـوبـارەکـە)ی لێنراوە، وشەی (مولێ هاتن) بۆ برینی پیس بەکـاردێت، دیسـان زۆر جار لەجیـاتی مردن (کـۆچی دوایی) کردن بەتایبەتی لەزمانی ئەدەبیدا بەکار دەهێنرێت.

باوەڕ کردنی خەڵکی بە هێـزو توانـاو سیحـری وشـە بۆ هێنانەدی ئاوات و ئامـانـج، یا بۆخەڵـەتاندن وفێڵ کردن لە هێزو سەرچاوەی خراپەو دێوودرنج وخۆپاراستن لێیان، تا ئەمڕۆ لە ناونانی مرۆڤیشدا رەنگی داوەتـەوە. وەك وتمـان ئەو وشـەو دەستـەواژەو رستـانـەی کە واتـایی بێ نرخی و سووکی و تەفـرەدان و هەنـدێ واتـای جیـاواز جیـاوازیتـر لەبـنـجـدا دەبـەخـشـن، بۆچاووراولێ کـردن و چەواشـەکـردنی هێـزی خراپە لەخەڵکی نراون، واتە بوون بەناوی مرۆڤ، ئەمانە هەندێکن لەوناوانە کە لە کۆمەڵێك زمانی جیاوازدا هەن:

لەو خێـزانـانـەدا کە منـاڵیان بۆنەئەما، ئەم چەشنە ناوانە بەرچاو دەکـەون؛ ئۆزبـەکی: تورگان [ماوەتەوە]، توردی [مایەوە]، توختە [بمێنـە]، تورسـون [بـابمێنێت]، ئولمـەس [نـامرێت]، تورکی: دوردی [مـایـەوە]، لەسـەدەی (٧)ی زاینیـدا ناوی پاشـایـەکی خوارزمی (ئـاتسیـز)، واتـە [بێ نـاو] بووە، باشکیـری: تۆرهـۆن [بـابـژی]، کەرغیـزی: تۆکتـۆ [بمێنـە]، رووسی: نایـدیـۆن [دۆزراوە]، تاجیـکـی: یوفـت، یوفـتـەك [دۆزراوە]، مۆنـەد [بـابمێنێت]، خۆشـۆك [کـا]، پەخـۆل [گیـایی پـار]، خۆکیـرۆ [خـاکی ڕێ]، زەینـور [زەردەواڵـە]، پەششـە [مێشوولە]، جۆندۆر [مارومێروو]، کەرغیزی و کازاخی: سەسیك [بۆگەن]؛ کەرغیزی و کازاخی: ئیتـالنـاس [سـەگیش نایخـوات] دیسانەوە لە تاجیکیدا: پەرتۆف [فرێدراو]،[24] ئێمە لە نێوان (پەرتوف)ی تاجیکی و (پرتەو) کە ئەمیش لەزمـانـی کوردیـدا ناوبووە نزیکییـەکی تەواوو بەدی دەکـەین، واتە دوور نییە کە (پرتەو)ی کوردیش واتایی (فرێدراو)ی بەخشی بێت. هەر لەوحاڵـەتـانەدا کە منالیان بۆنەئەما، لەهەندێ زماندا ناونانەکە دوایی مەراسیمێکی تایبەتی نراوە، بۆناوەکەش ئەو وشەیەی کە هەڵبژێراوە نیشانەیی چەشنی مەراسیمەکە بووە.

بۆنموونە: کازاخەکان وئۆزبەکەکان کە منالیان بۆنەئەما هەر کە منـاڵی تریـان دەبـوو هەڵیـان دەگرت و دەیان بردە ماڵە دراوسێیەك، ڕوپـاش ماوەیـەکی کورت، دەچـوونـەوە ماڵە دراوسێکەو پارەیەکی رەمـزییان دەدانێ ومناڵەکەیان لێ وەردەگرتنەوە، ئەم منالێ ئالێ وگۆڕ کردنـە بۆئەوە بووە کە دێـوۆدرنج تێ بگەیەنن کە ئەومناڵە هی ئەمان نییە، بەڵکوو بەپارە کڕیویانە. منالی ئۆزبەکی وکازاخی کەبەوجۆرە ئاڵ وگۆڕە ناو نرابن، ناوەکانیان واتایی (کراو) دەبەخشن، وەك: کازاخی: ساتیلسگان، ئۆزبەکی: سۆتیبۆلدی، سۆتیم ...

باشکیرێکانیش منالیان بەم جۆرە مەراسیمە ناوناوە، بەڵام ئەمان کە دەچـوون منـاڵـەکـە لە دراوسێکـەیـان وەرگـرنـەوە، لەباتی پارە حەیـوانێکیـان دەبرد، مناڵەکەشیان ناو دەنا (ناتیبال) واتە (کڕاو)، یا ئیشکینـە [شـەریـك]. هەر لای ئەم باشکیریانە لەهەندێ خێزاندا کەمنـاڵیـان زووزوو دەمرد، دەچوونە (٤١) چل ویەك ماڵ، لە هەر ماڵێـك پارچـە قومـاشێکیـان دەسـەنـد، ئەنجـا لەو (٤١) پارچـەیە کراسێکیـان دەبـری و دەیـان کردە بەر منـاڵـەکـە، ئەوکراسـە ناوی (کـریك یامای) بووە. لایی هەندێ میللەتی ڕۆژهەڵاتی تر هەر ئەم

## رۆشنبیری گشتی

چەشنە ناونانە کە بە دووری نازانین هەمان مەراسیمی ئاڵ وگۆڕ کردنی بۆکرابێت هەبووە، ئەووشانەی کە ناوی منداڵیان پێ ناوە واتایی (گۆڕاوە، لە جیاتی) دەبەخشێت، وەك، تاجیکی : بەدەل، ئەلوشی، ئیڤەز[لەجیاتی] . ، ئێمەوایی بۆدەچین کە ناوی (عەوێز، حەوێز)یش لە زمانی کوردیدا جاران هەر بەپێی نەریتی ئاڵ وگۆڕ کردنی منداڵ نرابێت، چونکە وشەیی ئیڤەزی تاجیکی و عەوێزو حەوێزی کوردی گومانی تێدا نییە کە لە ئەسڵدا لە وشەی (عوض)ی عەرەبییەوە وەرگیراون .

بەپێی بیروباوەری کۆن دێوودرنج بەهەندێ شت قارس وگرژ و دوور دەکەونەوە، لەبەر ئەوە ئەم ناوانە بەرچاودەکەون : لەزمانی ئۆزبەکیدا : ساریمسۆك [سیر] لە منداڵ نراوە، گوایە یەکێك لەو بۆنانەیی کە دێوودرنج پێی قاریس دەبن بۆنی سیرە، جا کە منداڵەکە ناوی (سیر) بێت ئیتر توخنی ناکەون ولێی دوور دەکەونەوە بەمە ئەو منداڵە لەمەترسی مردن رزگاری دەبێت، لە رووسیدا : (گەرچاکۆف) کە لە قەبە واتای [تاڵی] دەبەخشێت، لە تاجیکیدا : کەمژەك، تەلخەك [دوو رووەکی تفت وتاڵن] . ئێمە وای بۆدەچین کە وشەی (تاڵ) لە کوردیشدا وەك ناو بەتەنیا بەکار هاتبێت پاشان وشەی (حەمە)ی چوو بێتە سەرو بوو بێت بە (حەمەتاڵ) .

لەوخێزانانەدا کە حەزیان لە کوڕ بوو، بەڵام هەر کچیان دەبووبۆ ئەوەی لە دەست چاوو نەفەسی پیس وهێزی شەڕو دێوو درنج رزگاریان بێت ودەستیان لێ هەڵگرن وتییان بگەیەنن کە ئەوا خاوەنی کوڕن لە ئۆزبەکیدا ناوی دوا کچیان دەنا : ئوغول [کوڕ]، لە تاجیکیدا ناویان دەنا : دۆدەر [برا]، لە ئۆزبەکی وتاجیکیدا بۆ وشەی ئوغول ودۆدەر ووشەی وایان دەخستە سەر کە وەك ناوە مێینەکانی تریان لێی بێت، واتە بەم شێوەیەیان لێ دێت : تاجیکی : دۆدەرگول، ئۆزبەکی : ئوغوڵ بیبی، ئوغولۆی، هەروەها لە تاجیکیدا کوڕیشیان ناو دەنا (دۆدەر) هەتاوەکو ئەوکوڕە تەنیا کوڕ نەبێت و برای تری بێت .

لەوخێزانانەدا کە بەردەوام کچیان دەبوو یەك لەدوایی یەك ئەم جۆرە ناوانە بەرچاودەکەون : ئۆزبەکی و کەرغیزی : گیز لەر بەس [بەسەکچ]، کۆمیکی ! کیزتوقمە [کچ نەبێ لەدایك]، کیز تەمام [کچ تەواو]، تاجیکی بەسەك [بەسە] هەروەها (بەسگول)و (بەسمو) شیان هەیە . ئێمەوای بۆدەچین کە (بەستێ و بەسێ)ی کوردیش لەبنجدا هەر بەو پێیە بەکار هاتبێت .

لەوخێزانانەدا کە منداڵەکانیان هەر کەلەدایك دەبوون نەخۆش بوون لەم ناوانەیان لێ دەنا : تاجیکی : گوشود [ئازاد]، ئۆزبەکی : ئۆچیل [رزگاریە] .

لەزووەوە خەڵکی ناوی حەیوانیان لە منداڵ ناوە، ئەمەش هۆی جیاوازی هەیە، لەوانەیە لەبەر پیرۆزی ئەوگیانلەبەرانە بێت، یا بۆمەبەستی شوبهاندنی منداڵ بە حەیوانی بەهێزی، وەك : شێرو پڵنگە، یا فیل کردن لە هێزی خراپەکارە؛ بۆنموونە : ئۆزبەکی : بوری [گورگ]، تاجیکی : گورگ، کەرغیزی : ئیتبای [ئیت! سەگ، بای! لەقەبە]، باشکیری : کاشکار [گورگ]، نیرتلان [کەمتیار]، ئەیلان [شێر]، یولبایس [پڵنگ] .

لەئەنجامی بەخێوکردنی هەندێ حەیواناتدا دیسانەوە منداڵیان بەناوی حەیواناتەوە ناوە : باشکیری : کەرەبۆگە [کەرە : رەش، بۆگە : مانگا]، بوراکای [حوشتر]

نیشانەی تایبەتی هەندێك لەئەندامانی لەشی مرۆڤ سەرچاوەیەکی ترە بۆناونانی منداڵ، لەزۆر زماندا منداڵیان بەناوی رەنگی قژ، یا پێستەوە ناوناوە، بۆنموونە : سکیفی : سورخەك [قژسوور، یا پێست سوور]، ئەم ناوە سیکفییە چۆتە یۆنانییەوەو بووە بە سورخاکۆس؛ تورکی : ئاك، ئاکیای [سپی]، ساری، سارییێك، سارییای [زەرد]، قەرە، قەرەبێك، قەرەبای [رەش]، باشکیری : کەرەسەس [قژ رەش]، کەرەگاش [برۆرەش]، کەرەباش [سەررەش]، تاجیکی : زەرد، زەردەك، زەردۆن [زەرد]، سورخ، سورخەك [سوور]، لەهەندێ ناوچەی شاخاوییەکانی تاجیسکتاندا کە زوربەیان قژکاڵن، وەختێك لەخێزانێکدا منداڵێکی قژ رەش لەدایك دەبێت ناوی دەنێن (سیوهـ) [رەش]، لە خێزانێکیشدا ئەگەر هەموو منداڵەکانیان قژ یان رەش بێت، تەنیا منداڵێك قژی کاڵ بێت ئەومنداڵە ناو دەنێن (سیوهـ) بەڵکو بەهۆی ناوکەیەوە ئەمیش قژی رەش بێت، وشەی (سیوهـ) لەومنداڵانەش دەنێن کە لە کاتی لەدایك بوونیاندا کارەساتی ناخۆش وەك مردنی دایك، یاباوك رووی دابێت . لەخوارووی تاجیسکستان منداڵی ئەسمەر ناونراوە (ئەفغان)، واتە ئەفغانی، چونکە بەگشتی ئەفغانەکان ئەسمەرن . زوربەی میللەتانی ئاسیای ناوەراست و تەتەرەکانیش کە منداڵی قژ زەرد، یا قژکاڵیان دەبوو ناویان ناون (ئوروس)، واتە (رووس)، وشەی (تورکی)یش کە لەزمانی عەرەبیدا بووە بەناو لەوە دەچێت لەومنداڵانە نرابن کە سووروسپین .

لەزمانی کوردیدا ئەم رەنگانە بوون بە لەقەب، وەك : تۆفیقە سوور، حەمەرەش، ئەحمەسوور. . . هتد .

منالّ که لەدایك دەبێت وا رێك دەکەوێت که نیشانەیەکی دیارو سەرنج راکێشەری پێوە بێت، ئەو نیشانەیە لەوانەیە (خالّ) بێت که له هەندێ زماندا بووە بەناو: تاجیکی: خۆل [خالّ]، خۆلمورۆد، خۆل مەت، ئۆزبەکی: خۆل بێك. لای میللەتانی ئاسیای ناوەراست (خالّ) نیشانەی بەختەوەرییە، لەبەر ئەوە وشەی (خالّ) یان خستۆتە پالّ ناوە ئەسلّیکە، گوایە بەهۆی ئەمەوە ئەو منالّەی بەوە ناو دەنرێت لە دوا رۆژدا کامەران دەبێت لەرولاوازی ئادەمیزاد، یا زیادییەك لە ئەندامەکانی لەشیدا بوون بەناو: تاجیکی: خەرۆب، لۆغەر [لەرولاواز]، گیردەك [قەلّەو، خر، خرپن]، هەندێ جار وشەی (گیردەك) کراوە بەناو بۆ منالّێکی لاواز بۆ ئەوەی لەدوا رۆژدا قەلّەو بێت، لای تاجیکێکان منالّێك که پەنجەیەکی دەستی، یا پێی زیاد بووبێت ناونراوە: زیۆدە [زیاد]، ئۆزبەکی: ئۆرتوك [زیاد] لەزمانی کوردیدا ئەم پەنجە زیادییە بووە بەلەقەب، وەك: (شەشە) کەلەقەبە.

ئەو کاتانەی که تیایدا منالّ لەدایك دەبێت، لەزۆر زماندا بووە بەناو، ئەم جۆرە ناوانە بەگشتی ناوی رۆژ و مانگە وجەژ ن وئەو بۆنانەش (موناسەبات) که لەگەلّ کاتی لەدایك بوونەکەدا بەرێکەوت یەك کەوتوون، کاتی رووداوی هەمە چەشنە، ناوی وەرزەکانی سالّ، بورجەکان، کاتی کۆکردنەوە، یا پێگەیشتنی بەروبوومی کشتوکالّ، دەگرنەوە، بۆ نموونە: تاجیکی: جومعە، ئۆدینە [هەینی، جومعە]، بەیرەم [جەژ ن]، ئیدی، ئیدیێك ئیدیگول [ئەم ناوانە هەموویان وشەی جەژنیان تێدایە، واتە ئەو منالانە لە جەژناکانی خۆی لەدایك بوون]، سەبز بۆهۆر [سەوزە بەهار]، ئۆشوب [ئاژاوە]، ئوروش [شەر]، کەختو [گرانی، قاتی]، بەشۆرەت [بەشارەت]، موژدە، سەرەتۆن [بورجی سەرەتان]، ئەکرەب [بورجی عەقرەب]، سەفەرگول [گولی مانگی سەفەر]. لە ناوچە شاخاوێکانی تاجیکستاندا ناوی هەندێ بەربوومی کشتوکالّی لەمنالّ نراوە، لێرەدا دوور نییە بەناوی کاتی کۆکردنەوەی، یا پێ گەیشتنی ئەو بەروبوومانەوە ناو نرا بن ـ وەك: جەف [جۆ]، جەڤپوخت [جۆیێ گەیی]، گەندم، نەخود [نۆك]، نەسك [نیسك]، زەگیر [رووەکی کەتان]. بە دووری نازانین کەناوی (کەتان)ی کوردیش لەسەرەتاوە لەرووەکی کەتانەوە وەرگیرابێت، ئەگەر لەناوی قوماشی کەتانەوە نەبێت. لەباشکیریدا: کۆن هیلو [کۆن: رۆژ، هیلو: جوان]، ئای هیلو [ئای: مانگە]، ئای سیاك [سیاك: رووناك]. لەزمانی کوردیشدا وشەی (هەتاو) لەئافرەت نراوە دیارە ئەو رۆژەی تیایدا لەدایك بووە رۆژێکی هەتاو وخۆش بووە. لە باشکیریدا کاتێ کە کاروان بەرێوە بووو کۆچیان کردووە کە منالّیان لەو وەختەدا بووە ناویان ناوە: یۆل ئامان [یۆل: رێکە، ئامان: خۆش، دروست، سەرکەوتوو]، لەو کاتانەشدا کە منالّیان بووەو میوانیشیان بووە منالّەکەیان ناوناوە: کۆناك بابی [کۆناك: میوان] بابی: دەولّەمەند]

لەزمانی کوردیشدا ناوی رۆژ وبەشەکانی رۆژ ومانگ ووەرزو جەژنەکان بوون بەناوی مرۆڤ، وەك: بەیان، جومعە، رەمەزان، قوربان، رەجەب، شەعبان، نوری [لەدایك بووی مانگی نور]، نەورۆز، بەهار، گولّبەهار... هتد.

ئەگەر منالّێك لەکاتی رووداوێکی خۆش، یان ناخۆشدا لەدایك بووبێت لەکوردیدا لەم ناوانە هەلّبژێراون: خۆشی، ئاشتی، مژدە، جەنگی، ژالّە. لەراستیدا ناوی زۆر میوەو گولّ ورووەك لە منالّ نراون ئەم شێوە ناونانە واتە ئەو جۆرە ناوانە لەوە دەچێت کەبنچێکی مێژوویی قوولّی هەبێت، جا لێرەدا لەوانەیە ئەو منالّەی کەبەم جۆرە ناوانە ناونراوە لەکاتی پێ گەیشتنی ئەو میوەو گولّ و رووەکانەدا لەدایك بووبێت، یا شێوەی منالّەکە شوبهێنرا بێت بەوانە: تاجیکی: نۆریوێی [نۆر: هەنار، بۆی: دەولّەمەند)، نۆرکول [کول: هەموو] لەکوردیدا: گولّە، گولّەباخ، گولاّلّە، شەوبۆ، مینا، لاولاو، نێرگس، چنار، کەنێر، شەمام، بەهێ، گێلاس، چرۆ، سنەوبەر، خونچە..... هتد

شوبهاندنی خەلّکی بەگیانلەبەرو پێ گیان لەزۆر کۆنەوە لەناوی مرۆڤدا هەیە، لەم بارەوە لە زۆر زماندا نێرینە بەگشتی ناوێکی لێنراوە کە لەبنچەدا واتای پتەوی وبەهێزیو لێ هاتوویی وئازایی و کارامەی بەخشیوە، .ئەوجۆرە واتایانەش دیارە مرۆڤ لەزۆر هێزو گیانلەبەری ئازاو درندەو گەلێ شتی سروشتیدا بەدی کردووە، بەپێچەوانەی ناوی نێرینە لە زۆر کۆنیشەوە ولەزۆر زمانشیدا هەر شتێك لە سروشتدا نیشانەی جوانی وناسك ونازداریو گەشاوەیو خۆشەویستی بووبێت، بەگشتی سەرچاوەوکانی هەلّهێنجاندنی ناوی مێینە بوون.

بۆ نموونە: ناوی گیانلەبەرێکی ئازایی وەك (شێر) لە زمانی کوردیو لەزۆر زمانی تر لە جیهاندا بە بەردەوام تاکوئێستا لە مرۆڤ نراوە؛ عەرەبی: اسد، یۆنانی: لیۆن، فەرەنسی: لیۆن، ئنگلیزی: Lion، رووسی: لیڤ، ئازربایجانی: ئارسلان، کازاخی: ئاریستەن، تاجیکی: شێر وشەی (شێر) لەزمانی کوردیدا بەشێوەی (شێرۆ)و

(شێركۆ) وەك ناوی مرۆڤ ئێستا بەكاردەهێنرێت. لە ناو ئەو وشانەدا كە لە زۆر كۆنەوە لە كۆمەڵێك زمانـدا بووە بەناوی مرۆڤ وشەی (بـەرد)ە. گوایـە ئەو منـاڵـەی كە بە (بـەرد) ناوی دەنێن وەك بەرد هەمیشـە قایم وپتـەو دەبێت و هیـچ كاتێـك لەش بەبـارو نەخـۆش نابێت، هۆیـەكی تریش بۆ ناونـانی منـاڵ بەبـەرد ئەوەیە كە لەكۆندا (بـەرد) بەشتێكی پیرۆز دانراوە.[٢٦] (Peter)ی ئنگلیزی وەربگێڕێتە سەر زمـانی یۆنـانی كۆن واتـای (بـەرد) دەگـەیـەنێت، تاجیكی: سەنـگ، سەنگین، سەنگـمـورۆد، سەنگـەك، تۆش، تۆشبـۆی، تۆشبێك [لەو وشە تاجیكیانەدا سەنگ وتۆش هەر دووكیان بەردن].

بۆ ناوی مێینە لە هەندێ زماندا جگە لەو واتایانەی پێشتروتمان، وشەی تریش هەڵبژێراوە كە نرخ وبەهاوپلەی بەرزی دەست نیشان دەكـەن: توركی: ئالـتین باش [سـەر بەزێـڕ]، بیشبینی [پێنـج هەزار]، كوردی: دەوڵـەت، سەڵتـەنـەت، سوڵتـانە، حەوت سەد [دیارە مەبەست حەوت سەد لیرەیە].[٢٧]

لەزمـانی كوردیـدا جگـە لەو هۆكـارانـەی كە تاكو ئێستا لە چەند زمـانێكی تری جیهـانیشـدا لە ناونـانی مرۆڤـدا دەوریـان گێـڕاوە، هەنـدێ هۆكـارو داب و نەرێتی تـر تا ئێستـا لەنـاونانـدا لە كاردان كە هەندێكیان دیسانەوە لە چەند زمانێكی تردا بەدی دەكرێن

١) بڵاوبـوونـەوەی ئایینی ئیسـلامی پیـرۆز بە هۆكـارێكی هەرە سەرەكی وگرنگ لە ناونانی مرۆڤ لەزمانی كوردی وتێكرای میللەتە موسوڵمانەكانی جهاندا دادەنرێت. زوربەی ناوە كوردییە نێرینەكان لەبنجدا عەرەبی بوون لەرێگەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزەوە هاتوونەتە ناو زمـانی كوردییـەوەو تاكـو ئەمرۆ لە برەودان و بوون بەهۆی فراوان كردن و دەوڵـەمـەنـد كردنی نەك تەنیـا زمانی كوردی، بەڵكوو زمانی هەموو میللەتە موسوڵمانەكانی تریش.

٢) ناونانی مناڵ بەناوی (باوك، دایك)ی دایك وباوكی مناڵەكە، یا بەنـاوی برای، یا خوشـكـی یەكێـكـیـان، یا بە ناوی دۆستێكی خۆشـەویستی خێـزانـەكـە، تا ئەمـرۆ لە زۆر خێـزانـدا پەیـرەوی دەكـرێت. ئەم عادەتـە لەوە دەچێت كە بنجێكی زۆر كۆن وقووڵی هەبێت و نەرێتێكـە پەیـوەنـدی بەباوەڕ بەبـوونی یەكێتی نێوان ناوو رۆحـەوە هەبـووە، بەڵگـەشمـان بۆ ئەمە ئەوەیە كە هەندێ میللەتی سەروو سیبیریـا تاكـو ئێستـاش باوەڕیـان وایە كە ناوورۆح یەكن، لەبـەر ئەوە منـاڵـەكـانیـان بەنـاوی خزمـە مردوەكـانیانەوە ناودەنێن. دیـاردەی ناونـانی منـاڵ بەناوی كەس وكاری مردووەوە دیاردەیەكە ئێستاش لەناو زۆر میللەتدا باوە.

٣) یەكـەم فۆنێمی، یا دوا فۆنێمی ناوی یەكـەم منـاڵ، یا نۆبـەرەی خێزان دەبێت بەهۆی ئەوەی كەناوی مناڵەكانی تریش یا بەو فۆنێمە دەست پێ بكـات، یا بەو فۆنێمـەش كۆتـایی بێت، وەك: مەستـان ئالان، چۆمـان، شیـلان، ژیلوان [دوا فۆنێم لەو ناوانـەدا (ن)ە]، كەژاڵ، كاوە، كامەران، كاڵێ [یەكەم فۆنیمیان (ك)یە].

٤) ئەو خێـزانـانەی كە هەركچیان بووە بەگشتی بۆ ناوی كچەكان تا كوڕێكیان بووە ناوی، وەك:

(حـەمـدیـە، سەبـریـە، شوكـریە)، واتە حەمدوسەنا بۆ خوای گەورە، سەبر دەكەین وشوكرین بە بەشت، بەڵام كە كوریان بووە، بەگشتی بەنـاوی پێغـەمبەری مەزنی ئیسلام (محمد) د.خ) ناویان ناوە، هەنـدێ جاریش (شـوان)یـان بە قاڵبـە كوردییـەكـەی وشەی (محمـد) كە (حـەمـە)یـە ناوەو بووە بە (حـەمە شوان)، گوایە لەدوا رۆژدا ئاگای لەخۆشكەكانی دەبێت و وەك شوانی لێ دێت بۆیان

٥) لەزمـانی كوردیـدا هەندێ خواردن لەبەر تام خۆشی، یا جوانیان ناوەكـانیـان لەمـرۆڤ نراوە، وەك: نەبـات، نوقـوڵ، شەربـەت، شەكراو (بەگشتی ئەم ناوانە لە مێینە نراون).

٦) ئافـرەتێـك ئەگـەر بەئـاسـانی منـاڵـەكەی نەبووبێت، كەبووە، هەندێ جار لەم ناوانەی لێنراوە: رزگار، نەجات، گران.

٧) ناوی هەنـدێ شت ومـەك كە بۆیەكـەم جار دروست كراوە یا بۆیـەكـەم جار خەڵكی بینیـویـانـە كراون بەنـاوی مێینـە، وەك: سوراحی، شوشـە، قومـاش، چرا، چل چرا. ئەم شتـانـە دیارە بەلایـانـەوە جوان بوون بۆیـە كردویـانن بەناو. بە شێوەیەكی گشتی ئەمـانـە ئەو هۆكارانە بوون كە لەزمانی كوردی وكۆمەڵێك زمانی تردا لە ناونانی مرۆڤدا دەور دەگێڕن، بەڵام لەپاڵ ئەو هۆكارانەدا هەمیشە لەهـەر یەكێـك لەزمـانـەكـانی جیهـاندا بەپێی بارو چەشنی ژیان و پەیـوەنـدی كۆمەڵایـەتی وپلەی رۆشنبیـری وڕووداوی رامیـاری، هۆكـارتـرو داب و نەرێتی تایبـەتیش لە هەڵبژاردن و پەسەند كردنی ناوی مرۆڤدا كار دەكەن.

ناوی مرۆڤ وەك نیشانمان دا لە ناوی گشتیەوە وەردەگیرێت، یا لەزمـانی ترەوە دەخـوازرێت،[٢٨] ئەو ناوە گشتیـانـە دیـارە خاوەنی خاسێت وتایبـەتێتی مۆرفـۆلـۆژی خۆیـانن، جا كە دەشبن بەناوی مرۆڤ بەگشتی ئەو خاسێتە مۆرفۆلۆژیانەیان هەر پێوە دەمێنێت، ناوە خوازراوەكـانیش ئەو تایبـەتێتیـە مۆرفـۆلۆژیانە وەردەگرن كە لە زمانە نوێكـەدا ناوەكـانی تر هەیـانـە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمە چەند تایبـەتێتیـەكی مۆرفـۆلـۆژی ناوی مرۆڤمان لەزمانی كوردیدا بەرچاو

کەوتووە کەبەو شێوەیەی خوارەوە دەیان خەینە ڕوو:

١) گومـانی تێـدا نییە کە هەموو وشەیەك کە لە زمانێکەوە دەچێتە ناو زمـانێکی ترەوە دەکەوێتە ژێر باری گۆڕانی فۆنەتیکی ئەوزمانەی کە تێی هاتووەودەبن بەموڵکی ئەووەك هەمووشەیەکی تری ئەوزمانە هەڵس و کەوتی لەگـەڵـدا دەکـرێت و دیارە خاسێتە مۆرفۆلۆژیکانی ئەو زمانەش وەردەگرێت. جاری وا هەیە گۆڕانی فۆنەتیکی وا بەسەر وشـەی خوازرودا دێت کە ئەگـەر بێت بیـان دەیتـەوە بە خاوەنـە ئەسڵێکـانیـان نایـان ناسنـەوە. بۆ نمـوونـە: ئەم ناوە عەرەبیـانـە: [محمـد، احمـد، محمود، اسماعیل، ابراهیم، سعید، رشید، عبـدالـلە، مجیـد، امین، قادر، صالـح] لەگـەڵ ئەوەدا کە لە ڕەسمیـاتـدا وەکـو خۆیـان بەکار دەهێنرێن، بەڵام چووشنەتە قاڵبی کوردییـەوە کە ئەمانەیە [حەمە، ئەحە، خولە، سمە، بلە، سەعە، ڕەشـە، عەبـە، مەجـە، مینـە، قالـە، سالـە]. جا لە مۆرفۆلۆژیدا پاشگری بچوککردنەوەو ناسك ونازداری بەگشتی دەچێتە سەر قاڵبە کوردێکـانی ئەو ناوانە، وەك: سەعۆل، ڕەشۆل، عەبۆل، مەجۆل [ئەم وشانە لە ناو + پاشگری ۆل پێکهاتوون].

٢) ئەو ناوانـەی کە هی ئافـرەتن و بە ئەسـڵ عەرەبین، کە هاتـوونە کوردییـەوە پاش گۆڕانی فۆنـەتیکی نیشانەمێینەکەشیان کە لە زمانی عەرەبیدا پێوەیان بووە، یا دەپەڕێنرێت، یا دەهێلرێتەوە، پەڕاندن و هێشتنـەوەی ئەو نیشـانەیە بەستراوە بەپلەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری ئەو کەسـانـەی کە بەکـاریان دەهێنن، بەگشتی لەناوخوێندەوارانـدا بێ نیشـانـەکـەیـە، ئەمانەی خوارەوە هەندێك لەو ناوانەن بەشێوەیە ئەسڵێکـەیـان و بەشێـوەو قاڵبـە کوردیکـانیـان: صبیحـة) سەبیح، صبري) سەبری، عائشە) ئایشێ، امینە) ئامین / / ئامە، خدیجة) خەجێ

٣) بەگـشـتـی وەك هەنـدێ ناوی‌تـر ناوی مرۆڤیش بە (ان) کۆ ناکـرێنـەوە، بەڵکـو پێویستە ناسراو بکرێن ئەنجا کۆدەکرێنەوە، بۆ نمـوونـە: ناتـوانین بڵێین: نەسـرینانی ئەم پۆلـە زیرەکن، بەڵکوو دەبێت بڵێین: نەسرینەکانی ئەم پۆلە زیرەکن.

٤) لەبـەشـەکـانی ئاخـاوتندا جگە لەناوژمارەیەکی زۆر لەئاوڵناوی ئاسـان و . ا. ئـ. ا ە لێکـ. ا ە ٦ ەتایبـەتی ئەو ئاوڵناوە لێکدراوانەی - نەوا دـانیـان مەجازی (میتافۆر) ن] لە ناوی مرۆڤ نراون، وەك: ئازاد، جوان، شیـرین، نەخشین، زیـرەك، بەختیـار، هوشیـار، دڵپاك، ڕووپاك، دڵ ئارام، ڕووخۆش، ڕووجوان.

**لەکۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەگەینە ئەم ئەنجامانە:**

١) مێـژ ووی ناوی مرۆڤ لەزمـانی کوردیـدا دەشێ بکرێت بە (٣) بەشـەوە: پێش موسـوڵمانەتی و دوای پەیدابوونی ئیسلام تا جەنگی جیهـانی یەکـەم لەوێشـەوە تا ئەمڕۆ. ناوی مرۆڤ لەسەردەمی پێش ئیسلامدا بە شێوەیەکی گشتی لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لێڵەوتەمی بە سەرەوەیە، هەرچەندە لەڕووی واتاوە دەکرێت ڕووناکی بخرێتە سەر.

٢) ناوی مرۆڤ لەزمـانی کوردیـدا، لەبنجـدا کوردین، یا لەزمانی ترەوە بەتایبەتی لەزمانی عەرەبییەوە خوازرون.

٣) ناو وئاوەڵناو بەکەرەسەی سەرەکی ناوی مرۆڤ لەزمانی کوردیدا دەژمێرێن.

٤) ئەرکی هەرەگـرنـگ و سەرەکی ناوی مرۆڤ جوداکـردنـەوەی کەسێکە لە کەسێکی تر لەکۆمەڵدا.

٥) لەزمـانی کوردیـدا (جگـە لە ناوە بەئـەسـڵ عەرەبێکان کەواتای کوت ومت ئاینـی دەبـەخشن) وکۆمـەڵـە زمـانێکی تریشـدا ئەو ناوانـەی کە بۆنێـرینـە هەڵ دەبـژێـرێن، واتـای بەهێـزی وپتەوی و ئازایـەتی دەبـەخشن، بەڵام ناوە مێینـەکـان جوانی وپاکی و نـ. ـلك و نازداری و ڕازاوەیی دەبەخشن.

٦) لە هەمـــو زمـانێکـدا هۆکـارو داب و نەریتی تایبـەتی دەور لە هەڵبـژاردنی ناوی مرۆڤـدا دەبینن، بەڵام بۆی هەیـەکـە چەنـد هۆکارێك لە کۆمەڵێك زماندا هاو بەش بن.

## پەراوێز

١) لەم لێکـۆڵینـەوەیەدا ناوی تایبەتی مرۆڤ و زۆر جاریش بەتەنیا ناوی مرۆڤ بەکار دەهێنین.

٢) ف. ئـا. نیکـۆنۆف، مەسـەلەو ئەنترۆپۆنیمیك، لەکتێبی ناوی تایبەتی مرۆڤ لەرابوردوو و ئێستاو داهاتوودا، مۆسکۆ، ١٩٧٠، ل٣٣.

٣) هەر لەم لێکـۆڵینـەوەیـەدا ئەو کارانە نیشـان دەدەین کە دەربارەی ناوی مرۆڤ تائێـستا بە زمانی کوردی کراون.

٤) ئە. غ. غەفوروۆف، دەربارەی ناوە ڕۆژهەڵاتیکان، مۆسکۆ، ١٩٧١، ل٤.

٥) هەمان سەرچاوە، ل٤

٦) ف. ئا. نیکۆنۆف، زمان و کۆمەڵ، مۆسکۆ، ١٩٧٤، ل٦.

٧) هەمان سـەرچاوە، ل٧.

٨) مامۆسـتـا بەشیر موشیر لە لاپەڕە (٣٢، ٣٣، ٣٤)ی پاشکۆی کتێبی سیارەی حق پەرستی کە لە بەغدا، ١٩٣١ چاپ کراوە، بە دوو لیستە ناوی کوڕوکچی

کوردی نووسیوە، مامۆستا عەلادین سوجادی لە بەغدا، ١٩٥٣ نامیلکەیەکی بە ناوی (نــاوی کوردی) چاپ کردووە کە تیــایــدا ناوی کوردی بێ لێکــۆڵینــەوە ریــزکــراوە، مامۆستا گیوی موکریانی نامیلکەیەکی بەناوی (نێوی کچ و کورانی کوردی) دانــاوە، ساڵی ١٩٨٥ لە هەولێــر بۆ سێــیەم جار چاپ کراوەتــەوە، ئەم نامیلکــەیەی مامۆستا گیویش دیــسانەوە بێ لێکۆڵینەوەیە، هوشیار محەممەد حاجی عەزیــز قەفتــان نامیلکــەیەکی بەناوی (ناوی کوردی نوێ) لە سلێمانی، ١٩٦٨ بلاوکــردوتــەوە، ساڵی ١٩٧٥ بۆ دووەم جار پاش زیادکردنی هەندێ ناو لەچاپی داوەتەوە، هەردوو نامیلکەکە بریتین لە ریزکردنی ناو.

٩) بۆ وتــارەکانی مامۆستا مەحمود زامدار، بروانە: گۆڤاری رۆژی کوردستان، ژمــارە (٣٢، ٣٣)ی ســاڵی ١٩٧٥ و ژمــارە (٩٩)ی گۆڤــاری رۆشنبیــری نوێی ساڵی ١٩٨٣

١٠) بروانە وتاری د. جەمال رەشید، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٥ - ١٠٦)، ١٩٨٥

١١) بروانــە. عبــاس کاظم مراد، اسمــاء النــاس، الجــزء الاول، بغــداد، ١٩٨٤، ص. ١٤٦ - ١٨١

١٢) بروانــە وتــاری د. عیــزەدین مستــەفــا رەســوڵ، رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٠٦١)، ١٩٨٩.

١٣) لە بەشێکی تایبەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بەگشتی ئەو هۆکارانە خراونەتە روو.

١٤) ئە. غ. غەفــوروْف، ئەنتــرۆپــۆنیمیکی تاجیکی، لە کتێبی ناوی تایبــەتی مرۆڤ لەرابوردوو و ئێــستاو داهاتوودا، ل٢٧٨ - ٢٨٣

١٥) سەرچاوەی ناوبراو، وتاری د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، هاوکاری (١٠٦١).

١٦) ت. خ. کوسیمــۆڤــا، دەربــارەی مێژووی ناوی تایبەتی باشکیری لەکتێبی ناوی تایبەتی مرۆڤ لەرابوردوو و ئێــستاو داهاتوودا، ل٢٤١ - ٢٤٨

١٧) سەرچاوەی ناوبراو، ف. ئا. نیکۆنۆڤ، زمان و کۆمەڵ، ل٦.

١٨) ئا. ڤ. سوپێرانسکایا، پێک هاتنی ناوی تایبەتی، مۆسکۆ، ١٩٦٩، ل٩.

١٩) هەمان سەرچاوە، ل١٠.

٢٠) ئی. ڤ. بێستــوژێڤ - لادا، بەرەو پێش چوونی مێــژووی پێش کەوتنی ناوی مرۆڤ، لە کتێبی ناوی تایبەتی مرۆڤ لە رابوردوو و ئێستاو داهاتوودا، ل٢٤.

٢١) لە زانستی زمــانــدا زاراوەی (taboo) بۆ ئەو وشــانــە بەکاردێت کە لەبەر ترس نەهی لە بەکارهێنانیان کرابێت، بەڵام ئەگەر لەبەر پیرۆزی وگەورەی بووزاراوەی (totem) بەکاردێت.

٢٢) ستیفن اولمــان، دور الكلمــة في اللغــة، ترجمــة د. كمــال محمــد بشيــر، قاهرة، ١٩٧٥، ص١٧١.

٢٣) هەمان سەرچاوە، ل١٧٦.

٢٤) ئەم ناوە ناکــوردییــانــەم لەو سەرچــاوانــەوە کە لە پاشکۆی ئەم باسەدا نیشان دراون وەرگرتووە.

٢٥) ناوی مانگــەکــانی تریش دیــســانەوە بون بەناوی مرۆڤ، وەك: موحەرەم، حوزەیــران، نیــســان [قــوتابیەکی خەڵکی پارێزگای هەولێر کە لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی سەلاحدین دەخوێنێت، باوکی ناوی (حوزەیران)ە باپیریشی ناوی (نیسان)ە.

٢٦) سەرچاوەی ناوبراو، ئە. غ. غەفوروْڤ، دەربارەی ناوە رۆژهەلاتیکان، ل٦.

٢٧) ناوی (حەوت سەد)م لە قوتابی خوێندنی باڵا (کەوسەر عەزیز ئەحمەد) وەرگرتووە.

٢٨) ئێمە زاراوەی (خوازراو) بەگونجاو لەزاراوەی (بێگانە) دەزانین.

## سەرچاوە

١) د. ئــەورەحمــانی حاجی مارف، رێــزمــانی کوردی، بەشی یەکــەم - ناو -، بەغدا، ١٩٧٩.
٢) تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزمی یەکەم، بەغدا، ١٩٢٩.
٣) سەعید سدقی کابان، مختصر حرف ونحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٨.
٤) محمد معروف فتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحدین، ١٩٨٧.
٥) نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

بەزمانی عەرەبی

١) الدکتور ابراهیم الســامرائي، الاعلام العربیة، بغداد، ١٩٦٤.
٢) الدکتور تمام حسان، مناهج البحث في اللغة، الدار البیضاء، ١٩٧٤
٣) الدکتور محمد حسن عبدالعزیز، مدخل الی علم اللغة، قاهرة، ١٩٨٣.

بە رووسی

١) ئۆ. س. ئەخمانۆڤا، فەرهەنگی زاراوەی زمانەوانی، مۆسکۆ، ١٩٦٦
٢) ر. ئا. بوداگۆڤ، سەرەتایەك لە زانصت دەربارەی زمان، مۆسکۆ، ١٩٥٨.
٣) ڤ. ڤ. ڤینۆگرادۆڤ، زمانی رووسی، چاپی دووەم، مۆسکۆ، ١٩٧٢.
٤) ب. ت. گۆلۆڤین، سەرەتایەکی زمانەوانی، چاپی سێیەم، مۆسکۆ، ١٩٧٧
٥) یا. ئی. کالۆنتاروڤ، فەرهەنگوکی تاجیکی - رووسی، مۆسکۆ، ١٩٥٥.
٦) ڤ. ئی. کۆدخۆڤ، زمانەوانی گشتی، مۆسکۆ، ١٩٧٤.
٧) یو. س. ماسلۆڤ، سەرەتایەکی زمانەوانی، مۆسکۆ، ١٩٧٥.
٨) یو. س. ستیپانۆڤ، بناغەی زمانەوانی گشتی، مۆسکۆ، ١٩٧٥.

ملخص البحث

# اسم العلم في اللغة الكردية - دراسة مقارنة

**الدكتور محمد فاروق عمر صديق**

**قسم اللغة الكردية بكلية الاداب**

**جامعة صلاح الدين**

يتناول هذا البحث بمنهج مقارن اسم العلم في اللغة الكردية مبتدء بتوطئة تاريخيه عنه موزعاً اياه على ثلاثة مراحل اولاها هي مرحلة ما قبل الاسلام وثانيتها بعد انتشار الديانة الاسلامية الحنيفة وحتى الحرب العالمية الاولى وثالثتها تبدأ بهذه الحرب وتستمر حتى الوقت الحاضر. وقد كان القصد من هذه التوطئة الوقوف على المفردات التي صارت اعلاما من حيث اصولها وتركيباتها ودلالاتها وتتبع تأثيراتها وانعكاساتها على التسميات التي يتداولها الناس حتى الان.

وعرض البحث الى الوظيفة الاساسية التي يتولاها اسم العلم وهي وظيفة متفرعة ليمثل تميز الافراد بعضهم من بعض اظهر جوانبها فضلا عن كشفه عن الميل الجماعي، او الفردي، الى ماهو سائد في المجتمع من قيم ومعتقدات وتقف هذه الوظيفة وراء دوافع المجتمعات البشرية، وخاصة الشرقية منها الى اختيار اسم ما واطلاقه على المولود وتتفاعل معها في الوقت ذاته. وان من ابرز هذه الدوافع اعتقاد الناس باهمية التسمية ودورها الايجابي الذي يمكن لها ان تلعبه مع القوى الغيبية المتحكمة في المصائر وعلى نحو يظهر ما تكنه النفوس لها من اجلال او تنطوي عليه من رهبة، والرغبة في تحديد الزمن الذي وقعت فيه الولادة او الحوادث التي رافقتها بغض النظر عن طبيعتها، والشعور بالتفاؤل في حالة اختيار اسم ما والتطلع الى ان يمثل المسمى ما تم اختياره له مستقبلا ويمكن ملاحظة هذا الامر بوضوح في الذكور الذين تطلق عليهم الاسماء التي تحمل امارات الشجاعة والبسالة والاقدام والتي تتميز من اسماء الاناث الدالة على الرقة والجمال وفضلا عن ذلك فقد يعمد المرء الى ان يبرز ما يتسم به المولود من علامة فارقة في بدنه او ان يعرب بوساطة عن اعتزازه بآبائه واقربائه فينتقي فهم اسما له وهناك دوافع فرعية اخرى ورد ذكرها في اصل البحث ولكن ما اريد الاشارة اليه هنا هو ان المجتمعات المتخلفة ظلت، وعلى الرغم من اشتراكها في هذه الدوافع مختفظه بخصوصيتها ومحكومة بقوانينها الخاصة فكان ان برز عند كل منها تأثير عامل بعينه اكثر مما عداه عند اطلاق التسمية.

لقد توصل البحث الذي احسب انه تفرد بمنهجه المقارن بين اللغة الكردية من جهة ولغات شرقية متعددة اخرى من جهة اخرى الى جملة من النتائج ابرزها:

١. ان اسم العلم في اللغة الكردية وفي عصر ما قبل الاسلام إتسم بغموض ما لقلة المصادر الموثقة التي من شأنها تعيننا على الاحاطة به وطبيعة اشتقاقه وان كان في مقدورنا ان ندرك اونتكهن بما ترمى اليه من دلاله.

٢. انتظار اسماء الاعلام في اللغة الكردية على قطرين اولهما ما هو كردي خالص من حيث الاصل والاشتقاق وثانيهما ما هو مقتبس اما من اللغة العربية واما من التسميات الاسلامية مع اجراء تحوير عليها يناسب التلفظ الكردي في احيان كثيرة.

٣. ضرورة الاسم العام والصفة مصدرين اساسين من مصادر نحت اسم العلم في اللغة الكردية.

٤. اضطلاع التسمية بمهمة التفريق بين الافراد اوبتشخيص ما وقف وراء اختيارها من اسباب وهما مما اشرنا اليه من قبل.

روشنبیری گشتی

# ئایا ئافرەت و پیاو وەك یەكن

ئازاد رؤوف قەزاز

كە دەروانینــە جیهــانی لە یەكتــر جیــاوازی پیــاووئافــرەت، تێدەگــەین ژیــان بەهــەردوكیــانــەوە نەبێت بەرێــوە ناچێت، وەكــو «توماس سازِ» دەڵێ «پیاو دەتوانێ بەبێ ئافرەت بژی بەڵام ناتوانرێ بوترێ ئەو پیاوە زیندووە» [(١)].

ئەگــەر تۆزێــك لەلایــەنی بایــەلۆژی و سایكۆلۆژی ئافرەت و پیاو وردبینــەوە؛ دەردەكەوێت لەزۆر لایەنی دەروون و رەفتارو هەست و نەست و هەڵوێست و بیركردنەوەشدا لەیەكتر جودان.

هەر لەیــەكــەم خانــەی دروست بونــەوە ئەم جیــاوازییــە دەست پێدەكــات، چونكــە یەكــەم خانــە گشت ئەو سیفاتە بایەلۆژییانەی تێدایە كە لە ماوەیەكی داهاتوودا لەو كە سەدا دەردەكەوێت.

ئەگــەر تۆوی پیــاو، كە لە دوو كرۆمــۆســۆمی (XY) پێــك هاتووە، كرۆمــۆســۆمی (Y) لەگــەڵ كرۆمــۆســۆمی (X) ی ئافــرەت كە لەدوو كرۆموسۆمی (XX) پێك هاتووە یەكیان گرت، واتە بەم چەشنە (XY) ئەوا ئەو كۆرپەلەیە نێرینە دەردەچێت، بەڵام ئەگەر (X)ی پیاو لەگەڵ (X) ی ژن یەكیان گرت واتە (XX) ئەوا كۆرپەلەكە دەبێتە مێینە.

جگە لەمەش دوو هۆرمۆنی جنسی جیاوازن وا رەفتاری ئەم دوو توخمــە دیــاری دەكــەن ئەویش هۆرمــۆنی نێــرینەی (ئەندرۆجینە)و هۆرمۆنی مێینەی (ئەسترۆجینە)ە.

(جــا لەبــەر ئەوەی مێشــك زاڵە بەسەر هەموو فرمانەكانی لەش، ئەمــە راستی یــەكە وامان لێ دەكات باوەڕ بینین بە جیاوازی لە نێوان مێشكی نێر و مێدا، چونكە رەفتارو هەڵس و كەوتی ئەو دوو توخمە لەیــەكتر جیلوازن، لەو رەفتارانە، تووڕە بوون و توندو تیژی و مەیلی شاڵاو بردنــە لە لایــەن پیــاوەوە، كە چەنــد رەفتــارێكی تایبــەتین بەخــۆیــەوە، هەمیشــە زاراوەی (تــوتــر ـ Agonistic) بەو وزە پەنــگ خواردووە بەلێشــاوە دەڵێن كە چەنــد رەفتــارێكی وەك (هــەڵاتن، هەڕەشــەكــردن، زۆرانبــازی، شاڵاو بردن، بەرگــری كــردن) دەگــرێتــەوە، ئەم رەفتــارانــەش گشتیــان بە هۆرمــۆنی نێــرینــە (ئەندرۆجینەوە) بەستراو نەتەوە) [(٢)].

(هــەروەها هۆرمۆنی مێینە (ئەسترۆجین) دەوری هەیە لەهێدی كردنــەوەو، دەنــگ ناســك كردنەوەو، پرچ و زۆری قژە سەرو، كەم [(٣)]

کردنەوەی لە لەشداو نەرمی و ناسکی پێستی لەش)

دکتۆر ریکان ابراهیم دەڵێ:

پێویستە لەبنەڕەتدا ئاوڕێ لە سروشتی جیاوازی بایەلۆژی نێوان ئافرەت و پیاو بدرێتەوە، بەچەند نیشانەیەك پیاو لە ئافرەت جیادەبێتەوە - ناڵێم لەو بالاترو بەرزترە، کێ وای وتووە؟! - ئەگەر ئەو نیشانانە نەبووناپە، پیاو، پیاوی پێ نەدەوترا، ئەگەر نەمان و نەبوونی ئەو نیشانانەش لە ئافرەتدا نەبوایە ئافرەت، ئافرەت نەدەبوو، هۆرمۆنی (تستیو ستیرۆن)ی نێرینە بەرجەستەکەرێکی بایەلۆژی هەمیشەیی تووکردن (البزار)، پەرەسەندن (الانتشار)، زبر کردن (التخشن)ە)[٤]

(تاقی کردنەوە سەلماندویەتی، کە توانستی دەرك پێ کردنی شوێن (المکان)و، وەلامدانەوە (الأستجابة) لە هەردوو توخمەکە (نێرومێ)دا بەدی دەکرێت، بەلام لە نێرینەدا زووتر دەست پێ دەکات.. توانای فێربوون لەنێردا زیاترە لە مێیە، هۆکەی دەکەرێتەوە بۆ ئەو (دەمارە خانانەی) کەوتوونەتە لای پلی پێشەوەی قاوغی مێشك، ئەم دەمارەخانانەش بۆ هۆرمۆنی ستیرۆیدی (هۆرمۆنی نێرومێ) زۆر هەستیاران، جا زانایان لەو باوەڕەدان ئەم دەمارە خانانە لێ پرسراوی توانستی فێربوونن، جا ئەم دەمارانەش بەهۆرمۆنی نێرینە ونە دەدرێن ئەمەیە یارمەتی منداڵی نێرینە دەدات بۆ ئەوەی پێشتر لەمێیە فێر بێت)[٥]

(لەناو یێك هاتووە زۆر وردەکانی دەمارەخانەو بەشەکانی خانە لێك بەستراوەکان لە شوێنی بەیەکداچوونی دەمارەکاندا لەنێوان نێرو مێدا هەندێك جیاوازی هەیە، لەو شوێنانەدا کە ریشاڵە دەمارەکان (الشجیریة) ریزکراون لە ناوچەی بەیەکدا چوونی دەمارەکان و تەنانەت قەبارەی کۆمەڵی دەمارەخانەکان لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە.. ئەم جیاوازییانە لە هەندێ ناوچەی دیاریکراوی ناو دەماخی هەردوو توخمەکە ئیسپات کراوە وەکو ناوچەی (تحت المهاد - هایبو ثالموس)و (النوی قبل البصریه ناوکە پێش بین))[٦]

ویتلسون - زانایەکی ئافرەتە - ئەوەی سەلماندووە کە پلی لای ڕاستی مێشك لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە لای کوڕان لە ئیشەکانیدا پسپۆری (تخصص) تەواو وەردەگرێت، بەلام بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی کچ تا تەمەنی سیانزە ساڵیش لای ڕاست و لای چەپی مێشکی هیچ چەشنە پسپۆرییەکی تیادا دەرناکەوێت، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە مێشکی نێرینە زووتر پسپۆری خۆی تەواو دەکات.

(ئەم جیاوازییە بایەلۆژییانە وای لە (ویتلسون) کردووە کە باوەڕ بەجیاوازی بەجێ هێنانی کاری ڕۆشنبیریش لەنێوان کچ و کوڕدا بێنێت، بۆنموونە: خوێندنەوە بە کردارێکی ئیدراکی دادەنرێت، بە هاوتایی دووپلی مێشکەوە بە ئەنجام دێت لە بەر ئەوەی دووکرداری شوێنی و زمانی (الحیزیة واللغویة) دەگرێتە خۆی، جا لەبەر ئەوەی مێشکی کوڕو کچ لە ڕووی ڕیزبوون و پێك هاتنیانەوە لە یەکتر جیاوازن و، لەو کاتەشدا کە فێری خوێندن دەبن لە تەمەنی (٦ - ١٠) ساڵیدایە، دووپلی، مێشکی کوڕ پسپۆری خۆی تەواو کردووە، بەلام کچ هێشتا تەواوی نەکردووە.. تەنانەت بەڵگە هەن ئاماژەی ئەوە دەکەن، جیاوازی دەماخ لە نێوان نێرومێدا، تەنها لەسەر خێرایی پێگەشتن و پسپۆری نەوەستاوە، بەڵکو لەدوا پلەی گەشەکردندا ئەم جیاوازییە هەر هەیە).[٨]

لێرەدا ئێمە کە باسی جیاوازی نێوان ئافرەت و پیاو دەکەین، مەبەست فەزڵدانی کە سیان بەسەر کە سیاندانیە، بەڵکو مەبەست ناسینی جیهانی هەردوولایە. دەنا هەردووکیان هەر مرۆڤن و، تەواوکەری یەکترن و، پێویستیان بە یەکترهەیەو، دەبێ بەچاوی مرۆڤانە لەیەکتر بڕوانن.

جا بێ دەنگی و ماتی ئافرەت و، لاوازی هێزو بازویان و، پەنابردنیانە بەرگریان لەکاتی ناخۆشیدا، زۆرجار بۆتە هۆی زوڵم لێ کردنیان لەلایەن پیاوەوە هەندێکیان لە مرۆڤ بەکەمتر ڕوانیویەتە ئافرەت و مافەکانی پێ شێل کردووە؛ هەندێکی تریش دەڵێن: - بەتایبەتی لەم سەردەمەی خۆماندا - دەبێ ئافرەت لەگەڵ پیاودا لەهەموو کاروباریکادا یەکسان بن شان بەشانی یەك بڕۆن لەڕاستی ئەمەشیان هەرستەمە لەئافرەت دەکرێ؛ چونکە ناگونجێت دوان لە زۆر لایەن و ڕووەوە لە یەکتر جیاوازبن تەنها لەو ڕووەوە نەبێت مرۆڤن، کەچی لە هەموو کاروفرمانێکا وەك یەك پێی هەڵسن، بەڵکو دەبێ مافی هەردووکیان هێندەی کاروفرمانیان و، کارو فرمانیان هێندەی تواناو لێ هاتوویی یان بێت.

لە گەردووندا لەم مەسەلانە زۆر دووبارە بۆتەوە دووشتی جیاواز بەیەك چاو سەیردەکرێن و یەك ناویان لێ نراوە.. بۆنموونە شنە - نسیم - دووجۆرە:

شنەی دەریاو شنەی زەوی، بەهەر دووکیان دەوترێ شنە لەگەڵ ئەوەشدا پەیدابوون و پێکهاتن و دەوریان لەیەکتر جیاوازە..

ئەگەر تۆزێك وردبینەوە تێ دەگەین ئەم دووشنەیە هەریەکەیان بێ ئەوی تر دروست نابێت، کەچی جیهان و بە ئەنجام هاتنی هەردوو شنەکە زۆر لەیەکتر جودان و بەهەر دووکیان دەوترێ شنە..

## رۆشنبیری گشتی

ئافـرەت و پیـاو، نێـرو مێ، وەکـو شـنە لەیـەکتـر جیـاوازن بەڵام هەردوکیان مرۆڤن . .

ئەمجارە لە جیهـانی بیـروژمـارەکردن ورد دەبینەوە، سەیرێکی هێمـاکـاتی بیـرکـاری دەکـەین، هێمـای کۆکـردنـەوە (+) ولێ دەرکردن(-)ی تێدایە، کاتێ بەگشتی لە بیرکاری دەدوێین بەهەردوو هێمـاکـە دەوتـرێ هێمـای بیـرکـاری، بەڵام لەکاتی بەجێ هێنانی کرداری بیـرکـاریدا دەبێ هەر هێمایەك بە ناوی خۆیەوە ناوبنرێ کە (+) و (-)ە، دەنـا کردارەکەمان تێکرا هەڵە دەردەچێت . . ئافرەت و پیـاویش لە جیهـانی ئادەمیدا هەر رووکیان مرۆڤن، بەڵام لە ژیانی رۆژانـەداو لە مامـەڵـەکـردن و هەڵس وکەوتـدا هەریەکـە جیهـانی تایبەتی دەروونی و بایەلۆژی خۆی هەیە . .

هەروەکـو دەزانین بۆگشت کارتێ کـردن و ئـ‌ـ‌ـە دەرێـك (میـژ)ی دەوروبـەروژینگـەو ناخی مرۆڤ دووجۆروە ۔ـدانـەوە هەیـە، ئەقڵی و عاتیفی :

ئایا پیاوو ئافرەت کامیان وەڵامدانەوەیان بۆ دنەد ـەکان عاتیفی یا ئەقڵی یە؟!

هەڵبـەتـە وەڵامـدانـەوەی ئەقڵی یا عاتیفی، دەبێ بەستـرابێتەوە بەگشت لایـەنێکی بایـەلۆژیو دەروونی و فرمان و دەوری ئەو کەسە لە ژیـانـدا . . ئاخۆ فرمانی کۆمەڵایەتی کامیان پێویستی بەعاتیفەیە یاکـامیـان پـێویستی بەئـەقڵە؟ باجـارێ بروانینە ئافرەت کە دەوری دایك دەبینێت، هەڵبەتە هۆرمۆنی وا هەبێت و تیایدا کاریگەر بێت، تابتـوانێ‌دەوری دایکێتی ببینێت، ئەو هۆرمـۆنـەش هۆرمـۆنی (بـرۆلاکتین)ە، دەبێ دایك خاوەن عاتیفەیەکی زۆر بێت، تابتوانێ دەوری دایکێتی بەرێك وپێکی‌ببینێت، جگە لەوەش منداڵ هەر لە سەرەتـای ژیـانیـەوە پـێـویستی بەسـۆزو عاتیفە هەیە؛ تەنانەت ئەوە سەلمێنـراوە کە (ئـەو ناوچە دەماخی یانەی کەوتوونەتە ژێر مێشکەوەو لێپرسراون لە هەست و هەڵچوون لە قۆناغێکی زۆر زوودا پێ دەگـەن) . . [81] وەکـو دەروونناسان سەلماندویانە منداڵ لە قۆناغی کۆرپەلەیی و ساواییدا پێویستی یەکی زۆری بە عاتیفەیە، نەمانی ئەم عاتیفەیە لەمنداڵیدا، بەگەورەیی پێوەی دیارە . .

(ئـەوەش سەلمێنـراوە کە ئافرەت عاتیفـەی لە پیـاو زۆرتـرەو، کاریگـەری عاتیفی زووتر دەیجوڵێنێ . . دکتور. (ولیم هـ، فری)، لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاورێیانی خۆی هەستان بە تاقی کردنەوەیەك بۆ زانینی هۆی گریان، ئەم تاقی کردنەوەیە لەسەر (٣٣١) کەسدا کرا، ئەو کەسانەش خۆیان تەرخان کردبوو تەمەنیان لە (١٨ ـ ٧٥) ساڵ بوو، بۆمـاوەی سی (٣٠)رۆژ هەمـوو رۆژێ دەیـخـستـنـە ژێـر کارتێکـردنی بەگـریـان هێنـان، لەرێ کارتێکـردنی عاتفی‌یەوە، لە ئەنجـامـدا لە ماوەی ئەو مانگەدا تێکرای ئافرەتان بە رێژەی (٥,٣) یان تۆمار کرد، تێکرای پیاوان بەرێژەی (١,٤)یان تۆمارکرد.) [9]

هەروەها (د. ولیم هـ فری) لە ئەنجامدا پاش تەمەنی باڵق بوون دەردەکـەوێت، بەهـۆی ئەو گۆڕانـە کیمیـاوییانەوەیە کە بەسەر هەر دوولادا دێت، گرنگتـرین ئەم گۆڕانانە زیاد بوونی رێژەی هۆرمۆنی (برولاکتین)ە ـ هۆرمۆنێکە لەگەڵ کرداری پەیدابوونی شیردایە ـ کە رێـژەکـەی (٦٠٪) لە کوڕزیـاتـرە، کەواتە ئەم توخمە پەیوەندی بە کرداری گریانەوە لە ئافرەتدا هەیە) [10]

جا لێـرەدا بۆمـان دەرکـەوت کە ئافـرەت زیـاتـر جیهـانی عاتیفە بەسـەریـدا زاڵـە، دەمێنێتـەوە پیاو وەکو بەڵگەنەویستێك کە جیهانی ئەقڵانیـەت بەسـەریدا زاڵ بووە . . ئەم بۆچوونە ئەوە ناگەیەنێت کە ئافرەت لە ئەقڵ بێ‌بەش بووە و، پیاویش عاتیفە تیایدا وشك بووە . بەڵکـو مەبـەست لەوەیە لە پیاودا رێژەی ئەقڵ زیاترە عاتیفە کەمترە، بەڵام لە ئافـرەتـدا رێـژەی عاتیفـە زاڵتـرە لە ئەقـڵ، سەرەرای بە ئەقڵیش و بەعـاتیفـەش هەیـە، چونکـە پەیـوەنـدیـیـەکی ئۆرگـانی (ئـەنـدامی) لە نێـوان بیـرکـردنـەوەو هەست یاخود ئەقڵ و عاتیفەدا هەیـە، بیـرکـردنـەوە پەیـدا نابێ تاوەکـو حاڵـەتێکی هەڵچـوون نەیووروژێنێ، بەڵام ئەم بیـرکـردنـە وەیـە . ناگـاتە ئەو ئامانجەی مەبـەستیـەتی تالەوهەستەی دنەی داوە رزگاری نەبێت، تا بتوانێ بە بۆچـوونێکی راست و بەشێنـە پێ بروانێتـە ئەو هەڵـوێستـەی بەرەو رووی بۆتەوە تا بگاتە هەڵێنجانێکی راست ورەوان و بەسەریدا زاڵ بێت، ئەمە ئەوە دەگەیێنێ بیرکردنەوە پێویستی بە، عاتیفە هەیە بۆ خرۆشاندنی .

پاش ئەم روون کردنـەوانـەی پێشـوو ئاشکـرابـوو لە ئافـرەت لە رووی ئەقلیـەوە پلەی لە پیـاو نزمتـرە بەڵام لە رووی سۆزو عاتیفەوە بەرزتـرە، پیـاویش بە هەمان شێوە پلەی عاتیفەی لە ئافرەت نزمترە و لە رووی ئەقڵەوە بەرزترە .

ئاسمـانی هەست و سۆزو عاتیفـە ئەو ئاسمـانـە بەربـڵاوو روونـاکـەیـە، بەسـەربەستی و هێمنی هەناسە دەدات لەومەیانەدایە گەشە دەکاو پێ دەگاو هەرگیز پیرنابێ . . !

ئەم ئاسمـانـە، ئاسمـانی سۆزو عاتیفـە کە ئافـرەت خاوەنیەتی شتێکی ساکـارو ئاسـایی نییە، هەتا بڵێی مەزنە، ئاڵۆزە، بەیەکدا چووە بەجیهـانێکـە هیـچ پیـاوێـك، هەرپیـاوێـك بێت سەری

لیٚ دەرنـاکـاو، ناتـوانی خۆی بکـوتێنـە ناویـەوە، مەگـەر کەسێـك شاعیـرێکی رەسـەن بێت یان بلیمـەتێکی بەهـرەدار بێت یاخـود مرۆڤیـك بێت رۆحی زۆر لە رۆحی ئافـرەتەوە نزیك بێت. تابتوانێ ئەم جیهـانـە ئاشکـرا بکـات، وەکـو شکسبیـر و تاگور و (ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری).

ئەم ئالـۆزییـەی جیهانی ئافرەت ئەوە ناگەیەنێ کە مەخلوقێکی جیـایـە لە پیـاو، بەلکو هۆی سەرەکی خۆشەویستی وعاتیفەیە، ئەم خۆشەویستی یە کە لەدەروونی هەر مرۆڤێکەوە ئالاو بە «سەریدا زال بوو» هەلس وکەوتـی ئاراستـە دەکـات، چارەنـووسی رەوشت و کۆمەلایەتی ورامیاری دەست بەسەر دەکات.

جاکـەمی ئالـۆزیوگـۆران لە پیـاودا لە چاو ئافـرەت هۆیـەکەی ئەوەیەکە خۆشەویستی ناتوانێ دەستی بەسەردا بگرێت وەکو ئافرەت لە ناخ و دەروەیدا ئاراستەی بکات. ، خاتوو (دەستال) راستی وتوە کە دەلێ :ـ

«خۆشەویستی رووداوە لە ژیانی پیاودا، بەلام تێکرای مێژووی ژیانی ئافرەتە».[11]

پەراوێز:

(١) «النفس» دكتۆر عبي كمال لاپەڕە ٦٧٤

(٢) جريـدة طب وعلوم/ الـدماغ عند الأنثى والذكر - الخصائص والفروقات / د. عامر الانصاري/ العدد الرابع/ ١٩٨٨

(٣) النفس والعدوان/ د. ريكان ابراهيم /ل٢٧

(٤) جريدة العراق/ الأديب والمرأة /٦/٤/١٩٨٨

(٥) جريدة طب وعلوم/ الدماغ عند الانثى والذكر/ د. عامر الانصاري.

(٦) جريـدة طب وعلوم/ الـدمـاغ عنـد الأنثى والـذكـر/ د. عامر الانصـاري/ العدد الرابع ٣

(٧) جريدة طب وعلوم/ د. عامر الانصاري/ الدماغ عند الذكر والانثى

(٨) جريـدة طب وعلوم/ د. نـوري جعفـر/ تطـور دمـاغ الفرد/ العدد ٥٨٦٢ سنة ١٨

(٩) طب وعلوم/ هل هنـاك انـواع مختلفـة من الـدموع/ ترجمة سوسن الراوي/ العدد ٦٥٠٨

(١٠) هەمان سەرچاوە.

(١١) بروانە کتێبی «فلسفة الحب» تأليف عبداللطيف شرارة، ل٢١

## ملخص البحث

## هل يتماثل المرأة والرجل؟!

ئازادرؤوف قادر


ان المـرأة والـرجـل يفتـرقـان في أول خلية التكوين، حيث ان الخليـة التي تتكـون منهـا المـرأة هي خليـة (XX) والخليـة التي ستصبـح ذكـراً هي خلية (XY)، اذاً الذكر والانثى لايتماثلان وهما بعـد في بدايـة التكـوين، والظـاهر هنا ان الناحية الوراثية لها تأثير على سلوك كل منهمـا، أضـافـة الى التأثيـرات البيئيـة، وكـذلـك الهـورمـونـات التي توجـه كل منهمـا السلوك حيث ان الهـرمـون (استروجين) توجه سلوك المرأة وهرمون (الأندروجين) توجه سلوك الـرجـل، ويتبين من المقـال ان العقـلانيـة غالبـة على الـرجـل، والعاطفة غالبة على المرأة. وهذا لايدل على ان الرجل أفضل من المـرأة بل الأمـر نسبي، وتنظـر اليهـا على اسـاس أنتمـائهمـا الى العـائلة الأنسـانيـة ويختلفان من حيث التفكير والسلوك. . وتوجد شواهد كثيرة في الطبيعة، من هذا النوع حيث ينتمي حيث شيئان مختلفان الى أصل واحد ولكنها غير متماثلين مثل نسيم البر والبحر وتوجد فروقات تركيبية في دماغ كل من الذكر والانثى.

فهـدوء المـرأة وضعف قوتهـا، والتجـائها الى البكـاء عنـد مضـايقتهـا، كثيـراً كان سببا ليظلمها الرجال، وينظر بعضهم اليها بنظرة أقل من الرجل، وبعضهم يقولون ان المرأة يجب ان تتساوى مع الرجال في كل الأمور وهذا ايضاً غير صحيح أذ لايمكن لأثنين يختلفـان في كل النـواحي السـايكولوجية والفسيولوجية والبايلوجية أن يكـونـا متسـاويين في كل الأمـور والحقـوق والـواجبات بل من العـدل ان تكـون الحقوق بقدر الواجبات، والواجبات بقدر الطاقة والاستطـاعـة. . وهمـا متسـاويـان من الناحية الأنسانية، وتتعامل المرأة بأنها انسانة ولها الحقوق الانـسانية كالرجال. . ونحن نعرف ان لكـل مثيـر نوعين من الاستجـابـة، الاستجـابـة العـاطفيـة والاستجابة العقلية، وبأن

العاطفية تكون من قبل المرأة والاستجابة العقلية تكون من قبل الرجل. .

## بەرپسیاری یا دەولەتی و یاسا دەولەتان : پشکا سێ

# ژێدەرێت یاسا دەولەتی ئو بەرپسیاری یا دەولەتی

شعبان مزیری

### پێك هاتن چیە :-

پێك هاتن یانكو پێك گەهشتنەكە یان گرێدانەكە دهێتە موركرن دناڤبەرا دوو دەولەتان یان پترتر ئەوژی چونكو كەسێت یاسا دەولەتی یا گشتی نە بنگێت[1] ئەڤێ یاسایێ ئەوان رێكدێخیت ل سەر شینەوارێت وێ

### رەنگێت پێك هاتنا

پێك هاتن گەلەك رەنگن ژوان[2]

١ - پێك هاتنێت رامیاری ئەوژی پێك هاتنێت دهێنە موركرن وەكو پەیمان یان دەست تێ گرێدان ئو دابین كرن و بێلا

٢ - پێك هاتنێت بازرگانی وەكو پێك هاتنێت كمركا

٣ - پێك هاتنێت چڤاكی ئارمانج و رامان ژێ ئەوە

باشكرنا سەروبەرێ ژیانا وەلاتی یا ئوبلندكرنا پەلا وان یارەوشەنبیری یێ دناڤبەرا دەولەتان دا . ئەڤەو یاهەژی یێ گوتنێ یە كو ل كەڤن دا پێك هاتن دهاتنە موركرن ل سەر دەڤا و نەدهاتنە نڤیسین وەكو پێك هاتنا هاتی یە موركرن دناڤبەرا (بطرسێ مەزن) ئیمبراتوری روسیا ئو (فردریكی سێ یێ) بەلێ ئەڤ[3] پێك هاتنە پێجبوون دەمێ كو كوما نەتەوەیا هاتی یە پەیدابوون ڤێجا دیت كو پێدڤی یە پێك هاتنا ل دەڤ بهێتە تومار كرن ئو رابگەهینن ئەڤ كارە ژی بجهـ ناهێت ئێلا لدەڤ پێك هاتنێت دهێنە نڤیسین .

### چێكرنا پێك هاتنێ

ژبێ رەنگێ پێك هاتنێ ڤە پێك هاتن پێك دهێت ژ (٤) چار پشكا :

١ - پێش گوتن : ناڤا و ناڤێت سەرۆكێت دەولەتا ئەوێت موردكەن ئو قاسدێت وان دیاردكەت ئو ئارمانج و رامان ژێ ئەوە ژ بەرخاتر وێ . . ئەڤ پێك هاتنە هاتی یە گرێدان .

٢ - بابەت : دبیتە وەكو رێزا تێدا بابەتێ شروڤەدكەت .

٣ - دیرۆكا دەست پێ كرنا وێ و دەمێ وێ ئو دگەل باوەری پێ هینانا دەولەتان ئو كانێ دێ شێن هندەكێت دی ژی باوەری یا خوپێ هینن یان نەء .

٤ - موركرنا دەولەتێت باوەری یا خوپێ هینای ئو[5] رێزكرنا موركرنا ئەوژی یان دێ لدویڤ پێتێت ئەلف بێ یێ بیت یان ب رێكا هلبژارتنێ (الاقتراع)

### ئەزمانێ پێ دهێتە نڤیسین

ل كەڤن دا پێك هاتن داهێنە نڤیسین ب ئەزمانێ لاتینی پشتی هینگی ئەزمانێ اسپانی جهێ وێ گرت . . ئەڤەو پشتی هینگی دەولەتان هندەك رێكێت دی بوخوگرتن ئەوژی[6]

١ - رێكا ئێكێ : هلبژارتنا ئەزمانەكی بتنێ (uneLangueunique) كو ئەو دەولەت دناڤبەرا خۆدا ئەزمانەكی ب هلبژێرن ڤێجا ل سەد سالا هەژدێ ئەزمانێ فەرەنسی دهلبژارت ئەڤە هوسا ما هەتاكو گرێدانا پێك هاتنا (لوزان) ئەوا هاتی یە گرێدان ل(٢٤) هەیڤا یولیو یا سالا ١٩٢٣ .

٢ - رێكا دوێ :- نڤیسینا پێك هاتنێ ب دووئەزمانا یان پترتر ئو دناڤبەرا خۆدا پێك بێن ل سەر هلبژارتنا زمانەكی كو ببیتە ژێدەر دەمێ لێ دزڤرن هەروەكو رویدای ل پێك هاتنێت ئاشتی یێ یێت سالا (١٩١٩ - ١٩٣٠) ئەوێت هاتینە گرێدان دناڤبەرا هەڤالاو ئەلمانیادا .

٣ - رێكا سێ یێ : هلبژارتنا هژمارەكا ئەزمانا هندی یێت دەولەتێت پشكداری یێ دكەن . . ئەڤێ رێكێ گەلەك كێماسیێت خوێت هەین ، چونكو ل دەمێ راڤەكرنێ بیت خەلەتی تێدا دیاربن ئەو پێك هاتنێت هوسا وەكو كارناما دمزگەها نەتەوەیێت ئێكگرتی یاكو هاتی یە نڤیسین بـ (٥) پێنج ئەزمانا ئەوژی (ئینگلیزی و فەرەنسی و روسی و صینی) ئەڤەو هەمی ئەزمان ژی دانان ژێدەر بو دەمێ لێ دزڤرن . .

### مەرجێ دروست بوٚ گرێدانا پێك هاتنێ

١ ـ شیانا دەولەتێ بوٚ گرێدانا پێك هاتنێ . . ڤێجا مەرج ئەوە كو پێك هاتنا دروست بیت ژ لایێ یاسایێ ڤە دڤێت ئەو دەولەتا موردكەت شیان هەبیت وپێڤەبهێت ئەڤەوژڤی لایی ڤە دڤێت جودابینەكێ بێخنە تێدا . . ئەوژی . . [٧]

١ ـ دەولەتێ سیادەتا دروست هەبیت : ل ڤێ حالەتێ چ گازندە نینە و دەولەت دشێت هەمی پێك هاتنا گرێبدەت .

٢ ـ دەولەتا سیادەتا وێ یادروست نەبیت : ئەوژی دبیت سیادەتا وێ یاكێم بیت ئەڤ چەندە ژی دژڤریتە دوو ئەگەرا .

أ ـ یان یا رابووی چوویە دناڤ دەزگەهەكێ دا یان ئێكەتیەكێ دا . . . ل ڤێ حالەتێ دڤێت سەحكەنە كارناما وێ داكو بزانن كا دشێت رابیت پێك هاتنێ گرێبدەت ئو كانێ مولەتێ ددەتێ ئو هەكە مەگرتێ كو دەولەتەكا سیادەتا وێ یاكێم رابوو دگەل دەولەتەكا دی پێك هاتن موركر دڤێ حالەتێ دا ئەو پێك هاتنا بەتال نینە بەس بەتالی یا وێ دێ مینیتە ل سەر مولەت نەدانا دەولەتا خودانا سیادەت هەی .

دوو : ـ رازیبونا دەولەتێ ب دروستی : كو پێك هاتن یا دروست بیت دڤێت ب رازیبونا دەولەتان بیت ئەوێت گرێددەن ویا دویربیت ژ كارێت خورتی لێ كرن و خەلەتیا .

ل ڤێرێ پێدڤی یە بێژم كو هەكە خورتی كەفتە لەسەر قاسدێ دەولەتا پێك هاتنێ موردكەت ئەڤە ناچێ بیت ئو ئەو [٨] پێك هاتن یابەتالە . . هەروەكو پەیدابووی ژ دەڤ نابلیونی ل سالا (١٨٠٧) ل سەر «فردیناند بن كارلوسێ چارێ» داكو بهێتە خارێ ژ سەر كورسیكا حكمی ل وەلاتێ اسبانیا بوٚ نابلیونی . هەروەسا بیت خورتی بكەڤیتە ل سەر دەولەتێ بخوٚ ئو بترسیت كو ئاگرێ شەری هلبیت ڤێجا ل بن ئەڤێ گەڤێ رابیت پێك هاتنێ موربكەت هەروەكو رویدای ل سالا (١٩٣٦) [٩] دناڤبەرا وەلاتێ مسرێ و ئینگلیزی ئەڤەم بیر وهزرەكا دی یاهەی دبێژیت خورتی لێ كرن نابیتە ئەگەرا بەتالكرنا پێك هاتنێ ئەڤەژی دەولەت بوخوٚ دكەتە هێجەت داكو خوٚ قورتال بكەت ژ خال و بەندێت وێ پێك هاتنا هاتی یە موركرن .

سێ : ـ دروستی یا جهێ گرێدانا پێك هاتنێ

پێك هاتنا دروست ناهێتە گرێدان هەكە بابەتێ وێ ئو جهێ وێ یادروست نەبیت ئەوژی ل چەند حالەتانە [١٠]

١ ـ هەكە نەرێكەڤیت دگەل بنگێت یاسا دەولەتان یاگشتی وەكو دوو دەولەت پێك هاتنەكێ موربكەن لدور رێكخستنا بازرگانییا «عەبدا» رقیق

٢ ـ تێكدانا سوٚزا بەراهیكێ ئو ئیلتزامێ پێ نەكەت .

٣ ـ پێك بێن لدور ئیلتزامێ بكەن كو دەولەتا نەلایەك بیت ژ پێك هاتنا هاتی یە گرێدان دناڤبەرا وان دا كو ئیلتزامێ بكەت ب وێ پێك هاتنێ ئەڤە ژی چێ نابیت چونكو ئەو نەلایەكە ژ وێ پێك هاتنێ .

چار : ـ هشیاربیت ژ بەندێت دستوری : دڤێت خال و بەندێت پێك هاتنێ نە دژی دستوری دەولەتێ بن هەكە وەسا دیاربوو یانكو ئەو پێك هاتن یابەتالە ژلایێ یاسایێ ڤە

پێنج : ـ دڤێت قاسد ئیلتزامێ بكەت ب وێ توخیبێ ئەوپێ هاتی یە وەكیل كرن ئو ژێ دەرنەكەڤیت .

### باوەری پێ هینان ب پێك هاتنێ

پشتی قاسدێت دەولەتێ ئەوێت پشكداریكری ل ناڤ گوٚت و بێژادا موركری پێدڤی یە بهێلتە باوەری پێ هینان ژدەڤ سەروٚكێ دەولەتێ نەكوژ دەڤ پەرلەمانی . . [١١] ل ڤێرێ پێدڤی یە بێژم كو پەرلەمان دێ بەرێ خودەتە پێك هاتنێ ئو دێ بیروباوەرێت خوٚ لدور دیاركەت بەس ئەڤە نابیتە ئەگەر كو هندە باوەری پێ هات بەلكو دڤێت سەروٚكێ دەولەتێ رازیبینا خوٚ ل سەر دیاربكەت ئو موربكەت ڤێجا بجهـ هاتنا پێك هاتنێ دێ مینیتە ل سەر باوەری پێ هینانا دەولەتا ل سەر پێك هاتنێ ئو بێ باوەری پێ هینان ئەو پێك هاتن ناهێتە بجهـ ئینان .

### دیاركرنا دەمەكێ بوٚ باوەری پێ هینانێ

بارا پتر ژ پێك هاتنا دەمەكی ددانن كو باوەرییا خوٚ ب پێك هاتنێ بینن ئو هەكە ئەو دەم بوری و باوەری پێ نەهینا . . یانكو هەروەكو چ نەبوی ئو ل حالەتێ كو هەكە دەم نەدیاركر دڤێت دەمەكێ بەرئاقل بدانن هەتاكو باوەرییا خوٚ پێ بهینن هەكە دیت پێك هاتن پێچیبیت و بەتال بیت ئو پێدڤی یە ل سەر وان رابن ب پێك گوهورینا [١٢] باوەری پێهینانێ دناڤبەرا خوٚدا ڤێجا بەراهیكا دەست پێ كرنا ب پێك گوهورینا باوەری پێ هینانێ دەولەتێ مافێ هەی ئو یا ئازایە ل پێك هاتنێ ب زڤریت وسەحكەتێ بەلێ پشتی پێك گوهورینا باوەری پێ هینانێ چێ نابیت لێ ب زڤریت ڤێجا پێك گوهورینا باوەری پێ هینانێ یانكو پێك هاتن وگەهشتنە قوناغا دویماهیكێ .

### تومارکرنا پێك هاتنێ

کارنما دەزگەهێ نەتەوەیێت ئێکگرتی یادیارکری ل مادا (۱۰۲) دبێژیت «هەمی پێك هاتن ئو پەیمانێت دەولەتی یاکو ئەندامەك ژئەندامێت نەتەوەیێت ئێکگرتی گرێددەت پشتی کاردکەت ب ئەڤێ کارنامێ پێدڤی یە تومار بکەت ل دەڤ ئەمینداری یەتا دەزگەهێ ئو ب زیترین دەم رابیت بەلاڤەبکەتن . » .

### دویماهیك هاتنا پێك هاتنا

پێك هاتن ل گەلەك حالەتا بدویماهیك دهێت ژ وان[14] . .

ئێك :- ئەوبخو بدویماهیك دهێت ل ڤان حالەتا . .

۱ - دویماهیك هاتنا رامانا وێ ئەوا پێك هاتن ژ بەر هاتی یە مورکرن

۲ - بجهـ هاتنا مەرجا پیچکرنا وێ یاکو هاتی یە دیارکرن دپێك هاتنێ دا

۳ - بدیماهیك هاتنا دەمێ بوٚ هاتی یە دانان .

٤ - قەت چێ نابیت خال و بەندێت پێك هاتنێ بجهـ بێن

٥ - پیجبونا بابەتێ پێك هاتنێ

٦ - پیجبوون و نەمانا دەولەتەکێ ژ دەولەتێت پێك هاتن گرێدای . .

۷ - هەمی پێك هاتنێت بەراهیکێ یێت کو نارێکەڤن یان دژی کارناما دەزگەها نەتەوەیێت ئێکگرتی بن ئەوێت هاتی نە مورکرن دناڤبەرا دەولەتێت ئەندامێت نەتەوەیێت ئێکگرتی ڤێجا ئەو پێك هاتن بدویماهیك دهێن ب رازی بوونا وان دەولەتا بنە ئەندام لناڤ رێکخراوا دەولەتی ئەوژی رێکخراوا نەتەوەیێت ئێکگرتی

دوو :- ب رازیبوونا هەردوو لایێت پێك هاتن مورکری . . ڤێجا چ ئەو ئێکسەر دیاربکەن ب رازی بونا خوٚیان ژی پێك هاتنەکا[15] دی موربکەن یانوی تێدا باوەری یا خوٚ دیاربکەن ل سەر پێك هاتنا بەراهیکێ یان ژی دەولەت تەنازلێ بکەت ژ مافێت هاتینە دیارکرن ب پێك هاتنەکێ . .

سێ : ژلایەکێ بتنێ ڤە :-

۱ - خوٚ ژێ ڤەکێشان (الانسحاب)[16] هەکە پێك هاتنێ دیارکربیت کو کا دشێت خوٚ ژێ ڤەکێشیت یان ب گوهورینا کاودانا (سەروبەری)[17] یان دەولەت رابیت مافێ خوٚ بکاربهینیت ل ڤێرێ پێدڤی یە کو بێژم ئەڤ حالەتە ناچێ بیت هەکە دپێك هاتنێ دا دەمێ دویماهیك هاتنا وێ هاتبیتە دیارکرن یان ژی پێك هاتن هاتبیتە مورکرن ل سەر حالەتەکێ هەردەم ئەڤە ناچێ بیت ئێلا ب رازی بوونا لایێت مورکرین . .

۲ - تێکدان و پیچکرن . . ئەڤە ژی ل وی حالەتی دەمێ کو لایەك رادبیت ئیلتزامێ[18] ب پێك هاتنێ نەکەت

چار :- بەتال بونا پێك هاتنێ :

ئەڤە پەیدادبیت ل حالەتێ کو جەنگ پەیدابیت دناڤبەرا دوو دەولەتێت پێك هاتن مورکری ل ڤێرێ پێدڤی یە بێژم ئەڤ حالەتە بجهـ نائێت و (تەتبیق)[19] نابیت ل سەر پێك هاتنێت هاتینە مورکرن بوٚ حالەتەکێ هەردەم وەکو پێك هاتنێت توخیبی یان پێك هاتنێت بەحسی دەینێت گشتی دکەن . . ڤێجا هلبوونا ئاگرێ شەری داخباری یێ ل سەر ئەڤان پێك هاتنا ناکەن . .

### تێکدانا پێك هاتنێت دەولەتی

پێك هاتنێت دەولەتی ئێك ژ گرنگترین وەسائیلێت بەلاڤەکرنا بنگەهێت یاسا دەولەتی نە و ئەو نمونەکا دیار و بەرچاڤە دناڤبەرا دەولەتادا و یا هاتی یە ئیعتراف پێ کرن . . ڤێجا مورکرنا وێ وراستکرنا وێ وپشت گوهـ هاڤێتنا هندەك ریز و مادێت وێ یێت بجهـ هاتین ب رازی بوونا دەولەتێت مورکرین . . ئەڤەو سەیدا[20] (Fitzmaurice) ئەوێ کو پشکداری کری بوٚ دانانا یاسا پێك هاتنا ژ دەڤ لەژنا یاسا دەولەتی ڤە یا دڤیلانکا نەتەوەیێت ئێکگرتی ل(٤) جارێ هەیڤا ئادارا سالا (١٩٥٦) گوٚت .

[ئەو پێك هاتنا دەولەتی یە و ئێکە ژ کارنامێت رەسمی ڤێجا ناڤێ وێ چ بیت یان ناڤ و نیشانێت وێ یان ئارمانجا وێ»

ئەڤەو فەقەرا (أ) ژمارادا[21] دوێ ژ پێك هاتنا ڤینا یاسالا ١٩٦٩ یاتایبەتی ب یاسا پێك هاتناڤە دبێژیت :- پێك هاتن یانکو پێك هاتنا دەولەتی یە دهێتە گرێدان دناڤبەرا دوو دەولەتا یان پترتر ئەڤ پێك هاتنە دهێنە نڤیسین لناڤ کارنامەکێ دا یان ژ کارنامەکێ پترتر بلا چ بیت ناڤێ و چ ناڤی بدانە ل سەر . . »

ئو دکتور عبدالعزیز سرحان :[22] دبێژیت «پێك هاتنا دەولەتی ئەوە رابیت ب کارێ رێکخستنا بابەتەکێ رامیاری وەکو پێك هاتنا ئاشتی یێ پشتی شەرێ جیهانێ یێ ئێکێ ئەوا کو هاتی یە بناڤ کرن پێك هاتنا فرسای»

ئەڤ تەعیرفە یاکێمە چونکو ئەوە پێك هاتنا وی بەحس ژێ کری دگریت ژ پێك هاتنێت گشتی ڤێجا پێك هاتنێت تایبەتی ژی یێت هەین .

ئەڤەو یاهەژی یێ گوٚتنێ یە کو پێك هاتن یێت هاتینە مورکرن ژدەڤ کەلەخێت دڤیلانکێت یاسا دەولەتی ڤە ئو کەساتی یا خوٚ یادەولەتی وەردگریت و پێڤە هاتنا وێ ل سەر چێکرنا یاسایا . . و ئارمانجێت وێ . . و پەیداکرنا ماف و کارا یان راگرتنا تێکەلی یا لدویڤ حکمێ یاسا دەولەتی . . ڤێجا چ گاڤا مەرجێت پێك هاتنێ

**بجهـ هاتن وهاتـەموركـرن** و باوەری پێ ئینان دێ دروست بیت و پێـدڤی یـە ب سەر دەولـەتێت موركـرین ئیلتـزامێ پێ بكەن . . ئەڤەو پێـت هاتن هێـزا خۆوەردگـریت لدویڤ رازی بوونـا لایێت ئەڤ پێـك هاتنـە موركـرین و پێت سوزدای كو دێ خال و بەنـدێت وێ بجهـ ئینن . . ئەڤـەو دپێش گۆتنـا كارنـامـا نەتـەوەیێت ئێكگـرتی دا یاهـاتی یـە دیـاركرن كو پێدڤی یە ئیلتزام بهێنەكرن [23] ل سەر ئەوان پێـك هاتنێت هاتینـە موركـرن ئو هەروەسا ژێدەرێت یاسا دەولەتی هەروەسا مادا (٣٨) [24] ژ رژێما بنیاتی یا دادگەها دادێ یا دەولەتی پێـدڤی یـە پێـك هاتنێت دەولـەتی پێت گشتی و پێت تایبەتی ئیلتزام پێ بهێنـەكـرن ژ لایێت دەولـەتێت ب هەڤـرك چووین . . هەروەسا بریارا جڤاتا كوما نەتەوەیێت ئێكگرتی یاكو دەركەفتی ل(٧) حەفتێ هەیڤـا كولانـا سالا ١٩٣٥ ب بۆنـا راگـەهاندنا ئەلمانیا كو رابووی ب تێكـدانـا مەرجـا كو ئەلمـانیا چێ نابیت خۆچەكدار [25] بكەت دویڤ پێـك هاتنا فرسای یاسالا ١٩١٩ . . ڤێجا بریارا جڤاتا كوما نەتـەوەیێت ئێكگرتی دبێژیت «رێزگرتنا ئیلتزماتێت هاتینە چێ بوون ژ پێـك هاتنـا دهێنـە دانـان ژ گرنگترین مەبادئێت یاسا دەولەتی نە و پێدڤی یە سلامەتی یا وێ بهێتە پاریزتن .» [26]

هەروەسـا بوسلمـانـەتی یێ ژی ب چاڤـەكێ رێـزگرتن یا بەرێ خودایە پێك هاتنا ئو بجهـ ئینانا خال و بەندێت وێ و مەرجێت وێ . . ئەڤـەو ژلایێ ئولا بوسلمـانـەتی یێ ڤە وەفەداری نەبـەس كارەكێ یاسـایی یـە یان كارەكێ رامیـاری یـە بەلكـو كارەكێ ئۆلی یە ژی . . ئەڤەو دقورآنا پیروزدا یاهاتی دەمێ دسورەتا الاسراء ئایەتا (٣٤) [27] دا دبێژیت :-

«وأوفـوا بالعهـد إن العهد كان مسئولا» هەروەسا دسورەتا النمل دا ئایـەتـا (٩١) دا دبێـژیت «وأوفوا بعهدالله اذا عاهدتم ولاتنقضوا الأيمان بعد توكيدها وقد جعلتم الله عليكم كفيلا .»

پێـك هاتن دهێنـە پشككـرن لدویڤ رەنگێ وان ئو پێت هەین لدویـڤ دەمێ وێ وهنـدەك لدویڤ سروشتی یـا وێ هەروەسـا پێـك هاتن دهێنە پشككرن لدویڤ بابەتێ وێ . . ڤێجا چ رامیاری بیت یان ئابـوری بیت هەروەسـا دهێنە پشككـرن لدویڤ رەنگێ وێ . . پێـك هاتنێت گشتی ئەون پێت كو گەلەك دەولەتا دگریت ئو پێـك هاتنێت تایبـەتی ئەو پێـك هاتن پێك هاتینە ژ دوو دەولەتا یان پترتر یان ژێ دووقولی نە . . هەروەسا پێك هاتن دهێنە پشككرن بۆ دەمەكێ درێژ و هندەكێت هەین بۆ دەمەكێ كورت . .

ئەڤـەو پێـك هاتنێت دەولـەتی ڤێجا چ پێت تایبەتی بن یان ژی گشتی . . ئارمانج ژێ ئەوە رێكخستنا تێكەلێیێت دەولەتی یە . . ئەڤ رێكخستنە چ ژلایێ رامیاری ڤە بیت یان ژی ئابوری ڤە یان جڤاكی یان یاسـایی ڤـە بیت . . ڤێجـا یانكـو كارەكێ یاسـایی یـە دهێنە بجهـ ئینان ب رازی بوونا ئیرادەتا دوو دەولەتا یان پترتر .

ئەڤـەو پێـك هاتن دوو پشكن ژلایێ سروشتی یـا وێ ڤـە ژ بلی ئاڤەروكا وێ ئەو ژی . .

١ - پێك هاتنێت تایبەتی یان گرێدای [28] (Traites - contrats) ئەڤ پێـك هاتنـە نابنـە ژێدەرەكێ رەسن بۆ یاسا دەولەتی یاگشتی چونكو نارابیت بەدانـان و ئاڤـاكرنا بنگەهـەكا دەولەتی بۆ یاسا گشتی بەلكو دێ رابیت ب گرێـدانـا هنـدەك ئیلتـزاما تێت تایبەتی یاكو گرێدای هەێ بەس بەوان دەولەتاڤە ئەوێت ئەڤ پێك هاتنە موركری . . ڤێجا چ دوو دەولـەت بن یان پترتـر بن وەكو پێك هاتنێت بازرگانی یێ . . پێـك هاتنێت دیـاركـرنـا توخیبی پێـك هاتنێت هاتن وچوونێ پێت هەڤال بەندی یێ وەكو پێك هاتنا برایەتی یا عەرەبی دناڤبەرا عیراقێ و سعـودی یێ دا یا سالا (١٩٣٦) ئو پێـك هاتنـا برایـەتی یی و هەڤـال بەنـدی یێ دنـاڤبـەرا عیـراقێ و ئوردنێ یا سالا ١٩٤٧ ئو پێـك هاتنـا هاتن و چوونـا ئەسمـانی دنـاڤبەرا عیراقێ و قطر یاسالا ١٩٧٨ . . هتد .

٢ - پێـك هاتنێت گشتی یان الشـارعـە [29] (Traites - lois) ئەڤ پێـك هاتنـە دگشتی نە و دهێنە موركرن دناڤبەرا گەلەك دەولەتان دا ئو ئەڤ پێك هاتنە دبنە بنیات بۆ ئاڤاكرنا ژێدەرێت یاسا دەولەتی . . بۆ نمـونە پێك هاتنێت لاهای پێت سالا (١٨٩٩)، (١٩٠٧) وكارناما كوما دەولەتان و پێك هاتنا فرسای یا سالا ١٩١٩ وكارناما نەتەوەیێت ئێكگرتی و پێك هاتنێت جنیف یاسالا ١٩٤٩ . . ئەو خال و بەندێت ئەڤـان پێـك هاتنـا پێت بووینـە بنیاتێت یاسا دەولەتان . . چ دەولەتا تێكبدەت و ئیلتزامێ پێ نەكەت دێ بەرپسیاری یا دەولەتی كەڤیتە سەر،

## عرفا دەولەتی

عرفـا دەولـەتی ئێكـە ژ ژێـدەرێت رەئیسی پێت بنگـەهـا یاسـا دەولەتی . . ئەڤە ژی دهێتە دیتن ژ دیتنێت رۆژانە . . رامان ژ عرفا دەولـەتی ئەوە كومـەكـا بنگـەهێت یاسایێت نە بێ كو دهێنە چێكرن لنـاڤ كومـەلگـەهێ دا [30] ژ بـەر كو دەولـەت بۆ دەمـەكێ درێـژ بكـاردهینن . . یا وەلێ هاتی هەتـاكـو دەولەت باوەری یێ پێ تینن و هەست دكـەت هەكـە ب كارنەهینا یانكو گونەهباری یەك كر ئو ئەڤ

بنگەهە ژ ی ل سەروان دڤێت بکاربینن . . ئەڤەو بەردەوامبوونا بکارئینانا وێ ژدەڤ دەولەتان . . تشتەکێ پێدڤی یە . . ئەڤەو عرف یاپێك هاتی ژچەند مەرجا ئەومەرج موکمکرنا عرفێ پەیدا دکەتن دهێلیت ببیتە عرف . . [31]

١ ـ دووبارەکرنا وێ بۆگەلەك جارا ئول هەرئێك کاودان دا وەکو جارەسەرکرنا هەڤرکی یا دناڤبەرا دەولەتادا ب رێکاتە حکیمێ ئو هەروەسا ڤێجا دێ تەحکیم ببیتە بنگەهەکا دەولەتی . . دەولەت دێ هەڤرکییێت خوب ڤێ رێکێ جارەسەرکەن . .

ئەڤەویاهەژ ییێ گوتنێ یە کوبنگەها عرفی دهێتە چێکرن ژکارێت باش وکارێت نەباش ژ ی . . ئومادا[32] (٣٨) ژ رژێما بنیاتی یا دادگەها دادێ یا دەولەتی دبێژیت «عرفا دەولەتی یارازی بوی وەکو یاسایەکێ یە ب بەردەوام بکاردهێت . »

ئەڤەو بۆپەیدابوونا عرفا دەولەتی پێدڤی یە دوورەگەز پەیدابن . . رەگەزێ مادی . . ئەوژ ی پێك هاتی یە ژ پەیدابوونا بەردەوامی یا ویێو دووبارەکرنا وێ ل ئێك کاودان دا .

٢ ـ کارێ دەمی . . ل ڤێرێ مەرج نینە کوبنگەها عرفێ یاکەڤن بیت . . بەلێ یاپێدڤی یە بێژم کوعرف دمینیتە ل سەر دەمی ڤێجا ئەڤ دەمە چ یێ درێژ بیت یان ژ ی یێ کورت بیت ئەڤە ژ ی دمینیتە ل سەر کاودانێت وێ . .

رەگەزا مەعنەوی:ـ یانکو هزربکەن کو پێدڤی یە ئەڤی کاری بجهـ بینن[33] ئەڤەو خوژکەڤن وەرە دادگەها عرف یا بکارئینای . .

کوئێکە ژ ژێدەرێت یاسا دەولەتان . . بۆنموونە دەمێ کو(السیر ولیم سکوت) (sirw. scott) رابوو بکارئینا ل خلمەتا سانتاکروز (SantaGruz) ل سالا (١٨٩٧) دەمێ گوتی «دادگەهێت تالانکرنێ یاسا خۆیاهەی ولدویف وان دێ پرێڤەچیت وئولدویف رەوشتێت وێ وکارئینانا وان یاکەڤن . » هەروەسا بریارا دادگەها بلند یا هەرێمێت ئێکگرتی یائەمریکی ل خلمەتا پاکیت هبانا (The Paguet Habana) ل سالا (١٩٠٠) سەرۆکێ دادگەهێ کرای (Grag) دراپوورتا خۆدا گوت بوو: .

«ان السفن الصيد الساحلي التي تحترف صيد الاسماك . وجلبها وهي طرية تعتبر معفوة مع بضاعتها وبحارتها من الاسر كغنائم حربية بمقتضى ممارسة قديمة نشأت بين الامم المتمدنة منذ عصور خلت . »

## کێماسیێت عرفا دەولەتی

١ ـ نەیا روهن و دیارە . . تەم و مژ دناڤدا مشەیە . .

٢ ـ یاسا عرفا دەولەتی پێش دکەڤیت . . یانکو ناهێتە گوهورین دگەل گوهورینا تێکەلیێت دەولەتان . . ڤێجا هۆسا گەلەك گوهورین گەڤتنە تێکەلیێت دەولەتان ورژێمێت حکمی وبازرگانی یێ و معاملەتێت دراڤێ دەولەتی . .

ڤێجا نەدیاربوونا[34] وێ دێ گەلەك ئاستەنگا پەیداکەت بۆ بجهـ ئینانا بنگەها بەرپسیاری یا دەولەتی دەمێ کو دەولەتەك رابیت ب تێکدانا وێ . . بەلێ دسەر هندێرا ژ ی عرف بنیاتەکا موکمە ژ ژێدەرێت یاسا دەولەتی ئویاهاتی یە دیارکرن لناڤ گەلەك تیگستێت پێك هاتنێت دەولەتی وەکومادا (٧) [35] حەفتێ ژ پێك هاتنا لاهای یا سالا (١٩٠٧) ئویا تایبەتی ب چێکرنا دادگەها تالانکرنا دەولەتی ئومادا (٣٨) ژ رژێما بنیاتی یا دادگەها دادێ یا دەولەتی یا هەردەم یا سالا١٩٢٠، ١٩٤٥ .

## مەبادئێت گشتی یێت یاسایی

خوژکەڤن وەرە مەبادئێت یاسایێ یێت گشتی یێت بوینە ژێدەرێت یاسا دەولەتی یا گشتی . .

لێ دزڤرن بۆوەرگرتنا بنگەهەکێ یاحکمەکی بۆجارەسەرکرنا تێنەگەهشتنا پەیدابووی دناڤ دەولەتادا ئوبۆرێکخستنا تێکەلیێت وان . . ئەڤەو دەولەت لناڤ پێك هاتنێت خۆیێت تەحکیمێ . . ب رەنگەکێ دیارو ئاشکەرا دیاردکەن[36] مافێ حکمکران کوبزڤرنە مەبادئێت یاسایا گشتی داکوحکمی بکەن لدۆر وێ هەڤرکی یا ئەو دێ بەرێ خۆدەنێ . . بۆنموونە . . پێك هاتنا تەحکیم وتوفیقا هاتی یە مورکرن دناڤبەرا ئەلمانیاو سویسرا ل(٣) سێ هەیڤا کانونا ئێکێ یاسالا ١٩٢١ ئومادا (٥) [37] پێنجێ ژ وێ پێك هاتنێ تشتەکێ دیارو ئاشکەرایە . .

هەروەسا حکمێ دادگەها تەحکیمێ یا هاتی یە دانان بۆ هەڤرکی یا هەی دناڤبەرا ئینگلیزوئەرجەنتینێ دا ل سالا (١٨٧٠) هەروەسا حکمێ هاتی یە وەرگرتن بۆهەڤرکی یا روسیاوتورکیا ل سالا (١٩١٢) . . ئەڤەوفەقەرا (ج) ژمادا[38] (٣٨) ژ رژێما بنیاتی یا دادگەها دادێ یا دەولەتی بەحسی ئەڤی ژێدەری یاکری . . هەروەسا فەقەرا (٣) سێ ژمادا (٣٨) ژ رژێما دادگەها دادێ یا دەولەتی یا هەردەم بەحسی ئەڤی مەبدەئی یاکری . . کوئێکە ژ ژێدەرێت یاسا دەولەتی ئەڤەوئارمانج ژ ئەڤی ژێدەری ئەوە کو گرێدانا بنگەهێت تێکدا ئەوێت پەیدابووین دناڤبەرا ملەتێت

خۆدان شارستـان دا وەکـو یاسـا مللەتێت رومان . . ئەڤەو هەروەسا ئەڤی مەبـدەئی گرێدانەکا هەی ب مەبادئێت یاسایێ یت ناڤخو . . ئەڤەو ل ڤیری پێدڤی یە بێژم کو دادگەها دادێ یا دەولەتی ل خلمەتا (دەرتـەنگـا کورفـو)[٣٩] یا سالا ١٩٤٩ رابـوو بجهـ ئینـانا مەبدەئێ یاسایێ یا گشتی .

ل ڤیـرێ هنـدەك زەحمەتی دهێنە دیارکرن بۆ دیارکرنا مەبادئێت گشتی یێت یاسـایێ بەلێ بارا پتـر ژ نڤیسـەڤـان و علمـدارا بنەجهـ دکـەن کو مەبـادائێت گشتی یێت یاسـایـا ناڤخـو دبنـە عمبـارەك بۆ مەبـادئێت یاسـایێ . . قازیێ دەولـەتی دێ لێ زڤـریت لدویڤ حکمێ مادا (٣٨) ژ بنیاتا دادگەها دادێ یا دەولەتی ل وی دەمێ کو چارەسـەرکـرنـا دهێنـە وەرگرتن ژ مەبادئێت گشتی دڤێت رێکەڤیت وپرێڤەبجیت دگەل تێکەلیێت دەولەتی .

ژێـدەرێت یاسـا دەولەتی یا گشتی . . ئەوێت هاریکار وییت کو هنـدەك شرۆڤـەکـرن و راڤەکرن بۆ هندەك خلمەتا ئەوێت کو هاتینە چارەسەرکرن نەکو پشتا خۆ گرێدای ب پێك هاتنێت دەولەتی وعرفا دەولـەتی و مەبـادئێت یاسـا دەولـەتی بەلکـو هنـدەك جارا هنـدەك خلمـەت دهێنـە بەرچـاڤ کرن ودێ داننـە بەردەستێ دادگـەهێت دەولـەتی گەلـەك دئـالـۆزن . . ڤێجـا ئەو حکمێ دەردکەڤیت لدور ئەوان خلمەتا . . دێ بنە بنیاتێت سەنەوی ل دەمێت پێدڤی دادگەها مافێ هەی لێ بزڤرن . . ئەڤە ژی دوو ژێدەرن . .[٤٠]

١ ـ ئەحکامێت قضائا . .

٢ ـ مەزهەبێت مەزنترین زاناو علمدارێت یاسایێ . . نوکە ژ ی دێ بەحسی وان کەم . .

### ١ ـ ئەحکامێت قەضائا

ئەحکـامێت قضائا ل پێشی یا ژێدەرایە.یێت کو دادگەهـ دزڤرنێ بۆ وەرگـرتـنـا سودێ و دیـارکـرنـا بنگـەهێت یاسایێ ئەڤەو ل هندەك ئەحکامێت دەرکەڤتین ژدەڤ دادگەها ئەوێت کو پشتا خۆ نەگرێدای ب پێك هاتنێت دەولەتی و عرفا دەولەتی و مەبادئێت یاسا گشتی . . ڤێجا دادگەها مافێ هەی ب زڤرنە وان ئەحکاما ئەوێت دەرکەڤتین ژ دەڤ قەضـائـا دەولـەتی . . ئەڤ چەنـدە ژی یاهـاتی یـە دیـارکـرن ل فەقەرا (z) ژمادا (٣٨)[٤١] یا رژێما دادگەها دادێ یا دەولەتی یاهەردەم .

٢ ـ مەزهەبێت علمدار و زانایێت یاسا دەولەتی یا گشتی .

ئەڤـە ژێدەرێ دوێ یە یێ کو هاتی یە دیارکرن ل فەقەرا (z) ژمادا (٣٨)[٤٢] یا رژێما دادگەها دادێ یا دەولەتی یا هەردەم . .

ڤێجـا خانـدن و ڤەکـولین و شرۆڤـەکـرن و راڤەکرنا نڤیسـەڤان و علمــدارێت یاسـا دەولـەتی یـا گشتی . . پێ رادبن لدور مەبـادئێت یاسایێ و بنگەهـ و ئەحکاما . . ئەڤ شرۆڤەکرن و نڤیسینە دێ رێکێ خۆش کەن و بەرفـرەهـ کەن بۆ وەرگـرتـنـا هنـدەك حکمــا لدۆر خلمـەتێت ئلۆز ئەوێت کو دداننـە ل بەردەستێ دادگـەهـا . . ئەڤەو بیر و هزرێت علمدار و زانا یا دێ گەلەك هاریکاری یا قازی یاکەن بۆ وەرگرتنا حکما . . ژ وان علمدارا . .[٤٣]

«جـروسیـوس Grotius) (فـاتیل Vattel) ئو (دسبانییە Despagnet) (فوشی Fauchille) (لیفور Lefur) (جورج سل G.scelle) ل فەرەنسا ئو (تریبل Triepel) (شتـروب strupp) ل ئەلمانیا ئو (انزیلوتی Anzilotti) ئو (کـافـاکلیـری Caveglieri) ل ئیتالیا (فیردروس Verdross) و (کلسن Kelsen) ل نمســا (اوبنـهـایم oppenheim) ل نکلتـرا ئو هویتن Wheaton) وقـازی (هـدسن Hudson) ل ئەمـریکـا ئەڤ هەردوکێت دویمـاهیکێ . . یانکـو ئەحکـامێت قەضـائـا و بیـر و هزرێت زانـاو علمدارا ناهێنە دیارکرن بۆ پەیداکرنا بەرپسیاری یا دەولەتی . .

بەس مە بەحس کرن بۆ وەرگرتا سودێ . . هەروەسا بزاڤا کومەلا و پەیمـانگـەهێت زانیاری یابۆیە تشتەکێ دیار بۆ پێش ئێخستنا یاسا دەولەتی ژ وان کومەلا . .[٤٤]

١ ـ کومەلا ئەمریکی یا یاسا دەولەتی

٢ ـ کومەلا فەرەنسی یا یاسا دەولەتی

٣ ـ کومەلا فەرەنسی یا یا نەتەوەیێت ئێکگرتی

٤ ـ کومەلا چروسیوس ل ئینگلترا

٥ ـ خرڤەبوونا یاسایا دەولەتی ل ئیتالیا

٦ ـ کومەلا مسری یا یاسا دەولەتی .

ئو ئەو گوڤـار و بەلاڤـوکێت هەیڤـانە یێت کو پیتەدایەکرن ب یاسا دەولەتی* . . ژ وان .

١ ـ گوڤـارا یاسـا دەولـەتی یاکـو دەردکـەڤیت ژ دەڤ پەیمـانگـەهـا خاندنێت سەرەتای لە لاهای . .

٢ ـ گوڤارا ئەمریکی یا یاسا دەولەتی

٣ ـ گوڤارا گشتی یا یاسا دەولەتی ئەوا دەردکەڤیت ل فەرەنسـا . .

٤ ـ گوڤـارا مســری یا یاسـا دەولـەتی ئەوا دەردکەڤیت ژدەڤ کومەلا مسری یا یاسا دەولەتی .

ژێدەر ودەهەمەن

١ ـ دكتور علي صادق ابو هيف. القانون الدولي العام چاپا دوازده منشأة المعارف الاسكندرية ـ ل٥٢٣.
٢ ـ هەر ئەو ژێدەر ـ ل٥٢٦
٣ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٥٣٢
٤ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٥٨٠
٥ ـ شارل روسو. القانون الدولي العام مطبعة المتوسط بيروت لوبنان سالا ١٩٨٢ ٣٥.
٦ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٤١
٧ ـ دكتور عبدالمجيد عباس. القانون الدولي العام.. مطبعة النجاح. بغداد١٩٤٧
٨ ـ الدكتور محمد سامي عبدالحميد اصول القانون الدولي العام. الجزء الثاني. القاعدة الدولية چاپا شەشێ سالا ١٩٨٤ الدار الجامعية.
٩ ـ هەر ئەو ژێدەر ل١٢١
١٠ ـ بنێره دكتور علي صادق ابو هيف.. القانون الدولي العام ل٥٣٥
١١ ـ بنيرة شارل روسو. القانون الدولي العام ل٣٧
١٢ ـ صالح يوسف عجبنه، القانون الدولي العام. چاپائێكێ سالا ١٩٥١ ـ ١٩٥٢ ـ چاپخانا الزهراء ـ بەغدا ـ
١٣ ـ بنێره الدكتور عبدالمجيد عباس القانون الدولي العام ل٨٠
١٤ ـ بنێره صالح يوسف عجبنه. القانون الدولي العام ل٣٠٢
١٥ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٣٠٣
١٦ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٣٠٥
١٧ ـ بنێره دكتور علي صادق ابو هيف ل٥٧١
١٨ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٥٧٨
١٩ ـ هەر ئەو ژێدەر ل٥٨١
٢٠ ـ هەر ئەوژەێدەر ل٥٨٢
٢١ ـ تونكين ـ أ ـ القانون الدولي العام. وەرگێرانا احمد رضا الهيئة المصرية العامة للكتاب القاهرة سالا ١٩٧٢
٢٢ ـ دكتور عبدالعزيز محمد سرحان. مبادىء القانون الدولي العام القاهرة سالا ١٩٨٠.
٢٣ ـ دكتور محمد المجذوب. محاضرات في القانون الدولي العام الدار الجامعية.
٢٤ ـ الدكتور محمد السعيد الدقاق. القانون الدولي المصادر الاشخاص. چاپا دوێ سالا ١٩٨٣ الدار الجامعية
٢٥ ـ هەر ئەو ژێدەر.... ل٤١
٢٦ ـ هەر ئەو ژێدەرێ بەراهیكێ ل٤٣
٢٧ ـ القرآن الكريم سورەتا الاسراء ئايەتا ٣٤
٢٨ ـ دكتور علي صاق ابو هيف. ژێدەرێ بەراهیكێ ل٥٢٤
٢٩ ـ بنێره دكتور علي صادق ابو هيف ل٥٢٥
٣٠ ـ الدكتور عبدالحسين القطيفي. القانون الدولي العام پشكائێكێ بەغدا سالا ١٩٧٠
٣١ ـ الدكتور الشافعي محمد بشير. القانون الدولي العام في السلم والحرب. الاسكندرية سالا ١٩٧١
٣٢ ـ محمد طلعت الغنيمي. العرف في القانون الدولي. ڤەكولینەكەهاتیيە بەلاڤ كرن ل كۆڤارا الحقوقي سالا (٩) نەهێ هەژمارا (٣)و(٤) یاسالا ١٩٥٩ ـ ١٩٦٠
٣٣ ـ محمد حافظ غانم. مبادىء القانون الدولي. دار النهضة العربية سالا ١٩٦٧ ل٧٠
٣٤ ـ محمد سامي عبدالحميد. اصول القانون الدولي پشكائێكێ القاعدة الدولية مكتبة مكاوى. بيروت سالا ١٩٧٧ ل٢١٥.
٣٥ ـ عبدالعزيز سرحان. القانون الدولي العام دار النهضة العربية القاهرة سالا ١٩٦٩ ل٦٨
٣٦ ـ بنێره دكتور محمد السعيد الدقاق. القانون الدولي ـ المصادر ـ الاشخاص ل٢٢٣
٣٧ ـ مفيد شهاب. المبادىء العامة للقانون. كوڤارا مسرىيا ياسا دەولەتی. مجلد ٢٣ سالا ١٩٦٧ ل١ ئویشتیوێ..
٣٨ ـ مفيد شهاب. القانون الدولي العام پشكا ئێكێ دار النهضة العربية القاهرة سالا ١٩٧٤ ل٧٤ ئو ل پشتیوێ.
٣٩ ـ دكتور حكمت شبر. القانون الدولي العام پشكا ئێكێ بەغدا چاپخانا دار السلام سالا ١٩٧٥
٤٠ ـ بنێره دكتور محمد السعيد الدقاق ـ ژێدەرێ بەراهیكێ ل٢٢٦ ـ ٢٢٧.
٤١ ـ دكتور عصام العطية القانون الدولي العام. چاپا سێ سالا ١٩٨٢ چاپخانا زانینگەها بەغدا ل١٢٥
٤٢ ـ دكتور عصام العطية ـ ژێدەی بەراهیكێ ل١٢٥ ـ ١٢٦
٤٣ ـ هەر ئەوژێدەر ل١٢٩
٤٤ ـ بادفان. القواعد العامة لقانون السلم في مجموعة محاضرات لاهاى سالا ١٩٣٦ ل٤٩٩.

ملخص البحث

# المسؤولية الدولية والقانون الدولي العام

## - القسم الثالث -

# مصادر القانون الدولي والمسؤولية الدولية

بقلم: شعبان مزيرى

تتميز مصادر القانون الدولي عن مصادر القانون الداخلي بافتقارها الى مشرع اعلى يشرع القواعد . . اذ ان قواعد القانون الدولي تنشأ عن طريق الاتفاق الصريح كما في المعاهدات او الاتفاق الضمني كما في العرف . . فالعلاقات السائدة بين الدول تقوم على مبدأ المساواة فيما بينها لا فرق بين كبيرها وصغيرها . . فلا يمكن لدولة مهما عظم شأنها او مجموعة من الدول ان تفرض ارادتها على الدول الاخرى حيث كانت هذه الظاهرة ملازمة للعلاقات الدولية في فترة القانون الدولي التقليدي لكن العلاقات السائدة في عهد القانون الدولي المعاصر تقوم على أساس التكافؤ . .

هذا وان الباحث يتناول في هذا البحث أهم مصادر القانون الدولي ويقسم الى مصادر رسمية أو شكلية (المعاهدات والاعراف) إذا لايمكن تصور نشوء أية قاعدة قانونية دولية بدون الاتفاق العام بين دول العالم المختلفة ومصادر مساعدة حيث تساهم في عملية خلق قواعد القانون الدولي كما تساعد القاضي في عملية تفسير قواعد القانون الدولي الرئيسية

وان النظام الأساسي لمحكمة العدل الدولية في المادة (٣٨) يبين اهم مصادر القانون الدولي وهي :

أ ـ الاتفاقيات الدولية العامة والخاصة التي تضع قواعداً تعترف بها صراحة الدول المتنازعة . .

ب ـ العادات الدولية المرعية المعتبرة بمثابة قانون دلت عليه تواتر الاستعمال (العرف) . .

جـ ـ مبادىء القانون العامة التي أقرتها الامم المتمدنة

د ـ أحكام المحاكم ومذاهب كبار المؤلفين في القانون العام في مختلف الامم . ويعتبر هذا اوذاك مصدراً احتياطياً لقواعد القانون الدولي مع مراعات احكام المادة (٥٩) وان الباحث يتناول العمل غير المشروع لكل مخالفة لالتزام دولي تفرضه قاعدة من قواعد القانون الدولي فاذا ما أخلت دولة ما بأحكام معلهدة سبق لها ان تقيدت بها، فأنها تتحمل المسؤولية الدولية الناشئة عن هذا الاخلال وتلتزم بالتالي بتعويض الدولة التي لحقها ضرر من جراء هذا العمل لان التعويض يعتبر متمما لتطبيق الاتفاقات اضافة الى ذلك فان الباحث تناول المسؤولية الدولية التي تقع على عاتق المنظمات الدولية في حالة عدم تنفيذها مثلا لمعاهدة مبرمة مع احدى الدول او مع منظمة دولية اخرى . .

رۆشنبیری گشتی

# کورتەیەك لە مێژووی خوێندن و خوێندەواری ئافرەتی کورد ....

مغدید حاجی

**سەرەتا سەرگوزشتەیەك:**

«ئافرەت لە زۆر ماف بێ بەری کرابوو. . تاکو دوێنێ مافی خوێندنی نەبوو. تۆ بڵێیت مێینە لە نێرینە کەمتر تینووی خوێندەواری بووبێت؟!

کچێکی پۆلۆنی لە سەدەی چواردەداو دەستە خوشکێکی ئیسپانیی لە سەدەی حەڤدەدا وتیان هەر کەسێك شەکری وای شکاند سەری دای لە بەرد، هەردووکیان هێند تینووی خوێندن بوون بە بەرگ خۆیان کردە کور، ئەو رۆژەی بەو جۆرە گەیشتنە بەر دەروازەی زانکۆ پێیان وابوو جیهانیان پێ بەخشراوە. یەکەمیان بەخت بۆی نەهێنا، پاش دوو ساڵ خوێندنی ریکوپێك رۆژێکیان بەرزی سینەی سەرنجی سمێڵ گەورەکانی راکێشا کە بە (هۆی ها) زانکۆ بەدەریان کرد!!.

پاش دەورویەری سێ هەزار ساڵ نەوەی ئەو کیژە ناچاربوون دیسان لە پۆلۆنیا زانکۆیەکی نهێنی گەرۆك دابمەزرێنن کە دوا رۆژ یەکێکیان پڕ بە دەم هاواری کرد: شەرمە ئافرەت لە مافی خوێندن بێ بەری بکرێت.

ئەو یەکە زانای گەورە (ماری کۆری) بوو کە پیاوان بە شانازییەوە ساڵی ١٩١١ لەسەر سینی زێر خەڵاتی نۆبلیان پێشکەش کرد.(١)

**ئاورێك لە رابوردوو:**

ئاشکرایە کە عیراق لە سەردەمی عوسمانییەکان دا لە هەرسێ ویلایەتی بەغداو بەسرەو مووسل پێك هاتبوو، لە هەموو روێکی ئابووریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری دواکەوتو بوو و لە بارێکی نارێك و ئاڵۆزو نالەبار دەژیا. تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کە مەدحەت پاشا (١٨٦٩ ـ ١٨٧٢) کرا بە والی بەغدا هیچ جۆرە هەوڵێکی دڵسۆزانە بۆ چارەسەرکردنی باری دواکەوتووی ئەم وڵاتە بەدی نەکراوە.

بەر لە سەردەمی مەدحەت پاشا جگە لەو چەند خوێندنگایەی نێردراوو موژدە دەرە دیانەکان لە بەغداو مووسل کردبوویانەوە لەگەڵ حوجرەی فەقێیان و خوێندنگای مزگەوتەکان، هیچ قوتابخانەیەکی نوێ بابەت لە عیراق نەکراوەتەوە.(٢)

ئەگەر ئاورێکیش لە مێژووی کوردستانی عیراق (ویلایەتی مووسل) لە سەردەمی عوسمانییەکان بدەینەوە باری نالەبارو دواکەوتووو پشت گوێ خراوی هەرێمەکەمان بۆ دەردەکەوێت. بە تایبەتی باری لادێو شارۆچکە دوورەکانی هەرێمەکە کە زۆربەی دانیشتوانیان گرتبوە خۆ.

بەڵام دەبێ دان بەو راستییە بنێین کە هەندێ ناوچەی کوردستان لە سەردەمی دەسەڵات دارێتی سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆی میرنشینێتییە خۆماڵییەکان دا، وەکوو هەردوو میرنشینێتی سۆران و بابان، لە رووی ئابووریو کۆمەڵایەتیو رۆشن بیریدا تا رادەیەك بووژانەوەیان بە خۆیانەوە بینیوە.

هەندێ لاپەرەی مێژوو و فۆلکلۆری نەتەوایەتیمان بۆمان دەگێڕنەوە کە چۆن خاتوو خانزادی میری سۆران بایەخی بە گەشانەوەی ناوچەکەی بە تایبەتی شاری هەریر داوەو زاناو مامۆستای لە هەندەرانەوە هێناون بۆ ئەوەی لە خوێندنگاکانی هەریرو شارو گوندە گەورەکانی تری ناوچەکە دایان بمەررێنێو دەرسیان پێ بڵێتەوە.

لە سەردەمەزێرینییە کورتەکەی میری سۆران پاشای گەورەش دا میر محەمەد بایەخی بە پەرەپێدانی میرنشینێتییەکەی لە هەموو روێکەوە داوەو خوێندنگای ئاینی دامەزراندووەو ئاوڕی لە زاناو مامۆستاکان داوەتەوەو هەوڵیداوە دانیشتوان بە ئاسودەیی بژین و لە ژێر دەسەڵاتی بێگانەو دواکەوتن دا رزگاریان بێت.

خۆ سلێمانیو دەوروبەری لە سەردەمی بابان دا بووژانەوەیەکی زۆری بە خۆوە بینیوەو شاری سلێمانی کە پایتەخت بووە بۆتە مەڵبەندێکی بازرگانیو رۆشنبیریو مەڵبەندی زاناو شاعیرو شەیدایانی خوێندەواری.

بەڵام کە خۆری ئەم میرنشینێتییانە ئاوا بووەو ناوچەکان کەوتوونەتەوە ژێر دەسەڵاتی رژێمی عوسمانی دواکەوتوو، شان بە شانی ناوچەکانی تری عیراق پشت گوێ خراون و جگە لە رووتاندنەوەی دانیشتوان چ خزمەتگوزارییەکی ئەوتۆیان پێشکەش نەکراوە.

**سەرەتاکانی خوێندنی کچان لە عیراق دا:**

بزووتنەوەی بورژوای تورکیا لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیە بە تایبەتی لە دوای بەرپابوونی کودێتای عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ دا کە لە لایەن کۆمەڵەی (یەك گرتن و پێشکەوتن)ەوە بەرپا کراو سوڵتان

عەبـدول حەمیدی دوووەم (١٨٧٦ - ١٩٠٩) ناچـار کرا دان بە دروشمی کۆمـەڵـەکـە (ئـازادیو دادپەروەریو یەکسانی) بنێت و دەستووری نوێی عوسمانی بسەلمێنێت.

ئەنـدامـانی کۆمـەڵـەکـە کەوتنە چالاکی نواندن و کەلکیان لە ڕۆژنـامـەو قوتـابخـانـەکـان و هۆی تری بڵاوکـردنـەوە ئەبینی بۆ پڕۆپاگەندە کردن بۆ دروشمەکانیان.

کۆمەڵەی ناوبراو لقی لە هەموو ویلایەتەکان کردەوەو لە هەمان کات دا دەست کرا بە کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی سەرەتایی کە بە لقـەکـانی کۆمـەڵ دەبـەسـترانـەوەو مامـۆسـتـاشیان لە ڕیزی ئەنـدامـەکـانی بۆ دائەنراو هەوڵیش دەدرا ئەم قوتابخانانە بکرێنە خوێندنگای نموونەیی و شاگردەکانیش بە ئامانجەکانی کۆمەڵ گۆش دەکران.

هەر لەو سەردەمـەدا بایەخ بە خوێنـدنی کچـان دراوەو چەند قوتابخانەیەکی سەرەتایی کچان لە ساڵی ١٩١٤دا بە بڕیاری کۆمەڵ لە شاری بەغدا کراونەتەوە. لە پاشان لە شارەکانی تری عیراق و لە شارە گەورەکانی کوردستان دەست کراوە بە کردنەوەی قوتابخانەی کچان.

جگە لە هەوڵ و کۆششی کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقیو بەر لە ساڵی ١٩١٤ هەوڵی تریش دراوە بۆ کردنـەوەی قوتـابخـانـەی کچان لە بەغـداو شارەکـانی تری عیراق. بۆ نمـوونـە لە سەدەی نۆزدەدا جموجۆڵی باوکە دومنیکەکان لە شاری مووسل پەرەی سەندووەو لە ساڵی ١٨٧٣ دا قوتـابخانەیەکی «راهبات» یان بە ناوی «اخوات المحبـة» لەم شارە کردۆتــەوە کە دەوری لە فێرکــردنی کچــە مووســڵاوییەکــان بینیوەو لەســەر ئیش وکــاری دەست وەکــو درووماں و نەخش و نیگار ڕایهێناون.

هەروا نامق پاشـای والی بەغـدا (١٨٩٩ - ١٩٠٢) لە ساڵی ١٨٩٩ دا یەکـەم قوتابخانەی ڕوشدیەی کچانی لە شاری بەغدا کردۆتــەوە. لە پاشـان دا بە بڕیاری ئەم والییە لە هەردوو شاری مووسل و بەسرە قوتابخانەی کچان کراونەتەوە.[٣]

بەر لە دەست پێکــردنی جەنگی یەکــەمی جیهـان لە کۆی (سـەرجـەمی) (١٦٠) قوتابخانەی سەرەتایی لە شارە گەورەکانی عیراق تەنها (١٣) یان قوتابخانەی کچان بوون. لەو سیانزەیەش حەوتیان لە ویلایەتی بەغدا بوون. چواری لە مووسل و دوانەکەی تریش لە بەسرە بوون.[٤]

**ئافرەتی کوردو خوێندەواری:**

بەر لە ساڵی ١٩١٧ دا خوێنــدەواری لە ڕیزی ئافــرەتـان لە کوردستـان بە دەگمـەن یان گەلێك کەم بووە. بەر لە کردنـەوەی قوتـابخانەی میری لە هەندێ شارو شارۆچکەی کوردەواریدا بۆ نموونە وەکو شاری کۆیە ئافرەتانیش سوختەخانەیان هەبووەو پێشیان وتـوون (مـامـۆستـا)، زۆر ئافـرەتی وەکـو: (فەقێ فاتم و فەقێ زەینـەب و فەقێ عەیشێو فەقێ پیرۆز). . هتد لەم سوختەخانانە وانـەکانی زانستی ئایین و قورئانیان خوێندوەو فێری خوێندەواری بووین.[٥]

سەرەڕای ئەوەی کە شۆڕشــی ساڵی ١٩٠٨ی (یەکـێتــیو پێشکـەوتن) نەیتوانی تا سەر گیروگرفتە ئاڵۆزەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چارەسەر بکات و پیاوە نەخۆشەکە لە مردن ڕزگار بکات، بەڵام چەند ئاڵ وگۆڕێکی نیمچە پێشکەوتنخوازانەی لە بوارەکانی کۆمــەڵایەتـیو ڕامیاریو ڕۆشنـبــیری بە ئەنـجــام گەیانــدو ئیمپــراتـۆریەتــەکـەی هێنایە هەژان. ئەمـەش کاری کردە سەر بیرکردنەوەو ڕاپەڕینی ڕووناك بیرو ڕۆشنبیرەکانی ناو نەتەوەکانی تری ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتە نەخۆشەکە.

ڕوونــاکـبــیرە کوردەکـان هەر زوو دەرکیان بە مەتـرسیەکـانی جەهــالــەت و نەخـوێنــدەواری کردووەو هەوڵی بڵاوکـردنـەوەی خوێندەوارییان داوە. بۆیە دەبینین کە زۆربەی هەرە زۆری ژمارە یەکی یەکـەم ڕۆژنـامـەی کوردی (کـوردستان) بۆ باس و نرخ و بایەخی خوێنـدن و خوێنـدەواری تەرخان کراوەو هەموو دێرێکی پارانەوەی دڵسۆزانەیە بۆ ئەوەی گەلی کوردیش (بە نیرو مێیانەوە) وەك گەلانی تر دەست بداتە خوێندن. بۆ بزواندنی هەستی خەڵکی لەم بارەیەوە گەلێك فەرمــایشتی پێغـەمبــەری دەربــارەی پێویستی فێربوون و خوێندن هێناوەتەوە، جگە لە چەند نموونەیەکی بەجێ سەبارەت بە گرنگیو ئەنجامەکانی زانست و شارستانیەت.[٦]

**دەوری کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردییەکان:**

---

• هەر لەو دەوروبەرەداو بە تایبەتی لە دوای بەرپابوونی شۆڕشی بۆرژوای تورك لە ساڵی ١٩٠٨ دا چەنـد کۆمـەڵەو ڕێکخراوێکی کوردی دامـەزراون و دەستیان بە هۆشیارکـردنـەوەی لاوانی کورد کردووە، وەکو

١ - (کومەڵەی هێڤی) بۆ خوێندکارانی کورد کە ڕۆژنامەی (ڕۆژا کورد)ی بڵاوکردۆتەوە،

٢ - (کـۆمـەڵی تەعالی وتەرەقی کورد) کە بە یەکەم ڕێکخراوێکی ڕامیاری کورد دانراوەو ژمارەیەك لە ناودارانی وەکوو (ئەمینی عالی

بەدرخان)و (شەریف پاشا)و (شیخ عەبدول قادری شەمزینی) لە دەوری کۆبوونەتەوە،

٣ - (کۆمەڵەی رزگارکردنی کوردستان) کە بە دڵسۆزیو چالاکی سەردەمێ لە کاردا بووە.

٤ - (کورد تعمیم معارف جمعیتی) لە پێش جەنگ دامەزراوەو یەکەم قوتابخانەی بۆ منداڵە کوردەکان لەئەستەمبوڵ کردۆتەوە.

لەو کاتەدا تەنانەت ئافرەتانی کوردیش کەوتوونەتە خۆو هاتوونەتە مەیدان و دەستەیەکی پێشڕەویان بە ناوی (کۆمەڵی بەرزی ئافرەتانی کورد - کورد قادینلری جمعیتی) دامەزرانـدووەو ئەم کۆمەڵەش بە یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتانی کورد دادەندرێت.

لە ساڵی ١٩١٢دا کۆمەڵی (جیهانداری) لە کوردستانی ئێران دامەزراوەو یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی بڵاوکردنەوەی خوێندەواریو ڕۆشنبیری بووە لە ناو منداڵ و لاوانی کورد بە کچ و کوریانەوە.(٧)

ئەم ڕێکخراوانە دەورێکی باڵایان لە بزووتنەوەی نەتەوەیی و ژیانی رووناکبیریو ڕۆشنبیری گەلی کورد دا بینیوەو ئەندامە باڵاکانی ئەم کۆمەڵانە بە پەرۆشی بڵاوکردنەوەی خوێندەواریو ڕۆشنبیری کوردی بوون لە ناو ڕۆڵەکانی گەلەکەیان داو بۆ ئەم مەبەستەش جیاوازیان نەخستۆتە نێوان کورو کچانەوە، بایەخیان بە زمان و ئەدەبی کوردی داوەو هەوڵیان داوە گۆڤارو ڕۆژنامە بە کوردی دەربچوێنن. سەرەڕای ئامانجە رەواکانی تری ڕامیاریو کۆمەڵایەتی ئەم ڕێکخراوانە.

**یەکەم قوتابخانەی کچان لە کوردستان دا:**

لە ئەنجامی بارودۆخی باسکراوو گۆڕانکاری تر لە ناوچەکەدا، لە کوردستانیش مەسەلەی بەرەو یەکسانی نێوان ئافرەت و پیاو بۆتە خاڵێکی گرنگ و کەوتبووە سەر زاری رووناك بیران.

جا بە هەوڵ و کۆششی پێشکەوتن خوازان و لە پێناوی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لە ناو ئافرەتان دا یەکەم قوتابخانەی میری بۆ فێرکردنی کچانی کورد لە (١٧)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٥ لە شاری سلێمانیدا کراوەتەوە.

یەکەم بەڕێوەبەرو مامۆستای ئەم قوتابخانە پێشەنگە مامۆستا مەلیحە نەزهەت خان بووە کە دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی زانست و نیشتمان پەروەر.(٨)

لەوانەیە دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیە لە شاری سلێمانی لە ئەنجامی چالاکیو هاندانی کوردە رووناکبیرەکانی سەر بە کۆمەڵەی یەکێتیو پێشکەوتن بووبێ. بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە لەو کاتەی عیراق لە لایەن ئینگلیزەکانەوە داگیر کرا ئەم قوتابخانەیەو قوتابخانەکانی تری کچان کە لە ساڵی ١٩١٤دا لە شاری بەغدا لە لایەن کۆمەڵەی ناوبراوەوە کرابوونەوە، داخراون.(٩)

دوا بە دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانیو داگیرکردنی عیراق لە لایەن هێزەکانی ئینگلیزو لە پاشان دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق لە بەغداو حوکمدارێتی شێخی نەمرو (کۆمەڵەی کوردستان) لە سلێمانی، بزووتنەوەی نیشتمانیو رووناکبیری پەرەی سەندووەو کەسانی وا چوونەتە ریزیەوە کە هەڵگری بیروباوەڕی پێشکەوتن خوازانە بوون و مەسەلەی ئازادکردنی ئافرەتان و بە یەك چاو سەیرکردنیان لەگەڵ پیاوان دا لە هەموو بوارەکانی ژیان لەلا کراوەتە دروشمێکی نیشتمانیو بەرەو بە ئەنجام گەیاندنی هەنگاو نراوە.

لە پاش داخستنی یەکەم قوتابخانەی کچان لە سلێمانی بە چەند ساڵێك بە تایبەتی لە ناوەڕاستی بیستەکان بە سەرەوە بەرە بەرە بەڵام نەك بە فرەوانی سلێمانیو شارەکانی تری کوردستان خوێندنگای کچان و ئافرەتانیان بە خۆیانەوە بینیوە.

**کۆمەڵی زانستیو خوێندنی ئافرەتی کورد:**

کۆمەڵی زانستی لە بەهاری ١٩٢٦ دا دامەزراوەو «هەر لەو ساڵەشەوە شان بە شانی جوولانەوەی ڕۆشنبیری کورد بە تەرازوویەکی پێشکەوتوو رووداوەکانی کۆمەڵ، کێشەو گیروگرفتەکانی گەلیان دەکێشاو بە سەنگ و بەردی هاوچەرخ بە شوێن دەرمانی دەردی دواکەوتن و نەخوێندەواریدا دەگەڕان و لە پێناوی هەڵ و مەرجی سەرکەوتن و پێشکەوتن دا وێڵ بوون. هەمیشە لە چاویلکەی یەکسانی نێوان پیاوو ئافرەت و ئازادکردنی لە کۆت و زنجیری کۆیلایەتییەوەو هاوبەشی کردنی لە هەموو مەیدانێکا لەگەڵ پیاودا ئەیان ڕوانییە ئەم کێشەیە. بۆیە دلێرانە بەرۆکی کۆمەڵگای ڕزیوی داروخاویان ئەگرت و لە پێناوی مافی رەوای ئافرەتان دا دووچاری زۆر گێچەڵ بوون و کەوتنە بەر ئاگری رق و قین تیرو توانجی کۆنەپەرستەکان.(١٠)

لە ساڵی ١٩٣٠ داو لە ئەنجامی چالاکی کۆمەڵی زانستیو هەندێ لە ئافرەتە خزمەتگوزارو رووناك بیرەکانی وەکو حەپسە خانی نەقیب، جوولانەوەیەك لە ڕیزی ئافرەتان لە سلێمانی پەیدا بووە کە ئامانجی پێگەیاندن و پێخوێندنی ئافرەتی کورد بووە بە هەموو دەستەو چین و تەمەنێکیەوە،

## رۆشنبیری گشتی

هەر لەم پێناوەدا لە رۆژی ٢٨ی تەمووزی ١٩٣٠ دا کۆمەڵە ئافرەتێك کۆبوونەتەوەو بڕیاریان داوە کە پێویستە لە ماڵی حەپسەخانی نەقیب کۆبینەوە بۆ باس کردن و دامەزراندنی کۆمەڵێکی زانستی بۆ خۆیان.

بەم چەشنە بانگیان دا بە شار (هەروەکو لە رۆژنامەی ژیان دا هاتووە) بۆیە ژنانی شار پۆل پۆل بەرەو ماڵی حەپسە خان کشان، پاش کۆبوونەوەو شەربەت و چای خواردنەوە، حەپسە خان بە گەرمی بەخێر هاتنی کردن و لە دوایی‌دا لە جیاتی حەپسە خانی نەقیب حەپسە عرفان کە قوتابی‌یەکی پۆلی شەشەمی قوتابخانەی کچان بووە کەوتە وتار خوێندنەوەو مەبەستی گرتنی ئەم کۆبوونەوەی روون کردەوە.

لە سەرەتای ئەم وتارە مێژوویی‌و بە نرخەدا هاتووە: «. . لە پاش سڵاو: بە شەرەفێکی زۆر گەورەی دەزانم کە ئەمڕۆ بە بۆنەی ئاهەنگی کردنەوەی قوتابخانەی زانستی ژنانەوە. لەم کۆبوونەوە پیرۆزەدا یەك دوو قسەتان بۆ بکەم. هەموو دەزانین کێشی هەر میللەتێك بە ئاستی عیلم و عیرفانی‌یەوە تەقدیر دەکرێت. ئەویش بە سایەی قوتابخانەوە دروست دەبێ. میللەتێك بە تەنیا هەر پیاوی خوێندەوار بێ تەرازووەکەی لاسەنگ دەبێ‌و ئەم میللەتە وەکو پیاوێکی پەك کەوتەو نا تەواوو نەزان دەمێنێتەوە. . کەوابوو پێویستە ژنیش خوێندەوارو زانا بێت. . .(11)

**هەندێ سەرەتای تر:**

لە سەرەتای سی‌یەکان قوتابخانەی کچان لە هەولێر کراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٣ یشدا قوتابخانەی کچان لە شاری کۆیە کراوەتەوە. (بڕوانە مێژووی کۆیە ـ بەرگی دووەم).

گۆڤاری زاری کرمانجی لە ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٢٨دا دەقی راپۆرتێکی بڵاوکردۆتەوە کە بۆ وەزارەتی معارف ناردراوەو تیایدا داواکراوە کە قوتابخانەیەکی کچان لە شاری رواندز بکرێتەوە. جا لەوانەیە لە سەرەتای سی‌یەکان قوتابخانەی کچان لە رواندز کرابێتەوە.

[illegible]دا بۆمان دەردەکەوێت کە شاری سلێمانی لە رووی بەخۆوە دیتنی یەکەم قوتابخانەی کچان پێشەنگە لەم کوردستانە.

[illegible] کوردستانی ئەو دیوەوە نموونەیەکی گەشی چلەکان [illegible] کە [illegible] زاری یەکێکی نەمری ئەو دیوەوە وەرگیراوە: [illegible] محەمەدی پێشەوا لەگەڵ هەڵکردنی ئاڵای کۆماری [illegible] خوێندن داو یەکەم کەس کچەکەی خۆی

برد بۆ قوتابخانەو قوتابخانەکەش تێکەڵ بوو لە کچ و لە کوڕ، ئەوسا خەڵکەکە لاسایی پێشەوایان کردەوە.

**خوێندنی کچان لە چاو خوێندنی کوڕان دا:**

بەڵام پەرەسەندنی خوێندنی کچان لەچاو خوێندنی کوڕان دا زۆر بە سستی‌و لەسەرخۆ بە رێوە چووە، بۆ نموونە: «لە ساڵی ١٩٥٢دا لە هەموو پارێزگای هەولێر تەنیا (٧٥٩)و لە سلێمانی (١١٣٢) کچ دەچوونە قوتابخانەی سەرەتایی، ئەوانەی هەولێر هەموو بەسەر یەکەوە (٣٩)و ئەوانی سلێمانیش (٤٩) مامۆستای ئافرەت دەرسیان پێ‌دەگوتن.

هەر لەو ساڵەدا لە پارێزگای هەولێر (١٣١٢٢٨) ئافرەت نیشتەجێ بوون ژمارەی ئەوانەی کە لە پێنج ساڵان پترو نەخوێندەوار بوون گەیشتبووە (١٠٧٩٤٠) کەس. لە هەمان ساڵ ژمارەی ئافرەتانی پارێزگای سلێمانی بێ کۆچەرەکانی خۆی لە (١٢٤٦٣٣) کەس دەدا، ژمارەی ئەوانەی کە لە پێنج ساڵان پترو نەخوێندەوار بوون گەیشتبووە (١٨٨٦) کەس.(12)

لە ساڵانی ١٩٥٣/ ١٩٥٤دا لە سەدی هەشتای دانیشتووانی کوردستانی ئێران نەخوێندەوار بوون. باری خوێندنی ژنان زۆر لەوەش خراپتر بوو. لە شار (٩٠٪)ی ژنان و لە لادێ هەموویان نەخوێندەوار بوون.

لە ساڵی ١٩٦٧دا (٧٥٪)ی ژنانی مەهاباد نەخوێندەوار بوون. لە هەر پێنج کچ کە تەمەنیان لە نێوان (٧ ـ ١٥) ساڵان بوو دوانیان نەدەچوونە قوتابخانە. لە لادێکانی ناوچەی مەهاباد (٩٤٪)ی خەڵك نەخوێندەوار بووە. لە ناو ژنان دا نیسبەتی نەخوێندەواری گەیشتۆتە (٩٩٪)!!.

هەر لە پەنجاکان دا لە کوردستانی تورکیا (٧٥٪) تا (٨٠٪)ی دانیشتووان نەخوێندەوار بوون. لە کاتێك دا کە لە هەموو تورکیا ئەو نیسبەتە سەدی پەنجا بووە.

لە ناو ژنان دا رادەی نەخوێندەواری دەگاتە سەدی نەوەت هەتا سەدی نەوەت و شەش کەچی لە هەموو تورکیا لە سەدی حەفتا کەمترە.(13)

لە ئەنجامی ئەم روونکردنەوانەی سەرەوە باری نەخوێندەواری‌و رۆشنبیری کوردستانیان تا دوا چارەکی سەدەی بیستەم بۆ دەردەکەوێت کە لە چ دواکەوتنێ بووە.

بێ گومان داگیرکەری بیانی‌و هێزە کۆنەپەرستە دەسەڵات دارەکان هەمیشە بەرژەوەندیان بەوە باشتر بۆ دەچێتە سەر کە کۆمەڵانی

خەڵــك بە نەخــوێنــدەواریو نەزانی بمێنــەوە. بۆیە درێغییان نەکــردووە لە پشت گوێ خــستنی بڵاوکــردنــەوەی خوێنــدەواریو تیشکەکانی رۆشنبیری بە تایبەتی لە ناو ئافرەتان دا.

ئاشکــرایە کە باری خوێنـــدەواریو رۆشنبــیری ئافــرەت لە کوردستــانی عیراق داو بە تایبــەتی لە پەنجاکانی ئەم سەدەیە بە سەرەوە لە کوردســتــانــی تورکــیاو ئێران چاکــتر بووەو سەر ژمێرییەکانیش ئەمەیان بۆ سەلماندووین.

جێگای مشت ومر نییە کە ئەگەر نەخوێندەواریو نەزانینی بە رێژەیەکی بەرز لە ناو کۆمـەڵ دا بڵاوبـوّوە زەمینە بۆ بڵاوبوونەوەو چەسپانی داب و نەریتی کۆن و بۆچوونی نازانستانەو بیروباوەری کۆنەپەرستانە خۆش دەبێت و هۆشیاری رۆشنبیریو هونەری لە ناو جەمـاوەردا نزم دەبێت و هونـەرە جوانـە هاوچـەرخەکان لە لایەن زۆربەی خەڵکەوە نرخی شایستەی خۆیان پێ نادرێت.

هۆی ئەم بارە نالـەبـارەش بە رادەی سەرەکی ناگـەرێتـەوە بۆ خەلکــەکــە، بەڵکــو بۆ بارو دۆخـە ماددییە چەسپیوەکـە، بۆ پەیوەندییەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتی، بۆ رژێمی باو، بۆ ژێرخان دەگـەرێتەوە، کە بوونەتە هۆی خولقاندنی ئەم جۆرە سەرخانە کە رەوشت و داب و نەریت و پلەی رۆشنبیری دەگرێتەوە.

جا ئەگـەر بێت و لەم روانگەیەوە، کە بریتییە لە بۆچوونێکی مەوزووعیو زانستـانە سەیری مەسەلەکە بکەین، نابێ گلەیی لە ئافـرەتیکـورد بکـرێت کە لە رووی خوێنـدەواریو رۆشنبـیری دواکەوتوو بووە.

### پەرەسەندنی خوێندن و پلەی رۆشنبیری ئافرەتی کورد:

لە پەنجاکان بە سەرەوە بە تایبەتی دوای پەرەسەندنی بزووتنەوەی ئازادی خوازیو نەتـەوە پەروەری لە ناو جەمـاوەردا، هەروا دوای پەرەسـەنـدنی باری ئابووری وڵات و پەخش بوونی تیشکەکانی شارستـانیەت، رۆژ لە دوای رۆژ بیروبـاوەری دیمـوکـراتییانـەو یەکســانیو ئازادی ئافـرەتـان پتر بڵاو دەبـووەوەو کرایە دروشم و ئامـانجی بەشێك لە هێزە دیمـوکـراتی خوازو شۆرشگـێرەکـان و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان.

لە ئاکام دا تێروانینی خەڵك بەرامبەر بە ئافرەتان بەرە بەرە بەرەو چاکـە گۆرانی بەسەردا هات و لە لایەن زۆر کەسەوە بە یەکچاو سەیری کورو کچ کراوەو پێکــرا بێ جیاوازی ناردوویانـەتـە بەر خوێنـدن و رێگـای ئافـرەتیان داوە خوێندنی ئامادەییو باڵا تەواو بکـات و لە پاشان دا لە فەرمانگەو کارگەکاندا دابمەزرێت و ئەم جۆرە ئافرەتانەش کەسایەتی خۆیان لە مەیدانا چەسپاندووەو شان بە شانی براکانیان کەوتوونەتە کارو بەرهەم بەخشین.

بەرە بەرە ژمارەی قوتابخانەی کچان لە شارو نە شارۆچکەکان دا پەرەی سەندو لە سەرتاپای گوندەکان دا خوێندنی تێکەڵاو پەیرەو کراو لە ساڵانی حەفتا بەرەو ژوور یاسای بە زۆر پێ خوێندن بۆ هەمـوو منداڵێك تەمەنی گەیشتبێتە شەش ساڵان جێ بەجێ کراو دەست کرا بە خوێنـدنی تێکـەڵاو لە قوتـابخـانـەکان داو هەندێ خوێندنگای باڵا لە کوردستان دا کرانەوە کە کورو کچ وێکرا تیایاندا وەرگــیراون، وەکــو زانــکـۆی سەلاحــەددین و پەیمانــگــای هونـەرەجـوانـەکـان و پەیمانگـای باڵای تەنـدروستیو پەیمانگـای مامۆستایان.. هتد

ئەم دیاردە شارستانیتییەش کە لە حەفتاکان بە گەشانەوەدا بوو، بووە هۆی هەڵگیرساندنی نیمچە شۆرشێکی کۆمەڵایەتی بە رووی بیروبـاوەری کۆنـەپەرستانەو لە پێناوی یەکسان بوون و بە یەکچاو سەیرکـردنی کچ و کور لە بوارەکـانی خوێنـدن و تێکەڵاوبوون و پەرەســەرەندنی پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی نێوان ئافرەت و پیاو بە تایبەتی لە کۆمەڵگەی شارەکان دا.

### پەراوێزو سەرچاوە:


(١) دوکتور کمال مەزهەر، ئافرەت لە مێژوودا، بەغدا ١٩٨١

(٢) الـدكـتـور ابراهيم خليـل، تطور التعليم الـوطني في العراق (١٨٦٩ - ١٩٣٢)، ١٩٨٢، ل: ٢٥ - ٢٦.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٤) هەمان سەرچاوە.

(٥) طاهر احمد حويزي، مێژووی کۆیە، بەشی دووەم، بەغدا ١٩٨٤، ل١٧٦.

(٦) د. کمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ل١٤١.

(٧) بۆ پتر زانیاری پەیدا کردن لەم بارەیەوە تکایە سەیری کتێبە بە نرخەکەی دکتور کمال مەزهەر (کوردستان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهان) بکە.

(٨) مەلیحە نەزهەت لە ساڵی ١٨٩٣ دا لە پارێزگای سلێمانی لە دایك بووەو ناوی تەواوی (مليحە نزهت کچی عبدالقادر افندی کوری شیخ عبدالسلام افندیو لە بنەماڵەی شێخ سلام افندی قازییە.

(٩) کمال رؤوف محمد، حلقە تاريخية مفقودة للتعليم الحديث، اول مدرسة للاناث في السليمانية، رۆژنامەی (العراق)، ژمارە (٣٠٦٧) رۆژی ١٩٨٦/٢/٢٧.

(١٠) غەفــوور میرزا کەریم، تەقــەڵــلایەکی دڵســۆزانە بۆ لەنـاو بردنی نەخوێندەواری لە کوردستاناو کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، بەغدا ١٩٨٥، ل٦٤.

(١١) رۆژنامەی (ژیان) ژمارە (٢٢٥)، ١٩٣٠/٧/٣١.

ملخص البحث

# نبذة عن تاريخ تعليم النساء الكرديات

● مغديد حاجي - أربيل ●

نشطت بعد الانقلاب العثماني سنة ١٩٠٨ جمعيات ومنظمات كردية داخل الدولة العثمانية تحث الجماهير على التعلم والأخذ باسباب التقدم والمدنية وتبث الوعي القومي والاجتماعي بينها. فكانت تستخدم الصحافة باللغة الكردية كوسيلة تثقيفية بالاضافة الى محاولة فتح مدارس للأطفال الكورد. ومن هذه الجمعيات جمعية (هيڤى)و (تعالى وترقى كورد).و(كورد تعميم معارف جمعيتي) و(كورد قادينلرى جمعيتيى) والجمعية الأخيرة خاصة بالنساء.

وبجهودها وجهود دعاة التقدم من المثقفين الكورد نشر الوعي الاجتماعي بين المجتمع وبرزت الدعوة الى تعليم الفتيات في المدن الكبيرة، فأول مدرسة رسمية للبنات فتحت في السليمانية عام ١٩١٥ ومديرتها مليحة نزهة خان.

وبعد العشرينات تأسست في كردستان العراق مدارس للبنات في السليمانية وأربيل وكوي وفيما بعد لم يشهد التعليم النسوي التطور الذي شهده التعليم العام ففي سنة ١٩٥٢ كان عدد طالبات المدارس الابتدائية في اربيل ٧٥٩ من مجموع نفوس الاناث البالغ ١٣١٢٢٨ نسمة وفي السليمانية (١١٣٢) طالبة من مجموع ١٢٤٦٣٣ نسمة.

وفي السبعينات تطور التعليم النسوي في كوردستان تطوراً كبيراً وشمل القرى والأرياف أيضاً فتم تطبيق التعليم الالزامي على الجنسين وتعميم التعليم المختلط للجنسين، وفتحت في مدن الحكم الذاتي معاهد ومدارس عالية فبالأضافة الى جامعة صلاح الدين هناك معهد للفنون الجميلة ومعهد الصحة العالي ومعهد المعلمين.

وهذه الظاهرة الحضارية أدت الى قيام أشبه ماتكون بثورة اجتماعية ضد التقاليد البالية والتوجهات الرجعية.

# ئاژەڵ لەو چیـرۆکـە فۆلکلۆریـانـەی کە بۆ منداڵانی کورد هەڵێنجراون

• نوزاد علی أحمد •

**پێشەکی:-**

-------------

فۆلکلۆر ئەو سامـانـە زۆرو زەوەنـدەیـە کە مێژووی گەلان دەگێڕێتەوەو سەربردەی کۆنە سالانێکی پڕ ڕووداومان باس دەکات، جا وەکو دەڵێن مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە مل دەبەر ئەو چیایەنێ، مەبەستم ئەوەیە فۆلکلۆر چیایـە، نەخێر بەڵکو مەبەستم ڕەوسە گەورەکانی فۆلکلۆرە، بەڵێ سەختیشـە چونکـە مێری ئەوێ خۆی لێدا، تا شەن و کەوی بکات «مەبەستم من وتۆو ئەو. . . هتد نیە» بۆ ئەوەی قۆمەتەکە بێ بەدوو، قۆمەتی گەنم و قۆمەتی کا، حەزناکەم زۆری لەسـەر بڕۆم چونکـە گەلێـك پسپۆڕ و نووسـەر لە پەرۆزی دواون، هەندێکیان بوونەتە بنێشتە خۆشەی نێو دەمان. . !!

ئەوەی دەمـەوێت لێـرەدا خۆمی لە قەرە بدەم لەو جیهـانـە پڕ سیحراویـەی منـداڵانە بۆ ئەوەی بزانین چۆن ئاژەڵ ویستویەتی لەو جیهانە نزیك بێتەوە، یان ڕۆڵی ئەم بگێڕێت. . . جا بە گوێرەی ئەو کەمە ڕۆشنبیری یەی هەمە پاش خوێندنەوەی چەندان چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی تایبەت بە منداڵان وام بە باش زانی ئەو شتانەی لەلام گەڵاڵـە بووە بیـان خەمـە سەر کاغـەزو کردیـشـم. . لەو قەنـاعـەتـەشم نوقسـانـی زۆرە، بەڵام وا بزانم لە نەبـوونی باشترە چونکە ئەوەندەی گەڕام بە تایبەتی لە ئەدەبی کوردی سەرچاوەیەکی ئاوام بەردەسـت نەکـەوت، تا سوودی لێ ببیـنم، تەنیـا چەنـد سەرچاوەیەکی عەرەبی نەبێت. . .

وام بە باش زانی لێکـۆڵینـەوەکـەم بکـەم بە دووبـەش لە بەشی یەکـەمـدا چەنـد خاسیـەتێکی جیهـانی ئاژەڵ و منداڵ لەو چیرۆکە فۆلکلۆریـانـە دیـاری بکـەم. . لە بەشی دووەمیشـدا هەنـدێـك چیرۆکم بە نموونە هێنا وەتەوە، تا ئەو سەرباسانەم بەهێز بکەن کە بۆ بەشـی دووەمـی لێکـۆڵینـەوەکـەم هەڵم بژاردوون چۆنیـەتی سەربـاسـەکـانیش پەیـوەنـدی بە ناوەڕۆکی چیـرۆکـەکان هەیە. . پێـویستـە ئەوەش دەربخـەم کە لێکۆڵینەوەکەم بە گشتی پەیوەندی بە ناوەڕۆکی چیرۆکەکان هەیە، واتە لایەنی ناوەڕۆکم گرتووە. . . ئیتر نازانم پێم دەڵێن: خەرمان بەرەکەت، یان ماڵی قەڵپ سەر بەخاوەنیەتی.

**بەشی یەکەم:**

**١ - بۆچی ئاژەڵ. . ؟**

بە ڕای من هەر نووسـەرێـك کە دەست دەداتـە قەڵـەم پێـویستە یەکـەم جار بیـر لەوە بکـاتـەوە ئایـا ئەو بابەتەی دەینووسێت شتێکی سواونیـە؟ یان چەند گوڵم بۆ خەرمانی ئەدەبەکەی زیاد دەکات. . . ئینجـا دوایی نەخشـەو ڕیـزکـردنی سەرچـاوە دێت، کە هەر هەموو ئەوانەش بەندن بە زەمینەی ڕۆشنبیری بێجگە لە خۆماندووکردن. . جا ئەو باسـەی منیش ماوەیـەکی چاکـە لە مێشکم گینگـڵ دەدات و ئەمـلاو ئەولام پێ دەکـات، هەتـا گەیشتمـە ئەو قەنـاعـەتەی چەند لاپەڕەیەکی پێ ڕەش بکەمەوە، ئەگەر هەر هیچیشی لێ دەرنەچێت، ئەوە دەراوێك لەم لایەنە بکاتەوە. . . .

بۆ ئاژەڵ. . ؟! بەڵـێ بۆ ئاژەڵ! بە کورتـی لەبـەر ئەوەی ئاژەڵ جیهـانێکی سەیـر و سەمـەرەی هەیـە ئەمـە لەلایەك لە لایەکی ترەوە هیچی لە مرۆڤ کەمترنیـە، دوایش کێ دەڵێ ڕۆژە سەرەتاییەکانی مرۆڤ لەمـەوە دەستـی پێ نـەکـردووە، یان گۆڕانێکی بەسـەرا هاتبێت. . . ئەمـانـە هەمووی لە لایەك لە لایەکی ترەوە ئەو جیهانە بەرفراوانەی سامانی میللەتەکەمان تا ئێستا بە شێوەیەکی وا خۆی لە قەرە نەدراوە تاسکمـان بەخـۆمـان نەسـوتێت، نەخوازەڵڵا ئەو بەشە گەورەیـەی چیـرۆکی فۆلکلۆری کە تایبـەت بە منـداڵانمـانن، «بە تایبـەتیش ڕۆڵی ئاژەڵ» واش بزانم کاتی ئەوە هاتـووە هەنـدێکمـان خەریکی ئەو دەقە فۆلکلۆرییانە بین کە لەلایەن خوشك و برا دەران کۆکـراونـەتـەوە چونکە بۆمان هەیە بڵێین با هەر کەسەو لەلای خۆی

خەریـك بێت هەنـدێك بە « خرکردنەوە» ـ جمع ـ هەندێکی تریش بەشەن و کەوو لێکۆڵینەوە ـ دراسة ـ بەلام حەز ناکەین خرکەرەوەکان بەلێکـۆڵـەران ـ باحث ـ بڵێن حازربـەدەستن، ناوانیـە «مەربەپێی خۆی وبـزنیش بەپێی خۆی. . یان چاکتـرە بڵێن «کـەس رزقی کەس ناخـوا» هەردوو لایـان هەرخزمـەتی ئەدەبی بەلـەنگـازی کوردییە، قەت نەبووەو ناش بێت تەرو هیشك وەکو یەك بسوتێنرێ. . !

بوونی ئاژەڵ لە چیـرۆکی فۆلکلۆری بە تایبـەتی ئەوچیـرۆکـە فۆلکلۆر ـ بیانەی بۆ مندالانی کورد هەڵبژاردن ڕوویەرێکی چاکی داگیـرکـردووە. ، بە زۆریش ڕۆڵی سەرەکی واتە ڕۆڵی پاڵەوان کاك عبـدالغني بەعلی پەحیـا دەڵێت: «زۆرتر لە نێوخەڵکدا باوە کە تێدا گیان لەبەر دەوری سەرەکی دەبینێ و زیاتر لە چیرۆکی دی سەرنجی منـدال رادەکـێشـێ و بە پەسـنـدی دەزانن، ئەم جۆرەش خۆی لە خۆیدا دەکـرێتـە دووبـەش بەشی یەکـەمیـان ئاژەڵ و بەشی دووەمیشیـان باڵنـدەن»[١] ئەوەی لەم چەند دێرە وەدەردەکەوێت کاك عبـدالغني شتێکی وردی وە دیـارخستـووە ئەویش جیـاکـردنـەوەی ئاژەڵ و باڵنـدەیـە، کە من تەنیـا لەێکم گرتـووە ئەویش «ئاژەڵ»ە، چونکـە زۆربـەی نووسـەرانمان تاکو ئێستا ئەو دووانەیان تێکەلاوی یەکتـر کردووە. . ! جا هەڵبـژاردنی ئەو سەرباسەی منیش پەیوەندی بەو کۆمەڵە بۆچوونە هەیە کە لە پێشەوە باسم کرد. . .

**٢ ـ ئاژەڵ و مرۆڤ:**

ئەگـەر بمـانتـوانیبـایە هەمـوو مێـژووی کۆنی مرۆڤایەتی تاوتوو بکـەین و. ئەگـەر هەبـوایـە. . ! بچووباینە بنج وبناوانی ئەوشتانە تاکـو ئێستـا نهێنی وشاراوەن، بەلام تاکـو ئێستـا زۆریان بوخچەی نەکـراوەن و شتێکی ئاوایـان لێ هـەڵنـەکـرانـدووەو قولاییـە تاریك و نوتـەکەکانیان نەدۆزرانەتەوە. . . جا وەکو شتێکی حەتمی پێویستە بۆ ئەو دەقـانە بگەڕێنەوە «واش کراوە» کە وەکو سامانێکی کۆمەڵگای مرۆڤـایـەتی دەستمـان کەوتـوون، ئیتر لە هەر سەردەم و قۆناغێکدا لایـەك لەو دەقـانـە کراوەتـەوەو تۆزێـك هەڵگێڕ و وەرگێڕ کراوەن و بە گوێرەی باری زانیاری ئەو سەردەمە شتیان لێ وەرگیراوە. . .

لە سەردەمـە هەرە زووەکـانی مێـژووی مرۆڤـایـەتیـدا ئەدەب هەبووە، بەلام نەك وەکو ئەمڕۆ، ئێمەش بڵێن ونەڵێین ئەدەبیاتیش ڕەنگدانەوەی ئەو بارە کۆمەلایەتییە کە لە نێو منداڵدانی واقیعەکەی سەری هەڵـداوە، لە ئەدەبیشـدا ئێمـە ملی حیکـایـەت و ئەفسـانە دەگرین، ئەگەر شتێکمان بۆ ڕوون بکاتەوە، بەڵێ هەندێك شتمان پێ دەڵێن، ئەگـەر هەر هیچمـان پێ نـەڵێن، دەڵێت: کۆمەڵگای ئەو سەردەمی ئی وهـا ژ یـاون، ئی وها ڕاویان کردووە، ئی وها گوزەرانی ڕۆژانـەیـان بردۆتـەسـەر. . . بۆ نموونە ئەگەر ئەوشتەی «کاوە» یان «زوحـاك» یان «ئـەژدەهـاك». . .[٢] هەڵبـەستـراوەو وتراوە ئەفسانە بێت، یان هەقیقـەت بێت، ئەوە بە قەنـاعـەتی من مێژووییەك یان دەراوێك بۆ کۆمەڵگای ئەوسای کورد دەست نیشان دەکات، کە من بەو سەردەمـە دەڵێم: قۆناغی کۆیلایەتی گەلی کورد، نموونە زۆرو زەوەنـدە، نەك لە ئەدەبیـات وکەلـەپـووری کوردی بەڵکو لە هەموو سامـانی مرۆڤـایـەتی شتی ئاوا دەبینـدرێت، بابـە کورتی مەبەستی تەواومـان ڕوون بکـەیـنـەوە: ئاژەڵ و مرۆڤ هەر لە سەردەمـە کۆنـەکـانەوە پەیوەندییەکی چاکیان بەیەکەوە هەبووە کە هەردووکیان تەواوکـەری یەکتـربـوونـە ئێمـە دەمانەوێت بڵێین بە هۆی ئەودەقە فۆلکلۆریـیـانـەی دەستمـان کەوتـوون دەتـوانین ئەوپەیـوەنـدییـە بدۆزینـەوە، کە بە هۆی ئەوپەیـوەنـدییـە دۆزراوەش دەراوێـك بۆ مێـژوو و گوزەرانی ئەوسـای گەلـەکەمان دەکەینەوە چۆن؟ هەر هیچ نەبێ دەتـوانین داب و نەریتی ئەوسـای گەلـەکـەمان دەست نیشان بکـەین، با بۆ نمـوونـە جارێکی تـر بگـەڕێینـەوە سەرسـەربـردەی (زوحــاکی زۆردار) کەوا دەڵێن ئەگـەر دوو «مار»ەکـەی سەر شانی زوحـاکی وەدەربکـەوتبـانە دەبوایە مێشکی دوولاویان بدرێتێ، کێ دەڵێ ئەمە ڕاستە؟ ئەی کێ دەڵێ ڕاست نیە؟

یان ئایـا ئەمـە شتێکی ئەو سەردەمـە دوورەمـان.بۆناگێـرێتـەوە؟ حیکـایـەت و سەربـردە لەسـەر ئاژەڵ زۆرەو بەهۆی هەریەکێك لەو هەقـایـەتـانـە دەتـوانین کۆمـەڵێ شت هەڵێنجین، ئا لێـرەدا بۆ وەدیارخستنی سەردە مێژووییەکەی ئەلکزاندەر هجرتی کراب دەڵێت:[٣] (هـەقـایـەتی ئاژەڵ، یەکێکـە لە کۆنتـرین چیـرۆك کە زانیـومـانـە) هەر بۆبەیـان کردنی پەیـوەنـدی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ ئەلکـزانـدەر باسی ئەوە دەکـات کە گەلێـك ئاژەڵ بوونەتە خواوەندو ڕەمـزێکی پیـرۆز[٤] (هـەنـدێك لەوچیرۆکانەی لە دەوری ئاژەلان دەسـوورێنـەوە، پێشکـەوتوونەو بوونەتە خواوەند، ئەو هەقایەتانەش سەرەتـایـەکی ڕاستـەوخـۆن بۆئەو هەقـایـەتـانـەی کە لە دەوری خواوەندەکان دەسووڕێنەوە یان وەکو وتوومە سەرەتایەکن بۆ ئەفسانە)[٥]

**٣ ـ منداڵ و ئاژەڵ:**

منـداڵ بە چەنـد قۆنـاغێـك تێـدەپەڕێت، پاش ئەوەی لە دایك دەبێت، لە هەر قۆنـاغـەو خاسیـەتێکی تـر بە خۆی دەگـرێت، لە

قۆناغی (پەنەوانی ٨ - ١٢)[٥] مندال حەز دەکات زیاتر لە جیهانی ئاژەلان نزیك بێتەوە بە تایبەتی ئەو ئاژەلانەی لە دەوروبەرەکەی دەژین و وادەکات وەکو پالەوانێکیش رۆلی ئەوان بگێرێت . .

بێجگە لە ئاژەلی هەقیقی ، کە وێنەیەکی ئاژەل دەبینێت هەمیسان پێی دلخوش دەبێت ، گەلێك جار دەست دەکات بە چەپلە لێدان بە تایبەتی کە دەبینێت ئاژەلەکە دەجولێتەوە وەکو لە تەلەفزیون دا دەیبینین ، ئەمە نەك لەو قوناغە ناوبراوەی ناومان هێنا ، بەلکو لە دوو قوناغەکەی پێشووش مندال حەز لە جیهانی ئاژەلان دەکات گەلێك جار رووی‌داوە مندال لە قوناغی یەکەمی ژیانیدا ئاژەلێکی خوشویستووە ، کەچی لە دوا قوناغی رقی لێ بوتەوە ، بەرای من ئەوە بە گەشەی مێشکی بەند ، چونکە بەرە . . بەرە مێشکی گەشە دەکات و کامل دەبێت . . . لێرەدا بەرامبەر بە مروڤ پرسیارێك خوی زەق دەکاتەوە ئایا لە قوناغی یەکەمدا (قوناغی واقیعی و خەیالی سنووردار) مندال هیچ جیاوازی لە نێوان مروڤ و ئاژەل دەکات؟ بەرای من هێشتا بە وردی وەلامی ئەم پرسیارە نەدراوەتەوە رەنگە هەر کەسە و رایەك بدات ، بەلام هێشتا لایەنە زانستیەکەی نەخراوەتە روو . . ! خالێکی تر ماوە کە پێویستە روونی بکەمەوە ئەویش ئەوەیە کە مندال بو هەر ئاژەلێك ناوێك دەردەبرێت ، یان رەمزێك بەکاردێنێت ، بو نموونە کە (کەر)ێك دەبینێت دەلێت (حەچە) یان (بەعە) راستە لە سەرەتادا دایك و مالەوە ئەو ووشەو برگانە فێری مندال دەکەن بەلام دەبێت ئەمەش بناغەیەکی مێژوویی هەبێت کە لە و باوەرەش دام سەرچاوەی سەرهەلدانی ئەو ووشانە هەر مندال خویەتی واتە : یەکەم جار لە دەمی مندال پرژابێت و ئینجا خوی جێگیرگردبێت جا بو ئەوەی ئەوچەند دێرە راستی بدەنە دەست ئەوە ناوەروکی چیروکی فولکلوری کوردی بو زاروکان پریەتی لەو راستیانە بەلکو گەلێك شتی تریشی تیایە . . .

**بەشی دووەم :**

لەم بەشەدا بێجگە لە تاوتووکردنی سەر باسەکانم بە نموونە زیاتر رایەکانم لە راستی نزیك دەخەمەوە . . . نموونەکانیش زیاتر ئەو چیروکانەن کە بلاوکراونەتەوە چ بە نامیلکە یان کتێب ، وەکو لە پێشەوەش گووتم من زیاتر لە ناوەروکی چیروکەکان دەدوێم بە تایبەتی ئەو چیروکانەی لەم لایەنە دەستکاریەکی ئاوایان نەکراوە ، واتە مێزاجە کونەکەی چیروکەکان تێك نەدرابێ . . ئەوچیروکانەش هەموو ئەوچیروکانەنین کە بلاوکراونەتەوە چونکە من نەهاتووم بیبلیوگرافیای ئەوچیروکە فولکلوریانە رێك بخەم کە بو مندالان لە واقیعەکەمان هەلێنجراون . . ئەوچیروکانەی من هەلم بژاردوون بو بە پێزکردنی باسەکەیە .

**١ - دز یان مشەخور :-**

کاکە جەزا عەلی ئەمین دەلێت : «من تا ئێستا ناو بە ناو ترس وەك تالە موویەکی بارێك ئاوێتەی چیروکەکان دەکەم بەلام بە نیازی ئەوەنا مندال زارەترەك بێ ! ترس بو ترس نا ، بەلکی بو زانینی حقیقەتی . سەکەیە ، یان ترس بو هەیە؟ کێ دەیهێنێ؟ کەی نامێنێ؟ » ئەم ووتەیەم بویە هێنایەوە ، دەمەوێت پێتان بلێم دزیش جورە ترسی‌ـە کە راچلەکینێکی ترساوی سەرتاپای لەش داگیر دەکات نەخەر . ـلا مندال . . . دزی و مشەخوریش بە شێکن لە واقیعی دوێنێ و ئەمرو ئەی بوچی باسیان نەکەین و ژیانیکی ئاوەژوو فێری مندالانمان بکەین ، بەلام سەربارەی ئەم کردەوەیە پێویستە بەردەبازەکەش هەبێ . . . فولکلوری کوردیش بە تایبەتی لایەنی راز و حکایەت و چیروکی لەم شتە بەدەرنیە کە ئەمە ئەوچیروکانەش دەگرێتەوە کە بو مندالان رێك خراون .

فولکلوری هەموو سەر رووی زەمین دوو لایەنی تیایە دەبینرێت ، کە لایەنی «خێر و شەرە» دزیش لایەنی شەرە ، لە زوربەی چیروکەکانیش لە دوایدا هەر لایەنی خێر سەردەکەوێت ، لەو چیروکانەی بو مندالانیش هەلێنجراون هەروایەو گرەو هەر بو خێرە . . . بە زوریش لەو چیروکانەدا ئاژەل رولی سەرەکی دەبینێت بە تایبەتی بو دزی کردن ، یان مشەخوری .

ئێستا چیروکێ بە نموونە دەهێنمەوە هەم لایەنی دزی تیایە هەم لایەنی مشەخوری «تیتل و بیبل»[٦] دوو کاریلەی بزنیکن هەموو جارێ کە بزنەکە بو لەوەر دەچوو دەیشاردنەوە تا کەس نەیان خوات . . ئێواران بزنوکە دەگەراوەو دەیگوت :-

تیتل و بیبلی دە دایە
دەرکەی وەکەن لە دایە
شیرم دە گوانان دایە
گیام دەکەلێنی ددان دایە

هەتا روژێك ، گورگێك بەشوێنەکەیان دەکەوێت و لە دەرگا دەدا کەچی ئەوان دەرگای لێ ناکەنەوە ، چەند جارێك فێل دەکات کەچی هەرنایکەنەوە تا شیعرەکەی سەرەوەش دەلێتەوە هەر سوودی نابێت ئینجا دەرکە لەرێسمە دەبات و هەردووکیان دەخوات . . . ئیتر گورگی تاوانبار ئەم تاوانە دەکات ، تا لە کوتاییدا بزن و گورگ لەسەر ئەوە رێك دەکەون ، کە بەشەربێن بو ئەوەی بزانن کێ

دەبیـاتـەوە. پاش شەڕێکی توند کە گەلێك هاتبوونە سەیریان، بزن شاخە تیژەکانی لە زگی گورگ داو تیتل و بیبل بە ساغ و سەلامەتی لە زگی گورگ هاتنە دەر . . . ئیتر بزن و تیتل و بیبل گەڕانەوە مال.

ئێستا با بزانین دەرەنجامی ئەم چیرۆکە چی یە؟

١ ـ باسی دزیکردنێك دەکات، کە ئاژەڵێك لەسەر بەرهەمی ئاژەڵێکی تردەژیت!

٢ ـ ململانێ یە لە نێوان خێر و شەڕ.

٣ ـ مندال فێری ئەوە دەبێت هەر خێر بەسەر شەڕدا زال دەبێت.

٤ ـ ڕوویکی تری واقیعەکەیە.

٥ ـ خاسیەتی دوو ئاژەڵ خراوەتە ڕوو بزنی سوودمەند هەر سوودمەندیشە «واتە لە چیرۆکەکە» لەگەڵ گورگی بەزیان، کەهەر زیانداره

٦ ـ خاسیەتێکی ئەفسانەیی تیایە کە بریتی یە لە: پاش ئەوەی گورگەکە هەردوو کاریلەکە دەخوات، دوایی بە سەلامەتی لە زگی گورگەکە دێنەدەرەوە.

چیرۆکی بەم شێوەیە لە ئەدەبی فۆلکلۆریمان زۆرە، ئەم چیرۆکەش بۆ چەسپاندنی ڕایەکانمان بەسە، چونکە گەلێك جار زۆر، بۆر دەبێت . . . بۆ ئەم جۆرە چیرۆکانە

ئەم وتەیە دەهێنمەوەو دەرگای ئەم سەرباسەی پێ دادەخەم:

«پێویستە مندال بۆ شەڕێکی تووش ئامادە بێ دژی ناهێمنی و زوڵم و بێدادی»[١٠]

**ج ـ ململانێ:ـ**

**«حیکایەتی ئاژەڵان شێوازە چیرۆکێکە، ئاژەڵ ڕۆڵی سەرەکی تیایە دەبینێت»[١١]**

**ئاژەڵیش وەکو بەشێك لەو سروشتەی لێی ژیاوەو لێی دەژیت تووشی هەڵدێرو دەشتایی هاتووە بۆیە سەیرنیە ئەگەر باسی ململانێی نێوان ئاژەڵان بکەین، گواستنەوەی قۆناغەکانی ئاژەڵیش لە چاخێك بۆ چاخێکی تر بەندبووە بە ململانێ بۆ؟ چونکە وای لێکردووە زیاتر لەگەڵ ژیان ڕابێت و خۆی بپارێزێت . . .[١٢]**

**«گەشتێ بەرەو کوێستان»[١٣] چیرۆکێکی سامانی نەتەوایەتیمانەو لە دەورو خولی جیهانی منداڵان دەسوڕێتەوە، کەرێك دەچێتە کوێستان لە ڕێگا تووشی دوو بەران دەبێت لەگەڵ خۆیان دەبات، کەڵەبابێکیش دەگەڵی کەوتەرێ لە نێوان خۆیان بڕیاریان دا لە هەمووو تەنگ و چەڵەمەیەکدا پشتی یەکتر بگرن، تا ئێرە ئەمە ڕوویکی چیرۆکەکەیە، ڕووەکەی تریشی بریتی یە لە گورگێك کە**

ڕووی شەڕە، ئەویتریش ڕووی خێربوو «پیرەکەر بەبەرانەکانی گووت ئەوە من لە ناو ئەم قنە گیایە دەڵەوەڕێم و هەرکە گورگە بۆلای من هات، ئێوە بە قۆچەکانتان هێرشی بۆبەن وزگی بدڕن و کەڵەبابی هاوڕێشمان بادەم چاوی بە دەنووکی بڕنێتەوە.

هەموویان لەسەر قسەی پیرەکەر ڕێك کەوتن کە گورگەکە بۆلای پیرەکەرەکە چوو کەڵەباب خۆی بە دەم و چاوی دادا و ڕنیەوەو بەرانەکانیش گەیشتنە سەری و بە قۆچەکانیان زگیان دڕی، ئەم چیرۆکە یەکێکە لەو چەندان چیرۆکەی کە بەزەقی ململانێی نێوان ئاژەڵانی تیایە دیارە، دەتوانین ئەم سەرنجانە لەمەڕ ئەم چیرۆکە بخەینە ڕوو

١ ـ ململانێی نێوان خێرو شەڕ.

٢ ـ کەرو بەران و کەڵەباب دوو ئاژەڵ و پەڵەوەرێکی سوودمەندن لەبەرەی خێر.

٣ ـ گورگ وەکو ئاژەڵێکی زیان بەخش لەبەرەی شەڕ.

٤ ـ سەرکەوتنی بەرەی خێر.

٥ ـ لایەنێکی پەروەردەیی جوانی تیایە، پشتی یەکترگرتن و سەرکەوتن.

٦ ـ ململانێ لە پێناوی مانەوەی بەرەی خێر.

٧ ـ ڕێك کەوتن لەسەر چەند فێلێك بوو سەرکەوتن.

**د ـ بەزمی مام ڕێوی:**

**ئاژەڵ گەلێك جۆری هەیە، هەر جۆرەو بە گوێرەی ئەو ژینگەیەی لێی ڕاهاتووە دەژیت، ئەگەر سەیری ئەو دەقە فۆلکلۆرییانە بکەین دەبینین ژینگە ڕۆڵێکی بنچینەیی دەگێڕێت لە خۆگونجاندنی ئاژەڵ وەکو لە پێشەوەش باسم کرد پانتایی ئاژەڵ لەڕووبەر دیارە بەڵام ئەوەی سەرنجی ئێمەی ڕاکێشاوە، ڕێوی لەو پانتایی یە زۆری بەردەکەوێت، بە ڕای من بوونی ئەم ئاژەڵە یەکەم بۆ جۆرو شێوەو هەڵکەوتوویی ئاژەڵەکە دەگەڕێتەوە، دووەم بۆ شوێنە جوگرافیاکەی . . . ئیتر بەزمی مام ڕێوی زۆرە، بەزم لەگەڵ ڕێوی واتە ڕێوی لەگەڵ ڕێوی، ڕێوی لەگەڵ ئەسپ، ڕێوی لەگەڵ سروشت، ڕێوی و مرۆڤ، ڕێوی لەگەڵ باڵندە، ڕێوی لەگەڵ پەڵەوەر. . . هتد، مام ڕێویش، بەڕێوی فێلباز بەناوبانگە نموونە زۆرەو پێویست بە ئەوەندە نموونە هێنانەوە ناکات بۆیە وامان بە چاك زانی خۆمان لە قەرەی یەك نموونە بدەین «ڕێوی گەرمیان و ڕێوی کوێستان»[١٤] چیرۆکێکی فۆلکلۆری خۆشە سەرنجی منداڵان بۆلای خۆی ڕادەکێشێت، دوو ڕێوی دەبنە هاوڕێی یەك،**

یەکێکیـــان سێ فیـلْ دەزانێ، ئەویتـریشیـان سیو سێ فیـلْ . . . ڕۆیشتن تا تووشی دوونگە مەڕێکی قەڵەوبوون، ئەو ڕێوییەی سێ فیـلْ دەزانێ بەو ڕێـوییـەی ووت کەسیو سێ فیـلْ دەزانێ گووتی چۆن دەستمـان لێ گیـر دەبێ، خۆی لێ نـزیـك خستەوەو پێوەبوو، ڕێوی سێ فێلیش بە کلکی دوونگەکەی لێ کردەوەو خواردی، ئینجا ڕێوی سیو سێ فێلْ بە ڕێوی سێ‌فێڵی گووت :ـ چۆنم ڕزگار دەکەی؟!

ڕێـــوی سێ فیـلْ گوتی : کە خاوەن بیستـان هات، تۆش خۆت بمـرێنـە، منیش لە دوورەوە خۆ شەل دەکەم بۆ ئەوەی بێتە لات، کە زانی تۆ مردی لە تەڵـەکـەت بکـاتـەوە، منیش وا بەشـەلی بمینێ دەکەوێتە دووم ئەو کاتە ڕادەکەم و تۆش لە لایەکیترەوە بۆی دەرچە؟!

بەم جۆرە ڕێـوییەکەیتر ڕزگار دەبێت، هەمان ڕێوی سیوسێ فیـلْ جارێکی تـر چووە گوندێك بۆ ئەوەی مریشکێك بدزێت کەچی لەبـەر سەگـەی ئاوایی ڕایکـرد بە دەست بەتـاڵی گەڕایـەوەو کەچی ڕێـوییـەکی تـر چووەبن گونـدیوخۆی بە مردوودانا بۆبەیانی چەند پەلـەوەرێکی گونـدی لێی نزیـك بوونـەوە تا لە ناکـاوڕا یەکێکیانی فڕاند . . . بە هەمان فێلْ و تەڵەکەبازی لە لەهەرسێك ڕزگاریبوو.

سەرنجم لەسەر فێڵەکانی ڕێوی :ـ

١ ـ زۆربەی فێڵەکانی مام ڕێوی لایەنی (سلبی)یە .

٢ ـ زۆربەی فێڵەکانی مام ڕێوی لە پێناوی زگ پڕکردنی خۆیەتی .

٣ ـ مەرج نیە ڕێوی لە هەموو کارەکانی سەرکەوتن بە دەست بێنێت وەکو چیرۆکی «پڵنگ» هەبوو. . نەبوو.[١٥]

٤ ـ ئەو ترس و مشـەخـۆرییـەی مام ڕێـوی دەرسێك فێری منداڵان دەکـات بۆ ئەوەی ڕێگـا ڕاستـەکـە ببینن، کە دوایی فێـر دەبێت ئەو کارانە لای کۆمەڵگاکەی پەسندنین . . !

**٤ ـ لایەنی پەروەردەیی :**

چیـــرۆکی فۆلکلۆری بەشێکـــە لەو ژیـــانــەی کە کۆمـەڵگـای مرۆڤـایـەتی پیـایـا تێپـەڕیوەو ئەمرۆ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت . . جا (ئاسایی یە ئەگەر منداڵ ئەو چیرۆکە میللیانەی خۆش بوێ، چونکە لە هەموو شوێنێ لای خەڵك خۆشەویستن لەبەر ئەوەی بە وێنەیەکی ئەدەبیو هونـەری کەلـەپـووری مرۆڤـایـەتی دادەندرێت)[١٦] بۆیە جێگـای گومـان و سەرسـوڕمـان نیە منداڵ بە قەدژیانی نێو مرۆڤان حەز بە ژیانی نێو ئاژەڵان بکات، ئینجا بۆ منداڵ حەز لەو چیرۆکانە دەکـات؟ ئایـا ئەویش هەست بەوە دەکـات ئەمـە لاپەڕەیەکی کۆنەو ئاوێنـەی ئەمـرۆمـان پێشـان دەدات؟ یان هەست دەکات ئەمە کۆنە سروشتـەکـەی خۆیەتی؟ یان وەکو گۆرکی دەڵێت : (پێویستە کتێبی لەمـەڕ دوێنێ بخـوێنینـەوە، هەتا بە چاکی لە ئەمرۆ بگەین)[١٧] ئایا بۆچوونی منداڵ بەمجۆرەیە یان قۆناغی منداڵی، قۆناغی ئاژەڵی‌یە؟

ئەوەی ئێمـــە لێـــرەدا هەڵـــوەستـــەیـــەکی بۆدەکـــەین لایـــەنی پەروەردەیی یە لەو چیرۆکە فۆلکلۆرییانەی بۆ منداڵانی گەلەکەمان لە واقیـــع هەڵێنجـراون . . لە کۆنـدا کە داپیـرە لە شەوی ساردوسـری زستـانـدا هەقایەتێکی بۆ منداڵان دەگێڕایەوە، بێجگە لەوەی بە تام و بۆیـەکی خۆش چیـرۆکـەکەی دەگێڕایەوە، ئەگەر چیرۆکەکە ترس و دزیو یان شتێکی زیـان بەخشی تیـابایە بۆمنداڵان لێکی دەدایەوەو بە گوێرەی هەقایەتەکە ڕێگای ڕاستی پیشان دەدا ئەمەش خۆشی لە خۆیـــدا لایـــەنێکی پەروەردەکـــردنـــە، زۆربـــەی جاریش پاش تەواوبـوونی چیـرۆکـەکـە منداڵان دەستیان بە پرسیار کردن دەکرد، وەکـو باسمـان کرد گەشـەی منـداڵ بە چەنـد قۆنـاغێکی دیاریکراو تێ‌دەپـەڕێت، هەر قۆنـاغـەو خاسیـەتی تایبەتی هەیە، بۆگێڕانەوەو بڵاوکـردنـەوەی چیـرۆکی فۆلکلۆری منـداڵان پێـویستە هەمان بناغە ڕەچـاوبکرێت، چونکە ئەگەر نا بێ مەنهەجی سەرهەڵدەدات . . . ڕەنگـە خەڵکێکی وا هەبن و بڵێن ئەو چیـرۆکـە فۆلکلۆرییانە باویان نەمـــاوەو ئەمـــرۆ دوورن لە پەروەردەکـــردنی منـــداڵان، من تاکـە پرسیـــارێـك دەکـەم نەك درێـژەی پێ بـدەم، با نمـوونـە بێنین و لە مەداری مەبەست تزیك ببینەوە.

چیـرۆکی (کێشکـۆکەو مام ڕێوی)[١٨] چیرۆکێکە تام و بۆیەکی خۆشـی تیـایـــەو لە جیـهـــانی دەژێت (کێشکـــۆکـــەکی جوان لە دارستـانێکـدا لە ناکاوڕا ڕێوییەکی فێڵباز پڕی دایێ و گرتی، ڕێوی لێ پرسی : ئەرێ کێشکـۆکـە، ئەوە پێم ناڵێی تۆی بێ‌دەسەڵات و نەفـام بۆچی ئەوەنـدە دڵ خۆش و بەختیارو سەربەستیت؟! ئەمیش گوتی : وەرە تۆبەرەڵـڵام بکـە با بفـرمـە سەر لقی ئەم دارانە، ئینجا بزانـە هۆی بەختـەوەری من چی‌یـە؟ ئینجا کێشکۆکەی بەرەڵاکردو فڕی‌یە سەر بەرزترین چڵێ دارێك ڕووی لە ڕوی‌کردو گوتی :

هۆی ڕێوی ڕاستە من بێ دەسەڵاتم، بەڵام هەموو کاتێکیش بیر لە ئازاردانی کەسـانی تـر ناکەمەوە کە لە خۆم بێ‌دەسەڵات ترن، بە هیـچ جۆرێـك زۆرداریم بە خەیـاڵـدا نایـەت، کەچی ڕێوییەکی فێڵبـازی وەك تۆ هەمیشـە بیـر لە ئازاردانی کەسـانی بێ دەسـەلات دەکـەیتـەوەو زۆرداری خۆت بەرامبـەریان دەنوێنیت، هەر بۆیەشە هەمـوودەم وا لەغـەم وپەژارەو ناخۆشیدا ئەستۆت شکاوە، چونکە

هەرخەریکی ئەم جۆرە بیرکرد نانەوەی)

با بزانین لە ململانێی ئەو ئاژەڵ و باڵندەیە منداڵ چ دەرسێك وەردەگرێت:

١ ـ فێری ئەوە دەبێت چۆن عەقڵ بەکاربێنێت، بە تایبەتی بۆخۆ ڕزگارکردن و دەربازکردن.

٢ ـ زۆرداریتی تاسەر نیە.

٣ ـ ڕ. ێگایەکی ڕاست بە منداڵ پێشان دەدات، کە بیر لە ئازاردانی خەڵك نەکاتەوە.

٤ ـ منداڵ بیر لە زۆرداری نەکاتەوە.

٥ ـ ئەوەی بیر لە زۆرداری بکاتەوە هەمیشە پڕ تەنگ و چەڵەمەیە.

**ئەنجام:**

لە ئەنجامی ئەم باسە دەگەینە قەناعەتێك کە فۆلکلۆری کوردی هێشتا گەلێك زۆری وەبەرماوە لە ڕووی خرکردنەوە یان لێکۆڵینەوەی ئێمەش لەم باسە کورتەدا لە ڕۆڵی ئاژەڵی نێوچیرۆکی فۆلکلۆری کوردی بۆزاروکان دواوین و بە گوێرەی توانای ڕۆشنبیری و تێگەیشتن، باسەکەم کردۆتە دووبەش: بێجگە لە پێشەکی یەکی گشتی لە بەشی یەکەمدا بە شێوەیەکی تیۆری باسی ڕۆڵی ئاژەڵم کردووە، هەوڵم داوە پەیوەندی یەکی گونجاو لە نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ و دەوروبەرەکەی بدۆزمەوە لە بەشی دووەمدا لە چەند سەرباسێکی نوێ دواوم لەگەڵ هێنانەوەی چەند نموونەیەکی گونجاو بۆ هەر باسێك. . بە کورتی: ئاژەڵ ئەوگیاندارەیە، کە منداڵ حەزی لێ دەکات، خۆشەویستی هەر ئاژەڵێکیش لای منداڵ بە گوێرەی چەشەی منداڵ دەگۆڕێت، بە تایبەتی لە ڕووی قەبارەو سوودمەندی و زیانداری و کۆمەڵێ شتی تر، کە پەیوەندی بە دەروونی منداڵەوە هەیە.

**پەراوێز:**

---

١) عبدالغني علي يحيى، چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی لە ئەدەبی منداڵاندا گۆڤاری «ئۆتۆنۆمی» ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٨٣، لاپەڕە «١٢٤».

٢ ـ د. محمد نوری عارف، مامۆستای زمانی فارسی یە لە بەشی کوردی کۆلیژ ی ئەدەبیات ـ زانکۆی سەلاحەددین، زانیاری یەکی لەمەڕ زوحاك و نەورۆزو کاوە پێ یە، لە پیاسەیەکی تایبەتیدا هەندێك سنی درکاند، ڕەنگە ئەو چەند بۆچوونەم لەمەڕ زوحاك بۆنی بۆچوونەکانی ئەمی لێ بێت، سوپاسی دەکەم.

٣ ـ الكزاندر هجرتي كراب، علم الفلكلور، ترجمة. رشدي صالح، دار الكاتب العربي، القاهرة ـ ١٩٦٧، لاپەڕە «١١٤».

٤ ـ هەمان سەرچاوە، لاپەڕە «١١٩»

٥ ـ كراب: مەبەستی ئەوەیە لە شوێنێکی تری هەمان کتێبی دا باسی ئەمەی کردووە.

٦ ـ بۆزیاتر شارەزابوون لە قۆناغەکانی گەشەبوونی منداڵ سەیری ئەولێکۆڵینەوەم بکە کە لە ژمارە (١١٥)ی گۆڤارە ڕۆشنبیری نوێ بڵاوم کردۆتەوە.

«هەبوو. . نەبوو» بەناوی «ڕویڤی» چاپی کردووە.

٨ـ جەزا عەلی ئەمین، سەرەتایەکی پێویست بۆ ئەدەبیاتی منداڵان، گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ـ ٦ ـ ی خوولی دووەم، شوباتی ١٩٨١، لاپەڕە ـ ١٦٦، ١٦٧ ـ

٩ ـ دەستنووسی خۆم، لەم دووسەرچاوەش هەیە: ـ

أ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، تیتیلەو بیبیلە بە ناوی «دادگایەتی بزن و گورگ».

ب ـ عبدالرحمن نقشبندی، هەبوو. . نەبوو، بە ناوی «زەنگ و بەنگ».

١٠ ـ هەمان سەرچاوەی هەشتەم، لاپەڕە «١٦٧»

١١ ـ د. عبدالرحمن يونس، الحكاية الشعبية، لاپەڕە «٢٩»

١٢ ـ جارێکی بۆزیاتر شارەزایی سەیری باسەکەم لە ژمارە (١١٥)ی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بکە.

١٣ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، ڕێوی گەرمیان و کوێستان، لاپەڕە «٥٧»

١٤ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە «٤٥».

١٥ ـ عبدالرحمن نەقشبەندی، هەبوو، لاپەڕە «١٦١ ـ ١٦٤»

١٦ ـ فوزي العنتيل، الحكايات الشعبية وتنمية طاقة الابداع، مجلة الطليعة ـ عدد (٤) ابريل ـ ١٩٦٦ ص٥٦ ـ

١٧ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ـ ٧٢ ـ

١٨ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، کراشم دڕاو چم پێ نەبڕا، لاپەڕە «٢٦»

**سەرچاوە**

---

١ ـ الكزاندر هجرتي كراب ـ علم الفلكلور، ترجمة: رشدي صالح، دار الكاتب العربي، القاهرة ـ ١٩٦٧.

٢ ـ عبدالفتاح ابو معال، ادب الاطفال، دار الشروق ـ عثمان ـ ١٩٨٤

٣ ـ د. عبدالحميد يونس، الحكاية الشعبية، سلسلة كتاب الجيب مشروع النشر المشترك.
٤ ـ مجلة الطليعة ـ العدد (٤) السنة الثانية، ابريل ١٩٦٦، عدد خاص حول «نظرة اشتراكية لعالم الطفل»
٥ ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ـ ژماره (٢) ساڵی حەوتەم، ساڵی ـ ١٩٨٣ ـ
٦ ـ عبدالرحمن نقشبندی، هەبو. نەبو، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ـ ١٩٨٠.
٧ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، تیتیلەو بیبیلە، ئەمانەتی گشتی رۆشنبیریو لاوان، بەغدا ـ ١٩٨٠
٨ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، رێوی گەرمیان و کوێستان، بەغدا ـ ١٩٨٤
٩ ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز، کراشم دراو چم پێ نەبرا، بەغدا ـ ١٩٨٦
١٠ ـ گۆڤاری نووسەری کورد، ژماره (٦)ی خولی دووەم، شوباتی ـ ١٩٨١ ـ
١١ ـ کۆمەڵە چیرۆکێك دەستنووسی خۆم.
١٢ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژماره (١١٥) ئەیلولی ساڵی ١٩٨٧.

# ملخص البحث:

## الحيوان والحكايات الشعبية للأطفال

بقلم: نوزاد علي احمد
- اربيل -

ينقسم البحث الى قسمين، قسم نظري وقسم تطبيقي، في القسم النظري يتحدث الباحث عن الغرض من بحثه ولماذا اختار موضوع (علاقة الطفل بالحيوانات) ولماذا يميل الطفل الى اللعب مع بعض الحيوانات، أويكون اهتمامه موجهاً الى حيوان معين دون غيره، لماذا يجلب الحيوان نظر الطفل وكيف يختلف هذا الامر بالنسبة لبيئة الطفل ونوع الحيوانات الموجودة فيها.

في القسم التطبيقي ينتخب الباحث عدداً من القصص الفلكلورية للاطفال ويحللها تحليلاً جيداً وكأن القصص تبدأ من نقطة معينة، تدور وكانها تكون الدائرة حتى يكتمل المحيط، ماراً (الى النقطة) بعدد من الاحداث والمفاجئات والصراعات بين الخير والشر الى ان ينتصر الخير والحق على الشر والباطل مع استخلاص بعض الجوانب التربوية والتوجيهية.

# ساڵی تازەیەو نەورۆزە هاتەوە

ساڵ دێو ساڵ دەڕوا نەورۆز بەهارو سەرەتای ساڵێکی نوێیە، ساڵ دێو ساڵ دەڕوا نەورۆز وەك لوتکەی پیرەمەگرون سەربەرزو بڵندەو دەڕوانێتە ئاسۆیەکی گەش. ئیتر باوی ئەو پەندە نەماوە کە دەڵێت (ساڵ بەساڵ خۆزگەم بە پار)، مرۆڤی گەش بین بە چاویلکەیەکی ڕوونەوە دەڕوانێتە ڕۆژانی داهاتوو بەرامبەر هیچ مەترسیەك چۆك دانادات دەڵێت ئەمساڵمان لەپار باشترو داهاتومان لەئەمساڵمان باشتر دەبێت.

با لایەك لەساڵانی ڕابوردوو بکەینەوەو بڕوانین چۆن دوژمن هەشت ساڵ لەسەریەك کردی و کۆشا نەیتوانی لەسنور بێتە ئەم دیوەوەو پێی نەکرا دەلاقەیەك بخاتە ڕیزی نیشتمانیەوە، ئەوەبوو لەڕۆژی هەشتی، مانگی هەشتی، ساڵی هەزارو نۆسەدو هەشتاو هەشت، گەلی عێراقمان بەسەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە کاك صدام حسین - خوایپارێزێت - سەرکەوتنی وەدی هێناو دوژمن بەجاری هەرەسی هێنا.

ئەم ساڵان وا لەبەرچاوە دەبینین سەرۆکی فەرماندە هەمیشە لەکوردستاندایەو سەرپەرشتی ئاوەدان کردنەوەی هاوینە هەوارەکانیان دەکات.

با دوور نەڕۆین چارەکە سەدەیەك لەمەوپێش ژمارەی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانیان لەژمارەی ئەنگوستەکانی یەك دەست تێنەدەپەڕین، ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پانزدە ڕۆژنامەو گۆڤارمان دەردەچێت، ژمارەی کتێبە چاپکراوەکانە لە هەشتاکانیان دا بەقەدەر نیو سەدەی پێش خۆی بووە.

وادەبینین لەنەورۆزی ئەم ساڵان دا دەشت و دۆڵ و چیاکانی کوردستان بەرگێکی سەوزیان پۆشیوە ئەوبەرگەش بەگوڵی ئاڵ و ڕەنگاو ڕەنگی لاڵەو نێرگس و نەسرین ڕەنگین بوەو نازدارانیش شایی و زەماوەن ئەگێڕن و ڕەشبەڵەك ئەکەن و سرودە نەمرەکەی پیرەمێرد ئەچڕن:

[ ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە.
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بە هاتەوە]

سکرتێری نووسین

# نووسەرانی بەڕێز

کورد تاقە گۆڤارێکی پسپۆری هەیە کە باس و لێکۆڵینەوەی (ئەدەبی، زمانەوانی، مێژوو، زانست، کەلەپوور) بڵاو بکاتەوە، ئەم گۆڤارەتان ـ رۆشنبیری نوێ ـ لەلایەن چوار زانکۆی عیراقی‌یەوە دانی پیادانراوە، هەر دکتورێکی زانکۆ بێتو کەرەستەیەك لەم گۆڤارەتان بڵاوبکاتەوە کار دەکاتە سەر سەرکەوتنی لە پلەی مامۆستایی‌داو لێرە چەندە مافی نووسینی وەرئەگرێت لە زانکۆش دوو چەندان وەردەگرێ.

وە نەبێت گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) تەنیا بۆ نیسۆرو مامۆستایانی زانکۆ تەرخان کرابێت و بەس بەلکو لاپەرەکانی بۆ هەموو ئەدیب و نووسەرانی کورد کراوەتەوە، با ئەوەشتان عەرز بکەم ئەو نوسینانەی لەمەولا بۆمانی ئەنێرن ئەبێت ئەم مەرجانەی تیادا بێت:

١ ـ باسەکە لە سنوری (٥٠) لاپەرە تێنەپەرێت و بە خەتێکی خۆش نوسرابێت، خەتێ نە خەتێ، لاپەرەیەك نە لاپەرەیەك بێت و تقطیعیش کرابێت و لەسەر رێنوسی ئەم دوایی‌یەی کۆر بێت.

٢ ـ باسەکە رەسەن بێت و وەرگێراو نەبێت و ئەم خاڵانەی تیادا کۆبێتەوە (پێشەکی، کەرەستەی‌باس، سەرەنجام، پەراوێز، سەرچاوە، کورتەیەکی عەرەبی باسەکە ـ لە دوو لاپەرە کەمتر ـ نەبێت)

٣ ـ بۆ هیچ نوسەرێك دوو ژمارە لە سەریەك کەرەستە بڵاو ناکرێتەوە

٤ ـ ئەو کەرەستەیەی بۆ بڵاوکردنەوە بشێ یا نەشێ خاوەنەکەی ئاگادار ئەکرێت و هۆی بڵاو نەکردنەوەشی بۆ ئەنوسرێت.

٥ ـ بریار دراوە ئەم گۆڤارە کۆرێك بۆ باس و لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆرو کەلەپوور لەهەولێر سازبکات، لەدەرچوونی ئەم ژمارەیەوە تا سێ مانگ هەرچی کەسێك چ باسێکی تێرو تەسەلی هەیە با رەوانەی بفەرموێ پاش ئەو کۆرە ژمارەیەکی تایبەتی ـئەم گۆڤارە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەوباسانەیـ تەرخانکراوانە دەبێت.

٦ ـ لەهونەرمەندان داوائەکەین تابلۆیەکی کوردەوای بۆ بەرگی ئەم گۆڤارە ئامادەبکەن، تابلۆکە لە باری زانستی‌و ناوەرۆکی ئەم گۆڤارەوە هەڵقوڵاو بێت و ئامێتەی سروشتی کوردستان کرابێت لەگەڵ دروشمی گۆڤارەکە هەرتابلۆیەك سەرکەوت ئەبێتە بەرگی هەمیشەیی رۆشنبیری‌نوێ‌و پاداشیشی ئەدرێتە هونەرمەندەکە.

ئیتر بۆ پێشەوە بۆخزمەت کردنی ووشەی رەسەنی کوردی.

**سەر نووسەر**

## لەم ژمارەیەدا

